8

ئامادەکردنی: بیلال ن. شمشیر

# بەڵگەنامەکانی ئینگلیز

## لەبارەی کێشەی کوردی تورکیاوە (١٩٢٤-١٩٣٨)

## شۆڕشەکانی شێخ سەعیدی پیران، ئاگری و دەرسیم

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە
سەلمان عەلی

پێشەکی و پێداچوونەوەی
سدیق ساڵح

# بەڵگەنامەکانی ئینگلیز لەبارەی کێشەی کوردی تورکیاوە (١٩٢٤-١٩٣٨)

## شۆڕشەکانی شێخ سەعیدی پیران، ئاگری و دەرسیم

ئامادەکردنی
بیلال ن. شمشیر
وەرگێڕانی لەئینگلیزییەوە
سەلمان عەلی

پێشەکی و پێداچوونەوەی
سدیق ساڵح

٢٠٠٢

**ناونیشانی کتێبە ئەسلییەکە :**

Ingiliz Belgeleriyle
TÜRKIYEDE KÜRT SORUNU
(1924-1938)
Şeyh Sait , Ağri ve Dersim
Ayaklanmalari
2. Baski
Hazirlayan
Bilal N. ŞIMŞIR
Türk Tarîh Kûrumu Üyesi
ANKARA, 1991

# وەزارەتی رۆشنبیری

## بەڕێوەبەرایەتی خانەی وەرگێڕان

- ناوی کتێب: بەڵگەنامەکانی ئینگلیز لەبارەی کێشەی کوردی تورکیاوە(١٩٢٤-١٩٣٨)

شۆڕشەکانی شێخ سەعیدی پیران، ئاگریو دەرسیم

- ئامادەکردنی: بیلال ن. شمشیر
- وەرگێرانی لە ئینگلیزییەوە: سەلمان عەلی
- تایپ: بەهرە عیزەدین
- نەخشەی بەرگ: ستار قادر
- ژمارەی سپاردنی( ٤٠٦ ) ی وەزارەتی رۆشنبیری دراوەتێ
- زنجیرە: ٨
- تیراژ: ٧٥٠ دانە
- چاپ: چاپخانەو ئۆفسێتی ئاسا
- چاپی یەکەم ٢٠٠٢ سلێمانی

# پێشەکی

ساڵی ٢٠٠٠ کاك (سەلمان عەلی)م ناسی. بۆم تاقی بووەوە کە لاوێکی، لە خۆبوردوو و چالاك‌و دانایەو، هەوڵی خۆ پێگەیاندن ئەدات لە بوارێکی وەرگێڕاندا لە ئینگلیزییەوە کە ئێمە یەکجار پێویستیمان بە کەسانی شارەزای لە و جۆرە هەیە. بەو پێیە، دەرکەوت ئەشێ ئەو بەهرەو سەلیقەو وردەکارییەی بۆ لایەنێکی گرنگی وەك مێژوومان بخرێتە کارو، لە و ڕووەوە خێر بداتەوە.

من هەمیشە لە ئاستی ئەو ژمارە زۆرەی بەڵگەنامەو کتێبی بیانیدا کە بە زمانانی جیاجیا لە سەر کورد هەن‌و نووسراون‌و هێشتا نەکراونەتە کوردی، خەم دامئەگرێ‌و، ئاواتەخوازم ڕۆژێك لە ڕۆژان وەرگێڕی تواناییان بۆ پەیدا ببێ تا کتێبخانەی هەژاری مێژووی کوردیان پێ ئاوەدان ببێتەوە.

بۆ ئەم مەبەستە، ڕووم لە کاك سەلمان نا دەست بەکار بێ‌و، ئەم کتێبەی بەڵگەنامەکانی ئینگلیز لە سەر شۆڕشەکانی شێخ سەعیدی پیران‌و ئاگری داغ‌و دەرسیم بکاتە یەکەم کاری ئەو پرۆژەیە کە ئومێدمە تاسەر درێژەی پێ بداتو، منیش بتوانم هاوکاری بم. هەر لە سەرەتایشەوە، ئەرکی پێداچوونەوەیم، لە ڕووی زمانەوانی‌و ساغکردنەوەی ناوی شوێن‌و کەسەکانەوە، خستە ئەستۆی خۆم. کاری ڕاست بێ، بە پشوودرێژی‌و کۆشش‌و مەراقی دڵسۆزانەی بۆ فێربوون‌و هونەرنواندن، بەتەواو بوونی گەیاند. پێنج ئەڵقەیشی تائێستا کە تا بەڵگەنامەی ژمارە (٤٦)ی گرتووەتەوە، لە ژمارەکانی (١٢،١٣،١٤،١٥،١٩)ی گۆڤاری "هەزارمێرد" دا بڵاوبووەتەوە.

جێی باسە کاك ئومێد محەمەد ئەمین بەشی (کورتەی بەڵگەنامەکان)ی کتێبەکەی لە تورکییەوە کردە کوردی‌و، داڕێژرایەوە. منیش بە پێویستم زانی کۆمەڵێك پەراوێز بۆ ڕوونکردنەوەی ناوەکان ئامادە بکەم، کە بۆ جیاکردنەوەیان لە وانەی کاك سەلمان، نیشانەی (س)م خستووەتە دوایان. ناوی شوێنەکانم، بەگشتی، پشت بەستوو بەم سێ سەرچاوەیە ڕاستکردەوە:

١ـ ROAD MAP OF TURKEY 1969، مامۆستا عەبدولڕەقیب یووسف پێشکەشی کردووم، سوپاسی ئەکەم.

٢ـ قائممقام محمد رشدی و معلم محمد عبدالقادر، مکملو مفصل تورکیە جمهوریتی اطلاسی، استانبول، ١٩٢٨.

٣ـ Good & Darby, The University Atlas, 2nd ed. London,1940

ئەوی دووەمیان کە زۆرتر بەکارم هێناوە، هی سەردەمی کەمو زۆر ئەو شۆڕشانەیە. پاشان بە مایەی سوودم زانی، بۆ ئاسانکردنی کاری لێکۆڵەرەوە، پێڕست بۆ ناوی شوێنو کەسەکان ڕێك بخەم تا وەك پاشکۆیەك بخرێتە دوای دەقی بەڵگەنامەکانەوە.

ئەم کتێبە پرۆفیسۆر دکتۆر بیلال ن. شمشیر ئامادەی کردووە کە کاتی خۆی بەڕێوەبەری پلان دانانی وەزارەتی کاروباری دەرەوەی تورکیاو، ماوەیەکیش کارمەندی باڵیۆزخانەی تورکیا بووە لە باکۆ. هەتا پۆستی باڵوێزیشی وەرگرتووەو، دواجار خانەنشین کراوە*. جگەلە وە، وێنەی ئەسڵیی هیچ یەکێك لە م بەڵگەنامانە لە کتێبەکەدا نییە، هەوڵی بەدەستهێنانیشیان بۆ ئێمە، کارێکی ئەستەم بوو. بەڵام وەك بەناوەڕۆکیاندا دیارە، پێناچێ دەستکاری کرابن،و گومان لە دروستیو ڕاستییان ناکرێ. لەگەڵ ئەوەیشدا، جاروبارو لێرەو لە وێ هەڵە ی چاپیان تێکەوتووە، کاك سەلمان خۆی بە سەلیقە ڕاستی کردوونەتەوە. چەندین پاشکۆو هاوپێچی ئامازە پێدراوو برگەی تر لە بەڵگەنامەکاندا چاپ نەکراون.

ئەم بەڵگەنامانە، بەحوکمی ئەوەی کە برووسکە یا ڕاپۆرتی وردو هەمەلایەنەن،و هاوزەمانو لە گەرماو گەرمیی ڕووداوەکاندا، یا لە شوێنو ناوچە جێی مەبەستەکان خۆیانەوەو، لە قسەی کاربەدەستانەوە، یان بە گێڕانەوەی دەمیی ئەموئەوی ئاگادار نووسراونو، ڕۆژنامەکانی تورکیایشی بۆ بەسەرکراونەتەوە؛ پڕن لە زانیاریی هەمە جۆری گرنگ لە سەر وەزعی کۆمەلایەتیو سیاسیو ئابووریو وردەکاریی بەسەرهاتەکانی ئەو شۆڕشانەو، کەرەستەیەکی گرانبەها ئەخەنە بەردەستی لێکۆڵە

* کاك سەلمان ئەم چەند زانیارییەی لە بارەیەوە لە ئینتەرنێتەوە وەرگرتووە.

ڕەوەی کوردو، تەنانەت زانیاریەکانی پێشوومان زیاترو دەولە مەندترو ڕاستتر ئەکەنەوە. ئەم کتێبە بەڵگەیەکی حاشاهەڵنەگرە لە سەر شوێن و بایەخی لە ڕادەبەدەری بەڵگەنامە بۆ نووسینەوەی مێژوو.

هیوامە ئەم بەرهەمە کاری گەورەو بەکەڵکتری بەدوادابێ و، دەستخۆشیش لە برای ئازیزم کاك سەلمان ئەکەم.

**سدیق ساڵح**

٢٠٠٢/٦/١

# پێشەکیی ئامادەکار

کۆماری تورکیا، لە سەرەتای دروست بوونییەوە، ناوبەناو تووشی کێشەی کوردبووەو، کێشەکەیش لە شێوەی یاخی بوونەکانی ساڵی ۱۹۲۵ی شێخ سەعیدو ۱۹۳۰ی ئاگریو ۱۹۳۷ی دەرسیمو تونجەلیدا بووەو، حکوومەتە جیاجیاکانی کۆمارەکەمانی بەشێوەیەکی بەرچاو گیرۆدە کردووە.

بریتانیا یەکێکە لەو دەوڵەتانەی کەبەدەنگ گرفتی کوردەوە هاتووەو، ڕێکخەری ئەو بەندانەی سیڤەریش بووە، کەتایبەت بوون بەکورد. ئەم وڵاتە، لە بەرئەوەی کەلە ماوەی هەردوو جەنگی جیهانیدا دەسەڵاتدار بووەو، حوکمڕانیی عیراقی کردووە، ڕووبەڕووی کێشەی کورد بووەتەوە. هەروەها بەهۆی کێشەکانی سنووریی عیراق- تورکیاو مووسڵەوە، شەڕێکی دیبلۆماسیی لە نێوان تورکیاو بریتانیادا هاتووەتە گۆڕێ. ناوچە کوردنیشینەکان پانتاییەکی فراوانی دەوڵەمەندی نەوتن و، بریتانیاش بایەخ بەهەر جێیەك دەدات کەنەوتی تێدا بێ.

لە بەرئەوەی دیبلۆماتەکانی ئینگلیز لە نزیکەوە چاودێری کێشەی کوردیان کردووەو، لێکۆڵینەوەو پلانیان بۆ چۆنییەتی چاودێریی کێشەکە لە تورکیادا هەبووە. بەباشم زانی لێکۆڵینەوەو بەدواداگەڕانێکی ئەم بابەتە بکەم. دیارە گەلێ بڵاوکراوەی کۆن لە بارەی کوردەوە لەم وڵاتەدان، بەڵام هێشتا لێکۆڵینەوەیەکی وا لە سەر بەڵگەنامە ڕەسمییەکان نەکراوەو، بەڵگەنامە دیبلۆماسییە ئینگلیزییە بڵاوکراوەکانیش کەپەیوەندییان بەم مەسەلەیەوە هەیە، زۆرنین. جا بۆ ئەوەی بزانین دیبلۆماتەکانی ئینگلیز چۆن مامەڵەو چاودێریی کێشەی کوردیان کردووە، ئەبێ ڕاستەوخۆ پشت بەئەرشیفەکان ببەستین، هەر بۆیە بەهەلم زانی لێکۆڵینەوەیەك لە سەر ئەو ئەرشیفانەی تا ساڵی ۱۹٤۰ی بریتانیا لە لەندەن بکەم.

پێدەچێ ئەمە یەکەم لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون بێ کە لە ئەرشیفە بیانییەکانەوە لە سەر کێشەی کورد کرا بێ، بەڵام لە هەڵەو چەوتییەوە دوورە، لێرەدا بابەتەکە تەنها ماوەیەکی کەم لە خۆ دەگرێ و، کێشەکانی سەردەمی ئیمپراتۆریەتو

بەڵگەنامە ئینگلیزییەکانی پازدە ساڵی یەکەمی کۆماری تورکیای تێدا نین، بەڵکو تەنها چەند دۆکیۆمینتێکی هەڵبژێردراوی پێشانگایەکی بچووکن کەشیاوی لێکۆڵینەوەن.

پێم وایە ئەم بەڵگەنامانە، هیچ نەبێ، دەتوانن کەم یا زۆر بیرۆکەیەکمان لە بارەی چۆنییەتی لێکۆڵینەوەو چاودێریی کێشەی کوردەوە لە تورکیا لەلایەن دیبلۆماتانی ئینگلیزەوە بدەنێ.

بەڵگەنامەکان بەپێی مێژووی ڕووداوەکانی (Chronology) ڕیزکراون. هەر دۆکیۆمێنتێك کورتەی ناوەرۆکەکەی لە لاپەڕەکانی(١٠–٦٩)دا نووسراوەو، ئەو بەرگانەی کە ئەرشیفەکانیان لیٚ وەرگیراوە، بەکورتی لە ژێریاندا تۆمار کراون. (F.O) کورتەی ئەرشیفەکانی وەزارەتی دەرەوەی ئینگلتەرەیە. (٤٢٤) ژمارەی پێشانگای ئەرشیفی وەرگیراوەو، (٢٦١و ٢٦٢و ..هتد) ژمارەی بەرگەکانی ناو پێشانگاکەن. ئەمجا ژمارەی لاپەڕەو ڕیزبەندەکانیان نووسراون.

کورتەی ناوەڕۆکی دەقەکان بەتەواوی دراوە، بۆیە ئیتر پێویست ناکات بەجیاجیا لێیان بکۆڵرێتەوە. ئەوەی کەشایانی باس بێ هەر ئەوەندەیە بلێم:

ئەگەر بەوردی بچیتە ناو بەڵگەنامەکانەوە، ئەوا چەند خاڵێك سەرنجت ڕادەکێشن و، وات لێدەکەن ڕابمێنی. زۆربەی ئەو بیروبۆچوونانەی کەخراونەتەڕوو، ڕاپێچی بیرێکی قووڵت دەکەن و، هەندێکیشیان تا ئەمڕۆ بایەخی خۆیان هەیە.

ئەگەر ئەم بەدواداچوونە بووبێتە مایەی کەمێك ڕامان لە بابەتەکە، ئەوا ئەوە دەردەخات کەلێکۆڵینەوەکەم بێهودە نەبووە.

**ب.ن.ش**

**لەندەن**

**١٩٧٢/٦/٢٨**

# کورتەی بەڵگەنامەکان

| ژ | ڕۆژ | |
|---|---|---|
| ١ | ١٩٢٤/٧/٢٣ | ڕاپۆرتی ژمارە ٥٧٢ی مستەر هندرسنی کار- هەڵسووڕێنی ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ ماك دۆناڵدی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل:٦٩<br>باروودۆخی سیاسیی تورکیا، هەوڵەکانی والی و فەرمانڕەوای تازەی ئەستەمبوڵ و ئاسایش. قسەو قسەلۆکی نهێنیی ئیتیحادە کوردەکان دژی حکوومەت. وتەکەی عیسمەت پاشا دەربارەی کۆمپانیا بیانییەکان و پەیمانی لۆزان. |
| ٢ | ١٩٢٤/٩/١٦ | ڕاپۆرتی ژمارە ٦٨٥ی مستەر هندرسنی کارهەڵسووڕێنی ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ ماك دۆناڵدی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە ل: ٨٠<br>باروودۆخی تورکیا. کار پێکردنی پەیماننامەی لۆزان و پڕوپاگەندەی جێبەجێنەکردنی بەندە جیاجیاکانی لەلایەن حکوومەتی تورکیاوە. دەرکەوتنی جووڵانەوەی کوردی. گواستنەوەی زەکی بۆ لەندەن. تێپەڕبوونی مستەفا کەمال پاشا بە دەریای ڕەشداو، لانەدانی لە ئەستەمبووڵ. |
| ٣ | ١٩٢٥/٢/٢٣ | برووسکەی ژمارە ٣٧ی مستەر لیندسەیی نوێنەری دیبلۆماسیی ئینگلیز لە |

| | | |
|---|---|---|
| | | ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل: ٩١<br>یاخی بوونی شێخ سەعید. دەستبەرسەرداگرتنی زێدی والی لەلایەن یاخییانەوە. سەردانی عیسمەت پاشا بۆ ئەنکەرە بەمەبەستی تاوتوێکردنی هەلومەرجەکە. |
| ٤ | ١٩٢٥/٢/٢٤ | برووسکەی ژمارە ٤٠ی مستەر لیندسەیی نوێنەری دیبلۆماسیی ئینگلتەرە لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلە ینی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل: ٩٢<br>یاخیبوونی شێخ سەعید. ڕاگەیاندنی حوکمی عورفی لە هەندێ ناوچەی هەرێمی ئەرزرۆم و باشووری ڕۆژهەڵاتی تورکیا. |
| ٥ | ١٩٢٥/٢/٢٤ | ڕاپۆرتی ژمارە ١٥٤ی مستەر لیندسەیی نوێنەری دبلۆماسیی ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٩٣<br>یاخیبوونی شێخ سەعید. ڕۆیشتنی یەکسەری عیسمەت پاشا بۆ ئەنکەرە بەم هۆیەوەو، هەڵسەنگاندنی بزووتنەوەی کوردی. |
| ٥/ﻫ | ١٩٢٥/٢/٢٤ | پوختەی چاپەمەنییەکان دەربارەی یاخیبوون. ل: ٩٥<br>هەواڵی یاخیبوونەکە لە ڕۆژنامەکانی |

| | | |
|---|---|---|
| | | تەنین، وەقت، جمهورییەت، تەوحید، وەتەن، ئەنگۆرە تێلیگرامز. |
| ٥/٢ه | ١٩٢٥/٢/٢٥ | دووەم کورتەی چاپەمەنییەکان سەبارەت بەیاخی بوون. ل: ٩٨<br>هەواڵی ڕۆژنامەکانی تەنین، تەوحید، وەقتو وەتەن. |
| ٦ | ١٩٢٥/٢/٢٥ | برووسکەی ژمارە ٤٢ی مستەر لیندسەیی نوێنەری دیبلۆماسیی ئینگلتەرە لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی بریتانیا ل: ١٠١<br>یاخیبوونی شێخ سەعید. هەواڵی دەست بەسەرداگرتنی خەرپووتو دیار بەکرو دەرسیم لەلایەن یاخییانەوە. |
| ٧ | ١٩٢٥/٢/٢٧ | برووسکەی ژمارە ٤٤ی مستەر لیندسەیی نوێنەری دیبلۆماسیی ئینگلیز بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل:١٠١<br>یاخیبوونی شێخ سەعید. هەواڵی گرتنەوەی خەرپووت. |
| ٨ | ١٩٢٥/٢/٢٧ | برووسکەی ژمارە ٤٦ی مستەر لیندسەیی نوێنەری دبلۆماسیی بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل: ١٠٢<br>یاخیبوونی شێخ سەعید. پیلانەکانی ئینگلیزو گوشاری تورکیا بۆ سەر ڕاپەرینەکە. هاننەدانی بەهیچ جۆرێکی یاخیبوون لەلایەن بریتانیاوە. |

| | | |
|---|---|---|
| | | پەسندنەکردنی یارمەتیدانی نووسرەت و ڕوونکردنەوەی ئەمە بۆ نوێنەری وەزارەتی دەرەوەی تورکیا لە ئەستەمبووڵ. |
| ٩ | ١٩٢٥/٣/٣ | ڕاپۆرتی ژمارە ١٧٨ی مستەر لیندسەیی نوێنەری دیبلۆماسیی ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ١٠٣ |
| | | فراوانبوونی یاخیبوونەکەی شێخ سەعیدو کاریگەریی لە سەر حکوومەتی تورکیا. دەست لە کارکێشانەوەی فەتحیی سەرۆك وەزیر، شیکردنەوەی چەند لایەنێکی هێنانەوەی عیسمەت پاشا بۆ ئەو پۆستە. |
| ٩/١ھ | ١٩٢٥/٣/٤ | ڕاپۆرتی ئار.ئی. هارێنکی پاشکۆی سەربازیی باڵیۆزخانەی ئینگلیز بۆ مستەر لیندسەیی نوێنەری دیبلۆماسیی ئینگلتەرە لە ئەستەمبووڵ. ل: ١٠٧ |
| | | یاخی بوونی شێخ سەعید. تاووتوێکردنی ئەم یاخیبوونە لە ڕووی سیاسیی و سەربازییەوە. جموجووڵی شێخ سەعیدو مۆڵدانی سەربازانی تورك لە ڕۆژهەڵاتدا. |
| ٩/٢ھ | ١٩٢٥/٣/٣ | پوختەی نووسینی چاپەمەنییە خۆجییەکان لە سەر یاخیبوونەکەی شێخ سەعید. ل: ١١٠ |
| | | لێکدانەوەو هەواڵی ٢/٢٣- ٣/٣ی یاخیبوون لە بڵاوکراوەکانی تورکیادا. |
| ٣/٣ھ | ١٩٢٥/٣/٣ | دەقی چاوپێکەوتنی شوکری نایلیو ڕائید |

| | | |
|---|---|---|
| | | ئار. ئی. هارێنك. ل: ١١٤<br>زانیارییەكانی شوكری نایلی پاشا لە مەڕ یاخیبوون بۆ ڕائید هارێنكو هەڵسەنگاندنی ئەم مەسەلەیە لەلایەن ناوبراوەوە |
| ٩/٤ه | ١٩٢٥/٣/٣ | ڕاپۆرتی هەواڵدەریی تایبەت بەبزاوتنی سەربازیی تورك لە هەرێمەكانی رۆژهەڵاتدا. ل: ١١٦<br>كۆكردنەوەی سەرباز لە ئەدەنە لەلایەن ئەركانی گشتیی توركیاوە، و ئیتحتمالی هێنانیان لە ئەنكەرەو ئەزمیرەوە. |
| ١٠ | ١٩٢٥/٣/١٠ | ڕاپۆرتی ژمارە ١٩٩ی مستەر لیندسەیی نوێنەری دبلۆماسیی ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ١١٨<br>باری سیاسیی توركیا. هەڵوەشانی كابینەكەی فەتحیو بەرنامەی ئەوەی عیسمەت پاشا. دەرچوونی یاساكانی سەقامگیركردنی ئارامیو دادگاكانی ئیستیقلال. وتەی رەجەب بەگ دژی چاپەمەنییەكان. |
| ١١ | ١٩٢٥/٣/٢٣ | ڕاپۆرتی ژمارە ٢١٩ی مستەر لیندسەیی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە توركیا بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ١٢٢<br>دیداری نوێنەری دیبلۆماسیی بەرتیانیاو عیسمەت پاشای سەرۆك وزیرو تۆفیق |

روشدیی وەزیری دەرەوە. کێشەی کوردو کۆمەڵەی نەتەوەکانو پەیوەندیی سیاسیو ئابووری لەگەڵ ئینگلتەرەدا. قسەلە سەر تایبەتمەندییەکانی کالای بۆ دەرەوە نێردراوی ئەڵمانی بۆ گومرگی تورکیاو، پەیوەندیی لەگەڵ ولاتانی تردا

| ژمارە | بەروار | ناوەڕۆک |
|---|---|---|
| ١٢ | ١٩٢٥/٣/٣١ | ڕاپۆرتی ژمارە ٢٥٨ی مستەر لیندسەیی نوێنەری بالای ئینگلیز لە تورکیا بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل:١٣١<br>بارودۆخی سیاسیی تورکیا. پەرلەمانو چاپەمەنییەکان. دەست بەکاربوونی دادگای ئیستیقلالی ئەنکەرە. پەرەسەندنی یاخیبوونەکەی کورد. ئیحتیمالی هێرشی تورکیا بۆ سەر مووسڵ. |
| ١٣ | ١٩٢٥/٤/١٥ | ڕاپۆرتی ژمارە ٣٠٥ی مستەر لیندسەیی نوێنەری بالای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل:١٣٥<br>یاخیبوونی شێخ سەعید. ڕاپۆرتی ڕائید هاینك. ئیحتیمالی هەڕەشەی تورکیا لە مووسڵ. هەڵسەنگاندنی داواکانی نوێنەری بالای تورکیا لە لەندەن. |
| ١٤ | ١٩٢٥/٤/٢٢ | ڕاپۆرتی ژمارە ٣٢٢ی مستەر لیندسەیی نوێنەری بالای ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل:١٣٩ |

| | | |
|---|---|---|
| | | بـارودۆخی سیاسـیی تورکیـا. ڕاپۆرتـی پاشکۆی عەسـکەری لـە بـارەی یـاخیبوونی کوردەوە. گیرانی شـێخ سـەعید. مەسـەلەی بزواندنـی کـورد لەلایـەن ئینگلـیزەوە. دەسـتگیرکردنی حوسـەین جـاهیدی سەرنووسەری (تەنین) |
| ١٤/ھ | ١٩٢٥/٤/٢١ | ڕاپۆرتی ڕائید هارێنکی پاشکۆی سەربازیی کونسولخانەی ئینگلتەرە لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر لیندسەیی نوێنەری باڵا. ل:١٤٢ |
| | | یـاخیبوونی شێخ سەعید. دەسـتگیرکردنی شـێخو، خۆبەدەسـتەوەدانی یاخییـان. پچڕپچڕیی هەواڵەکان. درێژبوونەوەی ماوەی کـاری دادگاکـانی ئیسـتیقلال. چاکسـازیی کارگێڕی لـە ڕۆژهـەڵات. بەلگـە گیراوەکـانی سـەر شێخ سـەعیدو، دەرخستنی هەڵوێستی کاربەدەستانی ئینگلیز لە عێراق. |
| ١٥ | ١٩٢٥/٤/٢٨ | برووسکەی ژمارە ٦٦ی مستەر لیندسـەیی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ مسـتەر چامبرلـەینی وەزیـری دەرەوەی بریتانیا. ل: ١٤٤ |
| | | مۆڵدانـی سـەربازی تورکیـا لـە ڕۆژهـەڵاتو هەڕەشـە لـە مووسـڵ. پاراسـتنی هێمنیـی تورکیـا بەکۆکردنـەوەی سـەرباز. ویسـتی سەپاندنی فشاری مەعنەوی بەسەر کۆمەڵەی نەتـەوەکانو ئینگلتـەرەدا. نـەبوونی نیـازی پێکدادان لەگەڵ بریتانیادا. |

| ژ | ڕێکەوت | ناوەڕۆک |
|---|---|---|
| ١٦ | ١٩٢٥/٤/٢٨ | ڕاپۆرتی ژمارە ٣٣١ی مستەر لیندسەیی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ١٤٥<br>باری سیاسیی تورکیا. پشووی ئەنجومەن. کێشەی کورد. لێدوانی عیسمەت پاشا لە کۆنگرەی (ئۆجاخ)ی تورکدا. گیرانی حوسەین جاهید. لە ئایندەدا هاتنی غازی بۆ ئەستەمبوڵو، بەدرۆ خستنەوەی، لە وێوە چوونی بۆ فەرەنسە. |
| ١٧ | ١٩٢٥/٦/٢ | ڕاپۆرتی ژمارە ٤٣٥ی مستەر لیندسەیی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ١٤٨<br>بارودۆخی سیاسیی تورکیا. کاری دادگاکانی ئیستیقلالی ئەنکەرەو دیاربەکر. لە سێدارەدانی سەید عەبدولقادر. دادگاییی شێخ سەعید. ئاگادارییەکی غازی پاشا. |
| ١٧/١٨ | ١٩٢٥/٦/٢ | ڕاپۆرتی ڕائید هارینکی پاشکۆی سەربازیی کونسوڵخانەی ئینگلتەرە لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر لیندسەیی نوێنەری باڵا. ل:١٥٢<br>هەلومەرجی عەسکەری کەمکردنەوەی ئەو هێزانەی کە بۆ سەرکوتکردنی یاخیبوونی شێخ سەعید لە ڕۆژهەڵات کۆکرابوونەوە. مۆڵدانی بەردەوامی سەرباز لە باشووری ڕۆژهەڵات. |

| | | |
|---|---|---|
| ١٨ | ١٩٢٥/٦/٩ | راپۆرتی ژمارە ٤٦٨ی مستەر لیندسەیی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ١٥٤<br>باری سیاسیی تورکیا. داخستنی لقەکانی پارتی پێشکەوتنخواز. دەستی سوڵتان وەحیدەدین لە کاری کۆنەپەرستانەی ئەو لقانەدا کاری دادگاکانی ئیستیقلال. پەیوەندیی نێوان شێخ سەعیدی لەگەڵ تامپلینگ ناوێکی سیخور. |
| ١٩ | ١٩٢٥/٦/٣٠ | راپۆرتی ژمارە ٥١١ی مستەر هۆری کارهەڵسووڕێنی ئینگلتەرە لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ١٥٧<br>کۆکردنەوەی سەربازی تورک لە ڕۆژهەڵات. ئیحتمالی دژایەتیی بڕیاری دیاریکردنی سنووری مووسڵ لەلایەن تورکیاوە. پێویستی بەکارهێنانی هێز، هاوشانی هەواڵی دادگای ئیستیقلالی دیاربەکر لە ڕۆژهەڵات. |
| ١٩/ھ | ١٩٢٥/٦/٢٥ | راپۆرتی ژمارە ١٦ی ڕائید هارێنکی پاشکۆی سەربازیی کونسولخانەی ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر هۆری کارهەڵسوڕێنی بریتانیا. ل: ١٥٩<br>هەلومەرجی سەربازی. مۆڵدانی سەربازی تورک لە ڕۆژهەڵات. کێشەی کورد، ویستی تورکیا بۆ کارکردنە سەر بڕیاری تایبەت بە |

| | | |
|---|---|---|
| | | مەسەلەی مووسڵ کۆمەڵەی نەتەوەکان. |
| ١٩/٢٥ | ١٩٢٥/٦/٢٠ | سەرژمێرییەکی سەربازانی تورك لە ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ. ل: ١٦١ |
| ٢٠ | ١٩٢٥/٧/١ | ڕاپۆرتی ژمارە ٥٢٢ی مستەر هۆری کارهەڵسووڕێنی ئینگلیز لە ئەستەمبوڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ١٦٤<br>یاخیبوونی کورد، لە سێدارەدانی زیاتر لە ٤٠ یاخی، کەمیی ژمارەی ئەوانەی سزای زیندانییان بەسەردا سەپێنرا. گوتەی سەرۆکی دادگای ئیستیقلال دیاربەکر. گواستنەوەی ئەم دادگایە بۆ ئورفە لە ئایندەدا. |
| ٢١ | ١٩٢٥/٨/٩ | ڕاپۆرتی ژمارە ٦٠٢ی مستەر هۆری کارهەڵسووڕێنی بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ١٦٦<br>بارودۆخی تورکیا. کۆبوونەوەی نائاسایی ئەنجومەن. پەیوەندیی فەوزیی سەرۆکی شارەوانی دیار بەکر بە یاخبوونەکەی شێخ سەعیدەوە. چاو پێداخشاندنەوەیەکی کێشەی هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات. |
| ٢٢ | ١٩٢٥/٨/١٧ | ڕاپۆرتی ژمارە ٦٣٨ی مستەر هۆری کارهەڵسووڕێنی ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ١٦٩ |

| | | |
|---|---|---|
| | | کارەکانی دادگای ئیستیقلال ئەنگەرە. دادگایی ۷۰ کەس و لە داردانی (۱۱)ی تر. دادگایی کۆمۆنیستەکان. ستی ئەم ڕۆژانەی دوایی کارەکانی دادگای ئیستیقلال هەرێمی ڕۆژهەڵات. |
| ۲۳ | ۱۹۲۵/۹/۱٦ | ڕاپۆرتی ژمارە ۷۱۷ی مستەر لیندسەیی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە تورکیا بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل:۱۷۱ بارودۆخی سیاسی تورکیا. نەرمبوونی حکوومەت، ئازادکردنی ڕۆژنامەنووسانی دادگاییکراو بەتاوانی هاندانی یاخیبوونی شێخ سەعید. وەزعی وەلید ئەبو زادەی سەرنووسەری (تەوحیدی ئەفکار). بابەتێکی سەیری (قلیچ عەلی) ئەندامی دادگای ئیستیقیلالی ئەنکەرە لە (حاکمییەتی میللی)دا. |
| ۲٤ | ۱۹۲۵/۱۰/٦ | نووسراوی ژمارە ۷۵٦ی مستەر لیندسەیی نوێنەری باڵای ئینگلیز لەتورکیا بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل:۱۷٤ کوردەکان. نەمانی کورد لە هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات. وتووێژ لەگەڵ تۆفیق روشدی. گومانی حکوومەت لە کوردانی ناوچەی دەرسیمی بەشدار نەبوو لە یاخیبونەکەی شێخ سەعیددا، نەبوونی هەواڵی لە و جۆرە لە کۆنسوڵی تەرابزبوونەوە. |
| ۲۵ | ۱۹۲۵/۱۰/۱٦ | ڕاپۆرتی ژمارە ۷۸۵ی مستەر لیندسەیی |

| ژ | مێژوو | ناوەڕۆک |
| --- | --- | --- |
| | | نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەردوەی ئینگلتەرە. ل: ١٧٥<br>پەیوەندییەکانی ئینگلیزو تورك. گومانی تورکیا لە رووسیا. داوای ئاشتیو تازەگەری. کیشەی مووسڵ تاکە کۆسپی سەر ڕێی پەیوەندییەکانی تورکیاو بریتانیا. |
| ٢٦ | ١٩٢٥/١٠/٢٠ | راپۆرتی ژمارە ٧٩١ی مستەر لیندسەیی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلە ینی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ١٧٩<br>هەلومەرجی سیاسیی تورکیا. بیری نەتەوەیی تورك، بینینی کێشەی کورد وەکو هەڕەشەیەك بۆسەر رژێمی کۆماریی تورکیا. |
| ٢٧ | ١٩٢٥/١١/٣٠ | نووسراوی ژمارە ١١٥١ی مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی بریتانیا بۆ سێر ئاڕ. لیندسەیی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ. ل: ١٨٤<br>کێشەی کوردو پەیوەندیەکانی نێوان تورکیاو بریتانیا.پەیمانی بریتانیا بەبەخشینی خودموختارییەکی ڕێژەیی بەکوردانی عێراق. نەبوونی نیازی بەخشینی ئۆتۆنۆمیی تەواو یاخود گەڕانەوە بۆ پەیماننامەی سیڤەر. دانان بەمافی کوردانی عێراقدا، کاری خراپ نەکردنە سەر پەیوەندییەکانی تورکیا- بریتانیا. |

| | | |
|---|---|---|
| ٢٨ | ١٩٢٦/٢/١٧ | ڕاپۆرتی ژمارە ١٢٠ی مستەر هۆری کار-هەڵسووڕێنی ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە.ل: ١٨٧<br>درێژ کردنەوەی ماوەی دادگاکانی ئیستیقلال بۆ شەش مانگی تر. کاری دادگاکانی ئیستیقلالی ئەنکەرەو ئەلعەزیزو حوکمەکانیان. بەردەوام لێکۆڵینەوەی داواکانی زادەی یاخیبوونەکەی شێخ سەعید لەلایەن دادگای ئیستیقلالی ئەلعەزیزەوە. |
| ٢٩ | ١٩٢٦/٣/٢٣ | نووسراوی ژمارە ١٣٠ی مستەر هۆری کارهەڵسووڕێنی ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ١٩٠<br>یاخیبوونی کورد. کۆنترۆڵکردنی بارودۆخەکە لەلایەن سەربازانی تورکەوە. قوربانیدانێکی زۆر. دادگایی کردنی زیاترلە ٩٠٠ کەس. |
| ٣٠ | ١٩٢٦/٦/٣٠ | نووسراوی ژمارە ٣٢٨ی مستەر لیندسەیی نوێنەری باڵای ئینگلتەرە لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ١٩٢<br>هەلومەرجی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات. بایەخدان بەو ڕاپۆرتانەی کە بۆ ئەم مەسەلەیە لە ئەنکەرەو کونسوڵی |

| | | |
|---|---|---|
| | | تەرابزوونەوە گەیشتوون. |
| ٣٠/١ھ | ١٩٢٦/٦/١٠ | برووسکەی ژمارە ٢٢ی مستەر نایتی کونسوڵی ئینگلیز لە تەرابزوون بۆ ئاپ. لیندسەیی نوێنەری باڵا لە ئەستەمبووڵ. ل:١٩١ هەواڵی یارمەتیی ئێران بۆ یاخیبوونی کوردانی بایەزید. |
| ٣٠/٢ھ | ١٩٢٦/٦/١٥ | بروسکەی ژمارە ٢٤ی مستەر نایتی کونسوڵی بریتانیا لە تەرابزوون بۆ ئاپ. لیندسەیی نوێنەری باڵا لە ئەستەمبووڵ ل:١٩٢ ڕاگوێزانی کوردەکان بەرەو ڕۆژئاوا بەهۆی گرژیو ئاڵۆزیی بەردەوامی ناوچەی بایەزیدەوە. |
| ٣٠/٣ھ | ١٩٢٦/٦/١٦ | بروسکەی ژمارە ٢٥ی مستەر نایتی کونسوڵی ئینگلیز لە تەرابزوون بۆ ئاپ. لیندسەیی نوێنەری باڵا لە ئەستەمبووڵ ل:١٩٢ ناردنی تیپێکی سەربازی بۆ دامرکاندنەوەی یاخیبوون. ڕاگوێزانی گوندەکانو پەککەوتنی بازرگانی. کارگەیەکی چەك دروستکردن لە ئەرزڕۆم. |
| ٣٠/٤ھ | ١٩٢٦/١٩و١٧ | نامەیەکی مستەر نۆکسی کارهەڵسووڕێنی ئینگلیز لە ئەنکەرە بۆ ئاپ. لیندسەیی نوێنەری باڵا لە ئەستەمبووڵ، ل:١٩٤ نیازی تورك بۆ چارەی خێرای کێشەی کورد. ڕێنەدان بە تێپەڕبوونی نوێنەری پۆڵۆنیا بە بایەزیددا. |
| ٣١ | ١٩٢٦/٧/٥ | نووسراوی ژمارە ٣٣٩ی مستەر لیندسەیی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ |

مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ١٩٥

پرۆسەی نیشتەجێکردن لە ڕۆژهەڵات، بیرۆکەی هێنانی پەنابەرانی مووسڵمانی مەکدۆنیو نیشتەجێکردنیان لە شوێنی کوردانی بەرەو ڕۆژئاوا راگوێزراو. هەوڵی حکوومەتی تورك بۆ بەستنی پەیمانێك لە مەڕ پەنابەران لە نێوان وڵاتەکەیو دەوڵەتانی سیربو کرواتوسلۆڤیندا. دابەشکردنی زەویوزاری ئاغایانی راگوێزراو بەسەر گوندنشیناندا.

٣٢   ١٩٢٦/١/٢٤   نووسراوی ژمارە ٦٢١ی سێر جی. کلارکی نوێنەری باڵای ئینگلتەرە لە ئەنکەرە بۆ سێر ئێی. چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ١٩٦

سەردانی کۆمیساری باڵا (مەندوبی سامی)ی بریتانیا لە عیراق بۆ ئەنکەرەو چاوپێکەوتنی لەگەڵ غازیو تۆفیق روشدیدا. بیرۆکەی راگواستنی کوردەکانو رای نوێنەری باڵای ئەنکەرەو ئینگلیز لە سەری.

٣٢/ھ   ١٩٢٦/١١/٢٢   یاداشتێك دەربارەی دیدارو چاوپێکەوتنەکانی ئەنکەرەی سێر ئێچ. دۆبسی کۆمیساری باڵای بریتانیا لە عیراق. ل: ١٩٧

دیدار لەگەڵ تۆفیق روشدیدا. سنووری تورکیا عیراقو کێشەی کورد. مامەڵەی

کێشەی کورد لەلایەن تورکیاوە. دڵنیاکردنەوەکانی سێرئێج. دۆبس. پێشوازیی کۆمیساری باڵا لەلایەن غازی پاشاوە.

٣٣ ١٩٢٧/١/٤

نووسراوی ژمارە ٢١ی سێرجی، کلارکی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە ئەنکەرە بۆ سێر ئێی. چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٢٠٢

کێشەی کورد، چاوپێکەوتن لەگەڵ تۆفیق روشدیی وەزیری دەرەوەی تورکیادا. گرفتی کوردو باسو شیکردنەوەی وەزیرو، راو بۆچوونی نوێنەری باڵا.

٣٤ ١٩٢٧/١/١٢

نووسراوی ژمارە ٢٢ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ سێر ئێی. چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل: ٢٠٤

راپۆرتێکی کورتی دادگای ئیستیقلالی ئەنکەرە.

دادگایی ١٨٠٠ کەس بە تۆمەتی جیاجیاو، لە داردانی ١٢٥ کەسو زیندانیکردنی ٥٠٠ی‌تر. تێروانینی غازی دادگایی کوردەکان لەلایەن دادگای ئیستیقلالی ئەلعەزیزەوە. درێژکردنەوەی ماوەی یاسای عەسکەری لە رۆژهەلات تا ٢٣ی تشرینی یەکەم. نیشتەجێکردنی کورد لە ئەنادۆڵی رۆژئاوا، بیرکردنەوە لە هێنانی پەنابەر لە بولگارياو

| | | |
|---|---|---|
| | | یوگوسلاڤیاو قوبرس و قۆقازەوە، نیشتەجێکردنیان لە ڕۆژهەڵات. بۆچوونی کۆمیساری باڵا. |
| ٣٥ | ١٩٢٧/١/٢٦ | نووسراوی ئێی.، چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز بۆ جی. کلارکی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ. ل: ٢٠٧<br>سەردانی باڵیۆزی تورکیا لە لەندەن بۆ لای وەزیری دەرەوەی بریتانیا. تاوتوێکردنی پەیوەندییەکانی تورکیا- بریتانیاو ئیتاڵیاو یوگسلافیاو قەرزەکانی عوسمانیو دەستنیشانکردنی کونسوڵی تورک لە بەغداو تورکانی میسرو عیراقو گواستنەوەی نوێنەرایەتیی باڵای ئینگلیز بۆ ئەنکەرەو گلە یی لە کونسوڵەکانی بریتانیا لە ئێران کەکوردیان دژی تورک هانداوە. |
| ٣٦ | ١٩٢٧/٤/٢٠ | نووسراوی ژمارە ١٩٢ی سێرجی کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ سێر ئێی. چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە ل: ٢١١<br>هێرشی کوردەکان لە ئێرانەوە بۆ سەر تورکیا. بارودۆخی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات. |
| ٣٧ | ١٩٢٧/٦/٢٥ | ڕاپۆرتی ژمارە ٣٢١ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ سێر ئێی. چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل: ٢١٣<br>بارودۆخی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات. |

| | | |
|---|---|---|
| | | قەدەغـەکردنی هاتنـە نـاوەوەی خێڵـە کوردییـەکانی عـیراق بـۆ تورکیـا. ڕاگوێزانـی کوردانـی ڕۆژهـەڵاتی ئـەنادۆڵ بۆشـوێنەکانی تری وڵات. چاکسازیو چـەند کارێکی تـر لـە ئەنادۆڵی رۆژهەڵات . |
| ٣٨ | ١٩٢٧/٨/٩ | ڕاپۆرتـی ژمـارە ٤١٧ سـێرجی. کلارکـی نوێنـەری بـاڵای بریتانیـا لـە ئەسـتەمبوولّ بۆسێر ئێـی. چامبرلـەینی وەزیـری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ٢١٥<br>بارودۆخی ئەنادۆڵی ڕۆژهـەڵات. ڕاگوێزانـی کۆمـەڵ کۆمـەڵی کورد. پـڕۆژەی حکوومـەتی تورك بۆنیشتەجێ کردنی پەنابەرانی قۆقـاز لە ئەنادۆڵی رۆژهەڵات. |
| ٣٩ | ٩٢٧/١١/٩ | نووسـراوی ژمارە ٥٥٥ی سـێرجی. کلارکـی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بـۆ سـێر ئێـی. چامبرلـەینی وەزیـری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ٢١٩<br>پرۆگرامی کابینە تازەکەی تورکیا. سەرنج ڕاکێشیی وتـەکانی عیسمەت پاشـا لـە سـەر هەرێمەکانی رۆژهەڵات. |
| ٤٠ | ١٩٢٧/١١/٣٠ | نووسـراوی ژمـارە ٣٨٨ی مسـتەر هـۆری کارهەڵسووڕێنی ئینگلتـەرە لـە ئەسـتەمبووڵ بـۆ مسـتەر چامبرلـەینی وەزیـری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٢٢١<br>دوایـی هـاتنی حکومـی عورفیـی ئـەنادۆڵی ڕۆژهەڵات. دامـەزراندنی پشکنیاریی گشتیی |

| | | |
|---|---|---|
| | | ویلایەتـەکانی ڕۆژهـەڵات لـە دیـار بـەکر. دیاریکردنی ئیبراهیم تالّع بەگ بۆپشکنیاری گشتی. ڕاگوێزانی کورد بەرەو ڕۆژئاوا. |
| ٤١ | ١٩٢٧/١٢/٧ | نووسـراوی ژمـارە ٦٠٧ی مسـتەر هـۆری کارهەڵسووڕێنی ئینگلتـەرە لـە ئەستەمبووڵ بۆمسـتەر چامبرلـەینی وەزیـری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٢٢٣ |
| | | پشکنیاریی گشتیی ئـەنادۆڵی ڕۆژهـەڵاتو سنوورو دەسەڵاتو ئەرکەکانی. دەرچوونـی یاسـای ئەنجومـەن، تایبـەت بەگەڕانـەوەی هـەندێ لـە کـوردە ڕاگوێزراوەکـان بۆناوچەکانی خۆیـان. نـەرمبوونی سیاسـەتی تـورك بەرامبـەر بـەکورد. چـەند ئامادەکارییەکی تازە. کرانەوەی ڕێگەی نێوان تەرابزوونو بایەزید. |
| ٤٢ | ١٩٢٧/١٢/١٤ | نووسـراوی ژمـارە ٦١٨ی مسـتەر هـۆری کارهەڵسووڕێنی بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ مسـتەر چامبرلـەینی وەزیـری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ٢٢٥ |
| | | زانیاریی لە سەرکوردو ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات. شاردنەوەی لـە (٩٠٪)ی چەکـەکان لەلایـەن کوردەکانـەوە. هـاندانی یاخییـانی کـورد لەلایـەن ئینگلـیزەوە. کزیـی پێشـبینی سەرکەوتنی سـەرنجەکانی شـوکری قایـا لـە بـارەی ئاسـایی بوونـەوەی ویلایەتـەکانی ڕۆژهەڵاتەوە. |

| ژ | بەروار | ناوەڕۆک |
|---|---|---|
| ٤٣ | ١٩٢٨/١/١١ | ڕاپۆرتی ژمارە ١٧ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ سێر ئێی. چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل: ٢٢٦<br>گەڕانەوەی ٧٨١ کوردی ڕاگوێزراو بۆ ناوچەکانی خۆیان، دوای ئاگاداربوونیان لە سیاسەتە نوێیەکەی حکوومەت. پەسەندکردنی ڕەخنەکانی ناو پارتی گەل. بێ توانایی لە کۆنترۆڵکردنی کوردەکانی دەرسیمدا سەردانی ئیبراهیم تالع بەگی پشکنیاری گشتیی هەرێمەکانی خۆرهەڵات بۆ دیاربەکر. |
| ٤٤ | ١٩٢٨/٤/٩ | نووسراوی ژمارە ١٨٥ی مستەر نۆکسی کارهەڵسووڕێنی ئینگلیز لە ئەنکەرە بۆ مستەر چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٢٢٧<br>گەڕانەوەی کوردانی ڕاگوێزراو بۆ جێوشوێنی خۆیان. ڕاپۆرتی کونسوڵی تەرابزوون. گەڕانەوەی ڕاگوێزراوەکان بەلێبوردنی دەرەنجامی سیاسەتی ئاشتبوونەوەی حکوومەتی تورکیا. ڕێگە نەدان بە گەڕانەوەی دەرەبەگەکانی کورد. |
| ٤٤/ھ | ١٩٢٨/٣/٢٦ | نووسراوێکی مستەر ماتیوسی کونسوڵی ئینگلیز لە تەرابزوون بۆ کارهەڵسووڕێنی بریتانیا لە ئەنکەرە. ل: ٢٢٨<br>گەڕانەوەی کوردانی ڕاگوێزراو. تێپەڕبوونی |

| | | |
|---|---|---|
| | | ٤٠٠ کورد بەتەرابزووندراو، تێکەڵ نەبوونیان بەخەڵك. |
| ٤٥ | ١٩٢٨/٥/١٦ | نووسراوی ژمارە ٢٣٩ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ سێر ئێی. چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ٢٢٩<br>لێبوردنی کوردەکان. دەرچوونی یاسایەکی پەرلەمانی تورکیا بۆ لێبوردنی کوردانی یاخیو، ئومێدێکی زۆر بەم یاسایە، گەشتی پشکنینی ئیبراهیم تالع بۆ هەرێمەکانی ڕۆژهەلات. |
| ٤٦ | ١٩٢٨/٦/٢٦ | نووسراوی ژمارە٣١٢ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ سێر ئێی. چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ٢٣٠<br>لێبوردنی کوردەکان. ئاگادارییەکی پشکنیاری گشتیی هەرێمەکانی ڕۆژهەلات بۆ خەڵك. باش بەڕێوەنەچوونی کاروبارەکانی ڕۆژهەلات. باوەڕی سەرنەگرتنی سیاسەتی لێبوردنو دڵنیا بوون لە ئایندەدا. |
| ٤٦/ھ | حوزەیرانی١٩٢٨ | بانگەوازی تازەی ئیبراهیم تالع بەگی پشکنیاری گشتیی هەرێمەکانی ڕۆژهەلات. ل:٢٣١<br>یاسای (٩)ی مایسی ١٩٢٨ی تایبەت بە لێبوردنی قوربانیانی نەفامیو، ئازادکردنی گیراوەکان. دەرچوونی یاسایەکیتر بۆ دەست |

هەڵگرتن لە پرسینەوەی ئەو کەسانەی وا لە سێ مانگدا خۆبەدەستەوە دەدەن و، پێویستیی سوود وەرگرتنی هاووڵاتییان لەمە. بەڵێنی سزا نەدانی ناڕەوا.

| | | |
|---|---|---|
| ٤٧ | ١٩٢٨/٨/١٤ | نووسراوی ژمارە ٣٨٤ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ لۆرد کوشندنی بریکاری وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٢٢٣<br>تەسلیم بوونەوەی شێخ عەبدولڕەحمان و شێخ مەهدی برایانی شێخ سەعید پاش بەئاگابوونیان لەلێبوردنی حکوومەت. قازانجی ئەمە بۆ بەرنامەی هێورکردنەوە. هاتنی ئیبراهیم تاڵع بۆ ئەستەمبوڵ بۆ وەرگرتنی رای غازی لەم بارەیەوە. نیگەرانی شوکری قایا لە سیاسەتی عیراق بەرامبەر بە کورد. |
| ٤٨ | ١٩٢٨/١١/٨ | نووسراوی ژمارە ٤٨٤ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ لۆرد کوشندنی بریکاری وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٢٣٤<br>سیاسەتی تورک بەرامبەر کورد. سەرکەوتنی سیاسەتی هێورکردنەوە. بەردەوام گێڕانەوەی کوردانی راگوێزراو لە هاویندا. خۆ بەدەستەوەدانی هەندێ شێخی کورد کە چووبوونە عیراق. پشکنینی وان و بدلیس لەلایەن ئیبراهیم تاڵع بەگەوە. گران دابینکردنی مامۆستاو پزیشک و فەرمانبەر |

| | | بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات. دروستکردنی ڕێگە. |
|---|---|---|
| ٤٩ | ١٩٢٨/١١/٢٦ | نووسراوی ژمارە ٥٠٢ی مستەر ئەدمۆندزی کارهەڵسوڕێنی ئینگلیز لە ئەنکەرە بۆ لۆرد کوشندنی بریکاری وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ٢٣٦<br>ڕاپۆرتی کونسوڵی تەرابزوون. هەڵاتنی حسێن پاشا بۆ سووریا. وردە وردە بەرەوپێشچوونی سیاسەتی بەتورک کردنی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات. سەرکەوتنی سیاسەتی تورک بەرامبەر بەکورد، بەڕای حکوومەتی تورکیا. |
| ٤٩/ھ١ | ١٩٢٨/١١/٢٠ | ڕاپۆرتی ژمارە ٤٩ی مستەر چافیی کونسوڵی بریتانی لە مەرسینا بۆ مستەر ئەدمۆندزی کارهەڵسووڕێن لە ئەنکەرە. ل: ٢٣٧<br>هەڵاتنی حسێن پاشای کوردی ڕاگوێزراو بۆ قەیسەرییە بەرەو سووریا. تووڕەبوونی غازی لەمەو، پەشیمان بوونەوەی لە سەردانە بڕیاردراوەکەی بۆ قەیسەرییە. ڕای بەڕێوەبەری بانکی عوسمانی لە قەیسەرییە کە: کوردەکان نابنە بەربەستی ڕێی سیاسەتی بەتورک کردن. گۆڕینی کامەرندانی بانکی عوسمانی. نواندنێکی شانۆیی لەمەڕ یاخیبوونی شێخ سەعید. |
| ٥٠ | ١٩٢٩/٧/١١ | ڕاپۆرتی ژمارە ٣٠٥ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ |

سێر ئێی. چامبرلەینی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٢٣٩

ڕاپۆرتی مستەر هێلم‌و گەشتەکەی بۆ ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵ. سەختیی گەشتکردن بۆ ڕۆژهەلاتی فورات لە یاخیبوونی شێخ سەعیدەوە. چارەی کێشەی کوردی تورکیا بەشێوەیەکی سلبی. مەترسیی ئابووریی ڕۆژهەلات لە سەر تورکیا.

٥٠/ﻫ    ١٩٢٩/٦/٢٩

ڕاپۆرتێکی تایبەت بەگەشتێکی ٩-١٩٢٩/٦/٢٩ی ئالێکس کەی. هێلمی کارمەندی نوێنەرایەتی بالای ئینگلتەرە لە تورکیا بۆ ئەنادۆڵی ڕۆژهەلات. ل: ٢٤١

ئاکامی گەشتە (٢٠) ڕۆژییەکەی ئەنکەرە- حەلە ب- دیار بەکر- مەلاتیە- سیواس — قیرەسوون. لێکۆڵینەوەی تایبەت‌و هەمەلایەنەی کێشەی کورد. ترسی پێشکەوتنی ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵ.

٥١    ١٩٣٠/٣/١٧

نووسراوی ژمارە ٨٩ی مستەر ئەدمۆندزی کارهەڵسوڕێنی ئینگلتەرە لە ئەنکەرە بۆ مستەر هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٢٧٢

کێشەی کورد. چەند داوایەکی کوردانی داگیرکەری تورکیا لە حکوومەت‌و بەدەنگەوە هاتنی حکوومەت بۆ ئەو داوایانە. هێمنیی ئەنادۆڵی ڕۆژهەلات. سیاسەتی بەردەوام بەتورك کردنی کورد.

| ژمارە | بەروار | ناوەرۆک |
|---|---|---|
| ٥١/١ه | ١٩٣٠/٣/١٣ | برووسکەی کۆمیساری باڵای ئینگلیز لە بەغدا بۆ نوێنەری باڵا لە تورکیا. ل: ٢٧٣<br>ڕۆژنامەی (مساوات)ی قاهیرە: چەند داوایەکی کوردە داگیرکەرەکانی تورکیا لە حکوومەتو بەدەنگەوە هاتنی دەوڵەت بۆ ئەم داوایانە. |
| ٥١/٢ه | ١٩٣٠/٣/١٣ | برووسکەی نوێنەری باڵای ئینگلتەرە لە ئەنکەرە بۆ کۆمیساری باڵا لە بەغدا.<br>ناڕاستیی هەواڵە کە. نەرمبوونی حکوومەتی تورك لە سیاسەتیدا بەرامبەر بەکورد. |
| ٥٢ | ١٩٣٠/٤/١٦ | نووسراوی ژمارە ١٥٧ای سێر ئاڕ. کلایڤی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە تاران بۆ مستەر ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٢٧٤<br>وێنەی نوسراوێکی نێردراو بۆ کۆمیساری باڵا لە بەغدا سەبارەت بە (جووڵانەوەی کورد) |
| ٥٢/١ه | ١٩٣٠/٤/١٦ | نووسراوی ژمارە ٥٧ی (ئاڕ. کلایف)ی نوێنەری باڵای ئینگلتەرە لە تاران بۆ ئێف. هەمفریزی کۆمیساری باڵا لە بەغدا. ل: ٢٧٥<br>وتووێژێك لەگەڵ وەزیری کۆشکی ئێراندا. ترسی ئێران لە (بزووتنەوەی کورد)ی تورکیا. نیگەرانی لە بیرۆکەی (کوردستانی سەربەخۆ)و هەندێ لە کارمەندانی بەریتانی لە عیراق. هەواڵی بوونی کۆلۆنێل لۆرەنس لە |

| | | |
|---|---|---|
| | | ناو کوردانیدا. |
| ٥٣ | ١٩٣٠/٤/٢٩ | وەڵامی ئێف. هەمفریزی کۆمیساری باڵا لە عیراق بۆ ئاڕ. کلایڤی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە تاران. ل: ٢٧٧<br>بەڵێنی بریتانیا بە بەخشینی چەند ئیمتیازێك بە کوردو، پەشیمان نەبوونەوە لەمە. خودموختاریی کوردانی عیراق و، نەهێشتنی بوونی ئەم وڵاتە بەمەڵبەندی پیلانگێڕانی کوردو، ڕێگە پێنەدانیان بۆ زیان دان لە وڵاتانی دراوسێ. نەدانی پاسپۆرت بەنەتەوە پەرستانی کوردو ئەرمەن. نارەوایی گومانەکانی ئێران. |
| ٥٤ | ١٩٣٠/٥/٢١ | نووسراوی ژمارە ١٥٨ای مستەر ئەدمۆندزی کارهەڵسوڕێنی بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ ئێی هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ٢٧٨<br>یاخیبوونی ئاگری. ڕاپۆرتەکانی کۆنسوڵی تەرابزوون لە سەر ئەم بابەتە. یاخیبوونی کۆتایی مانگی شوباتی ٥٠٠ کوردی ناوچەی ئاگری. دامرکانەوەی یاخی بوونەکە. ڕاونانی (٥٠٠)یاخی لە چیاکاندا. هاوکاریی کوردەکانی ئێران و ئەرمەنیەکانی رووسیا. سەقامگیربوونی ئاسایشی هەرێمی کوردان. |
| ٥٤/ه | ١٩٣٠/٤/٢٩ | ڕاپۆرتی ژمارە ٤٨ی مستەر ماتیۆسی کونسوڵی بریتانیا لە تەرابزوون بۆ جی کلارکی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە ئەنکەرە. |

ل: ٢٧٩

یاخیبوونی ئاگری. سەرکوتکردنی (٥٠٠٠)کوردی یاخی. شوێن پێ هەڵگرتنی (٥٠٠) کورد. نەخشەی ئەم یاخیبوونە لەلایەن خالیسی شێخ عەبدولەجیدەوە کە (٣) ساڵ پێش هەڵگیرسانی یاخیبوون لە بایەزیدەوە راگوێزرابوو بۆ برووسە. هەڵاتنی ئەم سەرکردەیەی تاوانباران بۆ ئێران. ئیحتیمالی هاوکاریی کوردانی ئێران و ئەرمەنیانی رووسیا بۆ یاخییان.

| | | |
|---|---|---|
| ٥٤/٢ھ | ١٩٣٠/٥/٧ | راپۆرتی مستەر ماتیوسی کونسوڵی ئینگلتەرە لە تەرابزوون بۆ جی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەنکەرە. ل: ٢٨٢<br>یاخیبوونی ئاگری. سەرپشککردنی زەکی پاشاو ساڵەح پاشا بۆ سەرکوتکردنی یاخیبوون. مۆڵدانی ١٥٠٠٠ سەرباز لە ناوچە سنووریەکاندا. کۆچی ئەرمەنە رووسییەکان بۆ ئێران. هەواڵی هاتنی کونسوڵی ئێران لە ئەرزرۆم بۆ تەرابزوون. |
| ٥٥ | ١٩٣٠/٥/٢١ | نووسراوی ژمارە ١٥٩ی مستەر ئەدمۆندزی کارهەڵسووڕێنی ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ ئێی. هندرسی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل:٢٨٤<br>راپۆرتی تایبەت بەگەشتێکی سەرەتای مانگی مایسی ئەنادۆڵی رۆژهەڵات. |
| ٥٥/١ھ | مایسی١٩٣٠ | راپۆرتێك لە مەڕ گەشتی سەرەتای مایسی ١٩٣٠ ی راوێژکاری نوێنەری باڵای بریتانیا لە |

تورکیا بۆ ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات. ل:٢٨٤

کاریگـەریی گەشـتە جیاجیاکـان بـۆ مەرعـەش، عـەینتاب، ئۆرفـە، سـیوەرەك، دیاربەکر، سیلوان، غەرزان، بدلیس، مووش، وان و ماردین. لێکدانـەوەو سـەرنجی زیـاتری فـرە لایـەنی تایبـەت بەکێشـەی کـورد. بارودۆخی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات.

| | | |
|---|---|---|
| ٥٦ | ١٩٣٠/٥/٢٣ | نووسراوی ژمارە ١٦٦ی مستەر ئەدمۆندزی کارهەڵسوڕێنی ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ ئێی.هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلتـەرە. ل: ٣١٣<br>کوردەکان، ڕاپۆرتی کۆنسوڵی تەرابزوون لە سەر زانیاری کونسوڵی ئێران لە ئـەرزڕۆم. قسەی نـەقیب کۆڵۆنێل لۆرەنس لـە بـارەی کوردەوە. |
| ٥٦/١٨ | ١٩٣٠/٥/١٢ | ڕاپۆرتـی ژمـارە ٥٧ی مسـتەر ماتیۆسـی کونسوڵی بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل: ٣١٤<br>کوردەکان. بڕێـك زانیـاری کونسوڵی ئـێران لە ئەرزڕۆم. گرتنی چـەند کوردێك لەلایـەن تورکەکانـەوە. ئاشـکرابوونی (کۆمیتـەی کـورد)ی نـهێنیی ڕێکخـەری یـاخیبوون. کۆکردنـەوەی سـەربازی تـورك. کۆچـی ئەرمەنیـەکانی رووسـیا بـۆ ئـێران. هێنـانی بـەنزین لـە باتوومـەوەو، نـاردنی لەلایـەن تورکەکانەوە بەرەو ئەرزڕۆم. |

| | | |
|---|---|---|
| ٥٧ | ١٩٣٠/٦/٣ | نووسراوی ژمارە ١٩٤ی مستەر ئەدمۆندزی کارهەڵسورێنی ئینگلیز لە ئەنکەرە بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٣١٨<br>کوردو ئینگلیز. دادگایی سەلاحەدینی کوڕی شێخ سەعید لە ئەنکەرە. هەواڵی هەندێ بڵاوکراوەی تورك لە مەڕ هاندانی کورد لەلایەن ئینگلیزەکانی عیراقەوە. نارەزایی تورکیا لەم بڵاوکردنەوانە. |
| ٥٨ | ١٩٣٠/٦/٣٠ | نووسراوی ژمارە ٤٣و٤٤ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ سێر ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٣٢٠<br>یاخیبوونی ئاگری. هێرشێکی نەخشە بۆ کێشراوی تورك بۆ سەرکوردەکان. رەنگدانەوەی ئەم ڕووداوە لە بڵاوکراوەکاندا. |
| ٥٩ | ١٩٣٠/٦/٣٠ | نووسراوی ژمارە ٢٩٨ی مستەر ئەدمۆندزی کارهەڵسورێنی بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل:٣٢١<br>یاخیبوونی ئاگری. زانیاریی لە بارەی یاخیبوونەوە. سەردانی رۆبن پاشا ناوێکی ئەرمەنی بۆ تاران بۆ پڕچەککردنی کوردانی تورکیا. بۆ تاران. مەزندە کردنی ژمارەی هێزی دژی کورد بەکارهاتووی تورك بە (٦٥٠٠-١٥٠٠٠) سەرباز. سیاسەتی ئێران بەرامبەر بە کورد. |
| ٥٩/ﮬ | ١٩٣٠/٦/٢٨ | ڕاپۆرتێکی نەقیب کۆلۆنێل دۆدی پاشکۆی |

| | | |
|---|---|---|
| | | سەربازیی ئینگلتەرە لە تاران بۆ سێر ئارپ. کلایفی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە و وڵاتە. ل: ٣٢٢<br>یاخیبوونی ئاگری. دیداری ڕۆبن پاشای ئەرمەنی هەوڵی ناوبراو بۆ دەستەبەرکردنی یارمەتیی ئێران وئینگلیز بۆ کوردانی تورکیا. کۆنترۆڵکردنی هەرێمەکانی ئاگریو ئەرجیش. هێرشی قۆڵەکانی وانو ئەرزڕۆمی تورکو، بەرەنگاربوونەوەیان لەلایەن هێزێکی گەورەوە. پێویستیی یارمەتیی کوردی ئاگری بەچەکو تەقەمەنی. ئومێدی ڕۆبن پاشا بە بەدەستهێنانی ئەو یارمەتییانە لە ئێران. ل: |
| ٥٩/٢ه | ١٩٣٠/٦/١٨ | ڕاپۆرتی ژمارە ١٠٨ی پاڵمەری کونسوڵی بریتانیا لە تەورێز بۆ ئارپ. کلایفی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە تاران. ل:٣٢٥<br>یاخیبوونی ئاگری. جموجووڵی (١٥-١٦)هەزار سەربازی تورک دژی یاخییانو گومانی سەرکەوتن. نادیاریی ژمارەی کوردانی یاخیو مەزەندەکردنیان بە (٢٠٠٠-٢٥٠٠)کەس. هاوکاریی چەکو خۆراکی ئێران بۆ یاخییانی کورد. |
| ٦٠ | ١٩٣٠/٧/٣ | ڕاپۆرتی ژمارە ٢٥٤ی جی.کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لەئەستەمبووڵ بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل:٣٢٧<br>ڕاپەڕینی ئاگری. جموجووڵی سەربازیی |

تورك لە ناوچەی سنووری (ئێران- تورکیا)و فراوانیی جموجوولە کان .بەرپرسکردنی حکوومەتی ئێران و یارمەتیی ئەم وڵاتە بۆ یاخییان .بێدەنگیی تاران لەمە.

٦١ — ١٩٣٠/٧/٧

برووسکەی ژمارە ٤٥ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای ئینگلتەرە لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٣٢٩

یاخیبوونی ئاگری. بەشداریی( ١٠٠٠٠) دەهەزار سەربازی تورك لە جموجووڵدا .لە دەستدانی ١٠٠ سەربازو سێ فڕۆکەی سوپای تورك. تاوانبارکردنی ئاشکرا تری ئێران.

٦٢ — ١٩٣٠/٧/٧

برووسکەی ژمارە ٤٦ی‌سێرجی کلارکی نوێنەری باڵای ئینگلتەرە لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل: ٣٣٠

یاخیبونی ئاگری. تاوانبارکردنی بریتانیا لە لایەن چاپەمەنییە تورکییەکانەوە . ئاگادارکردنی عێراق لەمە.

٦٣ — ١٩٣٠/٧/١٠

ڕاپۆرتی ژمارە ٢٦٢ی سێرجی. کلارکی نوێنەری ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٣٣١

یاخیبوونی ئاگری. ڕاپۆرتی پاشکۆی سەربازی. ڕوونکردنەوەی بڵاوکراوەکانی تورك. گرنگ‌و فراوانبوونی ڕووداوەکان.

| | | |
|---|---|---|
| | | چالاکبوونی یاخییبان لە شەرگەیەکی ١٥٠ کیلۆمەتریدا. پەرەسەندنی هێرشی چاپەمەنییەکان دژی ئێران. یارمەتیی بەردەوامی ئێران بۆ یاخییان. بەڵێنی سەرکوتکردنی یاخیبوونەکە. |
| ٦٣/ھ | ١٩٣٠/٧/٤ | ڕاپۆرتی ژمارە ٥٠ی ڕائید ئۆلێریی پاشکۆی سەربازیی ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ جی. کلارکی نوێنەری باڵا. ل: ٣٣٤<br>یاخیبوونی ئاگری. بەکارهێنانی (١٠٠٠٠)سەربازی تورك لە کردە سەربازییەکانی دژی کورددا. نادیاریی ژمارەی کوژراوو بریندارانی. |
| ٦٤ | ١٩٣٠/٧/١٤ | ڕاپۆرتی ژمارە ٣٢٨ی ئار. کلایفی نوێنەری باڵای ئینگلتەرە لە تاران بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل: ٣٣٦<br>یاخیبوونی ئاگری. وەڵامێکی ڕۆژنامەی (ئێران)ی نیمچە رەسمی لە مەڕ بۆچوونی تورکیا کە گوایە ئێران یارمەتیی یاخییانی داوە. رەتکردنەوەی رەسمیی بۆ چوونەکە. تاوانبارکردنی سۆفیەتییەکان لەلایەن چاپەمەنییە ئێرانییەکانەوە. دواکەوتنی کۆبوونەوەی کۆمیسیۆنی سنووری تورکیا-ئێران. |
| ٦٤/ھ | ١٩٣٠/٧/١٠ | وەرگێڕدراوی بابەتی (کێشەی کوردو سیاسەتی حکوومەتمان)ی ڕۆژنامەی (ئێران). ل: ٣٣٨<br>یاخیبوونی ئاگری. یارمەتی نەدانی |

| | | |
|---|---|---|
| | | یاخییان لەلایەن ئێرانەوە. ناڕەوایی گومان لە هەڵوێستی ئێران. |
| ٦٥ | ١٩٣٠/٧/١٥ | نووسراوی ژمارە ٢٧٣ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل: ٣٤١<br>یاخیبوونی ئاگری. ڕاگەیاندنی سەرکوتکردنی یاخیبوونەکە. چاوپێکەوتنێکی وەزیری دەرەوەی تورکیا. ڕوونکردنەوەیەکی وەزیر. هاوکاریی یاخییان لەلایەن لێپرسراوانی ناوخۆوە. وەڵام نەدانەوەی تورکیا بۆ ناڕەزاییەکانی تاران. بیرۆکەی دیاریکردنەوەی سنووری تورکیا-ئێران لە ناوچەی ئاگری. بارودۆخی عیراق. |
| ٦٦ | ١٩٣٠/٧/١٦ | نووسراوی ژمارە ٢٧٤ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ٣٤٤<br>یاخیبوونی ئاگری. ڕاپۆرتێکی پاشکۆی سەربازی. نەتوانینی سەرکوتکردنی تەواوی یاخیبوونەکە. |
| ٦٦/١٥ | ١٩٣٠/٧/١٦ | ڕاپۆرتی ژمارە ٦٠ی ڕائید ئۆلێریی پاشکۆی سەربازیی بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆجێ. کلارکی نوێنەری باڵا. ل: ٣٤٥<br>یاخیبوونی ئاگری. ئامانجی یاخییان. جموجووڵی سەربازانی تورک. ڕێبەرانی |

| | | |
|---|---|---|
| | | یاخیبوون. چالاکیی یاخییان. سەرکەوتنی هێزی ئاسمانیی تورك. کوژرانی ١٥٠٠ یاخیو دەربازبوونی ١٥٠٠ی تر. فراوانبوونی یاخیبوون. ساڵح پاشاو زەکی پاشا. زانیاری تر. |
| ٦٧ | ١٩٣٠/٧/١٦ | ڕاپۆرتی ژمارە ٢٧٥ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل:٣٤٩ یاخیبوونی ئاگری. چەند زانیارییەکی سەیری خاتوو ماك گرات (ڕۆزیتا فۆربێس)ی ڕۆژنامەنووسی ناو کوردانی ئاگری. یارمەتیی ئێران بۆ یاخییان. |
| ٦٨ | ١٩٣٠/٧/١٧ | ڕاپۆرتی ژمارە ٢٧٦ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٣٥٣ یاخیبوونی ئاگری. هۆی یاخیبوونەکە. ئیحتیمالی چارەی کێشەی کورد. تورکیا لە ساتێکی ناخۆشدا. |
| ٦٩ | ١٩٣٠/٧/٢٨ | برووسکەی ژمارە ١٧٤ی ئاڕ. کلایفی نوێنەری باڵای ئینگلتەرە لە تاران بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل: ٣٥٥ یاخیبوونی ئاگری. ئیحتیمالی چوونە ناوەوەی هێزەکانی تورك بۆ ناو خاکی ئێران بۆ دەرکردنی یاخییان. ناردنی سەربازانی ئێرانی بەرەو سنووری تورکیا. |

| | | |
|---|---|---|
| ٧٠ | ١٩٣٠/٧/٣١ | نووسراوی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە . ل: ٣٥٥<br>یاخیبوونی ئاگری. چەند هەواڵێکی کەمی ڕۆژانی دوایی. دامرکاندنەوەی یاخیبوونی ناوچەی ئەرجیش. گەمارۆدانی هەرێمی ئاراڕات. تاوانبارکردنی ئێران لەلایەن ڕۆژنامەکانی تورکیاوە. قسەیەکی عیسمەت پاشا. تێبینییەکی تورکیا بۆ ئێران. خواستی سنوور دیاریکردنەوەی تورکیا- ئێران. گرژیو ئاڵۆزیی پەیوەندییەکانی هەردوو وڵات. |
| ٧٤ | ١٩٣٠/٨/٥<br>١٩٣٠/٨/٤ | برووسکەی وەزیری کاروباری وڵاتە کۆلۆنیالکراوەکان بۆ کۆمیساری باڵای بریتانیا لە بەغداو، برووسکەی بریکاری کۆمیساری باڵا بۆ وەزیر. ل: ٣٥٨<br>هاوکاریی کوردە بارزانییەکان بۆ یاخییانی تورکیا. کۆنترۆڵکەرانی بارزانییەکانی عیراق. |
| ٧٢ | ١٩٣٠/٨/٥ | برووسکەی ژمارە ٦٣ی مستەر هێلمی کارهەڵسووڕێنی بریتانیا لەئەستەمبووڵ بۆ ئێی.هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز.ل: ٣٥٩<br>کوردو سنووری تورکیا- عیراق. هاوکاریی کوردانی بارزانی بۆ یاخییانی تورکیا. پرسی چۆنییەتی وەڵامی عیراق بۆ نوێنەری تورکیا |

| | | له بەغدا. |
|---|---|---|
| ٧٣ | ١٩٣٠/٨/٦ | برووسکەی بریکاری کۆمیساری باڵای ئینگلیز لە بەغدا بۆ وەزیری کاروباری دەولە تە کۆلۆنیالکراوەکان. ل: ٣٦٠<br>وەڵامی عیراق بۆ تورکیاو، گوایە یارمەتینەدانی کورد. هاننەدانی ناسیۆنالیزمی کوردی جیاییخواز لە عیراقدا. |
| ٧٤ | ١٩٣٠/٨/٦ | برووسکەی بریکاری کۆمیساری باڵای ئینگلتەرە لە بەغدا بۆ وەزیری کاروباری وڵاتانی کۆلۆنیالکراو. ل: ٣٦١<br>پێکدادانی سەربازیی تورك‌و کوردانی ئۆرامار. یامەرتیی شێخی بارزان بۆ کوردەکان. |
| ٧٥ | ١٩٣٠/٨/٦ | راپۆرتی ژمارە ٢٩٨ی مستەر هێلمی کارهەڵسووڕێنی ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٣٦١<br>یاخیبوونی ئاگری‌و پەیوەندییەکانی تورکیاو ئێران. تێبینییەکی تازەی تورکیا بۆ ئێران. دیاریکردنەوەی سنووری تورکیا — ئێران‌و ویستی دەرکردنی یاخییان لە ئێران. وەستانی جموجووڵی دەڤەری ئاگری. چالاکیی دامودەزگاکانی حکوومەت. راوبۆچوونی توندی عیسمەت پاشا. نەرمیی غازی بۆ چارەسەری گرفتەکە. چاوەڕێکردنی وەڵامی ئێران. خاوبوونەوەی گرژیی |

پەیوەندییەکانی تورك‌و ئێران. کۆنترۆڵەکرانی هەرێمی کوردان. ناردنی هێزی نوێ بۆ ڕۆژهەڵات. جموجووڵ بەدرێژایی سنوورەکانی تورکیا- عیراق‌و تورکیا- سووریا.

٧٦   ١٩٣٠/٨/١٤   نووسراوی ژمارە ٩٣٩ی مستەر کامپێبڵی کارهەڵسوڕێنی بریتانیا لەپاریس بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە.ل:٣٦٥

یاخیبوونی ئاگری‌و پەیوەندیەکانی تورکیا- ئێران. چەند زانیارییەکی نوێنەری ئێران. چوونە ناوەوەی سەربازانی تورك بۆ ناو خاکی ئێران‌و بۆ دەرکردنی یاخییان. هاوکاریی سۆڤیەتیەکان بۆ تورکیا. خواستی ئێران بۆ بانگێشتکردنی دەولە تانی تریان کۆمەڵەی نەتەوەکان. ئاگادارکردنی فەرەنسە.

٧٧   ١٩٣٠/٨/١٤   نووسراوی ژمارە ٣١٨ی مستەر هێلمی کارهەڵسووڕێنی بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ٣٦٦

کوردە بارزانیەکان. پرسی تۆفیق روشدی لە مەڕ پەڕینەوەی کوردانی بارزانی بەسنووری تورکیادا. دڵنیاکردنەوەکانی عیراق‌و بریتانیا بۆ هاننەدانی ناسیۆنالیزمی جیاییخوازی کورد. گوتەکانی جێگرانی سەرۆکی عیراق‌و کۆمیساری باڵای بریتانیا. ڕێکەوتننامەی ئەنگلۆ عیراق.

| | | |
|---|---|---|
| ٧٨ | ١٩٣٠/٨/١٥ | برووسکەی بریکاری کۆمیساری باڵای بریتانیا لەبەغدا بۆ وەزیری کاروباری دەوڵەتانی کۆلۆنیالکراو. ل: ٣٦٨<br>پێکدادانی بارزانیان‌و سەربازانی تورك. ناردنی هێزی تازەی ئەم کوردانە بۆ پشتیوانیی کوردانی ئۆرامار. |
| ٧٩ | ١٩٣٠/٨/١٨ | برووسکەی ژمارە ١٩٤ی ئار. کلایڤی نوێنەری باڵای بریتانیا لە تاران بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل:٣٦٨<br>یاخیبوونی ئاگری. پێداگرتنی کونسوڵی تەورێزی بریتانیاو نوێنەری باڵای پێشووی تورکیا لە نەچوونە ناوەوە سەربازی تورك بۆ ناو خاکی ئێران. |
| ٨٠ | ١٩٣٠/٨/١٨ | راپۆرتی مستەر سترانگی کارهەڵسورێنی ئینگلتەرە لە مۆسکۆ بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل: ٣٦٩<br>یاخیبوونی ئاگری‌و هەواڵی چاپەمەنیەکانی سۆڤیەت دەربارەی پەیوەندییەکانی ئێران- تورکیا. بێ بناغەیی پروپاگەندەی سۆڤیەتیەکان بۆ تێکدانی پەیوەندیی ئێران‌و تورکیا. شیاویی یاخیبوونی کورد بۆ قازانجی ئیمپریالیزمی ئینگلیز. گەڕانی لۆرەنس لە عیراق‌و ئێران. بێهێزکردنی تورکیا. سەرنەگرتنی نیازی تێکدانی پەیوەندییەکانی ئێران- تورکیا. |
| ٨١ | ١٩٣٠/٨/٢٠ | نووسراوی ژمارە ٣٢٨ی مستەر هێلمی |

| ژمارە | ڕێکەوت | ناوەڕۆک |
| --- | --- | --- |
| | | کارهەڵسووڕێنی ئینگلتەرە لە ئەستەمبووڵ بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٣٧١<br>یاخیبوونی کوردو فراوانبوونی، ئاڵۆزیی پەیوەندییەکانی تورکیا- ئێران. گەیشتنی وەڵامی ئێران بەئەنکەرە لە بارەی تێبینییەکەی تورکیاوەو، دانە دواوەی داواکان. هەواڵی یەکگرتنی هێزەکانی تورکیاو ئێران بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی یاخییە کوردەکان.<br>هەوڵدان بۆ وەرگرتنی زانیاریی غازی لە سەر ئەو تێبینییە نوێیەکەدەدرێتە ئێران. بەتوانایی دەست بەکاربوونی کۆمیسیۆنی سنووری ئێران- تورکیا. کەمیی هەواڵی سنووری باشووری ڕۆژهەڵات. |
| ٨٢ | ١٩٣٠/٨/٢٦ | ڕاپۆرتی ژمارە ٤١٥ی ئاڕ. کلایڤی نوێنەری باڵای ئینگلتەرە لە تاران بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل: ٣٧٤<br>یاخیبوونی ئاگریو بارودۆخی سنووری تورکیا- ئێران سەرنج و لێکۆڵینەوەی هەواڵی چاپەمەنییەکانی تاران. ڕاپۆرتی پاشکۆی سەربازیی. نا ڕوونیی هەلومەرجەکە.<br>بانگکردنەوەی باڵیۆزی تورکیا لە ئێرانو ، دامەزراندنی خوسرەو بەگ لە و پۆستەدا. |
| ٨٢/١٥ | ١٩٣٠/٨/٢٦ | ڕاپۆرتێکی نەقیب کۆلۆنێل دۆدی پاشکۆی سەربازیی ئینگلیز لە تاران لەمەڕ بارودۆخی |

حکوومەتی تورکیاو، سەیریش نییە کەتوانییان بەبێ هیچ مەترسییەکی ئەنجومەنی وەزیران بەدەستی بهێنن. لەگەڵ ئەمانەیشدا، دەشێ هیواکانی کورد وەك سەرەتایەك پەسند کرابن، هەرچەندە پەسەند کردنی دادگا شەرعییەکان و نەبوونی باج و سەربازیی زۆرە ملێ بەناچاری، ماونەوە بۆ بڕیاری داهاتووی ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانی. لێبوردنی گشتی، بەهۆی ئاهەنگەکانی (دوملوپونار)ەوە، بۆ هەموو ئەو کوردانە کەبەتۆمەتی سیاسی یان کوشتن تاوانبارکراون، دەرچووە. هەمان کات، چەندین ڕاپۆرت هەن لەو بارەیەوە کەچەند کۆمەڵێکی گەورەی خەڵك بەو بڕیارانەی کۆنگرەکە ڕزای نین و، سەرهەڵدانێکی دژە کەمالیستیش لە ناوچەی قۆچگیریی ویلایەتی سیواس روویداوەو، حکوومەتی تورکیای ناچار کردووە هێزە دیکتاتۆرییەکان بۆ سەرکوتکردنی جەودا پاشای ئەفسەری گشتیی سوپای سیواس ببات. بەم جۆرە، مەسەلەی کورد وەکو هەر بابەتێك لەوانە دەمێنێتەوە کەبەردەوام و لە ئایندەیشدا کێشەو دڵەراوکێ بۆ کۆمارە نوێیەکە دروست دەکەن.

٨ـ حکوومەتی تورکی تائێستا ئارەزوویەکی کەمی بۆ ئاسانکردنی پاڵاوتنی نوێنەرانی بۆ ئەو کۆمیسیۆنە جیاجیایانەی وا بەپێی پەیمانەکە پێکدەهێنرێن، پێشانداوە. پێدەچێ چاوەڕێی گفتوگۆی پرۆسەی ڕاستەقینەکەبن. من بەردەوام نوسرەت بەگ بۆ هاندانی حکوومەت لەم بارەیەوە بانگێشت دەکەم، بەڵام تا ئێستا، جگە لە دەستی دەستی پێکردن لەسەر چەند بنەمایەك، هیچی ترم دەست نەکەوتووە. بۆ نموونە سەبارەت بەکۆمیتەی سنووری (Thrace)[1] پێی وتم، تا لەگەڵ حکوومەتی بولگارییدا لە سەر دەستکارییەکی کەم و تایبەتی سنوور ڕێکنەکەون، ناتوانرێ ئەندامی تورکیا دەستنیشان بکرێ. من سووربووم لە سەر نەشیاویی دواخستنی کەمترین دەستکاریی سنوور، تا ئەو ئاستەی کەناوچەی چەکداماڵراو دەگرێتەوە. ئەو ڕاستییەش کەوا بولگاریا هەرچەندە تاڕادەیەك کاری تیکراوە، بەڵام

[1] ناوچەیەکی جوگرافییە بەشی باشووری ڕۆژئاوای (ڕۆمەیلی)ی تورکیاو، باکووری ڕۆژهەڵاتی یۆنان ئەگرێتەوەو، سنووری نێوان ئەو دوو دەوڵەتەی دوو کەرت کردووە. (س).

ریشەییە. بەڵام بۆ ئەم مەسەلەیە بەشێوەیەکی سەرسوڕهێن جەختی لە سەرکرا. ئەنجامەکە هەرچەندە پەسندە، پێدەچێ فەتحی بەگ لە جنێڤ، وەکو گونجاوترین رێگە بۆ کۆتایی هێنان بەکێشەکە، پێشنیاری راپرسی (استفتاء)ێك بکات.

٥- بایەخێکی زۆر تایبەت، لەم پەیوەندییەدا، بەگۆنگرەی تورکی - کوردیی (١)ی ئابی دیاریەکر دراوە. چالاکییەکان بە نهێنی هێڵراونەوەو، هیچ ئاماژەیەکیان لە بڵاوکراوەکاندا پێنەدراوە، یەکێك لە ئامانجە سەرەکیەکانی سیاسەتی تورکیا پێداگرتنە لە سەر برایەتیو لێکجیابوونەوەی تورك و کورد، بەوانەشەوە کە لە ئێراندان. هەروەها کاریگەریی کورد پەیوەندیی بە دوودڵیی تورکیاوە هەیە لە تەنازولکردندا لە ویلایەتی مووسڵ. نیاز وا بوو کۆنگرەکە ئەم برایەتیە، بە رامالینی هەرچی هۆکاری نائارامیو بێزاریی کوردان هەیە، دەستەبەربکات.

٦- هەر چەندە ناتوانم بەرەهایی شایەتی لە سەر راستو دروستیی ئەو زانیارییانەی کەهەمن، بدەم، وا دەردەکەوێ کاتێك داوا لە نوێنەرانی کورد کرا کێشەکانیان بخەنەڕوو و پێشنیاری چارەسەرەکانیان بکەن، لە ناو هەموو شتەکاندا داوای بەرێوەبەرایەتییەکی تایبەتییان بۆ کوردستان کردبێ. ئۆتۆنۆمی وەك قەرەبوویەك بۆ کەمکردنەوەی نەهامەتیەکان، لێبوردنی گشتی، نەبوونی باجو سەربازیی زۆرە ملێ بۆ ماوەی پێنج ساڵ لە کوردستانو، گێڕانەوەی دادگا شەرعییەکانو چەکە دەست بەسەراگیراوەکان لە وڵاتداو، لابردنی ئەفسەرە سەربازیو کارمەندە تورکە بێزراوەکان لە داواکارییەکان بوون، کوردان، بەرامبەر بەوە، لە گشت مەسەلەکاندا بەمووسڵیشەوەو بۆ دامرکاندنەوەی هەر سەرهەڵدانێکی هاووڵاتیان بۆ قازانجی سوڵتانو خەلیفە، پشتیوانیو هاوکاریی تەواوی حکوومەت دەکەن.

٧- لەوانەیە ئەم داواکارییانە بە باشی پشتیان پێ ببەسترێ. ئەوان ویستیان ببنە سەرۆکاری هەندێ لە و کوردانەی کە لە کاتێکدا کوردستانو تورکیایان بەیەك پارچە دەبینی، دەیانویست چوونیەك بن. لەلایەکی تریشەوە ویستیان ببنە سەرۆکاری

پێنەکردووە ئاشکرا دەری بخات ئەم دەوڵەتە پابەندی ناوەرۆك یان رواڵەتی ماددەی کەمینە نەتەوەییەکانی رێککەوتننامەکەیە، چونکە لە بەرژەوەندییدا نییە.
ئێستا کەپەیمانەکە لە کاردایە، منو هەڤاڵە هاوپەیمانەکانم لە سەر ئەوە یەکدەنگین کە کاتێکی گونجاوە سەرنجی ئەم حکوومەتە بۆ ئەو مەبەستەو داگیرکارییە هەمەجۆرە تێبینیکراوەکانیشی رابکێشرێ، تا ئەو هەڵەیە نەکاتو خۆی لە رێککەوتننامەکە نەدزێتەوە. بەو پێیە، کۆمسیۆنی یاسایی هاوپەیمانان تێبینییەك لە سەر مەسەلە کە رەشنووس دەکات، تا لە هەنگاوی یەکەمدا بۆ دەوڵەتانی هاوپەیمان بەرزبکرێتەوە. دواتریش ئەمە دەکەمە بابەتی برووسکەیەکی تر.

٤ـ ئەنجامێکی باشی بڕیاردانی بریتانیای مەزن لە سەر پەیمانەکە، ئەوەندەی من بزانم، رەزامەندیی بێ چەندو چوونی حکوومەتی تورکی بووە لە سەر بەرزکردنەوەی کێشەی سنووری عێراق– تورکیا بۆ ئەنجومەنی کۆمەڵە ی نەتەوەکان. چاپەمەنییەکان، دوای چەند ڕۆژێك، دەستنیشانکردنی (فەتحی بەگ) یان وەکو وەفدی تورکیا بۆ جنێڤو بۆ ئەو مەبەستە راگەیاند. نوێنەری تورکیا لێرە بۆی دووپاتکردمەوە کەهەر چەندە باوەڕی بەڕاستیی هەواڵە کە هەیە، بەڵام هیچ پشت ڕاستکردنەوەیەکی ڕەسمیی لە لانییە. وا مەزندە ئەکەم کەحکوومەتی تورك هەستی بەئاڕاستەی کۆمەڵە کە کردبێ، بەڵام وادەردەکەوێ بیەوێ پێ لە سەر ئەو راستییە دابگرێ کەبەرزکردنەوەکەی ئارەزوومەندانە بووە، نەك بەهۆی گوشاری ئەو نێردراوە یاخود حکوومەتەکەیەوە بووبێ. فەتحی بەگو شاندەکەی، لە دواییدا، ماوەیەك لە قوستەنتەنییە مانەوەو، منیش بەورییاییەوە هیچ پەیوەندییەکم پێوە نەکردن، دەشێ بەتێپەڕیوونی کات یەکەمجار تێبینی بکرێ کەتێڕوانینی ئایندەی تورکیا بۆ کۆمەڵەکە، بەپێی بڕیاری کۆمەڵە دەبێ لەسەر کێشەی سنووری عێراقو، دووەمیش هەرچەندە ماوەی چەند مانگی پێشوو چەندین پەیوەندیی ڕەسیمیم بۆ ئەو مەسەلەیە کردووە بەحکوومەتی تورکیاوە، لە وەڵامدا، جگە لە دەمەتەقێ، هیچیترم وەرنەگرتووە. رقی تورك لە بەڵێنو قسەی نووسراو، شتێکی باو و

ئەو گەردەلوولانەدا بووە، کە دەشیا کاتی چالاکیی ئەنجومەن‌و داواکردنی راپۆرتی وەرزانە لە حکوومەت، هەڵبکەن.

٢ـ لەگەڵ ئەمەیشدا، ئەوەتی برووسکەی ناوبراو نووسراوە، پێشکەوتنی گرنگ هەبووە. پەیمانی لۆزان یەکەمجار لە بریتانیاو ئیتاڵیاو یابان لە (٦ئاب)ەوەو، مانگێکیش دواتر لە فەرەنسە، کاری پێکراوە. بڕیارەکان دەمێك بوو، بە جۆرێکی وا کە چەسپینی رێککەوتننامەکە چەند تێبینییەکی لێکەوتنەوە، دواخرابوون. بێگومان سەقامگیربوونی ئەو ئاشتییە، کە دواجار بەشێوەیەکی ئاسایی لەگەڵ هێزە رۆژئاواییەکاندا هاتە ئاراوە، ئاسوودەییەك‌و، دواخستنێك کە دەرهاوێشتەی هیچ ئاڵۆزیی‌و دڵە راوکێییەکی هێزەکان نەبوو بۆ گێرانەوەی پەیوەندیی ئاشتییانەو ئاسایی لەگەڵ تورکیادا، توورەیی‌و بێزارییان تێدا بەدی دەکرا. وا هەست دەکەم هەر بۆیە تورکیا لە پەسەندکردنی مامەلە کردن لەگەڵ پەیمانەکەدا، وەکو ئەوەی بەشێوەیەکی یاسایی کاری پێکرابێ، تا راگەیاندنێکی رەسمیی حکوومەتی فەرەنسەی بۆ ئەو مەبەستە پێگەیشت روویەکی تاڵی پیشان دا. هیچ شتێك لە ماددەی ١٤٣ی پەیماننامەکەدا نییە، ئاماژە بکات کە دەبێ پرۆسەی دەستەبەرکردنی بڕیار لێدانەکە لە رۆژێکی دیاریکراودا بێ کەوا دەبێتە رۆژی کارپێکردنی. راستییەکیش هەیە کەلە بەر چەند هۆیەك تا ٢٩ ئاب، پەیوەندیی رەسمی بەنوێنەری پاریسی تورکیاوە نەکرا. زنجیرە هەوڵێکی حکوومەتی تورکیایش بۆ پشتگیریی پێشنیارەکەی لە و بارەیەوە، پێدەچێ لەمەسەلە جیاجیاکانی وەکو رۆژی جێبەجێ کردنی ( تاریف tariff)ەکاندا، بەپێی‌مەرجەکانی رێککەوتننامەی بازرگانی، ئاڵۆزییەکی چاوەڕوانکراو دروست بکەن.

٣ـ حکوومەتی تورکی لە ئەنگۆرەوە کۆپیی ئەسڵی پرۆژە راستەقینە هەمەجۆرەکانی پێگەیشت‌و، بەم جۆرە ئیتر هیچ پاساوێکی بۆ دواخستنی جێبەجێکردن‌و کاری جۆراوجۆر بۆ بەگەڕخستن، یاخود شکاندنی مەرجەکانی پەیمانەکە، نییە. ببورن، پێویستە ئەوە بدرکێنم کە تائێستا هیچ چالاکییەکم هەست

سوپاسی دانیشتوانی مەغنیسیا دەکەم کە بەباشی گوێیان لێگرتم. هیوامە لەو بەیاننامەدا، کە زۆر حەز دەکەم بۆیانی ساخ بکەمەوە، ببینن ئێمەش کەبڕیارمانداوە بەڕێگای ڕاستو پێشکەوتندا مل بنێین، هەردەم ئامادەین حیسابنامەی کارەکانمان بخەینە بەرچاوی نەتەوەکەمان. ئێمە هەموو ئەو بەربەستانە تێدەپەڕێنین کەدێنە بەردەممانو، بەئامانجمان دەگەیەنن"[1]

نێڤڵ هندرسن

وەزارەتی دەرەوە ٢٦١/٤٢٤، ل: ١٦–٢٠، ژ٢٠

## ژ: ٢

## لەمستەر هندرسنەوە بۆ مستەر ماك دۆناڵد- (٢٣ی ئەیلول گەیشتووە)

## ژمارە:٦٨٥

**قوستەنتەنییە، ١٦ی ئەیلولی ١٩٢٤**

**گەورەم**

زووتر لە برووسکەیەکی جیاوازدا، وتەکەی مستەفا کەمالم بۆ ناردن، کە لە ڕیو- ڕەسمێکی (دوملوپونار—Doumlou Punar)[2]داو، بۆ ڕێزنان لە سەربازی ونی تورکیو، هەروەها لە سەر گێژاوی تورکیا– یۆنان سەبارەت بەلێکدانەوەی وشەی "established"ی ماددەی دووی ڕێککەوتننامەی لەمەڕ ئاڵوگۆڕی دانیشتوانی تورکو یۆنانی، پێشکەشی کردبوو. ئەمانە، دوو مەسەلەی سەرەکیی شەش هەفتەی رابردوون. ئەوەتی بروسکەی ژمارە (٦٠١)ی (٨ئاب)م کە بریتیبوو لە کورتەیەکی گشتیی ڕووداوەکانی ئەم وڵاتە بۆ ناردوون، ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانی پێناچێ تا تشرینی دووەم کۆببێتەوەو ، چەند مانگی کەمی پێشوو لە بارودۆخێکی ئارامی پێش

---

[1] ئەم برگەیە فەرەنسییەی خاتوو شەن محەمەد بەسوپاسەوە بۆی کردمە عەرەبی.

[2] شارۆچکەیەکی باکوری شاری ئەفیون قەرەحەسارییە. (س)

" ئێمە هەموو کارێك بۆ ئەو سەرمایەدارە بیانییە ئاسان دەکەین، کەبیەوێ لە لای ئێمە کاربکات. ئەو سروودانە کە ناحەزانمان بۆ ئەمە مەسەلە یەیان داناوە، دەبنە وێردی سەر زمانی ئەو کەسانەی وا نایانەوێ سەرمایە لە دەرەوە بێتە ناوەوە. ئێمە حەز دەکەین سەرمایەدارە چالاکەکان لای ئێمە پارەیان بخەنەکارو، ئامادەین هاوکارییان بکەین. بەڵام نامانەوێ ئەو ئیمتیازانە بدەینە هیچ کەسێك کە ڕێی دەدەن زێڕی دەوڵەت بماشێتەوە، ئەوان کە بەسەرمایەو زیرەکیو بەهرەی خۆیانەوە دێن شەرەفمەندانەو یاسایی کار بکەن، هەموو دەرگایەکیان بۆ دەخرێتە سەر پشت. دیارە ئێمە ناتوانین هیچ بدەینە ئەو کەسەی کەبۆ نموونە دێ ئیمتیازی کانەکانی مەغنیسیا بۆ ماوەی پەنجا ساڵ وەربگرێ، تا پاشتر دەستیان بەسەردا بگرێ. هەرکەسێك بێتەلامان یەکەمین پرسیارمان لێی ئەوە دەبێ: چەندی پێدەچێ تا دەست بەکاردەبێ؟ شتێکتان پێدەڵێم سەرسامتان دەکات. بەگشتی هەن پێیان وایە وڵاتەکەمان کانگەیەکی کەرەستەی خاوی نەبراوەی هەیەو، بۆ نەگبەتییش ئەم چینانە هێشتا بەرهەم نەهێنراون، چونکە تائێستا لەم ڕووەوە کارمان بۆ ئاسان نەکردوون. ڕاستییەکەیشی شتێکیترە. هەرچینێك لە هەر گۆشەیەکی نادیاری وڵاتدا بێ، خاوەنی پێشتری خۆی هەیە. هیچ شتێك نادرێ. ئیمتیازەکان دیاریکراون، بەڵام هێشتا دەست بەسەرمایە خستنەوە نەکراوە. لە دەستێکەوە دەچێتە دەستێکیتر، ئەم حاڵتە دەبێتە هۆی پەکخستنی ژیانی ئابووری دەوڵەتو، زیان لە بەرژەوەندییەکانی دەدات. ئێمە پیاوی بەقسەو بەڵێنو دڵسۆزمان دەوێو، نامانەوێ پشت بە کاری پارە گۆڕینەوە ببەستین.

ئێمەو هەموو خەڵکانی دەست کورت وا ڕاهاتووین ئەوپەڕی سوود لە هەڵەکانی ڕابردوو وەربگرین. ئێمە کارئاسانی باشتر بۆ ئەو کەسە چالاکانە دەکەین کە سەرمایەکانیانو کارو بەهری خۆیان دەهێننە ناو وڵاتەکەمان.. بەڵام هەرگیز ڕێنادەین پارەگۆڕکێ لە وڵاتەکەماندا بکرێ.

١٢ـ بەقسەی عیسمەت پاشا، گرنگترین مەسەلەی دەرەکی کە مابێتەوە بڕیاردانە لەسەر رێککەوتننامەی لۆزان. دواخستنیشی کەمو زۆر بەهۆی هەندێ هۆکاری یاساییو رەواوە بووە. ئەم هۆکارانە کزدەبوونو، پێدەچوو بەشی زۆری ئیجرائاتی پێویست کرابێ. بەڵام ویستی پێ لە سەر ئەو راستییە داگرێ کە تورکیا بەو رێککەوتنەی وا لە لۆزان ئیمزای کردووە، دڵخۆش بووەو، لە هەمان کاتیشدا چاوەڕێی جێبەجێکردنی نەکردووە، تورکیا پەیوەندیی ئاسایی لەگەڵ ئەڵمانیاو نەمساو.. هتد بەستووەو پەیوەندییەکانی دەرەویشی لە سەر بنەماکانی رێزی هاوبەشی نێوان دەوڵەتە هاوتاکاندا بەردەوام لە بەرەو پێشچووندا بوون. گەشەکردنو ئارامیی ناوخۆیی بەجۆرێك بوون کەوایان لە دۆستو بێگانە کردبوو بڕوا بەتوندتۆڵیی رژێمەکەی بهێننو، پێویست نەکات لە ناو خۆیاندا لە ئاسایشی ناوخۆیی بدوێن، ئەم هێمنیو ئارامییەی رژێمە نوێیە کۆمارییەکە، هەرگیز لە وەوپێش بەرقەرارنەبوون.

١٣ـ پاشا، دوای هەندێ تێبینیی گشتی سەبارەت بە کاروبارەکانی خەڵك، کەوتە سووکایەتیکردن بەهەندێ لە هەوڵەکانی ورە رووخێن کەبێ ئومێدی لە ناو خەڵکدا بڵاودەکەنەوەو. ئەوانەیش کە بەرەخنەی تێکدەر عەقڵی گشتی دەشێوێنن. دەریشی خست کە هەوڵیداوە بەرنامەکەیان لەمەڕ پێداویستییەکانی خەڵك گەلاڵە بکاتو، هیوای خواست خەڵکی وەکو یەکەم هەنگاو پێی رازیبن. ئەمە گەلێ کێشەی خستبووە روو. ئیتر هیچ شتێك نەیدەتوانی رێ لە بەردەوام بوونی بگرێ. هێزو پێزیشی نەك هەر لە نیازەکانی داهاتوو، بگرە لە کاریگەریی پێشتری بەرنامەکەوە وەرگرتبوو.

١٤ـ ئەو بڕگەیەی کەجگە لە دوا دەربڕینی سوپاسگوزاریی بۆ مەغنیسییەکانو چەند رستەیەکی باوی‌تر، کۆتایی بە قسەکانی پاشا هێنا، تایبەت بوو بەمەسەلەی پرۆژە دەرەکییەکانی تورکیا.

شایانی ئەوەن بەدەق و فەڕەنسییەکی نیمچە ڕەسمی بخرێنە ڕوو، باسی مەسەلەی قەرزی گشتیی کرد.

١٢- پەیمانی لۆزان کێشە گرنگەکەی تری بۆ چارەسەر نەکردووین کەقەرزی دەوڵەتە. قەرزەکان بەقیست دەبن و، دەبێ ئەو بەشەی دابین بکەین کەپێویستە بیدەینەوە. بودجەی پشت پێبەستراوی ئەو ساڵە لەلایەن ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانییەوە چەند دەستکارییەکی سەبارەت بەژمارەو مامەڵەی پشتیوانانی قەرزی دەوڵەت تێدا دەکرێ. ڕێگای بەدەستهێنانی باجمان لە هەموو نووسینگەکانی باج سەندنی دەوڵەتەوە دیاریکردووە. پێشتر بەپێی مەرسوومی مانگی موحەرەم رامانگەیاند کە سیستمی ئیش وکارمان پێوانەیی نەبووە. ئێوە دەزانن ئێمە لە لۆزان چەند شتێکمان خرایە بەردەم تاڕازی بین ئەو مەرسوومە بپشکنرێ. ئەم پێشنیارەمان، بەداکۆکیی شیلگیرانەو ڕەوا، ڕەتکردەوە. ئەو گۆڕانکارییانە کە دامانە ئیدارەی ناوەندیی قەرزی دەوڵەتی، پاساودرانەوە کە گوایە پێویستمان بەئابووری هەیە، ئەم گۆڕانکارییانە دەرەنجامی پێویستییەکانی بودجەن. ئەمە یاسای ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانییە. ڕازی نابین زیان بە بەرژەوەندیی موڵکداران بگەیەنرێ و، ئێمەش لەماف و بەهرەی قەرزداران و واوەتر بچین، قەرزەکانمان دوای لێکحاڵیبوون لەگەڵ پارەداراندا، پاش ئەوەی کەپێکەوە ڕێ و شوێنی دانەوەیان لە گەڵدا دادەنێین. دەدرێنەوە ئەمە ئەو کێشەیەیە کە هەمیشە داکۆکیمان لێکردووە. ئەوەیشی دەخەمە پاڵ، ئێمە هەستمان نەکردووە زۆر داگەییوبین. بۆیە بۆ پاراستنی بارودۆخی ئێستا سۆراخی هەمان ئیمکانیاتمان کردووە. ئێمە پێمان خۆشە، لە نزیکترین کاتدا، لەگەڵ نوێنەرانی موڵکداراندا بۆ چارەسەری ئەم کێشەیە بکەوینە گفتوگۆ. ئەگەر نەمانتوانی دەست بەدانوستاندن بکەین، ئەوسا کێشەکە لە وەدا دەمێنێتەوە کەهێشتا پەیمانەکە کاری پێنەکراوە[1].

---

[1] بەڕێز شەن محەمەد، بەسوپاسەوە ئەم برگەیەو برگە فەڕەنسییەکانیتری کردە عەرەبی.

بوو. کردنەوەی بیناکان، تەنها دەوڵەت بەرێژەی پێویست دیاریکردبوون. بیناکردنەوەی راستەقینە لەگەڵ سەرکەوتنی رێ و شوێنە ئابوورییەکاندا هاوئاهەنگ بوو، چونکە پشتیوان (اعتماد)ە گرنگەکانی بودجە بۆ مەبەستی ئابووری وەلانرابوون، پاشا زیاتر لە سەر ئەنجامە بەدی هاتووە سەرکەوتوەکانی بانکی کشتوکاڵیو دابەشکردنی تۆو و جۆرەکانی تری هاوکاریی دەوڵەت بۆ کشتیار رۆیشت، ئەو لای وابوو زۆربەی بەرهەمەکانی ئەمساڵ باش بوون. بەڵام هێشتا لە بیری ئەوەدایە کەچۆن ئەو بەرهەمانە، ساڵانی ئایندە، بکاتە دووهێندەیتر. دەزگا داراییو ئابوورییەکان، دەبوو گەشەیان پێبدراو، بەهێزبکرێن. بانکی کشتوکاڵی هەرگیز لەمەوبەر مەبەستێکی هێندە گەورەی پەرۆشیی حکوومەت نەبووە. قەرزی هەموو شتێکی تا ساڵی (١٩٠٨) دراوەتەوە.

١٠ـ عیسمەت پاشا ئاماژەی بەقەوارەی سەرمایەداری خۆماڵی کرد، کە لە بانکەکانی ئەورووپاوە گەشەیان کردووە. بە بۆچوونی ئەو، بانکی کشتوکاڵیو پشتیوانی نیشتمانی، شایستەی هەموو متمانە پێکردنێك بوون. حکوومەت لە هەوڵی ئەوەدابوو کە پێگەی ئەمەی دواییان بەهێز بکاتو، دامەزراوە داراییو ئابوورییەکان، کەهەن یان لە دروستبووندان، بەهەموو شێوەیەك هانبدات. پاشان ئاماژەی بەبانکی کاروبارە جۆراوجۆرەکانو پرۆژە هاوشێوە هەمەچەشنەکان کردو، هیواداربوو بەرهەمەکانیان ببینێ. دواتر لە سەری رۆیشتو، باسی هێڵی ئاسنو هۆیەکانی تری گواستنەوەی بەگشتی کرد. هەروەکو پاشا وتی: (١٣٠)ملیۆن لیرەی تورکی بۆ ئەوەی پێشوو خراونە لاوەو (٢٠٠)کم هێڵی ئاسن، تاکۆتایی ساڵ، جێگیر دەکرێ. دەشێ ساڵی داهاتووش زیاتری لێ ئەنجام بدرێ. گواستنەوە بەهەردوو رێگای زەمینیو دەریادا گرنگ بووو، کەموکوڕی، بۆ رێكو پێککردنی بەندەرەکان، هێشتا زۆربوون.

١١ـ پاشا سەبارەت بەکاروباری دەرەوەی قسەی کردو، لە برووسکەی ژمارە (١٢٧)ی (١٨)تەمموزدا ئاماژەم پێکرد. دواتر درێژەی پێداو، لە چەند رستەیەکدا کە

٧- بۆ ئەوەی ئەم راپۆتە بەپێزتر بێ، پێم باشە ئاماژە بەکورتەی وتە گرنگەکەی ١٦ی تەمموزی مەغنیسیای[١] عیسمەت پاشا بکەم، خۆشحاڵبووم کەبەشێکی ئەو وتەیەتان لە برووسکەی ژمارە (١٢٧)ی (١٨)ی تەممووزدا بۆ دەنێرم.

٨- پاشا سەرەتا بەپیاهەڵدانی خەڵکی مەغنیسیا دەستی پێکرد. پاشان وتی: هیوادارە لە رێگەی چالاکییەکانی حکوومەتەوە قەرەبووی ئەوان و جەماوەر بکاتەوە. هەروەها لە وتەکەیدا هاتبوو کەخەڵکی هەمەجۆری لەماوەی گەشتەکەیدا بینیووەو، زانیاری لە سەر ئەو کێشانەی کەخەڵك پێوەیان دەناڵێنن، وەرگرتووە. پاشتر هاتە سەر باسی ئاوارەکان بەتایبەتی کێشەی نیشتەجێ بوونیان. هەروەکو ئاماژەی پێکردبوو، ئاوارەکان لە زۆر ناوچەدا ژیانیان ناخۆش بوو. پێدەچوو نارێك و پێکی هەبووبێ، بۆیە چاودێریی ورد پێویست بوو. جێبەجێکردنی ئەمەیش بووە مایەی کۆنترۆڵکردنی بارودۆخەکە. شتی زیادە دابین نەکرابوو، وڵات پێشوازیی ئاوارەکانی کردبوو و، سەرەڕای نائارامی خۆی ئەرکی خۆی بوو هەرچی پێدەکرێ بۆئەو کۆمەڵە هاو نیشتمانیانەی دەرەوەی سنوورەکەی کەپێویست بوو بهێنرێنەوە بۆ تورکیا بیکات.

٩- پاشا ئاوارەکانی زیاتر ئاگادارکردەوە تا زیادەڕەوی لە داواکانیاندا نەکەن. وتی: هەموو کەلوپەلی بەجێماوی یۆنانییەکان کەبەشێوەیەکی یاسایی وڵاتیان بەجێهیشتووە، بۆ ئەوان دەبن. هیوای خواست کە سەرپێچی ئەم بنەمایە نەکراو، هەموو هەوڵی خۆی بۆ زاڵ بوون بەسەر کێشەکاندا بخاتە گەڕ، ئەویش بەتاقیکردنەوەی جددیی جێگەی هاوبەشی تازەهاتووەکان و دانیشتوانە کۆنەکان. ئەمجا کەوتە باسکردنی پرۆگرامی حکوومەت بۆ بیناکردنەوەی وڵات. وەکو پاشا وتبووی: کێشەی گەورە بینای نوێ بوو. کارێکی راست نەبوو کەپایتەخت لە زیادکردنی ئەماندا نوقم بکرێ. چارەسەری راستەقینە لە بوژاندنەوەی ئابووریدا

---

[١] شارێکی نزیکی باکووری رۆژهەڵاتی ئیزمیری رۆژئاوای تورکیایە. (س)

گەلی کوردی ئاژاوە گێڕ، هەمیشە لە هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتدا نائارامە. ماوەیەکی کەمی پێش ئێستا نامەیەك بۆ ئەو مەسەلە یە نێردرا کەهەموو کۆمیتە ناوخۆییەکان ئامادەی بزاوتنبن‌و، نێردراوێکیشیان بەهەموو دەسەلاتێکەوە بۆ وتوویژ لەگەڵ ناودارانی کوردی ئێرەدا ناردو، (مستەر رایان) داوای لێکرا پێشوازی ئەو کەسە بکات، بەلام رەتی کردەوە. بەپێی راپۆرتێکی تر، هەر چەندە پشت راست نەکراوەتەوە، تەنانەت زولفی بەگی قۆمیسەری دیاریەکر، کە لە لۆزان وەکو کوردێکی جیایینەخواز پێشاندرا، یاخی بووە. هەموو ئەم ئامارژانە، هەروەکو چۆن ئالۆزن، نەبوونی هێمنی لە ولاتدا دەخەنە ڕوو و، دیمەنی گەردەلوولێکی نوێی سیاسی دەنەخشێنن. ئەمە لە کاتێکدا ئەنجومەن، ئەگەر هیچ روونەداو کۆبوونەوەکانی خۆی پێش نەخات، مانگی ئۆکتۆبەر کۆدەبێتەوە. هاوکات عیسمەت پاشا بەردەوام رێگای خۆی دەگرێ و، لەو کاتەوەی کە لە فەرید بەگ دوورکەوتووەتەوە، هیچ نیشانەیەکی جەماوەریی وا نییە کە لە پۆستەکەیدا بێ هێزبووبێ. تەنها پێویست بوو گۆڕانێکی تری گرنگ لە کابینەکەیدا بکات‌و، رەفعەت بەگ لە جێی جەلال بەگ کە پۆستەکەی بۆ هاوکاریکردن لە دروستکردنی بانکێکی نوێی نیشتمانیدا بەجێ هێشتووە، بەوەزیری بیناکردنەوە دەستنیشان بکات هەرچەندە ئەمەیان بایەخدارنییە، تەندروستیی پاشا باش بووەو، سوودی لە جەژنی قوربان بۆ سەردانی سمیرنا[1] و ناوچەکانی دەوروبەری وەرگرتووە. مەبەستی ئاشکرای ئەم گەشتەی سەردانی خێزانەکەی‌و گێڕانەوەیان بووە بۆ ئەنگۆرە. بەلام ئەمە ڕوویەکی سیاسیشی هەیەو، پێناچێ بۆ قسەکردن جیابەجیا لەگەڵ رەئوف بەگ‌و رەحمی بەگدا، کە ئەو کاتە لە سمیرنابوون. هەلی لە دەست دابێ.

---

[1] ناوچەی ئیزمیری ڕۆژئاوای تورکیایە. (س)

نارەزایی لە دژی کاری دنیایی و بێ دینی فەرمانڕەواکانی ئەمڕۆ پێك دێنن، بەڵام ناکۆکن و زیاتر بەهێزێکی ڕێتێچوو، نەك راستەقینە، دادەنرێن. هەموو کەسێك هەواڵی خۆپیشاندانە ناوبەناوەکانی نارەزایی جەماوەر دەبیستێ کەپشتگیریین بۆ واعیزی (سەلە فکە Selevke)[1] کەوا چوار مانگە وتارێکی کۆنەپەرستانەی داوەو، لە سەری گیراوەو، بەشێوەیەکی ئاسایی لە ئەنگۆرە دراوەتە دادگەو، حوکمی مردنی دراوە. وەکو هەوڵێکی بەقسەیش بۆ کردنەوەی قوتابخانە دینییەکان لە شوێنێکی کەناری دەریای رەشداو، هەروەها بۆ پشتیوانی خواجە(مەلا) کۆنەکانی ئەنگۆرە کەلە ئامۆژگاریەکانیاندا بەئامادەبوونی خودی مستەفا کەمال ١٣ی تەمموزی یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان، لە کاردانەوەی بێکەڵکیی کاریەدەستەکاندا، دەروونی خۆیان ئاسوودە کردبوو بەڕێزێکی تاڕادەیەك بێ ئاگا لە هەمان چین، ئەم دواییە، ویستی پەیوەندی بەم شاندەوە بکات. پێویستە بڵێم کەهیچ پشتگیرییەکی لێ نەکرا، بەڵام گرنگە سەرنجێك لە قسەکەی بدەین کە وتی: خواجەکان ئۆپۆزسیۆنێکیان لە سەر بنەمای گێڕانەوەی خەلیفە پێکدەهێناو، پەیوەندیی ناپاکانەیان لەگەڵ کۆمیتەی ئیتیحادو تەرەقیدا، کاتێك لەلایەن" قەرە کەمال بەگ"ی خیانەتکار نوێنەرایەتی دەکرد، دامەزراند هەروەها ئارەزوویان دەکرد لەگەڵ رەئووفدا کاربکەن، بەڵام وایان هەست دەکرد کەپێویستە لە وەی مستەفا کەمال کردوویەتی، زیاتر بکات. هەواڵی راستەوخۆی چالاکییەکانی کۆمیتەی ئیتیحادو تەرەقی، بەهیچ جۆرێك، نییە. بەڵام کەسانی وەکو جاوید بەگو رەحمی بەگو، لە ئاستێکی نزمتردا قەرە کەمال کەلەمەوبەر باسمان کرد، هەرچەندە لە روخساردا هێمن بن، هەرگیز ناتوانن واز لە هەڵوێستەکانیان بێنن، جاوید بەگی سەرنووسەرو رێبەریان جارێکیتر لە ئەورووپاو لە پشوودان گەڕایەوە تابەقەڵەمە جەرگبڕەکەی بکەوێتە ئازاردانی حکوومەت.

---

[1] ناوەندی ویلایەتێکی توورکیایە لە سەر دەریای سپیی ناوەڕاست، لە ڕۆژاوای ویلایەتی مەرسینە.(س)

کاری بەهێزی فەرمانگەکانی حکوومەت دەگاتێ. ئەگەر چەند هێمایەك بۆ پێشاندانی ئەوەیش هەبێ، ئەوا هیچ ئاماژەیەکی گەندەڵی لە ناو وڵاتدا نییە. پێدەچێ چەند هەوڵێکی راستەقینە بۆ هاوکاریی بەرژەوەندیی کشتوکاڵی درابن. بێ ئەژمار پرۆژە بۆ شتەکانی تر باس دەکرێن‌و، دەشێ چەند بڕیارێکی کەمی دیاریکراو بدرێن. کێشەی ئەو هاوڵاتیە تازانەی کەلە یۆنانەوە هاتوون، وەك دەڵێن، کەم‌و زۆر مایەی نیگەرانییە. بەکورتی، وەزیرەکان لە بەرامبەر ئەو ماوەیەدا کە تا کرانەوەی ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانی جارێکی‌تر هێرشیان دەکاتەوە سەر، نەزۆر باش‌و نەزۆر خراپ بەرێوە دەچن. مستەفا کەمال هەمیشە لە (چانقایا)[1] پێگەکەی بەقایمی دەگرێ، خۆئەگەر بەڕاستی جگە لە کفتی‌و شەکەتیی ئەو پالە وانە ماندووە زیاتر باس بکەین، ئەوا هەروەکو ناحەزەکانی دەڵێن: هەر زۆر سەری کردۆتە سەر مادده بێهۆشکەرەکان.

٦ـ مەحالە بوترێ ئەم شتانە چەندو چیان لە ژێردایە. پرۆپاگەندەی وا لە ئارادایە کەحکوومەت‌و تەنانەت کۆماریش بە رەئووف بەگی سەرۆکیان‌و دەستەیەك ناسیۆنالیستی هاوپەیمانەوە، خواجە(مەلا) کانی پاشماوە ناکۆك‌و دەسترۆیشتوەکەی کۆمیتەی ئیتیحادو تەرەقی‌و کوردانی بەپێشینە ڕۆژهەڵاتین‌و، لە بنەڕەتەوە بەدەوری هۆکارە زانراوو هەمە جۆرەکاندا دەسووڕێنەوە. رەئووف بەگ پاش چاکبوونەوەی، ماوەیەکی کەمی پێش ئێستا لە ئەوروپا گەڕایەوە، بە درێژایی سەفەرەکەی (وێمبلی) ی لە گەڵدابوو. لەم کاتەدا سەرنج راکێشترین شت لە بارەیەوە ئەوەیە کە هەرچەندە بەخت یاری نییە، بەڵام دەشێ کۆمەکێکی باش کرابێ. تائێستا لە ڕووی سیاسییەوە دەرنەکەوتووە. دەمێکە ئەو ئەسپە ڕەشەیە کەهاتنە دەری لە تەویلە کەی مایەی سەرسامییە[2]. خواجەکان بەشێکی گرنگی

---

[1] ئەو شوێنەی باشووری ئەنکەرە کە دائیرەی سەرۆکایەتیی کۆماری لێبووە(رفیق حلمی، یادداشت، بەشی سێهەم، بغداد، ١٩٩٢، ل١٣٤). (س)

[2] ئەسپی ڕەش لە ئینگلیزیدا بە کەسێك ئەوترێ کە چارەنووسی نادیاربێ.

بەلام بەرامبەر بەتازە هاتووەکان، بەیەك دەنگ پشتیوانیان لە ئیمتیازەکانیان دەکرد والی‌و فەرمانڕەوا، بەفەرماندان بەو کەسانەی کەمۆلە تیان وەرگرتبوو بۆ حەماڵی کردن لە هەر جێیەك بێ، مانگی رابردوو گورزێکی کاریگەریان لە قۆرخکردنی گشتی‌و پاوانکارییە ناوخۆییەکان دا. چاوەڕوانی‌و پێشبینیی کێشە دەکراو، پێ بەپێ قایمکارییشی بۆ کرا. سەندیکا چ لە بەر ئەوەی کەئەندامەکانی تەواو ترسێنرابوون، یان وەکو دەهەری ماتریالیستییەکان دەیانوت: چەند گۆڕانکارییەك روویاندابوو، بڕیارێکی چاوەڕواننەکراوی بێ‌هێزی دا. سەرکردەکان چوونە ئەنگۆرەو، بێ هیواکران. بەلام هێشتا زۆر زووە گەر بلێین هێزو دەسەلاتی سەندیکا تێکشکاون. چەند ڕۆژێك لەمەوبەر ئاژاوەیەك لە قوستەنتەنییە قەوما. بێگومان رووداوی لەم جۆرە لە ڕابردوویشدا بەرپابووە. ئەمەیشیان کەهاتە ئاراوە پرۆتستۆیان ریسواکردنێکی نەخشە بۆکێشراو نەبوو دژی بڕیارەکەی حکومەت، هەرچەندە زادەی ئەو نائارامییەی ئەنجامی بڕیارەکەبوو. خەڵك، هاوکات، کەوتوەتە ژێر فشاری بایەخی دەسەلاتەکەو چاکسازییەوە.

٤ـ داواکاریی خەڵك بەگشتی، سەرەڕای ناڕەزایی بەربلاویان دژی حکومەت، لە قوستەنتەنییە بەرزبووەتەوە. یەك دوو حالە تی جیاواز، دڵگەرمی ئەو خەڵکە تۆقێنراوەیان پێشان دا. ڕێزلێگرتنی دێرینی دەسەلاتی یەك بەرگ پۆشین (یونیفۆرم) بەو شێوە باشیەی جارانی نەماوە، بەجۆرێکی وا کەلە دەورووبەری ناوەڕاستی ئایاردا رووداوێکی بێ‌نرخی دەرەوەی دەروازەی (ئەدریانۆپل) کە بریتی‌بوو لە دەمەقالە ی جەندرمەو پیاوێکی سەرخۆش، بووە مایەی کۆبوونەوەی قەرەباڵغییەکی گەورەو، سۆزیان بەلای سەرخۆشەکەدا جولا، زۆر بەرەقی لەگەڵ جەندرمەکان‌و چەند پاسەوانێکی دارستان کەبۆ هاوکارییان هاتبوون، جوولانەوە. لەم رووداوەدا پەنا بۆچەك براو، قوربانیەکانیش کەم نەبوون.

٥ـ چەند هەواڵێکی بچووکی وەك: ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانی لە خولی کۆبوونەوەیدا نییە، لە ئەنگۆرەوە بەدەست دەگەن. چەندین راپۆرتمان سەبارەت بە

نوێیەکان. حەیدەر بەگی والیو بریکاری فەرمانڕەوا کەزۆر باسی دەکرێ، پاش شکستی فەرید بەگ، لێرە لە پۆستەکەی لادراو، کرایە فەرمانڕەوای ئەنگورە. لە وێ بۆچوونێکی گومانلێنەکراو هەیە کەناوبراو باشتر بەتەنگ دارشتنی پرۆژەکانی نەخشەدانانی شارەوە نەبێ لە چاو قوستەنتەنییەدا کە لە بریی بەخشینی نانی پێویست بەدانیشتوانی، خەریکی دروستکردنی شەقامی پانو جۆگەی جوانکاری بووە. زەمینە بۆ جیاکردنەوەی ئۆفیسەکانی والیو فەرمانڕەوا، جارێکیتر رەخسێنرایەوە. رێکخستنی هاوبەشیشیان یەکێکە لە و مەتەلە هەمیشەییانەی کەسیاسەتمەدارانی تورکیای سەرسام کردووە. رەشید بەگی والیی تازە، ناوبانگی کەمەو، زۆر بەدەگمەن شتێك لە سەرکارەکانی دەبیسترێ. ئەمین بەگی فەرمانڕەوای نوێ زیاتر دیارە، چونکە دەمەقالە ی توندو تیژی لەگەڵ ئەنجومەنی شارەوانییدا هەبووە. ئەمەی دوایی کەسێکی هەڵبژێردراوەو، خاوەنی گیانێکی رەخنە گرانەیە. لەگەڵ ئەوەشدا تەنها کارمەندێکی حکومی نییە، بەڵکو ئەنگورە لە دەرەوە هێناویەتی.

٣ـ ئەم دووکارمەندە گەورەیە، لە و بایەخپێدانە سەرنج راکێشەی دەسەڵاتدارێتی حکوومەتدا، کە لە دوای دەرکردنی خەلیفەوە قوستەنتەنییە بەخۆیەوە بینیوە، هاوکاری یەکتربوون. سڕینەوەی ئیمتیازی سەندیکای حەماله کان، چەند هەفتەیەك لەمەوبەر ، بەم جۆرە بووە، حەماله کانو خاوەن بەلەمەکان دوو کۆمەڵی بەهێزی سەندیکا کۆنەکانو، لە مێژەوە دوو سەرچاوەی رەخنەو ناڕەزایی بوونو، یەك لە دوای یەك لە کوردەکانو لازەکان پێکدەهاتن. ئەمانە کەچەند سەرکردەیەکی دیاریکراو پشتگیرییان دەکردن، بووبوونە یاسا بۆ خۆیانو، ئەمەیش هاوکات، مەبەستی رێکخراوە سیاسیەکان بوو بۆ لێپێچانەوەیان. حەماله کان سیستمێکی چڕوپڕیان هەبوو کە بەهۆیەوە نەك تەنها سەندیکایەکیان بەگشتی وەکو پاوانکردنێکی حەماڵی هەبوو، بەڵکو ناوەندی تایبەتیش بۆ بەشە تایبەتەکان تەرخانکرابوو. ئەمانە کێشمەکێشی ناوخۆییان هەبوو کەسۆز بەسەریدا زاڵ بوو،

## ژ:١

**لەمستەر هندرسنەوە بۆ مستەر ماکدۆناڵد- (٢٨ی تەمووز گەیشتووە)**
**ژمارە ٥٧٢**

**قوستەنتەنییە[1]، ٢٣ی تەمموزی ١٩٢٤**

**گەورەم.**

١- بارودۆخی سیاسیی ناوخۆی تورکیا لە دوومانگی رابردووەوە بەڕواڵەت نەگۆڕە. ئەو گەردەلوولە کەماوەیەکی درێژ دەوری (فەریدبەگ)ی وەزیری ناوخۆیدا، پاش سەرکەوتنی بەسەر رەجەب بەگدا، کەدامەزراندنەکەی لە برووسکەی ژمارە ٤٢٧ی ٢٨ی ئایاری "مستەر لیندسەی"دا هاتووە، خێرا دامرکایەوە. پاشان فەرید بەگ پشت گوێ خرایەوەو، بایەخی جەماوەریی لە بەر رەشە کوژیی ئەرمەن‌و پەنابەرە مەسیحیەکانی‌تر کەداوایان کردبوو بگەڕێنەوە بۆ تورکیا، کەم بووەوەو، لە دواییداو جارێکی‌تر بەهۆی بڵاوکردنەوەی ئەنجامە جۆراوجۆرەکانی کۆمیتەی لێکۆڵینەوەوە بایەخی پێدرایەوە. پێویستە ئێستا ئەوە بوترێ: ئەگەر حکوومەت بڕیار بدات رێو- شوێن لە دژی ئەو کەسانە بگرێتەبەر کەبەپێی راپۆرتی کۆمسیۆنەکە تاوانبارکراون، ئەوا پێدەچێ قەتڵوعامەکە جارێکی‌تر ببێتەوە بەهۆکارێکی گرنگ لە بارودۆخەکەدا. خۆ ئەگەر ئەوەیشی نەکرد، ئەوا هەر کەئەنجومەنی مەزنی نیشتمانی تشرینی یەکەم کۆبووەوە، دەبێتە ئەو کوتەکەی کەبۆ لێدانی ئەوان بەکاربهێنرێ.

٢- ئەنگۆرە[2] و قوستەنتەنییە هێشتا کەمێك ناکۆکن. سیاسەتمەدارانی ئەنگۆرە یەکدەنگ نین‌و، دەشێ گوشارێکی ناپەسەندیش کەوتبێتە سەر قوستەنتەنییە. ئەمە سەرباری کۆششی بڵاوکراوەکان بۆ بەیەکەوە بەستنی بەرژەوەندیی بوارە ئابوورییەکانی هۆکاری هەرە گەورەی ململانێی نێوان سەرمایەدارە دێرین‌و

---

[1] ئەستەمبووڵ.
[2] ئەنکەرە.

| | | |
|---|---|---|
| | | بۆ (٣٠) ساڵ زیندانیو کاری قورس. سەپاندنی سزای جۆراوجۆر بەسەر ٣٣ کەسی تردا. |
| ١١٩ | ١٩٣٨/٩/٩ | نووسراوی ژمارە ٤٥٩ی پی. لۆرەینی نوێنەری باڵای ئینگلتەرە لە تورکیا بۆ هالیفاری وەزیری دەرەوەی بریتانیا.ل: ٤٩٥<br>پێشکەشکردنی وێنەی ڕاپۆرتێکی پاشکۆی سەربازی دەربارەی دامرکاندنەوەی یاخیبوونی تونجەلیی کوردەکان. |
| ١١٩/ ا ﻫ | ١٩٣٨/٩/٥ | ڕاپۆرتی نەقیب کۆلۆنێل ڕۆسی پاشکۆی سەربازیی ئینگلتەرە لە تورکیا بۆ مستەر مۆرگنی کارهەڵسوورێنی ئینگلیز. ل: ٤٩٥<br>گەشتێکی ئەلعەزیز. شیکردنەوەیەکی جەنەراڵ عەبدوڵڵا ئالپدۆغان. نیشتەجێ بوونی کۆچبەرانی ڕۆژهەڵات لە دیجلە و فورات. یەك بنەچەیی خەڵکی تونجەلیو تورك. تەواو سەرکوتنەکرانی یاخیبوونی لە ساڵی ١٩٣٧دا. بەردەوامیی بزووتنەوەی هێورکردنەوە لە ساڵی ١٩٣٨دا. سەرکەوتنی جموجووڵی تورکەکان. دەستبەسەراگرتنی (١٢٠٠٠)پارچە چەك. چەند ئیجرائێکی لێپرسراوانی تورك بۆ پێشخستنی تونجەلیو، دروستکردنی ڕێگەیەکی (٤٢٠)کمیو بۆ پرد بەدرێژایی ٦٨٤م. پەرەسەندنی تۆڕی تەلەفۆن. ڕوونکردنەوەیەکی مارشاڵ (چاکماك) لەمەڕ دروستکردنی بەنداوێك لە سەر مورادسۆ. کردنی تونجەلی بە سویزلاندی دووەم. |

سەرکوتکردنی بەکردەوەی یاخیبوون. خۆ بەدەستەوەدانی (٥٠٠-٦٠٠) یاخیی ماوە. زیانی سەربازانو کوژراوێکی زۆری جەندرمە. بەشداریی سەبیحە گۆکچەن لە ئۆپەراسیۆنەکاندا. دەستگیرنەکرانی سەیید ڕەزا. چاکسازییەکانی ناوچەی دەرسیم. کۆتایی هێنانی دەرەبەگایەتی.

| | | |
|---|---|---|
| ١١٧ | ١٩٣٧/٧/١٦ | نووسراوی ژمارە ٣٤٢ی پی. لۆرەینی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر ئێدنی وەزیری دەرەوە. ل: ٤٩٢<br>دەرسیم. گفتوگۆ لەگەڵ پشکنیارێکی گەڕاوەی هەرێمەکە. بەردەوامیی پێکدادانەکان. دەسەڵاتی زیاتری جەنەڕاڵ ئاڵپدۆغان بۆ تەواو سەرکوتکردنی یاخیبوون. سووچی جەندرمەکان. جێگیرکردنی زیاتری سەرباز لە ناوچەکەداو کەمکردنەوەی جەندرمە لە داهاتوودا. بەرەو پێشچوونی ناوچەی دەرسیم. زیانی زیاتری پێکدادانەکانی تورك لە چاو یاخییاندا. |
| ١١٨ | ١٩٣٧/١١/٢٠ | نووسراوی ژمارە ٨٤٤ی پی. لۆرەینی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەنکەرە بۆ مستەر ئێدنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل:٤٩٤<br>یاخیبوونی دەرسیم. دادگایی یاخییان. حوکمی لە سێدارەدانی (١١) کەسو خێرا جێبەجێکردنی حوکمی سەیید ڕەزاو شەشی تریان. گۆڕینی سزای لە سێدارەدانی (٤)کەس |

| | | |
|---|---|---|
| | | یاخیبووندا، بەلام گرژبوونی پەیوەندیی تورکیا- فەرەنسی. ڕێوشوێنی سەربازی دژی یاخیبوون. |
| ١١٤ | ١٩٣٧/٦/١٦ | برووسکەی ژمارە ٢١ی مستەر مۆرگنی کار هەڵسوڕێنی ئینگلیز لە ئەنکەرە بۆ مستەر ئێدنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٤٨٨ یاخیبوونی دەرسیم. یاخبوونی لە وتاری ئەنجومەنی سەرۆك وەزیردا. بەکارهێنانی سەرباز دژی سەرتیرەکانی بەرهەڵستی چاکسازیەکانو، بەردەوامیی ئەم چاکسازیانە. کوژرانی ١٣و بریندابوونی ١٨ سەربازی تورك. |
| ١١٥ | ١٩٣٧/٦/١٧ | نووسراوی ژمارە ٣٦١ی مۆرگنی کارهەڵسوڕێنی ئینگلتەرە لە ئەنکەرە بۆ مستەر ئێدنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل:٤٨٩ یاخیبوونی دەرسیم. چەند برووسکەیەکی بلاوکراوەی چاپەمەنیەکانی تورك. بەپێی برووسکەکانی هەواڵدەرێك لە دەڤەری یاخییەوە: ئاڵۆزییەکان دەرەنجامی هاندانی سیخوڕانی باشوورن. ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی بەرپابوونی یاخیبوونەکە. |
| ١١٦ | ١٩٣٧/٧/٣ | نووسراوی ژمارە ٤٠٥ی سیرپێ. لۆرەینی نوێنەری بالای بریتانیا لەئەستەمبووڵ بۆ مستەر ئێدنی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل:٤٩٠ یاخیبوونی دەرسیم. برووسکەی تەرابزوون. |

| | | |
|---|---|---|
| | | نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەنکەرە بۆ مستەر ئێدنی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ٤٨٤ |
| | | یاخیبوونی دەرسیم. چەند هەواڵێکی کونسوڵخانەکانی مەرسین و تەرابزوون. ستەمی زۆرو زیانی ١٥٠٠ یاخی لە سەربازانی تورك. سووتاندنی سێ گوندو لە دەست دانی فرۆکەیەکی تورك. |
| ١١٣ | ١٩٣٧/٥/٢٣ | نووسراوی ژمارە ٣١١ی پی. لۆرەینی نوێنەری باڵای ئینگلتەرە لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر ئێدنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل:٤٨٥ |
| | | یاخیبوونیدەرسیم. ڕاپۆرتی پاشکۆی سەربازیی باس نەکردنی یاخیبوون لە چاپەمەنیەکانی تورکدا. بڵاوبوونەوەی تاکە گوتارێك لە ڕۆژنامەی(Son Telegraf) داو داخرانی ئەم ڕۆژنامەیە بەم هۆیەوە. |
| ١١٣/١٥ | مایسی ١٩٣٧ | ڕاپۆرتی ڕائید ڕۆسی پاشکۆی سەربازیی ئینگلیز لە ئەنکەرە لە بارەی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵاتەوە. ل:٤٨٦ |
| | | دووگرفتی هەنووکەیی ئەرکانی گشتیی تورك: |
| | | یەکەم ، جێگیرکردنی سەرباز لە سنووری باشوور بۆ ڕێگرتن لە و چەتانەی کەلە خاکی سووریاوە دێن. |
| | | دووەم، دامرکاندنەوەی یاخیبوونی دەرسیم. نەبوونی دەستی فەرەنسە لە |

| | | |
|---|---|---|
| | | بریتانیا. ل: ٤٨٠<br>کوردەکانی دەرسیم. دامەزراندنی ویلایەتی تونجەلی قسەکانی شوکری قایا. پیادەکردنی ڕێو شوێنی تازە لەو ناوچەیەدا. زانیاری دەربارەی دواکەوتوویی‌و تایبەتمەندی‌و..هتدی خەڵکی هەرێمەکە. |
| ١١٠ | ١٩٣٦/٣/٤ | نووسراوی ژمارە ١١٩ی سێر پی. لۆرەینی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەنکەرە بۆ مستەر ئێدنی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ٤٨٢<br>دامەزراندنی چوارەم پشکنیاریی گشتی لە ئەلعەزیزی ناوەندی ویلایەتی نوێی تونجەلی. دیاریکردنی جەنەڕاڵ عەبدوڵڵای ئالپدۆغان بەسەرۆکی ئەم پشکنیارییە. |
| ١١١ | ١٩٣٧/٥/١٧ | نووسراوی ژمارە ٢٩٣ی سێرپی. لۆرەینی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە ئەنکەرە بۆ مستەر ئێدنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل:٤٨٢<br>یاخیبوونی دەرسیم. برووسکەی تەرابزوون. کوژرانی پەنجا سەرباز بەدەستی یاخییان. کۆکردنەوەی سەرباز لە ئەرزنجان. ڕووبەڕووبوونەوی کورد لەگەڵ ئیجرائاتی کارگێڕیی ویلایەتە نوێیەکەی تونجەلی. کەمیی هێزی بەرفرمانی ئالپدۆغانی پشکنیاری گشتی. هەواڵی ناردنی هێزی تازەو فڕۆکەی جەنگی بۆ هەرێمی یاخی. |
| ١١٢ | ١٩٣٧/٥/٢٢ | نووسراوی ژمارە ٣٠٩ی سێر پی. لۆرەینی |

وڵات. خواستی یەکلاییکردنەوەی ئاگری داغ وەك خاکی تورکیا بۆ دەرکردنی چەتەکان.

١٠٧ — ١٩٣٢/١/١٨

نووسراوی ژمارە ٣٠ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆجەی.سیمۆنی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە ل: ٤٧٨

پەیوەندییەکانی تورکیا- عیراق‌و کێشەی کورد. تاوتوێکردنی کێشەی کوردان‌و چەتەگەری لە کاتی ئیمزاکردنی کۆتایی یاداشتی پەیماننامەکانی (١٩٣٢/١/٩)ی نێوان تورکیاو عیراقدا. ڕێگریی بەرپرسانی تورك لەو بارزانیانەی کەوا سنوور دەبەزێنن‌و، پەسەندکردنی دانەوەیان بەعیراق. داهاتی سووتەمەنی.

١٠٨ — ١٩٣٤/١٠/٢٤

نووسراوی ژمارە ٥٠٣ی مستەر مۆرگنی کارهەڵسوڕێنی ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ جەی. سیمۆنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل:٤٧٩

کوردەکانی دەرسیم. ڕاپۆرتی کونسوڵی تەرابزوون ڕزگاربوونی کوردانی دەرسیم لە گوشارەکانی ڕژێمی کۆماری بەهۆی بەشداربوونیان لە یاخبوونەکانی شێخ سەعیدو ئاگریدا.

١٠٩ — ١٩٣٦/١/٣

نووسراوی ژمارە ٦ی سیر پی. لۆرەینی نوێنەری باڵای ئینگلتەرە لە ئەنکەرە بۆ مستەر ئیدنی وەزیری دەرەوەی

کارهەڵسووڕێنی ئینگلتەرە لە ئەنکەرە بۆجەی. سیمۆنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا.
ل: ٤٧٣

پەیوەندییەکانی تورك و عێراق و کێشەی کورد. گەشتەکەی نوری پاشای سەرۆك وەزیری عێراقی بۆ تورکیا. داوای وەزیری دەرەوەی تورکیا لە نوری پاشا بۆ یەکخستنی هێزەکانی تورکیاو عێراق و ئێران دژ بە یاخیبوونەکانی کورد. بەڵێنی نوری پاشا تەنها بەچاودێریکردنی سنووری عێراق- تورکیا.

| ١٠٥ | ١٩٣١/١٢/٣٠ | نووسراوی ژمارە ٤٤٧ی مستەر مۆرگنی کارهەڵسووڕێنی بریتانیا لە ئەنکەرە بۆجەی. سیمۆنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل: ٤٧٦ |
|---|---|---|

پەیوەندیی تورکیا- عێراق وکێشەی کورد. کۆنترۆڵی کوردە بارزانیەکان و پاراستنی سنووری عێراق- تورکیا بەبەڵێنی نووری پاشای سەرۆك وەزیر.

| ١٠٦ | ١٩٣٢/١/٦ | نووسراوی ژمارە ١١ی جەی سیمۆنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز بۆ سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە تورکیا. ل: ٤٧٧ |
|---|---|---|

سەردانی وەزیری دەرەوەی تورکیا بۆ ئێران. سازدانی چەند دیدارێك سەبارەت بەچاککردنی ئایندەی سنووری هەردوو

| | | |
|---|---|---|
| | | لە سنووری ئێرانەوە بۆ ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ. |
| ١٠٢/ھ | ١٩٣١/٩/٢٢ | نووسراوی ژمارە ١٠٥ی ماتیۆسی کونسوڵی ئینگلیز لە تەرابزوون بۆجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ. ل:٤٧٠<br>ناردنی چەند خێزانێکی کوردی ناوچەی ئاگری لە تەرابزوونەوە بۆ ئەستەمبوڵو، نیشتە جێکردنیان لە ئەنادۆڵی ڕۆژئاوا. تەرخانکردنی ٨٥ هەزار لیرەی تورکی بۆ جێگیرکردنیان. |
| ١٠٣ | ١٩٣١/١١/١١ | نووسراوی ژمارە ٣٨١ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆجەی سیمۆنی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل:٤٧٢<br>ڕاپۆرتی کونسوڵی تەرابزوون لە بارەی ئەو کوردانەوە کەلە ناوچەی ئاگرییەوە بۆ ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ ڕاگوێزراون. |
| ١٠٣/ھ | ١٩٣١/١٠/٢٩ | ڕاپۆرتی ژمارە ١٢٤ی (فالانگا)ی جێگری کونسوڵی ئینگلیز لە تەرابزوون بۆ سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ. ل: ٤٧٢<br>ڕاگوێزانی کاروانێکی تری کورد لە ناوچەی ئاگرییەوە بۆ خۆرئاوای ئەنادۆڵ بەڕێگەی تەرابزووندا. هێنانی ئاژەڵو ماڵاتەکانی ئەم کوردانەی خێڵی خالکانی لە دواوە. ئیحتیمالی نیشتەجێکردنیان لە بوورسە. |
| ١٠٤ | ١٩٣١/١٢/٣٠ | نووسراوی ژمارە ٤٤٥ی مستەر مۆرگنی |

| | | |
|---|---|---|
| | | ل: ٤٣١<br>بارودۆخی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات. ڕاپۆرتێکی تایبەت بەگەشتەکەی هەردوو سکرتێری یەکەم‌و سێیەم بۆ ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ. سەقامگیرکردنی یاساو نیزام لە و دەڤەرەدا. خستنەگەڕی هێزو تواناییەکان بۆ بەرزکردنەوەی ئاستی ئابووری. |
| ١٠١/ها | تەمموزی ١٩٣١ | ڕاپۆرتێك دەربارەی گەشتی مستەر ڕۆبێرتسی سکرتێری یەکەم‌و مستەر ڕاڤێنسدەیلی سکرتێری سێیەمی نوێنەریی باڵای ئینگلتەرە لە ئەنکەرە بۆ ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ. ل: ٤٣٢<br>ڕاپۆرتێکی هەمەلایەنی لە سەر گەشتە نەخشە بۆ کێشراوەکەی (فەوزی پاشا، مەلاتیە، ئەلعەزیز، دیار بەکر، بدلیسی، ئەرجیش، وان، قەرەکۆسە، ڤارس، ئەرزڕۆم، تەرابزوون.) کێشەکانی کوردو ئەرمەن. دەرەنجامی گشتی. |
| ١٠٢ | ١٩٣١/٧/٧ | نووسراوی ژمارە ٣٢٨ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ مارکویس ئۆف ڕیدینگی جێگری وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل: ٤٦٩<br>ڕاپۆرتی کونسوڵی تەرابزوون. ناردنی هەندێ لە خێزانە کوردەکانی خێڵی جەلالی، کە بەتورکی دەدوێن‌و، ٣٠٠-٤٠٠ ساڵ پێشتر لە قۆنیاوە بەرەو ڕۆژهەڵات کۆچییان کردووە، |

| | | |
|---|---|---|
| ٩٩ | ١٩٣١/٣/٢٨ | نووسراوی ژمارە ١٠٢ی مستەر مۆرگنی کارهەڵسووڕێنی ئینگلیز لە ئەنکەرە بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ٤٢٧ |
| ٩٩/ھ | ١٩٣١/٣/٢٤ | نووسراوی ژمارە ٢ی ڕائید ئۆلێریی پاشکۆی سەربازیی بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ مۆرگنی کارهەڵسووڕێنی بریتانیا لە ئەنکەرە. ل: ٤٢٨<br>بارودۆخی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ. ئاڵۆزیی هەلومەرجەکەو ئیحتیمالی سەرهەڵدانەوەی یاخیبوون. نەبوونی ئیحتیمالی سەرکەوتن. بەردەوامی کوردەکان. نەبوونی نەتەوە پەروەری تاجەنگی سەربەخۆیی بکات.بەرەنگاریی حکوومەتی تورکیا. |
| ١٠٠ | ١٩٣١/٦/١٧ | نووسراوی ژمارە ٢٠٤ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای ئینگلتەرە لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا ل: ٤٣٠<br>گفتوگۆ لەگەڵ نوێنەری باڵای ئێراندا. بەڕێوەچوونی کارەکانی دیاریکردنەوەی سنووری تورکیا- ئێران بەسەرکەوتوویی. پێشبینی نەکردنی یاخیبوونەوەی کورد لەم ساڵەدا. |
| ١٠١ | ١٩٣١/٦/٢٨ | نووسراوی ژمارە ٢٤٨ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. |

| | | |
|---|---|---|
| | | ئێرانەوە. سەرهەڵدانەوەی یاخیبوون لە ساڵی دواتردا. سنوورەکانی تورکیا- ئێران‌و تورکیا- عێراق. |
| ٩٦ | ١٩٣١/٣/١٢ | نووسراوی ژمارە ٨٣ی مستەر مۆرگنی کارهەڵسووڕێنی ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٤٢٤<br>حکومدانی سەلاحەدینی کوڕی شێخ سەعید بە ١٥ ساڵ‌و دوو تاوانباری تر یەکیان بە ١٠ ساڵ‌و ئەویتریان مانگێك زیندانی. ئیحتیمالی نەبوونی بەڵگەی تەواو بۆ تاوانبارکردنی گیراوەکان، بەهۆی سووکیی سزاکانیانەوە. |
| ٩٧ | ١٩٣١/٣/١٧ | برووسکەی ژمارە ٤٥ی مستەر پاڕی کارهەڵسوڕێنی ئینگلیز لە تاران بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٤٢٥<br>برووسکەی تەورێز. هێرشی کوردەکان بۆ سەر ماکۆ. ناردنی سەرباز لە تەورێزەوە بۆ ماکۆ. |
| ٩٨ | ١٩٣١/٣/١٧ | برووسکەی ژمارە ٤٦ی مستەر پاڕی کارهەڵسووڕێنی ئینگلتەرە لە تاران بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٤٢٦<br>برووسکەی تەورێز. ناردنی سەربازی ئێران بۆ ماکۆ. بەزاندنی سنووری ئێران لەلایەن سەربازانی تورکەوە. بڕیاری سوپای تورك بۆ داخستنی سنوور بەرووی کورددا. |

| | | |
|---|---|---|
| | | یاخییانی کوردو ، مانەوەی تائێستای ئیحسان نووریی سەرکردەی یاخیبوون لە تاران. نەدانەوەی ئەو سەرکردەیە بەتورکیا. |
| ٩٥ | ١٩٣٠/١٢/٢٩ | نووسراوی ژمارە ٤٨٩ی سێرجی کلارکی نوێنەری باڵای ئینگلتەرە لە ئەستەمبووڵ بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٤٢٠ |
| | | ڕاپۆرتی پاشکۆی سەربازیی لە سەر کێشەی کورد. |
| ٩٥/١ھ | ١٩٣٠/١٢/٢٢ | نووسراوی ژمارە ١٣ای ڕائید ئۆلێریی پاشکۆی سەربازیی ئینگلیز لە ئەنکەرە بۆ سێرجی کلارکی نوێنەری باڵا لە ئەستەمبووڵ. ل: ٤٢٠ |
| | | ڕاپۆرتێکی تایبەت بەچاوپێکەوتنی لەگەڵ نەقیب کۆلۆنێل نووریی ئەرکانی گشتیی تورك سەبارەت بەکێشەی کورد. |
| ٩٥/٢ھ | ١٩٣٠/١٢/٢٢ | گفتوگۆی ڕائید ئۆلێریی پاشکۆی سەربازیی ئینگلیز لە ئەنکەرەو نووریبەگی ئەرکانی گشتی لە سەر کێشەی کورد. ل: ٤٢١ |
| | | زانیارییەکانی بەڕێز نوری دەربارەی ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ کەچەند ساڵێك تێیدا ژیابوو. دابەش بوونی کورد بەسەر سەدان خێڵدا. خۆبەکورد لە قەڵەمدانی چەندین تورك بەهۆی بەخشینی کوردانەوە لە خزمەتی سەربازی لە سەردەمی عوسمانییەکاندا. هاتنی یاخییانی ئاگری لە |

| | | بەبەرپرسانی تورك کەرێگە نادرێ عیراق وەك بنکەیەك، دژی تورکیا بەکاربێ. ویستی عیسمەت پاشا بۆ کۆنترۆڵ کردنی شێخی بارزان. بایەخی دیدارو چاوپێکەوتنەکان. |
|---|---|---|
| ٩٣ | ١٩٣٠/١١/٢٣ | نووسراوی ژمارە ٤٤٥ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لەئەستەمبووڵ بۆ ئێی.هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز. ل:٤١٧ نووسراوی کونسوڵی تەرابزوون دەربارەی جموجووڵی سەربازیی تورك دژی کورد. |
| ٩٣/ھ | ١٩٣٠/١١/١٥ | نووسراوی ژمارە ١٢٤ی ماتیوسی کونسوڵی بەریتانی لە تەرابزوون بۆ سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵا. ل: ٤١٧ دوایی هاتنی شەڕو شۆڕی ناوچەی ئاگری. ڕووبەڕووبوونەوە لەگەڵ کوردانی ناوچەی دەرسیمدا. |
| ٩٤ | ١٩٣٠/١٢/٣ | نووسراوی ژمارە ٤٥٣ی ئەنکەرەی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە تورکیا بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٤١٨ سنووری تورکیا- ئێران . کێشەی کورد. داوای تورکیا لە ئێران بۆ گۆڕینەوەی پارچە زەوییەکەی ویلایەتی وان بەیەکێکی ناوچەی ئاگری. ئومێدی بەشداریی کارهەڵسووڕێنی ئێران لە ڕێکەوتنەکەدا. ئیحتیمالی سەرهەڵدانەوەی جووڵانەوەی کورد لە بەهاری دواتردا. نەگیرانی هەندێ لە |

| | | |
|---|---|---|
| | | ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٤١٠<br>راپۆرتی پاشکۆی سەربازیی دەربارەی بارودۆخی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ. |
| ٩١/ه | ١٩٣٠/١٠/٢٣ | نووسراوی ژمارە ١١ی رائید ئۆلیێریی پاشکۆی سەربازیی ئینگلیز لە ئەنکەرە بۆ جی. کلارکی نوێنەری باڵا. ل: ٤١٠<br>بارودۆخی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ. پێکدادان لە چەند جێیەكو بەتایبەتی (باشقەلعە) پاش دامرکانەوەی یاخیبوون. نەبوونی هێزێکی یەکگرتووی کوردانی ئێرانو تورکیاو عیراق. راپۆرتێکی رێکخراوی خۆیبوون بۆ تاوانبارکردنی تورکیا. بڵاوبوونەوەی ئەم راپۆرتە تا ئەمریکا. |
| ٩٢ | ١٩٣٠/١١/٢٠ | راپۆرتی ئێف. هەمفریزی کۆمیساری باڵای ئینگلیز لە بەغدا بۆ لۆرد پاسفیڵدی وەزیری کاروباری دەولە تانی کۆلۆنیالکراو. ل: ٤١٢<br>سەردانی کۆمیساری باڵا، لە گەڕانەوەیدا بۆ لەندەن، بۆ ئەنکەرەو پێشوازیکردنی لەلایەن غازییەوە. وتەکانی غازی. چاوپێکەوتنی لەگەڵ عیسمەت پاشای سەرۆك وەزیرو شوکری قایای جێگری وەزیری دەرەوەدا. گفتوگۆ لە سەر پەیوەندیەکانی تورکیا — ئێرانو کێشەی کورد. هەرگیز هاننەدانی بیرۆکەی سەربەخۆیی کورد لەلایەن ئینگلتەرەوە. بەڵێنی کۆمیساری باڵا |

بەرەو رووسیا، هاوکاریی رووسەکان بۆ تورکیا. ئیحتیمالی چەك هەلگرتنی سەرتاسەری کوردستان لە بەهاری دواتردا.

پەڕینەوەی ژمارەیەك کورد بۆ ناو خاکی ئێران و هەلاتنی سەربازانی ئێرانی. زەرەرو زیانێکی زۆر لە هێزەکانی ئێران و کورد. سوپاسگوزاریی سەرزاریی تورکیا بۆ هاوکاریی ئێران. دانە دواوەی بیرۆکەی دیاریکردنەوی سنوور لەلایەن هەندێك لە ئێرانیانەوەو، لێکدانەوەی بەپروپاگەندەیەکی بەرفراوانی پان تورکی و داگیرکردنی دواتر. ڕەتکردنەوی هێرشی تورك بۆ ناوخاکی ئێران لەلایەن وەزیری دەوەرەی ئێرانەوە. دانانی پێشتێنەیەکی بەهێز لە سەقزو سابلاخ.

| | | |
|---|---|---|
| ٩٠ | ١٩٣٠/١٠/٨ | نووسراوی ژمارە ٣٨٧ی سێرجی. کلارکی نوێنەری بالای بریتانیا لە ئەستەمبوول بۆ ئێی.هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز.ل:٤٠٧ |

پەیوەندیەکانی تورکیا- ئێران و گرفتی کورد. دیدارو چاوپێکەوتنەکانی سێر ئێف. هەمفریزی کۆمیساری بالای ئینگلتەرە لە بەغدا لەگەڵ سەرکۆمارو سەرۆك وەزیرو جێگری وەزیری دەرەوەی ئەنکەرەو قسەکردن لە سەر کێشەی کورد. خواستی کۆنترۆڵکردنی بارزانیەکان.

| | | |
|---|---|---|
| ٩١ | ١٩٣٠/١٠/٢٥ | نووسراوی ژمارە ٤١٣ی سێرجی. کلارکی نوێنەری بالای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ |

| | | |
|---|---|---|
| ٨٨/٣٥ | ١٩٣٠/٩/١٦ | ڕاپۆرتی کارهەڵسوڕینی بریتانیا لە ئەستەمبووڵ لە سەر جموجووڵی سەربازیی ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵاتو یاخیبوونی ساڵی ١٩٣٠ی کورد. ل:٤٠١<br>سازدانی یاخیبوونی ئاگری. پێشەواو تیرە بەشدارەکان. هەوڵی ئەرکانی گشتیی تورك بۆ دامرکاندنەوەی یاخیبوون. پلانی جموجووله کانی ساڵح پاشا. یەکەم بزاوتنی سەربازی. تەشەنەکردنی یاخیبوون. هێزی بەرەنگاریی سەربازانی تورك. هاوکاریی بارزانیەکان بۆ یاخییان. زانیاری لە مەڕ دامرکانەوەی یاخیبوون. |
| ٨٩ | ١٩٣٠/٩/٢٣ | نووسراوی ژمارە ٤٦١ی سێر ئاڕ. کلایڤی نوێنەری باڵای ئینگلتەرە لە تاران بۆ مستەر ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٤٠٣<br>پێشکەشکردنی نامەی متمانەی خوسرەو بەگی باڵوێزی نوێی تورکیا لە تاران. باسی دیاریکردنەوەی سنووری تورکیا- ئێران لە دیدارێکی ڕۆژنامەی (ئێران)دا. دوا ڕاپۆرتی کونسوڵی تەورێز لە سەر کێشەی کورد. |
| ٨٩/١٥ | -٨/١٧<br>١٩٣٠/٩/٦ | هەڵبژاردەی ((ڕۆژانەی سیاسیو هەوڵی سەربازیی تەورێز))ی ڕۆژانی ١٩٣٠/٩/٦-٨/١٧ لە مەڕ بارودۆخی کورد. ل: ٤٠٤<br>پرچەکیی کوردو خستنە خوارەوەی (٥) فرۆکەی تورك. ڕاونانی سەربازانی تورك |

هەواڵە.

| | | |
|---|---|---|
| ٨٨ | ١٩٣٠/٩/١٨ | ڕاپۆرتی ژمارە ٣٦٤ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ٣٩٨<br>یاخیبوونی ئاگری. سەرکوتکردنی یاخیبوون. ڕاپۆرتەکانی تایبەت بەم مەسەلەیەی پاشکۆی سەربازیی. ئیحتیمالی سەرهەڵدانەوەی نوێی ناسیۆنالیزمی کوردی. سەختیی بەئاکام گەیشتنی بەرنامەی بەتورککردن. |
| ٨٨/١ھ | ١٩٣٠/٩/١٦ | ڕاپۆرتی ژمارە٨ی ڕائید ئۆلێریی پاشکۆی سەربازیی ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ . ل: ٤٠٠<br>یاخیبوونی ئاگری. گەیاندنی یاخییان بەحاڵەتی بەرگری لەلایەن هێزە تورکییەکانی بەر فرمانی ساڵح پاشاوە. پیرۆزبایی مارشاڵ فەوزی پاشا لە ساڵح پاشاو ڕۆیشتنی بۆ پشکنینی ناوچەکە. |
| ٨٨/٢ھ | ١٩٣٠/٩/١٧ | نووسراوی ژمارە ٩ی ڕائید ئۆلێریی پاشکۆی سەربازیی ئینگلیز لە ئەستەمبووڵ بۆ سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵا. ل: ٤٠١<br>یاخیبوونی ئاگری. ڕاپۆرتی تایبەت بەجموجووڵی هێزە سەربازییەکان بۆ سەرکوتکردنی یاخیبوون. |

| | | |
|---|---|---|
| | | ڕێکخراوە کوردییەکان. (کورد تەعالی)و (خۆییبوون)و (خەلاسکەران). هەڵوێستی کوردانی سووریاو یاخیبوونی ئاگری. هەوڵی خەلاسکەران بۆ بەدەستهێنانی هاوکاریی ئینگلیز. |
| ٨٦ | ١٩٣٠/٩/٣ | نووسراوی ژمارە ٤٣١ی ئاپ. کلایڤی نوێنەری باڵای ئینگلیز لە تاران بۆ مستەر ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٣٩٤ |
| | | یاخیبوونی ئاگریو پەیوەندییەکانی تورکیا- ئێران چەند زانیارییەکی مەمدووح شەوکەتی نوێنەری کێشراوەی تورکیا لە تاران. خراپ نەبوونی پەیوەندییەکانی ئێرانو تورك. ڕووسەکانو ((راونەکردنی ماسی لە ئاوی لێڵدا)). بەرپرسیی عیسمەت پاشا لە ڕەفتاری توندی تورکیادا. رەخنەکانی تەیموور تا چ لە سیاسەتەکانی عیراقو تورکیا. بەرامبەر بەکورد. مەسەلەی دیاریکردنەوی سنووری ئێران- تورکیا. |
| ٨٧ | ١٩٣٠/٩/١٧ | برووسکەی ژمارە ٩٠ی سێرجی. کلارکی نوێنەری باڵای بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ مستەر ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە. ل: ٣٩٨ |
| | | یاخیبوونی ئاگری. ڕاگەیاندنی تەواو سەرکوتکردنی یاخیبوون لەلایەن ڕۆژنامەکانەوە. پشت ڕاست نەکرانەوەی ئەم |

| | | |
|---|---|---|
| | | یاریدەدەر بۆ ماکۆ. |
| ٨٣/٣٥ | ١٩٣٠/٨/١٩ | ڕاپۆرتی ژمارە ١٥١ی پالمەری کونسوڵی ئینگلیز لە تەوریز بۆ ئارپ. کلایڤی نوێنەری باڵای بریتانیا لە تاران. ل: ٢٨٧<br>یاخیبوونی ئاگری. زانیاریی جوگرافیی تایبەت بە هەرێمی یاخی. ئامانجەکانی جموجووڵی سەربازانی تورک. سنووری ڕووسیاو بارودۆخی سنووری ئێران. |
| ٨٤ | ١٩٣٠/٨/٢٧ | ڕاپۆرتی ژمارە ٣٣٥ی مستەرهێلمی کارهەڵسووڕێنی بریتانیا لە ئەستەمبووڵ بۆ ئێی.هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلیز.ل: ٣٩٠<br>قسەکانی خوسرەو بەگی نوێنەری باڵای نوێی تورکیا لە تاران. پەیوەندیی دۆستانەی تورکیا- ئێران. بەدرۆخستنەوەی هەواڵی پەڕینەوەی سەربازانی تورک لە سنووری ئێران لەلایەن کارهەڵسووڕێنی ئێرانەوە. داوای حکوومەتی ئێران بۆ چاککردنی سنوور، ڕەزامەندیی ئێران لە یەکخستنی هێزەکانی لەگەڵ ئەوانەی تورکیادا. گەمارۆدانی سێ چوار هەزار کوردی ناوچەی ئاگری. ئیحتمالی شکانی ئەم گەمارۆیە لە زستاندا. |
| ٨٥ | ١٩٣٠/٨/٢٩ | نووسراوی ژمارە ٦٨ی میبەدی بریکاری کونسوڵی ئینگلیز لە حەلەب بۆ ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی ئینگلتەرە.<br>ل: ٣٩٢ |

| ژمارە | بەروار | ناوەڕۆک |
| --- | --- | --- |
| | | کوردستان. ل: ٣٧٧<br>یاخیبوونی ئاگری. سەرکەوتنی کردە سەربازییەکانی حوزەیران‌و تەمموزی تورك دژی یاخییانی. جوولانەوەی سەربازی‌و، برواو لێکدانەوەی بابەتەکە. پەیوەندییەکانی ئێران‌و تورکیا. دیاریکردنەوەی سنوور. دووریی ئیحتیمالی شەڕی تورکیا دژی ئێران. |
| ٨٣ | ١٩٣٠/٨/٢٦ | نووسراوی ژمارە ٤٢١ی سێر ئارپ. کلایڤی نوێنەری باڵای ئینگلتەرە لە تاران بۆ مستەر ئێی. هندرسنی وەزیری دەرەوەی بریتانیا. ل: ٣٨١<br>یاخیبوونی ئاگری. ڕاپۆرتی کۆنسوڵی تەورێز تایبەت بەم مەسەلەیە. |
| ٨٣/ھ | ١٩٣٠/٨/١١ | ڕاپۆرتی ژمارە ١٤٥ی پاڵمەری کونسوڵی ئینگلیز لە تەورێز بۆ ئارپ. کلایڤی نوێنەری باڵای بریتانیا لە تاران. ل: ٣٨٢<br>یاخیبوونی ئاگری. زانیاریی چەند سەرچاوەیەك لە سەر باری یاخییان. جموجووڵیی سەربازیی تورك. یارمەتیی نەقیب کۆلۆنێل لۆرەنس بۆ کوردەکان. ناردنی سەرباز لە تەورێزەوە بۆ ماکۆ. |
| ٨٣/٢ھ | ١٩٣٠/٨/١٢ | نووسراوی ژمارە ١٤٧ی پاڵمەری کونسوڵی بریتانیا لە تەورێز بۆ ئارپ. کلایڤی نوێنەری باڵای ئینگلتەرە لە تاران. ل: ٣٨٦<br>یاخیبوونی ئاگری. پێکدادانی کوردانی یاخی‌و هێزەکانی ئێران. ناردنی هێزی |

لە لای خۆیەوە دوو دڵ نەبوە، هەم نوێنەری خۆی ناوزەدو، هەم كاری بەراستی بەردەوامی دیاریكردنی سنوور، لە وناوچەیەدا ئاسان بكات. نوسرەت بەگ هەستێكی نالەبار (نێگاتیڤانە)ی بەرگریی، پێ بەپێی دڵنیایی لە جێبەجێكردنی هەرچی زووی دەستكارییەكەی، لا دروست بوو بوو، ئەگەر بەڕاستی ئارەزوویەك بۆ ئەم مەسەلە یە، كەمن لێی ئاگادارنیم، هەبێ، ئەوا تانوێنەری بولگاریا مانگی ئاییندە نەگەڕێتەوە بۆ ئەنكۆڕەو، دەست نەكاتەوەبە وتووێژە پچراوەكەی بۆ گەیشتن بەرێككەوتنی گشتی لەگەڵ توركیا، هیچ رێكخستنێك بۆ ئەو مەبەستە ئەنجام نادرێ ( تكایە بڕوانە برووسكەی ژمارە ٦٣٢ی ١٩ی مانگی رابردووم).

٩ـ بەهەمان شێوە، هێشتا نەمتوانیوە تورك ڕازی بكەم نوێنەریان دیاری بكەن بۆ لیژنەی (Graves) {ماددەی (١٣٠)ی پەیماننامەكە}و، كۆمیتەی ناوچەی چەكداماڵراوی تەنگەڵانەكان {مادەی پێنجی رێككەوتنی گەرووەكان} یان تەنانەت دەربڕینی رایەك سەبارەت بەبڕی مووچەی سەرۆكی بێ لایەن یان سكرتێری گشتیی دادگای بوارە هەمە جۆرەكان كەبەپێی ماددەی ٩٢ی رێككەوتنەكە دادەمەزرێ. لە راستیدا تاكە نوێنەر كەتائێستا وەكو سەرۆكی كۆمسیۆنی نێودەوڵەتیی تەنگەڵانەكان دیاری كرابێ، ئەدمیراڵ واسیف پاشایە.

١٠ـ لەلایەكیترەوە، نوێنەرێكی تازەی توركی پێشتر وەزیری كشتوكاڵی، زەكی بەگ ناویان بۆلە ندەن دەستنیشان كردووە، كەپێناچێ لە كاری نوێنەرییەكەیدا پاشەكەوتێكی وەهای هەبێ، ببێتە جێنشینی یووسف كەمال بەگ، كەبەهۆی ئیلتیزاماتی ئەم دواییەوە، نوێنەریی لە وەزیریو باڵوێزیی دەرەوە پێ باشتر بوو. ناتوانم بڵێم بەهەڵبژاردەیەكی گونجاوی دەبینم. بەراستی دڵنیانیم لە وەی كەبۆچی هەڵبژێردراوە: ئایا لە بەرئەوە بووە كە حكوومەت وای بەباشتر زانیوە لە دەرەوە بێ، یان كاندیدی تری شیاو نەبووە، یاخود پێی وابووە بەهۆی پەیوەندییەوە بەنوێنەرانی لیژنەی بازرگانیی لۆزانەوە، بۆ مەبەستێكی تایبەتی وەكو گەشەپێدانی پەیوەندیە ئابووریەكان لەگەڵ بریتانیای مەزندا، گونجاوە. هۆكارەكە هەرچییەك بێ،

بڕوا ناکەم ئەم ئیلتیزامەی ئۆفیسی لە ندەن درێژە بکێشێ. ئەو بەتەواوی وەزارەتی کشتوکاڵی بۆ ئەم پۆستە بەجێ هشتووەو، شوکری قایا بەگی نوێنەری سمیرناجێی گرتۆتەوە.

١١ـ شایانی باسە بڵاوکراوەکان، سەبارەت بەمەی دوایی، بڵاویان کردەوە کە حکوومەت بەنیازە پۆستی کابینەکەی بداتە ڕەحمی بەگ، یان داویەتی. ئەم نوێنەرەی سمیرنایش، وەکو یەکێك لە ئەندامانی دیاری کۆمیتەی دێرینی ئیتحادو تەرەقیو، یەکێك لەو ڕێبەرانەی کەپێیان دەوترێ بەرهەڵستکار (ئۆپۆزسیۆن)و، چونکە هاوڕێی ڕەئووف بەگ بووە، دەناسرێ. لانی کەم وەرگرتنەوەی لە حکوومەتدا گرنگەو، دەبێ هیچ نەبێ گفتوگۆی لە سەر کرابێ. بۆ ئەمەیش، دوو شیکردنەوە ڕێیان تێدەچێ: یەکەم، هەوڵێکی حکوومەتە بۆ ئاشتبوونەوەی لەگەڵ ئۆپۆزسیۆنداو باشتر بێهێزکردنی؛ یان دووەم: خودی مستەفا کەمال ناوی ڕەحمی بەگی پێشخستووە. زۆر کەس هەن پێیان وایە سەرۆك کۆمار، کەجێگەکەی لەو بڕوایەدام زەفەری پێنابرێ، هیچ کێشەیەکی لە مامەڵە کردنی ئۆپۆزسیۆندا نییە. پێویستە بەرهەڵستکاران، لەماوەی کاری داهاتوودا، بەتەواوی بەهێزبنو، بەسەرحکوومەتی ئێستادا سەربکەون. ڕەئووف بەگ کە ئێستا بەهێمنیو بەبێ خۆدەرخستن لە قوستەنتەنییە دەژی، دەشێ مستەفا کەمال لەم بارەیشدا داوای لێبکات حکوومەت پێکبهێنێ.

١٢ـ سەبارەت بەکێشەی زیاتر، سێ هەفتە لەمەوبەر ، چەند ڕووداوێك بوونە مایەی زیادبوونی بایەخی بەرچاوی کاروباری ناوخۆ، کەسەرنج ڕاکێشترینیان چارەنووسی ڕەشید بەگی والیی قوستەنتەنییە بوو. دە ڕۆژ پێش ئێستا لە کاتێکدا شێوی دەکرد، بەخەیاڵیدا هات فەرمان بدات: سەعات دووی پاش نیوەشەو بەشێوەیەکی سەیر سەرجەم هێزە چەکدارەکانی کۆمار لە شاردا کۆبنەوە. هەموو جموجوولە بازرگانیەکان بەو هۆیەوە وەستێنرانو، تێکڕای جەندرمەو پۆلیسو تیمی ئاگر کوژانەوەو، بەلانی کەمەوە بەشێکیش لە پاسەوانی سەربازی، بەچەکەوە

هێنرانە سەرشەقامەکانو، چاوەڕێی سەرهەڵدانێکی کۆمۆنستییان دەکرد. هەرچەندە کەس ئازار نەدرا، بەڵام بوونە جێگەی بێزاریی دانیشتوانی ئارامی مەدەنی. لە ئەنجامی گازندەی چاپەمەنیەکانەوە، لێکۆڵینەوەیەکی رەسمی کراو، ئەوەی پشت ڕاست کردەوە کەهەرچەندە ئەو جۆشو خرۆشەی ڕەشید بەگ بە ڕاستی لە بناغەوە بێ پاساو نەبوە، بەتایبەتی سەبارەت بەمەترسیی پێشتر باسکراوی کۆمۆنیستەکان کە هەندێ دەنگی لەبارەوە هەبوو، دوایش چەك دۆزرایەوەو، کۆمیتەی نهێنیی کۆمۆنیستەکانیش گیرا، بەڵام تەنها بەهۆی کاری ماددەی بێهۆشکەرەوە بووە. سەرەنجام بەخێرایی لەلایەن وەزیری ناوخۆوە لە کار لابرا.

١٣ـ ئەفسەرە هاورێکەی کە، وەکو هەر ڕیفۆرمخوازێك، کەسێکی ویستراو نییە، پلانی داڕشتووە بەڵگەیەکی نوێ بۆ زەبر لێدانی بداتە بڵاوکراوەکان. سەبارەت بەپێویستیی بیناکردنەوەی ناوچە سوتماکەکانی شاریش، بەئاشکراو جددی ئامازەی بەڕووخاندی دیواری وەك ناوی نابوو (Justaninan)[1] و بەکارهێنانی بەردەکانی بۆ ئەو ئامانجە سوودبەخشە کرد. دوژمنەکانی لە ئەنجومەنی شارەوانیدا، سوودیان لەم پێشنیارە نەزانانەیە وەرگرت بۆ گاڵتە پێکردنی.

١٤ـ کاریگرنگتر ، پاکسازیی دەستەی پارێزەرانی تورکییە لە قوستەنتەنییە. ئەولیژنەیە کەبۆ ئەم مەبەستە پێکهێنراوە، ماوەیەکە لێرە جێگیر بووەو، لێکۆڵینەوە لە سەر ڕابردوو و رەوشتی پارێزەرانی قوستەنتەنییە دەکات. زیاتر لە (٥٣٠) لە کۆی (٩٦٠) ئەندامی ئەو دەستەیە، لە ئەنجامی لێکۆڵینەوەکاندا، لە کارکردنی دادگای تورکی بێ بەشکراون. ئەو (٤٣٠) کەسەیش کە ڕزگارییان بووە، (٣١٣) تورکو (٣٩) ئەرمەنیو (٣٤)یان جوولەکەن. قوربانییەکان، بەنەبوونی تۆڕی

---

[1] بۆ توندوتۆڵیو قایمی شوبهێنراوە بە پۆستینیانۆسی یەکەم (٤٨٢–٥٦٥)ی ئیمپراتۆری بەهێزی بێزەنتی کە هەوڵیدا ئیمپراتۆریەکەی لە سیاسەتو دینو یاسادا یەك بخاتو، فەرمانی دا یاساکانی ڕۆمانی بنووسرێنەوە. کڵێسەی ئەیاسۆفیای لە ئەستەمبووڵ دروستکرد. شەڕی ڤاندالو فارسی کردو، ئیتاڵیاو هەرێمەکانی ئەفریقیاشی خستنەوە ژێر ڕکێفی خۆی (المنجد ق الاعلام، ط ٩، ص ٧٥٥). (س)

فراوانی بنەما ڕەوشتیەكان، یان لــە بەرئـەوەی بەڵگـەی پێویسـتی تـەواویان نـەبوو، یـاخود خـەریكی هــەندێ كـاری وەكـو بازرگـانیو تەنانـەت سیاسـەتیش بـوون، كەبەنەشیاو لە قەلەم دراونو لەگەڵ پیشەی پارێزەریدا نەدەگونجان، تاوانباركراون. ئەم ئیجرائاتە مفەووەزیشی گرتەوەو، ڕێی كاركردنی لە دادگای توركیدا لێگیرا. ئـەم پاكسازییە توندوتیژەی پارێزەرانی بێ فەڕ، دەبێتـە مایەی زیـادبوونی ناڕەزاییـەكان لە شارەدا، بەتایبەتیش كەهـەندێك لـە و پـارێزەرە وەدەرنراوانـە، مـاوەی (٢٠) یـان تەنانەت (٣٠) ساڵە ، لێرە كاردەكەن. دەركراوەكان بەپێی بڕیاری كۆمسیۆنەكە كـە دوابڕیارنییە، مافی پەنابردنە بەر وەزیری دادی ئەنگۆرەیان هەیە. پێویستە ئەوەیش بوترێ: ئەندامانی دەستە، دوای پاكسازی كۆبوونەوەیـەكی گشـتییان كـردو، لوتفـی شوكری بەگیان بەسەرۆكیان هەڵبژارد. ناوبراو، لەبەرئەوەی هەوڵی ناپـاكیی لـە دژی حكوومەت دابوو، كانوونی یەكـەمی رابـردوو، دادگـای ئیسـتیقلال سـزای پێنـج سـاڵ زیندانی بەسەردا دا. هەرچەندە دواتر بەخشراو سزاكەی لە سـەر سووك كرا، بـەڵام خۆپاڵاوتنی بـۆ سـەرۆكایەتیی پـارێزەرانی تـورك، ئـەوە دەگەیـەنێ: كـە هەرچـەندە پاكیش بۆتەوە، نایەوێ مل بۆ حكوومەتی ئەنگۆرە كەچ بكات.

١٥ـ كورتەی ڕووداوەكان، بەبێ ئاماژەكردن بۆ كارەكـانی سـەرۆك كۆمـار، تـەواو دەرنـاچن. مستەفا كـەمال، دوای وتەكـەی دوملوپونـاری، چـووە "برووسـە". وا چاوەڕواندەكرا چەند هەفتەیەك بەهێمنی لـە نـاو ڤیللایـەكی نزیكیـدا بمێنێتـەوە، تـا بەتەواوی پشوو بداتو، بەر لـە كرانـەوەی ئەنجومـەنی مـەزنی نیشـتمانی: هەوایـەك بگـۆڕێ. وەكـو پێشـبینی دەكـرا، لــە ئاهەنگـەكانی برووسـە خۆیـدا، بەبۆنـەی سەندنەوەی لە دەست یۆنانیەكان، بەشداریكرد. كـاتێك بـەردی بناغـەی پەیكـەری سـەربازی ونـی توركـی دانـا، وتەیەكی تاڕادەیـەك هاوشـێوەی پێشكەشـكرد، واتـە: جارێكیتر پێی لە سەر دوو ئامـانجی دەسـەڵاتەكەی داگـرت، كەیەكـەمیان: بایـەخی بەهێزكردنو پشتیوانیی ڕژێمی كۆماریی ئێستابوو، لە كاتێكدا سـوڵتانو خەلیفـەكان بەرپرسـی سـەرەكیی سـەرجەم ئـەو نەهامەتیانـە بـوون كـە توركیـا لـە ڕابـردوودا

تووشیان هاتبوو. دووەمیش: پێویستیی بنچینەیی سەرکەوتن بوو کە بریتیبوو لە پێشکەوتنی هاوشانی هێلە شارستانییە ڕۆژئاواییەکان.

١٦- ئەو پڕوپاگەندەیەی کە گوایە دەشێ ناوبراو شەشی ئۆکتۆبەری یەکەم ساڵڕۆژی چوونە ناو قوستەنتەنییەی سوپای ناسیونالیست سەر لەم شارە بدات، لێرە بەهۆی نزیکیی برووسەوە بڵاوە. رەتکردنەوەی داوانامەیەکی هاوشێوەی ئامادەبوونی لە (٩) ئەیلوولی دووەم ساڵیادی داگیرکردنەوەی سمیرنادا، پێدەچێ ئەوە بگەیەنێ کە خۆی ئامادە دەکات لە وەی قوستەنتەنییەیش دوورکەوێتەوە. لەگەڵ ئەمەیشدا، لە بەر ئەوەی سەردانی ئێرە بەبێ کێشەی وەکو رێوشوێنو جێگەی تاڕادەیەك نەشیاوی نوێنەرانی دەرەکی کەزۆربەیان نامەی متمانە (اوراق اعتماد)یان پێشکەش نەکردووە، نەك وەکو هەندێ کەس دەڵێن بەهۆی مەترسیی تیرۆرکردنیەوە، نابێ، واهەست دەکەم تاماوەیەکیتر سەر لێرە نادات.

١٧- سەرەڕای ئەمانە، دوایی‌و لە ڕوویەکەوە خۆی پێشانی خەڵکی کەللە رەقی قوستەنتەنییەدا. بەرەبەیانی هەینیی رابردوو (١٢ ئەیلوول) نامەیەکی تەلە فۆنیی مایەی بێزاریی نوسرەت بەگ خۆیم پێگەیشتو، پێی راگەیاندم مستەفا کەمال، بەو نزیکانە بەپاپۆڕی جەنگیی( حەمیدییە)و لە گەڕانەوەیدا بۆ دەریای رەش، بە (بۆسفۆر)دا تێپەڕ دەبێو، لێم پاڕایەوە، بۆ رێزنان لەو، فەرمان بدەم گەلە کەشتیی بریتانی بڕازێنرێتەوە. لە ڕاستیدا کاتێکی رەخساو نەبوو بۆ ئەو جۆرە ئامادەکارییانە، چونکە هەر سەعاتێك پاش نامەکەی نوسرەت بەگ، حەمیدییە لەگەڵ بەلەمێکی جەنگیی بەڕوالەت زۆر کۆنو ژمارەیەکی زۆر بەلەمی تیژڕۆ( Motor-Craft) دا بەلای باڵیۆزخانەی بریتانیادا لە (یەنی کۆی Yenikeuy) تێپەڕی. لە بەر ئەوەی کەمال دەمێك بوو لە خۆشیی بینینی بێبەشبوو، من خۆم لێرە گەورەترین ئاڵای بریتانی لای خۆمانم لە سەر بیناکە هەڵکرد.

١٨- سەرۆك، خێزانەکەی‌و چەند ئافرەتێکی تری لە گەڵدابوونو، بۆ تەرابزوون چوونو، دەڵێن دووهەفتەی لێ دەمێنێتەوە.من ئاگام لە ئامانجی ئەم سەردانە

چاوەڕواننەکراوە نییە، بەڵام شیاوترین مەبەست، خۆ پێشاندانیەتی لە هەرێمەکانی خۆرهەڵاتداو، بینینی بارودۆخی ئەو ناوچانەیە.

١٩- خۆشبەختییەکی کەم وێنەیە بۆ قوستەنتەنییە کە سەرۆك سەرپێیی و بێوەستان بەناو گەورەترین شاری کۆمارەکەدا تێپەڕێ. ئەگەر مانۆرەکەی دووبارە بکردایەتەوە، جگە لە سووکایەتییەکی نەخشە بۆکێشراو، بەدەگمەن وەك شتێکیتر لێکدەدرایەوە. بۆیە تەنها رێتێدەچێ کەمال لە گەڕانەوەیدا گەشتەکەی لێرە رابگرێ، بەتایبەتیش ئەگەر ئەو ماوەیەی کە لەسەر کەشتییە جەنگییەکە بوو، بمایەتەوە، هەندێك لە گرێ باسکراوەکانی سەرەوە دەکرانەوە.

نێڤل هندرسن.

لە گفتوگۆیەکدا، کەجارێکی تر بەجیا دەینێرم، بەڕەسمی ئاگادار کراومەتەوە: دوو ئەفسەری تورکی، بەپێی ماددەی (٥)ی رێککەوتنی تەنگەڵانەکان، بۆ کۆمیتەی چەکداماڵینی ناوچە تەنگەڵانەکان دیاریکراون. وا راگەیەندرا کەیەکێك لە و دوو ئەفسەرە، نوێنەری دەردەنێڵ و، ئەویتریان هی ناوچەی بۆسفۆرە. ئەمە لە خۆیدا هەنگاوێکە بەئاڕاستەیەکی راست، هەرچەندە پێویستە سەرنجی حکوومەتی تورکیا بۆ ئەوە رابکێشرێ کە، بەپێی ماددەی ناوبراو: دەبێ کۆمسیۆنەکە (لە چوار نوێنەر، کە فەڕەنسەو بریتانیای مەزن و ئیتاڵیاو تورکیا دیارییان دەکەن) پێکبێ. سەرەنجام، تەنها یەکێك لە و دوو ئەفسەرە دەبێتە نوێنەری تورکیاو، ئەوی تر دەبێتە یاریدەدەری. نوسرەت بەگ دوێنێ لە وتوێژێکدا تێیگەیاندم: ئەم حکوومەتە، پاشترو بەم زووانە، نوێنەرێك بۆ کۆمیتەی سنووری Thrace دەست نیشان دەکات.

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦١/٤٢٤، ل، ٤٤-٤٨، ژ ٦٣

## ژ:٣

## لەمستەر لیندسەیەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلە ین- (٢٤ ی شوبات گەیشتووە)

**ژمارە: ٣٧**

**برووسکە راپۆرت**

**قوستەنتەنییە، ٢٣ ی شوباتی ١٩٢٥**

ئاماژە بە برووسکەی ژمارە (١٣٤)م: ئاژاوەی کورد

راپەڕین، بەپێی (ئەنگۆرە تێلیگرامز—ANGORA TELEGRAMS)ترسناکترە، لە وەی یەکەم جار سەری هەڵدا. دوای داگیرکردنی گونـدی داراهـین " ئەناسـێنراوە"ی جیٚو شوێنی والیی گەنج (٢٠میل ڕۆژئـاوای مـووش)، راگەیـەندرا: شـێخ سـەعید دوو بەتالیۆنی، یەکیان بەئاراستەی لجیٚو[1]، ئەویتر بەرەو پیران[2] ناردووە. دەڵێن ئەو دوو بەتالیۆنە لەلایەن هێزەکانی تورکیاوە شکێنراون‌و، هەڵاتوون بۆ داراهین، کـە ئێسـتا تێیدا گەمارۆدراون. هاوکاریی تورك بۆ بەهێزکردنەوەی هێزەکانی، دەشیٚ لەم چـەند ڕۆژەدا بگاتە جیٚ.

شـێخ سـەعید، بـەپێی راپۆرتێـك، بـڵاوی کردۆتـەوە: کـارێکی گـەورەی بـۆ چەسـپاندنی یاسـای دینـی‌و موسـوڵمانان لـە تورکیـادا بەدەسـتەوەیە. بـەپێی راپۆرتێکی‌تـر ، داردەسـتی بریتانیایەو، بـارودۆخی گـەنج تەنـها گرێـدراوی ڕووداوی پایزی رابردووی هەکارییە. عیسمەت پاشا، بەشێوەیەکی چاوەڕواننەکراو، ٢٠ی ئـەم مانگـە گەیشـتە ئـەنگۆرەو، بارودۆخەکەی لەگـەڵ سـەرۆك کۆمـار، سـەرۆك وەزیـر، سەرۆکی ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانی‌و وەزیری ناوخۆدا تاووتویٚکرد. هەروەها وەك دەرەنجامی حەتمیی پرۆپاگەندەکان، بـۆ قـەیرانێکی کابینەکـە، دەنگـی راگـەیاندنی حوکمی عورفی هەیە.

(بۆ بەغدا دووبارە کراوەتەوە. ژ:١٢)

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤، ٢٦٢،،٨٠، ژ:٨١

---

[1] قەزایەکی باکووری ڕۆژهەلاتی ویلایەتی دیاربەکرە. (س)

[2] شارۆچکەیەکی ناحیەی ئاگیلی باکووری ڕۆژئاوای ویلایەتی دیاربەکرە. (س)

## ژ:٤

**لەمستەر لیندسەیەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلەین- (٢٥ ی شوبات گەیشتوە)**

**ژمارە: ٤٠**

**برووسکە راپۆرت**

**قوستەنتەنییە، ٢٤ ی شوباتی ١٩٢٥**

ئاماژە بەبرووسکەی ژمارە (٣٧)م

حوکمی عورفی، بەپێی ماددەی ٨٦ی یاسای بنەڕەتی، لە سەرجەم ویلایەتەکانی باشووری ڕۆژهەڵات، بەماردین‌و هەکاری‌و بدلیس‌و وان‌و دووقەزای ویلایەتی ئەرزرۆمەوە، راگەیەندراوە.

((ئاراستەی وەزارەتی دەرەوە کراوە، ژ:٤ هەروەها بۆ بەغدا دووبارەکراوەتەوە، ژ:٨٢))

وەزارەتی دەرەوە ٤٢٤، ٢٦٢/، ل:٨٠ ژ:٨٢

## ژ: ٥

## لەمستەر لیندسەیەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلە ین -( ٢ی ئادار گەیشتووە )

ژمارە: ١٥٤

قوستەنتەنییە، ١٤ ی شوباتی ١٩٢٥

گەورەم:

١- هەواڵی بانگهێشتکردنی پێنج شەممەی پێشووی عیسمەت پاشا لە هەلکییەوە بۆ ئەنگۆرەو دەست بەکاربوونی لە ڕۆژی دواییدا، کەلە بڵاوکراوەکانەوە ڕاگەیاندرا، بۆ قوستەنتەنییە سەیربوو، هەموان نوقمی چەندین بۆچوونی لەمەر هۆی گەشتەکە بوون،و، ڕای گشتی وابوو: قەیرانی کابینەکە تەشەنەی کردووە، پاشا شەممەی ٢٥ی مانگ گەیشتە پایتەخت،و، بە شێوەیەکی چاوەڕواننەکراو، سەرکۆماری لە وێستگەکەدا دی،و، سەرۆك خێرا گەیاندییە چانقایا بۆ کۆنفرانسێك. هەڵبەت ئامادەنەبوونی فەتحی بەگ سەرۆك وەزیرو هەندێ لە ئەندامانی کابینەکەی لە ویستگەکەدا بۆ چاوپێکەوتنی عیسمەت پاشا، هەر شتێك دەگەیەنێ.

٢- مەبەستی ڕاستەقینە ئەوەیە: سەرۆك ویستی سەبارەت بەیاخیبوونی گەنج، ڕاوێژ بەسەرۆك وەزیری پێشوو بکات. حکوومەت زۆر شتی لەم بارەیەوە شارۆدتەوە،و، تەنها هێندەی هەواڵ بڵاوکردۆتەوە، تا بایەخێك دروست بکات،و، ئەو گومانە بوروژێنێ کەباردۆخەکە لە وە مەترسیدارترە کەوا هەستی پیکراوە. هەواڵی ڕەسمیی سەرهەڵدانەکە بەگشتی پشت ڕاست دەکرێتەوە،و، ڕاگەیاندراوە کە ئامادەکاریی عەسکەری لەم چەند ڕۆژەدا، بەدڵنیاییەوە، یاخی بوونەکە دادەمرکێنێتەوە. حوکمی عورفی مانگێکە لە ویلایەتەکانی باشووری خۆرهەڵاتی تورکیادا (گەنج، مووش، ئەرغەنی، دەرسیم، دیار بەکر، ماردین، ئورفە، سیوەرەك، سعرت، وان، بدلیس، قەزاکانی خنس،و کیغیی ئەرزڕۆم،و هەکاری) ڕاگەیەندراوە بڕیاری ئەنجومەنیش لە سەر ئەم کارە، گومانی تێدا نییە.

٣ـ بزووتنەوەکە لە هەرێمێکی دوورو ناوەندی ئاسیای بچووکدا سەریهەڵداوە، ئەگەرچی زانیاریی رەسمیی بڕوا پیکراو نییە کەبزانرێ بەراستی چی روویداوە. تێبینییەك لە سەر کورتەی ئەو راپۆرتە هەمە جۆرانەی وا لە بڵاوکراوەکانی تورکیادا چاپکراون، دەنووسم. لەمانەوە دەردەکەوێ: راپەڕینی شێخ سەعید حسابی پێشهاتە چاوەڕوانکراوەکانی کردووە، دامرکاندنەوەیشی لە توانستی هێزە ناوخۆییەکاندا نییە، ژمارەیەك جەندرمەیش پەیوەندییان بەیاخییەکانەوە کردووە. رۆژنامەکان، لەمەڕ هۆکارەکان، بەئاشکرا رادەگەیەنن: فڕوفێڵی دەرەکی، کە (مەبەست بریتانیایە)، لە ئارادایە. بەلام لە راپۆرتەکەنیانەوە روون دەبێتەوە کە هۆکاری شەڕەکان دینو ناسیۆنالیزمی کوردن. بەسەرهاتی شێخ سەعید دەبیستم کە وتوویە: ئیسلام تاکە هاویەندیی نێوان تورکو کوردبووەو، تورك شکاندویەتی، کوردیش ئێستا پێویستە ئایندەی خۆی مسۆگەر بکات.

٤ـ ئەمە یەکەم جووڵانەوەی ئاشکرای جەماوەرییە دژی رێبازی عیلمانیی رژێمی ئێستای تورکیاو، بەگشتی کارێکی زۆریشی کرۆدتە سەر بیروڕاکان. تائێستا، هیچ نیشانەیەك نییە بۆ ئەوەی کە یاخی بوونەکە هیچ ئاکامێکی سیاسیی زامن کردبێ. دەڵێن: عیسمەت پاشا ویستوویەتی حوکمی عورفی قوستەنتەنییەو تەرابزوونیش بگرێتەوە، فەتحی بەگ دژی ئەمە بووە، بەلام ئەو هەواڵە جێی نکوولی لێکردنە کە گوایە کابینەکە خەریکە تووشی قەیران ببێ. جیاوازیی ئەم دووانە لەمەسەلە یەکی ئاوادا، لە وەدا دەبێ کەمەسەلە کان تا چ مەودایەك دادەمرکێنرێنەوە. سیاسەتمەدارانی تورکیای نوێ، جگە لە چەند کۆنەپەرستێکی ناو ئەنجومەن، هەستی تایبەتی دین زۆر بەدەگمەن جووڵاندوونیو، سۆزیان بەلای یاخی بوونەکەی شێخ سەعیددا نییە. دەڵێن سەرکردەکانی پارتی پێشکەوتنخواز لەگەڵ حکوومەتدا لە دانوستاندا بوونو، پێدەچێ لە هەندی رووەوە پشتگیرییان، لە ئیجرائاتەکانی حکوومەتەوە، بەدەست هێنابێ. هەروەها تێبینی دەکرێ کە رۆژنامەی (تەوحیدی ئەفکار— Tevhid.i - Evkiar)ی محافیزکاری ئیسلامی، هەرچەندە هەمیشە هەستی

بەلای دیندا دەبزوێ، نیگەرانە وا لە ڕێگەی یاخیبوونەوە هەوڵی دامەزراندنەوەی دەردێ. شێخ سەعید دەمێکە مایەی سەر ئێشەی حکوومەتە. بەڵام ئەگەر سۆزێکی فراوانیشی بەلادا هەبێ، دەشێ بیرو بۆچوونەکانی تەنها لە ناو تاکەتاکەی خەڵکدا بن. ئاڕاستەی گشتیی سیاسەتی ناوخۆی تورکیا، تا یاخیبوونەکە فراوانخوازیی زیاتر پێشاننەداو، بێ ئەمەکیو ناپاکی لە ڕیزی سوپادا دەرنەکەون، چاوەڕێیی گۆڕانی لێ ناکرێ.

٥- ئەم برووسکەیە بۆ بەڕێز (کۆمیساری باڵا- مەندووبی سامی) لە بەغدا دەنێرم.

ئاڕ ئێس. لیندسەی.

وەزارەتی دەرەوە/ ٤٢٤، ٢٦٢، ل:٩١، ژ:٩٢

## هاوپێچی (١)ی ژ:٥

## کورتەی چاپەمەنییەکان،

سەرجەم بڵاوکراوەکان (A-A)ی بڕیاری کابینە بۆ ڕاگەیاندنی حوکمی عورفی لە هەرێمەکانی ڕۆژهەلاتدا، (ڕۆژنامە فەڕەنسیەکان).

برووسکەکانی (تەنین- طنین Tanin)و (تەوحید – Tevhid) دەڵێن: توندڕەوەکانی پارتی گەل پێشنیاری ڕاگەیاندنی حوکمی عورفی لە تەرابزوونو قوستەنتەنییە دەکەن، چونکە پڕۆپاگەندەی دینی سەرتاسەری یاخیبوونی گەنجی گرتۆتەوە. ناوچەی حوکمی عورفی، بەپێی برووسکەکانی (وەقت–Vakt)و (وەتەن– Vatan)، فراوانتر دەکرێ. لە کۆبوونەوەی کابینەکەدا بەئامادەبوونی مستەفا کەمالو سەرۆکی ئەرکانی گشتی، باسی ڕووداوەکانی گەنج کرا. پارتی گەل ئەم بەیانییە لە ئیجرائاتەکانی حکوومەت دەدوێو، ئەنجومەن پاش نیوەڕۆ نامەکەی سەرۆك وەزیر سەبارەت بەڕاگەیاندنی حوکمی عورفی تاووتوێ دەکات، هەرچەندە بڵاوکراوەکان دەزانن ئەم حوکمە لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەلاتدا ئێستا جێبەجێ دەکرێ: وەزیری

ناوخۆ بەرۆژنامەکانی راگەیاند: پیلانگێرەکان یاخیبوونێکی گشتییان سازداوە، کەدەبوو لە کۆتاییی ئاداردا دەستی پێ بکرایەو، بەرپابوونیشی هۆی جۆراوجۆری وەکو سەڵتەنەتخوازی، خەلافەت، شەریعەتو پروپاگەندەی کۆنە پەرستانەی کوڕی عەبدولحەمیدی لە پشتەوەن. زۆربەی چاپەمەنیەکان دەڵێن: شێخ سەعید (٧٠٠) پیاوی لە تەکدایە. برووسکەکانی تەنینو تەوحید دەڵێن: شێخ سەعید، بەهۆی فرۆکەکانی بریتانیاوە، بڵاوکراوەی بەخشیوەتەوە کەتێیدا هاتووە: حکوومەتی تورکیا ئافرەت بەرەو بەدڕەوشتی دەبات؛ بێ باوەڕی هاندەداتو. خەلیفەی دوورخستۆتەوە، شێخ شەڕی دینو رەوشت دەکات، کوردستانی سەربەخۆ پێکدەهێنرێ و، خەلیفەی پێشوو دەگەڕێنرێتەوە. وتیان: هێزەکانی شێخ پاڵوویان داگیر کردووە. برووسکەی وەقت دەڵێ: یاخیبوونەکە لەگەڵ تەشەنەکردنیدا، بەربەست کراوە. یەکە (وحدە) گەورەکان لە ناوچە نائارامەکە نزیك دەبنەوەو، خێڵە کانی سیلوانو[1] حەزرۆ(Hazro)[2] دژی شێخ سەعید دەجەنگن، دەڵێن یاخیبوونی گەنج، زادەی پرۆپاگەندەی دەرەکییە. پیاوەکانی شێخ کە شەڕی گاردی پێشکەوتووی تورك دەکەن، چەند گرووپێکی (٣٠٠-٣٥٠)کەسین. وەقت لە سەری دەڕوا دەڵێ: ڕووداوی گەنج زۆر گرنگەو، گەورەترە لە وەی دەرکی پیکراوە. شێخ سەعید کوردی زازاو شێخێکی نەقشبەندییەو، گوندێکی زۆر پەیوەندییان پێوە کردووە.

کازم قەرەبەکر بەگو رەئوفو عەدنان بەگ، بۆ مەسەلەی یاخیبوونی گەنج، سەریان لە فەتحی بەگ دا. پارتی پێشکەوتنخواز، پاش شیکردنەوە، کۆبووەوەو، باردۆخەکەی هەڵسەنگاند (وەتەن). ڕۆژنامەی ناوبراو دەڵێ: بارودۆخەکە مەترسیدار نییەو، مەسەلە کە بەم زووانە کۆتایی دێ. چەند مانگێك لەمەوبەر ، شێخ سەعید لە قوستەنتەنییە بوو. خەڵکی پاڵووەو، زۆر دەولەمەندو خاوەن جەماوەرە، بەلام

---

[1] مەیافارقین، قەزایەکی باکووری ڕۆژهەلاتی دیاربەکرە(س).

[2] شارۆچکەیەکی باکووری ڕۆژهەلاتی شاری دیاربەکرە(س).

نەزانەو، دژی نەخشەی حکوومەتە بۆ دامەزراندنی ئیدارەیەکی جێگیرو، لە وناوچانەدا یاخیبووە.

(جمهوریەت– Jumhuriet)دەڵێ: بەڵگەنەویستە کە یاخیبوونەکە دەرهاویشتەی هاندانێکی دەرەکییە، لە بەرئەوەی هێزەکانی حکوومەت لە گەیشتندان، بەم نزیکانە تێکدەشکێنرێ.

ئەنگۆرە تێلیگرامز: یاخیەکان، بەپێی دوا زانیاری، گەمارۆ دراون. نێردراو بۆ ناوچە نائارامەکان بەڕێدەکەوێ. یاخی بوونەکە سەرەتا سروشتێکی کۆنەپەرستانەی هەبوو. ژمارەیەك جەندرمە پەیوەندییان بەیاخیانەوە کردووەو. وتوویانە شەڕی هاورێکانیان ناکەن. حکوومەت وای هەستکرد، هێزە خۆجێییەکان یاخیبوونەکە دادەمرکێننەوە، بەڵام چەند ڕۆژی رابردوو ژمارەی یاخیان بەهۆی پڕۆپاگەندەوە زیادیکرد. سەعیدو مامۆستا فەخریو نەورەس خەڵکی نەفامیان لە خشتەبردووە.

وەتەن: برووسکەی ئەنگۆرە نفووزی شێخ لە کوردستاندا دەخاتەڕوو. بەشێکی هۆکاری یاخیبوونەکە خراپیی ئیدارەی خۆجییە. کاتێ سنجەقەکان بوونە ویلایەت، خەڵکی بێ توانا بوونە والی، نەیانتوانی کارەکان بەڕێوەببەن. شێخ عەبدوڵلا لە گەنجو خالید بەگی سەرخێڵی جبران[1] پەیوەندییان بەسەعیدەوە کردووە.

سەر گوتاری تەوحید: فەتحی بەگ زۆر بێ بەخت بووە. لە کاتێکدا هەموو جۆرە جیاوازییەك لە ناو تورکاندا بەدی دەکرا، بۆ فەتحی بەگ، بەڵێنی هێمنیو ئاسایش، بەرەنگاربوونەوەی چارەنووس بوو سەرتاسەری وڵات لە هەلومەرجێکی ناسکدا دەژی، ئارامی، لە بەردەوامیی رووداوە ترسناکەکانی ئەم دواییەدا، سەقامگیر نابێ. قەیرانی ئابووری بەردەوام دەبێ. خۆ ئەگەر نائارامی بەردەوام پەرە بسێنێ، ئەوا

---

[1] ئەو دوو خالید ناوەی کە پەیوەندییان بە شۆڕشی شێخ سەعیدەوە هەیە، یەکیان جبرانییەو، ٢٠ کانوونی یەکەمی ١٩٢٤ گیراوەو زیندانی کراوە، ئەوی تریان حەسنانییە. بۆیە ئەبێ ئەمەی دوایی یان بێ (رۆبەرت ئۆلسن، راپەڕینی شێخ سەعیدی پیران، وەرگێڕانی ئەبوبەکر خۆشناو، سلێمانی، ١٩٩٩، ل ١٥٢– ١٢٥). (س)

هەر کەبچوکترین شت روویدا، هـەموو وڵات دەکەوێتـە مەترسییەوە. بەڕێوەبـەرێتیی پێویستە هەموو هەوڵێکی بخاتە گەڕ، گرنگ نییـە چۆن هێمنـیو ئاسایشـی نـاوخۆ رادەگرێ.

وەقت، سەرگوتار: دڵە راوکـێ بـەردەوام زیـاد دەکـات. ترسـیش کـاتێك دادگـای ئیستیقلال نێردرایە ئێرە، هەروا بوو. وڵات تەنـها پـار لـە نـارامیدابوو، بـەڵام ئێستـا یاخیبوون لە گەنج هەیە. بارودۆخ سـبەنێ روونـتر دەبێـتەوە. ئامـانجی حکوومـەت تیکشکاندنی یاخیبوونەکەو، بەرگرتنە لە هەڵگیرساندنەوەیەکی تر.

وەتەن: سەرگوتار: فەتحیبەگ، لە بەرەو رووبەڕووبوونەوەی کێشـەی دەرەکـیو ناوخۆییدا، زۆر بێبەخت بوو. رووداوی گـەنج زادەی سیسـتمی هەڵـەی ئیدارەبـوو لـە ویلایەتەکانی رۆژهـەڵاتدا. دەبـێ لێکۆڵـە رەوانـی گشـتی، بەدەسـەڵاتێکی فراوانـەوە بنێردرێنە ئەوێ، پێویستە بتوانن هەمان فشاری والییە بەشکۆ دێرینـەکانیان هـەبێ، ئەگەرنا، رووداوی تـری وەك ئـەوەی گـەنج دەقـەومێ. ئەگـەر ئیجرائـاتی زیـادە لـە سەرتاسەری تورکیا دابکرێ، بۆ وڵات باش نابێ. رووداوی گەنج جێی مەترسی نییە.

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٢،٤٢٤، ل٩٢–٩٣، ژ: ١/٩٢

* * *

## هاوپێچی (٢)ی ژ:٥

## کورتەی بڵاوکراوەکان-٢٥ ی شوباتی ١٩٢٥

هـەموو چاپەمەنییـەکان: قسـەکردنی زیـاتر لـــە ســـەر یـــاخیبوونی گـــەنج. روونکردنـەوەی دوێنێـی حکوومـەت بـۆ پـارتی گـەل. ئیجرائــاتی حکوومــەت جێـی رەزامەندییە (رۆژنامە فەرەنسییەکان). حوکمی عورفی مەڵاتیـەی گرتـەوە. دوێشـەو کۆبوونەوەی تایبەتی کابینە کراو، مستەفا کەمالو فەوزیو شەفیقو عیسمەت پاشـا ئامـادەبوون. پـارتی پێشـکەوتنخواز رایگـەیاند: پشـتیوانی سیاسـەتی حکوومـەت

دەكات. بەپێی تەنین، یاخیەكان ناوچەكانی گەنج، پیران، لجێ، پاڵوو و خەرپووتیان بەدەستەوەیەو، Jinianli Halid [1] و حاجی موسا هاوكاریی سەعید دەكەن.

تەوحید– سەرگوتار دەڵێ: كێشەكە لە و خراپترە كەهەست دەكرا. یاخیبوون، بەتەواوی، بەهۆی بەرێوەبردنی خراپەوەیە. بۆچی كارمەندان پیلانەكەیان لە كاتی خۆیدا بۆ دەرنەكەوت؟! پێویستە چاوەڕوانی پیلانی دەرەكی بین. بریتانیاو فەرەنسە دەوڵەتێكی ناوبژیوان بۆ نێوان خۆیان‌و توركیا داوا دەكەن. ((هاونیشتمانییە كوردەكانمان كێشەمان بۆ دروست دەكەن، لە كاتێكدا یۆنانییەكان لە رۆژئاواوەو بریتانیای بێ بەزەییش لە باشووری رۆژهەڵاتەوە هەڕەشەمان لێدەكەن)).

حكوومەت دەبێ رێوشوێنی سەركوتكاری بگرێتەبەر، بەڵام نابێ داد پەروەری‌و دووربینی لە یاد بكات. شەڕكردن دژی حكوومەت، ئەگەر بەهۆی ئیدارەی خراپیشەوەبێ، ناپاكییە. یاخیبوون نابێ بەكاردانەوە ناوببرێ. توركان پێویستە یەكبگرن.

دوێنێ كابینە دەسەڵاتی تەواوی بۆ دەركردنی حوكمی عورفی، لە هەرشوێنێكدا بێ، وەرگرت. نێردراوەكان تایاخیبوون دانەمركێنرێتەوە، ناچنە ناوچە نائارامەكان.

وەقت– سەرگوتار دەڵێ: یاخیبوون لە ویلایەتی بدلیس تەشەنەی كردووە. پڕوپاگەندەی دینی لە پشت یاخیبوونەكەوەیەو لە ناو خەڵكی نەزاندا بڕەوی هەیە. ئێستا كاتی سەرزەنشتكردنی كارمەندانی تورك نییە. حكوومەت پێویستە هێز بەكاربێنێ. كەمترین دوودڵی دەبێتە مایەی كارەساتێكی گەورە.

ئەنگۆرە تێلیگرامز دەڵێ: بارودۆخەكە ترسناكە. یاخییەكان سەعات سێی پاش نیوەڕۆی دوێنێ خەرپووتیان داگیركرد. یاخییەكان بەفڕۆكە بۆمباران دەكرێن.

---

[1] –هەر ئەبێ خالید بەگی حەسنانی بێ.(س)

کوردستانی باکوور بەپڕوپاگەندەی دەرەکی بەهەڵەدا براوە. ڕێی تێدەچێ ناوداری وان سەرپەرشتیی راپەڕینەکە بکات، بەڵام ناوەندەکەی بدلیسە.

دەڵێن خێلە سەرەکیەکانی مووش، سعرتو سیوەرەك نەفرەت لە شێخ سەعید دەکەن.

عیسمەت پاشا لە کۆبوونەوەی پارتی گەلدا وتی: هەلومەرجەکە سەرەتا هەر چۆنێك بووبێ، ئیستا دەستی دەرەوە لە یاخیبوونەکەدایە.

بەپێی وەتەن سەرگوتار، هیچ بەڵگەیەکی ئاشکرای هەبوونی دەستی بریتانیا لە یاخیبوونەکەدا نییە، هەرچەندە یاخیبوون ڕێکەوتی کاتی دەستبەکاربوونی لیژنەی عیراقی کرد.

یاخیبوونی گەنج چەند مانگێکە لە جۆشدایە. یاخیەکان باش شارەزای وڵاتنو، پێناچێ پێش مانگی نیسان تێکبشکێندرێن.

جمهوریەت- سەرگوتار ئەوە بیری تورکان دێنێتەوە کەدوژمنێکی زۆری دەرەکیو ناوەکیان هەیە. کەمتەرخەمیی رابردوو دەبێ وریاکردنەوەیەك بێ بۆ بەربەستکردنی ڕووداوێکی تری وەك ئەوەی گەنج.

ئەنگۆرە تێلیگرامز دەڵێ: جەندرمەی ناوخۆو فەوجەکان بەرپرسی سەرەکیی تەشەنەکردنی یاخی بوونن. فیرقە نیزامییەکانی تورکیا هێشتا نەگەیشتوونە هەرێمە یاخیەکە. کاردانەوە لە شێوازی ناپاکیدا بەردەوام زیاد دەکات. راگەیاندراوە: دیاربەکرو خەرپووتو، دەرسیم. لەلایەن یاخیەکانەوە دەستیان بەسەردا گیراوە.

پارتی گەل مەسەلەی راگەیاندنی حوکمی عورفی لە قوستەنتەنییەو برووسەو شوێنیتر تاووتوێ کرد. بەڵام هیچ بڕیارێك نەدرا.

ئەنگۆرە- تێلیگرامز دەڵێ: بەرەنگاربوونەوە بەدەستپێکردنی لە ئەنگۆرەوە تێکدەشکێنرێ. کابینە خۆی کردۆتە ئەنجومەنی جەنگ. نیشانەکانی بەرەنگاری لە ئورفە.

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٢/٤٢٤، ل:٩٣، ژ:٢/٩٢

**ژ:٦**

**لەمستەر لیندسەیەوە بۆ مستەر نۆستن چامبرلە ین- ( ٢٦-ی شوبات گەیشتووە )**

**ژمارە: ٤٢**

**برووسکە راپۆرت**

**برووسکەی ژمارە (٤٠)م**

**قوستەنتەنییە ٢٦ ی شوباتی١٩٢٥**

دەڵێن: یاخیەکانی خەریکی داگیر کردنی خەرپووت، دیاربەکرو دەرسیمن.

بۆ بەغدا دووبارە کراوەتەوە، ژ١٥

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٢/٤٢٤، ل٨٢، ژ:٨٥

**ژ:٧**

**لەمستەر لیندسەیەوە بۆ مستەر نۆستن چامبرلە ین- ( ٢٦ی شوبات وەرگیراوە )**

**ژمارە: ٤٢**

**برووسکە راپۆرت**

**برووسکەی ژمارە (٤٢)م**

**قوستەنتەنییە ٢٥ ی شوباتی١٩٢٥**

ئێستا راگەیەندرا کە گوایە خەرپووت گیراوەتەوە؛ زانیاری بەکشتی پێچەوانەی ئەمەیە.

(بۆ بەغدا دووبارە کراوەتەوە، ژ١٦)

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٢/٤٢٤، ل: ٨٢، ژ٨٦

ژ٨

**لەمستەر لیندسەیەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلە ین- (٢٧ی شوبات گەیشتووە)**

**ژمارە: ٤٦**

**برووسکە راپۆرت**

**قوستەنتەنییە ٢٧ ی شوباتی١٩٢٥**

دوێنێ بە نوسرەتم وت: لە چاپەمەنیو راپۆرتە رەسمییەکاندا تێبینیم کردووە، دەنووسن: یاخیبوونی کورد پیلانی بریتانیایە، نازانم خاوەنی ئەم راپۆرتانە خۆیان بڕوایان بەم قسەیە هەیە؟ بەڵام داوام لێکرد، حکوومەتی خاوەنشکۆ ئاگادر بکاتەوە کە هەموو دەست پێشخەرییەکی بریتانیا، نابەدڵ، بەرەتکردنەوەی رەهاو پەسەند نەکردنی هەر جۆرە یارمەتییەك وەڵام دراوەتەوە. بێگومان دەسەڵاتداران، کە لەوەدا بوون بەسەر یاخییەکاندا زاڵ بین، پشتیوانیی راپۆرتەکەمیان لە لێپێچانەوەی زیندانیەکانەوە، پێگەیشت.

نوسرەت بۆ راپۆرتە کە سوپاسی کردمو، وتی: خۆی متمانەی بەنووسراوەکانی سەبارەت بەبریتانیا نییەو، پێشی وانییە حکوومەتی تورکیا بڕوایان پێ بکات.

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٢/٤٢٤، ل: ٨٢–٨٣، ژ٨٧

(ژ ٩)

## لە مستەرلیندسەیەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلەین - (٩ی ئادار گەیشتووە)

## ژمارە: ١٧٨، نهێنی

قوستەنتەنییە ، ٣ی مارسی ١٩٢٥

گەورەم ،

شەرەفی ئەوەم هەبوو لە نووسراوی ژمارە ١٥٤ی ٢٤ شوباتمدا، راپۆرتی هەواڵەکانی ئەم یاخی بوونەی کوردان، کە لە گەنج سەری هەڵدا و بە خێرایی رووبەرێکی فراوانی گرتەوە، بەرزبکەمەوە. زۆر گرانە بڵێین بەتەواوی چی روودەدات .هەموو هەواڵەکان لە ئەنگۆرەوە دەگەن و، لە بەر ئەوەی پەیامنێر لە هەرێمەکانی رۆژهەلاتدا نییە، لە سەرچاوە رەسمیەکانەوە گەلاڵە دەبن و، بەدەگمەن متمانەیان پێدەکرێ. بێگومان بێ ژمارە پروپاگەندەیش، کە پشت راستکردنەوەیان ئاسان نییە، لە ئارادان. ناوەندی یاخی بوونەکە دەکەوێتە دۆڵی مورادسۆ و، لە سەرتاسەری هەرێمە شاخاویەکانەوە بەرەو باشوور: لجێ، هەینی، پیران و ئەرغەنی درێژدەبێتەوە. باکووری دۆڵەکە: خنس و گەنج یاخی بوون و. شەڕوشۆڕ لە چەمشگەزەکی[1] خۆرئاوای دوور هەیە. دەڵێن: گوایە شێخە ناودارەکانی دەرسیم، پەیمانی ئەمەکدارییان ناردووە. . بەلام راپۆرتەکە، یاخود نیازپاکی ریسواکردنەکە، پێدەچێ جێیگومان بێ. یاخیەکان چوونەتە ناو خەرپووتی پێچی رۆژئاوای مورادسۆوە و. دەسەلاتداران هەلاتوون. خێڵەکییەکان کەوتنە تالان و بڕۆ، شارنشینەکان بە سەرکردایەتیی پیاوێك. کە بە توندی دژایەتیی ئەم رژێمەی ئێستا دەکات. داگیر کەرانیان وەدەرنا. ئەمجا بەرەو رۆژهەلاتی دوورتر. هەواڵەکانی مووش زۆرکەمن و هیچ هەواڵێکی بدلیس و وان نییە. پێناچێ هیچ جۆرە پەیوەندییەك لەگەڵ ئەو هەرێمانەدا هەبێ. دەیشزانرێ حکوومەت لە کەناری دەریای رەشیشدا دۆستی لە

---

[1] قەزایەکی باکووری رۆژاوای ویلایەتی ئەلعەزیزە لە ناوچەی دەرسیم. (س)

هەرێمی تەرابزوون نییە {بڕوانە ڕاپۆرتـی مستەر نـایتی هـاوپێچی نووسـراوی ژمـارە ۱۳۸ی ۱۸ شوباتم(۷)} سەرهەڵدان لەوێ مەسەلەیەکی زۆر ترسناك دەبێ. هەرچەندە هەواڵی هیچ ڕووداوێك نییـە، بـەلاّم حکوومـەت، بـۆ ڕاگـەیاندنی حوکمـی عورفـی لـەو هەرێمـەدا وەکـو ڕێ و شـوێنێکی قایمکـاری و خۆپاراسـتن، گوشـاری لەسـەر بـوو .ڕاگەیاندنەکە بەهۆی گۆڕانی کابینەکەوە زیاتر ڕێتێدەچێ، بەلاّم تاکـاتی نووسـینی ئەم ڕاپۆرتە هێشتا بڕیاری لەسەر نەدرابوو.

۲–چاپەمەنیەکان ڕۆژانـە ڕاپۆرتـی چـالاکیی فرۆکـەکان و پێشڕەویکردنی سـوپا دژی شۆڕشگێڕان بلاّودەکەنەوە. پێنـج فیرقـە لـە باشووڕەوە خـەریکی پـەلاماردانی یاخیەکانن و لە باکووریشەوە هەر کە کەش و هەوا بواری دا، سریەکانی ئـەرزنجان و سێواس دەکەونـە خـۆ. دەمـەوێ ڕاپۆرتـی (ڕائیـد هـارینك – Harenc)ی پاشـکۆی عەسکەری بۆ ئەم مەسەلەیە لێرەدا هاوپێچ بکەم. چونکە درێـژەی یـاخی بوونەکـە و ڕێ و شوێنی عەسکەریی وەرگیراو بۆ دامرکاندنەوەیی تێدایە.

۳– هیـچ هۆکـارێك لەسـەر سروشـت وهۆکارەکـانی سـەرهەڵدان بـۆ گۆڕینـی ئـەو پێشنیارەی کـە لـە ڕاپۆرتـی ژمـارە ۱٥٤مـدا خراوەتـە ڕوو، ئێسـتا لــە ئارادانییــە. جووڵانەوەکە، دینی و نەتەوەیی و دژی کۆمارییە. سەرەڕای ئەمەیش، ناتوانین بڵێین هەریەك لەمانە تا چەند هاوکاری دەرەنجامە گشتیەکەیە. لێرە زۆر بـەبلاّوی دەڵـێن و لە ئەنگۆرەیش وا هەست دەکرێ کە سەلیم ئەفـەندیی کـوڕی سـوڵتان عەبدولحـەمید کەوا ئێستا لە مەنفاو لە بەیرووت دەژی، وەکـو سـەرۆکی بزوتنەوەکـە یـان تەنانـەت میری کوردستانیش لەلایەن کوردانەوە پێشاندراوە. هۆکارێکی تـری یـاخی بوونەکـە، وەك زۆرجـار دەوتـرێ. گـەندەڵیی بنـەما گشـتیەکانی بەڕێوەبەرایـەتیی زادەی ئـــەو سیسـتەمە گـۆڕاوەی حکوومـەتی ناسیونالیسـتە. ویلایەتـەکانی زوو پارچــە پارچــە کــراون، ســنجەقەکان بوونەتــە ویلایــەتی ســەربەخۆ و، والیــەکانیان ڕاســتەوخۆ فەرمانیان لە ئەنگۆرەوە پێدەگات. ناوەندخوازیی لە ڕادەبەدەر بـەم جـۆرە هۆکـار و هەل و مەرجی ڕەخساندو، بـووە مایـەی دواخسـتن. دەڵـێن: ئـەم جـۆرە والییانـەش

ستەمکار و لێنەهاتوون و لە کۆنترۆڵکردنی خەڵکدا، بە پێچەوانەی حاکمە گشتیە کۆنەکانەوە، توانانین.

٤- یەکەم کاری حکوومەت، هاوکاتی ڕاگەیاندنی حوکمی عورفی لە بواری سیاسیدا، پێشکەشکردنی ڕەشنووسی ماددەی تازەی یاسای ناپاکی بوو بە ئەنجومەن و، ئەویش بڕیاری لەسەر دا. هەرکەسێك دین بۆ ئامانجی سیاسی بەکاربێنێ، بەپێی ئەم ماددانە، بەرەو ڕووی سزاکانی مردن یا دووساڵ زیندانیکردن دەبێتەوە. ئیجرائاتی ئیداریش بۆ بەربەستکردنی توند و تیژیی چاوەڕوانکراوی زاری وتار بێژی مزگەوتەکان کراوەو، مۆڵەتی ئامۆژگاریکردن لە مەلاکانی قوستەنتەنییە وا (دەشێ شوێنی تریش) وەرگیراوەتەوەو، چاویان پێدا خشێنراوەتەوە و، هەندێ ئیمامی بەناوبانگ مۆڵەتی ئامۆژگاریکردنیان لێ سەندراوەتەوە. هەڕەشەی مامەڵەی توندیش لەتەك هەر ڕۆژنامەیەکدا، کە هەواڵی نادروست بۆ هاندانی یاخییان بڵاوبکاتەوە، لە ئەنکۆرەوە هەیە. هیچ یاسایەکی نوێ سەبارەت بە بڵاوکراوەکان نییە. ئەو یاسایەی ئێستایش کە هی سەردەمی حەمیدییەیە، ئەوەندە بەهێزە کە حکوومەت بتوانێ، بە شێوەیەکی کاتی و بە داخستنی هەر ڕۆژنامەیەك نووسینەکانی جێی ڕەزامەندی نەبن، کۆنترۆڵی بڵاو کراوەکان بکات. بۆیە چاپەمەنیەکان خۆیان لە بڵاوکردنەوەی ئەو هەواڵانەی کەمایەی نیگەرانین، بەدوور دەگرن.

٥- ئاشکرایە ئەنکۆرە ٢٣ و ٢٤ شوبات لە مەترسیی یاخی بووندا بوو. باشترین بەڵگەیش بۆ ئەمە لە هەوڵە ناکامانیاندا بۆ خێرا چارەسەرکردنی مەسەلەی پاتریارکی لەگەڵ یۆناندا، بەدی دەکرێ. لەوکاتەوە حکوومەت ئارام بۆتەوە و باس و خواسی بریتین لە سەرکوتکردنی یاخیەکان لە هەر جێیەك بن و، ئەمکداریی هەندێ لە هەرێمی کوردان و ، کۆنترۆڵکردنی خێرای بار و دۆخەکە بە گەیشتنەجێی سەربازەکان. لەگەڵ ئەمەیشدا. سێ چوار ڕۆژی ڕابردوو چەندین گۆڕانی گرنگی سیاسی لە ئەنکۆرەدا ڕوویان دا.

٦- پارتی پێشکەوتنخوازی بەرهەڵست، لە قەیرانەکانی هەفتەی ڕابردوودا دڵسۆزیو ئەمەکداریی خۆی بەووتار پێشان داو، سەرکردەکانیشی یاخی بوونیان ڕیسوا کرد. هەرچەندە پێدەچێ ڕێبازەکانی سەرسەختیی زۆرینەی پارتی گەل ڕەتبکەنەوە، بەلاّم هیچ شتێك نییە وامان لێبکات باوەڕبێنین کە گوایە هەرچۆنێك هاوسۆزی ویستی بەهێزی کۆنە پەرستانەی کوردستانن. فەتحی بەگ ماوەی سێ مانگی پێشوو، لەبەر هەڵوێستی ئاشتیخوازانەی، پشتیوانی ئەوپارتەی پێگەیشتووە .وەك دەزانین، ئەم، لەلایەکەوە بەمەبەستی خۆشکردنی زەمینە بۆ چاکبوونەوەی عیسمەت پاشاو، لەلایەکی تریشەوە بۆ ئەوەی ڕێی با لە بەلەمە چارۆکە دارەکانی ئۆپۆزسیۆن بگرێ و، هەڵوەشانەوەی پارتی گەل ڕابگرێ، هێنراوەتە گۆڕەپانەکەوە، بەلاّم ئەرکەکەی گران بووە، چونکە هەمیشە بۆ یارمەتیدانی پشتی بەپارتیگەل بەستووە کە سەرۆکەکەی عیسمەتی باپیریەتی و، سکرتێری گشتیشی لەم دوومانگەیدواییدا ڕەجەب بووە کە سەرەتای کانوونی دووەم، دووبەرەکیەکی دژی ئەو نایەوە. من زیاتر وا هەست دەکەم عیسمەت پاشا، وەك دەڵێن، ئامادەی کۆبوونەوەکانی کابینەکە بووەو، هاوشانی مستەفا کەمال دیفاکتۆیەکی کۆنترۆڵکردنی بارودۆخەکە بووە.

٧- فەتحی بەگ، بۆ جێبەجێکردنی کاری توند دژی یاخیەکان بە ڕاگەیاندنیحوکمی عورف لەتەرابزوون و قوستەنتەنیۆیە و بێ گومان لەسەرتاسەری وڵاتداو، قۆستنەوەی هەل بۆ سەرکوتکردنی پارتی پێشکەوتنخواز، لەلایەن توشی فشارێکی گەورەی پیاوە دڕندەکەی پارتی گەل بووە و، پێدەچێ تا ئەوئاستەی کە داوای داخستنی لقی هەرێمەکان لە سەرکردەکانی پێشکەوتنخواز بکات، ملی بۆ ئەم گوشارە کەچ کردبێ. بەلاّم داواکەی پەسند نەکراوە و، لەوانەیە ئیتر نەیەوێ پێی لەسەر داگرێ.

٨-دوێنێ، دووی ئادار، کاتێك داوای کۆبوونەوەی پارتی گەل کرا و دە سەعاتی خایاند، قەیرانەکە سەریهەڵدا. ڕەجەب هێرشی کردە سەر حکوومەت و، فەتحی

بەرگریی لەسیاسەتێکی میانڕەو کرد. تەنها زۆرینەی کابینەکەی خۆیی (٤:٦) بەدەست هێنا. بڵاو کراوەکان زۆر بە کورتی باسی ڕووداوەکەیان کرد، بەڵام ئەوان لەڕاستیدا زۆر توند و تیژتر بوون. سەرکۆمار خۆی ئامادەبوو و، لەسەر داوای (قلیچ عەلی)ی باشترین لایەنگری، ڕازیبوو وەڵامی پرسیاری نوێنەرەکان بداتەوەو، بیانهێنێتە قسە. سەرەنجامی دەنگدان (٩٠: ٦٠) دەرچوو و، دەقەکەی بڵاو نەکرایەوە .فەتحی ئەمەی بە سەرزەنشتکردنی خۆی زانی، بۆیە دەستی لەکار کێشایەوە .ئەمشەو ڕاگەیەندرا کە عیسمەت پاشا پۆستی سەرووەزیری وەرگرتۆتەوە و، دەشێ بۆ گرتنەبەری سیاسەتی سەرکوتکردنی سەرتاسەری، تا ئەو شوێنەی غازی ئارەزووبکات، ئامادەبکرێت.

ئاڕ . ئێس. لیندسەی

وەزارەتی دەرەوە: ٤٢٤/ ٢٦٢، ل: ١٠٠-١٠١، ژ ١٠٣.

*** *** *** ******

## هاو پێچی (١) ی ژمارە (٩)

**قوستەنتەنییە ، ٤ی مارسی ١٩٢٥**

گەورەم،

خۆشحاڵم بۆزانیاریتان ئەمانە پێشکەش بکەم:

١- کورتەی هەواڵی چاپەمەنیەکانی ناوخۆ لەبارەی یاخیبوونەوە کە لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەلات و دژی حکوومەتی ئێستا بەرپا بووە.

٢- تۆماری ئەم گفتوگۆ کورتەم لەگەڵ جەنەڕاڵ شوکری نایلی پاشای فەرماندەی فەیلەقی (٣) قوستەنتەنییە.

٣- زانیاری هەمە جۆر لەسەر جموجۆڵی فەوجەکان.

٢- تا ٢٥ شوبات وایان لێ کردبووم وا هەست بکەم: کابینەکەی تورکیا کەنەك تەنها بەپارتی پێشکەوتنخواز، بەڵکو بە ناڕەزایی ناو پارتی گەلیش، ماوەیەك بوو بەرهەڵستی گەورە دەکرا، بۆ ئەوەی ئەم ئۆپۆزسیۆنە بەلای خۆیدا ڕابکێشێ، ڕێگەی بەبلاو کراوەکان داوە لەهەواڵی هێرشی سەرەتایی (١٥٠) کورددا بەسەرۆکایەتیی شێخ سەعید بۆ سەر ئەرغەنی زیادەڕەوی بکەن و، وەکو یاخی بوونێکی دژی کۆمار بلاوی‌بکەنەوە.

٣-هەرچەندە حکومەت بەڕاستی بەئاگا هێنراوەتەوە و، ڕوو بەڕووی ئەم مەترسییە نوێیە کراوەتەوە، بڕیاردانی، بەپێی ئەو ڕێگەیەی کە سەبارەت بە پاتریارکێتی گرتوویە بەر، هەوڵێکە بۆ ئەوەی بە هەر نرخێك بێ ناکۆکیەکانی لەگەڵ یۆنانیەکاندا چارەسەربکات. زانیاریەکانی دوو ڕۆژی ڕابردوو، ترسناکیی بزووتنەوەکە دەسەلمێنن.

٤-پێدەچێ تا ٢٦ شوبات یاخیەکان، بەپێی ئارەزووی خۆیان، قەوارە و قورسییان بووبێ. ژمارەیەکی دیاریکراوی ئەفسەر و خەڵکی بێزار و ناڕازی پەیوەندییان پێوەکردبوون و، گەورە ترین بەشی ناوچەکانی دەرسیم، دیار بەکر، مووش، بدلیس، مەلاتییەیان داگیر کردبوو. دەشێ سەربازەکانی ئەوهەرێمانە خۆیان پێنەگیرابێ، چونکە خەرپووت، لەگەڵ ئەوەیشدا کە فەرماندەییەکانی‌فیرقەی ١٧ ی پیادە و میکانیزەی ٢٦ی تێدا بوون، ماوەیەك بوو بەدەست یاخیەکانەوە بوو (ئەمانە کۆتایی‌ی کانوونی یەکەمی ساڵی ڕابردوو و، پاش گەڕانەوە لەئۆپەراسیۆنی دژی نەستۆریەکان ڕاگەیاندران).

٥-لە ٢٦ مانگەوە یاخیەکان وردە وردە کز بوون و، بە گەلەکۆمەیەکی نەخشە بۆکێشراوی محەممەد بەگێکی نەیاری حکومەت لەخەربووت وەدەرنران .ڕۆژانە و سەبارەت بەوشارانەی کەهەمان هەڵوێستی خەرپووت وەردەگرن، ڕاپۆرتمان پێدەگات. دەبێ ئەوە بزانین کە مەسەلەکە بووەتە کێشمەکێشی تەنها شارێك لەگەڵ وڵاتدا. سوپا تا ئێستا بەشداریی وەدەرنانی یاخیانی نەکردووە.

٦- حکوومەت لە ٢٦ی مانگەوە متمانەی بە خۆی کردوەتەوە و، گیانێکی هاتۆتەوە بەر. زمانی لەمەڕ مەسەلەی پاتریارکییش توند کراوەتەوە. سەربازەکان بۆ ئەوە دانراون کە هەرکاتێك هەر جموجوڵێك لەهەرێمەکارتێکراوەکاندا ڕوویان دا .بەرەنگاری یاخی بوون ببنەوە.

٧- پێنج فیرقەی چاودێریی ئەدەنە، وەك ڕاگەیاندران، ئەمانەن:

فیرقەی (٢٣) لە ئیزمیتەوە[1]،

(٨) لە ئەنگۆرەوە،

(٧) لە ناو ئەدەنە خۆیەوە.[2]

دوانەکەی تریش: فیرقەکانی (٥٧)ی سیمیرناو (٤١)ی نغدە (Nighda)[3] یان (١٧)ی مەنەمەن[4] دەبن.

٨- ئەوفیرقانەی کەلە باکوورەوە دەبزوێن، ئەمانەن:

فیرقەی (٥) لە سیواسەوە،

(٩) لە ساری قامیشەوە،

(١٢) لە قارسەوە.

فیرقەکانی (١٥) یسامسۆن و(٣) ی تەرابزوونم حساب نەکردوون، چونکە پاراستنی ناوچەکانی خۆیانیان، لەکاتی هەڵایسانی ئاژاوە لەکەنارەکانی دەریای ڕەشدا، پێ سپێردراوە.

ڕائید ئاڕ. ئی. هارینك

وەزارەتی دەرەوە: ٢٦٢/٤٢٤، ل: ١٠١-ژ: ١/١٠٣

************

---

١ ویلایەتێکی تەنیشتی ڕۆژهەلاتی ویلایەتی ئەستەمبوڵە. (س)

٢ ناوەندە ویلایەتێکە بەو ناوەوە لە بەری باکووری ڕۆژهەلاتی دەریای سپیی ناوەڕاست. (س)

٣ ویلایەتێکی بەشی باشووری ناوەڕاستی تورکیایە خوار ئەوشوهرو سەروو مەرسین. (س)

٤ قەزایەکی ویلایەتی ئیزمیرە. (س)

## هاوپێچی (٢) ی ژ: (٩)

### کورتەی هەواڵی بڵاوکراوە خۆماڵییەکان سەبارەت بەیاخی بوونی گەنج

**٢٣ شوبات:**

یاخی بوون کە سەرەتا وا هەست دەکرا باندێکی ڕێگر و چەتە بەرپایان کردبێ، بەپێی دەمودووی گشتیی ڕۆژنامەکان، ئێستا زۆر ترسناکترە. دەرکەوتووە دەستی دەرەکی لەپشت ڕووداوەکەدایە. هەندێ ڕۆژنامە گەڕانەوەی خێرای عیسمەت پاشایان بۆ ئەنگۆرە، بە مەترسیی بار ودۆخەکە لێکدایەوە.

**٢٤ شوبات:**

چاپەمەنیەکان کە تا ئێستاله "ڕووداوی گەنج" دوواون، ئیتر باس لە "یاخی بوون" دەکەن کە ویلایەتەکانی مووش، ئەرغەنی، دەرسیم، دیاربەکر، ماردین،سیوەرەك، سعرت، بدلیس،وان، هەکاری، وئورفەی گرتۆتەوەو، حوکمی عورفی لەسەرتاسەری ئەو هەرێمانەدا ڕاگەیەندراوە.

**٢٥ شوبات:**

کابینە بەیانی بۆ کۆبوونەوە بانگهێشت کراو، بارودۆخەکە تاووتوێ کرا. پاشان وەزیری ناوخۆ لە وتەیەکیدا لەوە دووا کە: پیلانگێڕەکان یاخی بوونێکی گشتییان سازدا، کە دەبوو کۆتاییی مانگی ئادار دەستی پێ بکرایە. یاخی بوونەکە کۆنە پەرستانەیەو، کوڕی سوڵتان عەبدولحەمید بزواندوویەتی. هاندەرانی یاخی بوونەکە خەڵکی نەزان و ساویلکەیان هەڵخەڵەتاندووە تا پەیوەندییان پێوەبکەن، وتوویانە: حکوومەتی تورکیا هانی بێباوەڕیی داوە و، خەلیفەی دوور خستۆتەوەو، بەدڕەوشتی ژنانی بڵاو کردۆتەوە. شێخ سەعید وای پیشاندەدات کە لەپێناوی دین و ڕەوشتدا بە دەسەڵاتێکی‌خوایی ڕەفتار دەکات و، داوای گەڕانەوەی خەلافەت و شەریعەت و دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ دەکات.

دەڵێن هێزی شێخ سەعید لە(٧٠٠٠) حەوت هەزار کەس پێکهاتووە و، هەموویان برنەوی ماوزەر (Mauser)یان پێیە. بەلام ئەگەر ئەوناوەندانە نەگرن کەچەکیان تێدایە ، ئەوا ژمارەیان زیاد ناکات.

هەموو ڕۆژنامەکان پێ لەسەرئەوە دادەگرن کەبارودۆخەکە بە فیتیی دەرەوەیە. (تەنین) و (تەوحید) گەیشتوونەتە ئەو ئاستەی کەبڵێین: فڕۆکە بریتانیەکان بەیاننامەکانی شێخ سەعیدیان بلاو کردۆتەوە. (وەتەن) مەسەلەکە بۆ ئیدارەی هەڵەو نەبوونی ئیدارەی لێهاتوو دەگێڕێتەوە. هەروەها دەڵێ هیچ بەڵگەیەك نییە بێ ئاگایی بریتانیا بسەلمێنێ، بەلام هاودەنگی ئەوەیە کەوا ڕێکەوتێکی سەیرە ئەم یاخی بوونە لە کاتی دەست بەکاربوونی کۆمسیۆنی مووسڵدا سەری هەڵداوە.

***٢٦ی شوبات:***

سەرجەم بلاوکراوەکان پڕۆپاگەندەی ئەوە دەکەن کە دیاربەکر، ئەرغەنی، دەرسیم، خەرپووت و مەلاتییە لە دەست یاخیەکاندان.

هێزەکانی حکوومەت دژی یاخیان نێردراون، بەلام لەبەر سەرماو سۆڵەی سەختی وەرزی زستان و نەبوونی پەیوەندی، هێشتا نەیانتوانیوە دەستیان پێبگەیەنن، لەگەڵ ئەوەیشدا فڕۆکەکان ئەنجامی باشیان بەدەست هێناوە.

***٢٧ شوبات:***

ڕۆژنامەکان زیاتر گەشبینن کە هەلو مەرجەکە، هێندەی یەکەم جار هەستی پێ دەکرا، خراپ نییە. برووسکەیئاژانسی ئەنادۆڵ دەڵێ: داگیر کردنی خەرپووت لەلایەن یاخیەکانەوە ڕاست نییە و. دیاربەکر و ئەرغەنی و مەلاتییەیشیان نەکەوتوونەتە دەست.

بەپێی (جمهووریەت) هێزەکانی حکوومەت سەرەتای مانگی مارس دەست لەیاخیان دەوەشێنن و، لە دوو هەفتەدا بزووتنەوە کە دادەمرکێنێتەوە.

ئەنجومەن سوپاسی محەممەد بەگی بەگزادەی کرد کەپاش هەڵاتنی والی، خەڵکی خەرپووتی ڕێکخست و یاخیانی ڕاماڵی. ئەم پیاوە کە وەك بێ لایەنێك بۆ دوا هەڵبژاردن خۆی کاندید کردبوو، ڕێکخستنەکانی پارتی گەل پشتیوانییان نەکرد. ڕۆژنامەکان دەڵێن: ئەگەر جارێکی تر خۆی بپاڵێوێتەوە،ئەواپشتگیری لێ دەکرێ. بەشێکی زۆری سەرنجی بڵاوکراوەکان ئاماژە بەوە دەکەن کە تورکیا، ئەگەر بەرەو ڕووی مەترسیی دەرەکی ببێتەوە، بەڕاستی یەکگرتووە.

*۲۸ شوبات:*

هەواڵەکانی "ئەنگۆرە تێلیگرامز" دڵنیاکەرەوە بوو و، ڕۆژنامەکان ڕەزامەندیی گشتییان دەربڕی. هەروەها بەڕەسمی نکوڵی لەوە کرا کە گوایە بیانەوێ ڕەشبگیر (نفیر عام) یان ڕێوشوێنی زیادە لە قوستەنتەنییە ئەنجام بدەن.

"تەنین" لە سەر چاوەی نووسینگەیەکی ئەدەنەوە ڕایگەیاند کە لەدایکبووانی ۱۸۹٤-۱۹۰۲ بۆ لیوا عەسکەرییەکان داواکراون و، سەرجەم هۆیەکانی گواستنەوەی مەدەنی کەم و زۆر بۆ سوپا قۆرخ کراون.

زۆربەی بڵاوکراوەکان خۆشحاڵییان لەوە دەربڕی کە یاخی بوون ئیتر تەشەنە ناکات و، بەردەوام ڕووداوەکە بۆ دەست تێوەردانی دەرەکی دەگێڕنەوە و ئاواتە خوازن هاندەرانی ڕاستەقینە سزابدرێن.

*ای ئادار:*

ڕۆژنامەکان هەر گەشبینن، هەواڵی جیاوازیی بیروڕا لەناو سەرخێڵەکاندا و پەیمانی ئەمەکداریی هەندێ شێخ بۆ حکوومەت لەئارادایە.

بڕیار لەسەر تەرخانکردنی (۲٦٥۰۰۰) لیرەی تورکی بۆ خەرجیی (نەفیری جوزئی) درا.

(وەقت) دەڵێ: فەرەنسە ڕازی بووە تورکیا بەسەر بەشی ئەو لە هێڵی ئاسنی بەغدادا سەرباز بگوێزێتەوە. بەپێی (جمهووریەت) یاخیەکان جبەخانەیەکیان لەخەرپووت گرتووە.

## ٢ ئادار:

چاپەمەنیەکان دەڵێن: بارودۆخەکە بەردەوام باش دەبێ. شەڕ لەنێوان جەماوەری مەدەنیی ناوخۆو یاخیاندا بەردەوام ڕوودەداو، یاخیەکان لە هەموو لایەکەوە دەشکێن.

## ٣ ئادار:

هەواڵی شەڕوشۆڕی بەردەوامی خەڵکی مەدەنی و یاخییان. بەپێی هەندێ ڕۆژنامە: پالوو، سیلوان، چەمشگەزەك، و وارتۆ[1]، پاککراونەتەوە،بەلام بەپێی هەندێکی تر، هێشتا لە دەستی یاخیەکاندان.

(جمهووریەت) دەڵێ: هێزە سەرەکیەکانی تورکیا چوار و پێنجی مانگ دەگەنە هەرێمی یاخی.

وەزارەتیدەرەوە: ٢٦٢/٤٢٤، ل: ١٠٢-١٠٣ ، ژ: ٢/١٠٣

****** *** *** ***

١ قەزایەکی باکووری ڕۆژاوای ویلایەتی بدلیسە. (س)

## هاوپێچی ٣ی ژ (٩)

### تۆماری گفتوگۆیەکی ٣ ئاداری ١٩٢٥ لەگەڵ جەنەرال شوکری نایلی پاشا

سەردانی فەرماندەی فەیلەقم کرد و ئاگادارم کردەوە کە جێگری مارشاڵی هێزی هەوایی(سێر سێفتن برانکەر – Sir Sefton Brancker) بەڕێوەیە بۆ بریتانیا و، دەیەوێ لە(٥ و ٦)ی مانگدا بگاتە قۆنیا و، لەوێوە بێتە قوستەنتەنییە.

لەبەرئەوەی ئامادەبوو قسەبکات ، باسی ویلایەتەکانی ڕۆژهەلاتم کرد وو وتم: "هەمووشتێك ،جگە لە هاوار هاوار، ئاسایی بووەتەوە". ئەو زۆر جددی بوو و، وتی: " بەهیچ جۆرێك هیچ شتێك ئاسایی نەبووەتەوەو، زیاترە لەوەی، وەکو من وتم، مەسەلەی (١٥٠) کوردی ئاژاوە گێڕی تالانچی بێ، بەڵکو هی (٥٠٠٠) پێنج هەزار کەسی باش چەکدارکراوە کە دەیانەوێ حکوومەت برووخێنن.

من وتم: سەربازی تەواویان لەونزیکانە دا هەیە و، دەتوانن ڕێ لە (٥٠٠٠) چەتەو تالانچی بگرن. بەلام ئەو وتی: ئەوان چەتە و ڕێگر نین، بەڵکو جەنگاوەری پڕ چەکن و، ژمارەیەك ئەفسەر و سەربازی سوپای نیزامیشیان تێدایەو، بە چەند کۆمەڵە سەربازێك چاریان ناکرێ. ئەوێ هێندەی سەرباز لێ نییە و، ئەوانەیش کە لەوێن بۆ "کاری تر تەرخان کراون". هەروەها وتی: بەم زووانە پێنج فیرقەمان دەگەنە ئەدەنە و، دەتوانین خێرا بۆ هەرێمەکانیان بنێرین؛ هەر کە بەفرەکەیش توایەوە، سێ فیرقەی تر لە باکوورەوە ڕەوانە بکەین.

وتی: خۆی نە خەڵك و نە ناوچەکە دەناسێ، بەلام سەرۆکی دەستەکەی شارەزایە. هەروەها درێژەی پێدا و، وتی: زۆر جێی مەترسیبوون و حەزیان لە شەڕ دەکرد. بەڕەنگار بوونەوەیشیان، بە هۆی نەبوونی پەیوەندی و سروشتی ڕێگە و هەرێمەکەوە، ئاسان نەبوە. بە قسەی ئەو، ئەگەر یاخییەکان لەو شوێنانەی

ئێستایاندا گەمارۆ بدرێن، زوو لەناو دەچن. بەلاّم کردەوەی نیزامیی دژی کورد، بەگشتیو دەبێتە مایەی ڕاپەڕینی هەموو کوردەکان.

کۆلۆنێل نەقیب فەیسەلّ بەگی سەرۆکی ئەرکان، لەو کاتەدا هاتە ژوورەوە .هەولّم دا بیروڕای خۆیم پێ بلّێ، بەلاّم لەبەرئەوەی جەنەڕالّ شوکری نایلی پاشایش لەوێ بوو، واتە بوونە دووکەس، هیچی نەدرکاند.

تێبینی:

زانیاریەکان لەسەرچاوەیەکی فەڕەنسییەوە وەرگیراون. گفتوگۆکە دوو بایەخی هەبوو:

یەکەم/ جەنەرالّ شوکری یەکەم جارە زانیاریی عەسکەرییم ئەداتێ.

دووەم/ دەرکەوتو بەڕای سەرۆکی ئەنجومەنی وەزیران، تا ئێستا ئیجرائاتەکان ئەوانە بوون کە بۆ کۆنترۆلکردنی بارودۆخەکە کراون.

پێم وایە "بۆ کاری تر تەرخانکراون" ی جەنەڕالّ ئەوە دەگەیەنێ کە خۆیان بۆ شەڕی عێراق ئامادە دەکەن، یاخود لەبەر ئەوەی کە ژمارەیەك کوردیان تێدایەو سەرگەرمی ئاگادارکردنەوەی یەکترن.

وەزارەتیدەرەوە: ٤٢٤/٢٦٢، ل: ١٠٣-١٠٤ ، ژ: ٣/١٠٣

*** *** *** *** ***

## هاوپێچی (٤) ی ژمارە (٩)

## زانیاری لەسەر بزواتنی سەرباز بەرەو ویلایەتەکانی ڕۆژهەلات

بەپێی زانیاریی سەرچاوەیەکی فەڕەنسی، دەستەی جەنەڕاڵی تورکی (٥) فیرقــە لەئەدەنــە کۆدەکاتــەوەو، بــەرەو ڕۆژهــەلات (جــەرابلوس یــا ڕەئســـولعەین) بەشــەمەندەفەر و، پاشــان بــە ئاڕاستەی بــاکوور و بــاکووری خۆرهــەلات بــەپێ، بــۆ پاککردنەوەی ولات لەیاخیان ڕەوانەیان دەکات.

نایشیانەوێ، تا ئەو کاتــەی بەفرەکــە دەتوێتــەوە، هیــچ کردەوەیەکی ســەربازی لەناوچەی سەختی باکووری ڕۆژئاوای دیاربەکر دەست پێ بکەن.

برگەیــەك لەڕۆژنامەیــەکی نــاوخۆوە دەرکــەوت کــە تێیــدا هــاتووە: مۆڵــەتی دەسەلاتدارانی فەڕەنسە بۆ گواســتنەوەی ســەربازەکان، بەســەر ئــەو بەشــەی هێڵــی ئاسنی بەغدادا کە بە دەست ئەوانەوەیە، وەرگیراوە.

ڕێبوارێك کە ٢٧ شوبات ئەدەنەی بەجێ هێشتبوو، ئەم زانیاریانەی پێدام:

١- چوار ڕۆژ پێشتر، کاتێك لە (دۆرت یۆڵ) بووە، هیچ سەربازێکی لێ نەبوە.

٢-٢٥ی مانگ عەرەبانە لەئەدەنەدا دەست نەکەوتووە. ئەوسەرکارەی کــە زووتــر ئیشی لا کردبوو، پێی وتبوو: سوپا داوای هەموو ئەسپە بە کەڵکەکانی کردووە.

٣- هــەموو تورکــەکان کــە هاتبوونــە شــارەکەوە، لەگــەڵ جەندرمـــەدا تێکــەڵ بوویبوون و خۆیان کۆ کردبووەوەو، خەریکی ڕێ ڕۆیشتنی عەسکەری بوون. ئــەو ڕۆژە کە ئەوێی بەجێ هێشتبوو، (٥٠٠)کەس لە وێستگەکە بوویــوون و مەشــقیان کردبــوو. (١٠) عەرەبانــە - بڵێــین: ســێ ســەد کــەس- بــە شــەمەندەفەری قوســتەنتەنییەوە بەسترابوون، ئەمانە لە یەنیجــەی خاڵی گەیشتن بە مارسین[1]، کە وارگۆنێك چــاوەڕێی

---

[1] ویلایەتێکی تورکیایە لەسەر باکووری ڕۆژهەلاتی دەریای سپیی ناوەڕاست. (س)

کردبوون، وەستاون و بە هێڵی مارسینادا نێردراونەتە خوارەوە. ئەو دەیزانی کە هیچ شەمەندەفەرێکی سەربازی لە ئەدەنەوە بە رەو رۆژهەلات نەرۆیشتووە.

٤- پیاوەکە، لە رێگەی قوستەنتەنییەدا، شەمەندەفەرێکی لە ئەسکیشەهر[1] و دوانیشی لە نێوان ئەو وێستگەیە و (ئیرمی Irmi) دا بینیبوو. هەریەکەیان (٥٠ پەنجا) عەرەبانەی داپۆشراویان پێوە بووە و، نیوە بوون لە خەڵك بەجلی سەربازی و کەل و پەلەوەو، لە سەربازی تازە نەچووبوون.

هێندەی بینیبووی، تەنها نیوەیان برنەویان پێ بوو بوو و، چەك لە سەر شەمەندەفەرەکە نەبوو بوو، رەشاشیشی بەدی نەکردبوو.

__تێبینی:-__

هەر عەرەبانەیەك ئەگەر (٢٠) کەسی بۆ گەشتێکی دوور تێدا بووبێ، ئەوا دەکاتە (١٠٠٠) کەس لە هەر شەمەندەفەرێکدا. پێم وایە ئەو سەربازانە بەشێك بوون لە فیرقەی (٨)ی ئەنگۆرە و (٢٣)ی ئیزمیت. هەر فیرقەیەك (١٥٠٠)کەسە.

ناتوانم هۆی رۆیشتنیان بۆ مارسینا، ئەگەر بۆ مەبەستی ئاسایشی ناوخۆنەبێ، دیاری بکەم و ، هیچ زانیارییەکیشم لە بارەی نا ئارامیی ئەو ناوچەیەوە نییە.

وەزارەتی دەرەوە ٤٢٤/ ٢٦٢، ل: ١٠٤، ژ: ٤/١٠٣

***   ***   ***   ***   ***

[1] ویلایەتێکی باکووری رۆژاوای تورکیایە (س).

ژ: ١٠

## لە مستەر لیندسەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلەین- (١٦ مارس گەیشتووە)

(ژمارە: ١٩٩)

قوستەنتەنییە، ١٠ ئاداری ١٩٢٥

گەورەم،

من بۆ تەواوکردنی برووسکەی ژمارە ١٧٨ی سێی ئەم مانگەم، سەبارەت بە هەڵوەشاندنەوەی کابینەکەی فەتحی بەگ، دەمەوێ پێتان بڵێم: دەقی ئەو پێشنیارەی کە لە کۆبوونەوەی پارتی گەلدا لە دژی ئەو دەنگیان لە سەر دا، ئاشکرا نەکرا. هەرچەندە بە شێوەیەکی گشتی وا هەست دەکرێ تاکە هۆکار کە تەرازووەکەی لە دژی ئەو لاسەنگ کردبێ، خۆ هەڵقورتاندنی بووە لە چەنە بەرچەنە وەستانەوەی مستەفا کەمال پاشادا. ئەمەش ڕووناکییەکی سەیر دەخاتە سەر باری سیاسیی تورکیا. ئەنجامی دەنگدانەکە لە ناوپارتەکەدا (٩٠) بەرامبەر (٦٠)بووە .زیادبوونی (٣٠ یان ٤٠) ئەندامی ئاشکرا کراوی ئۆپۆزسیۆن بۆ ئەمەی دوایی، ڕێگە بۆ کاریگەریی سەرۆك خۆش دەکات و، ئاشکرا دەبێ کە بە ڕاستی پێویستە حکوومەتی عیسمەت پاشا تەنها کەمینەیەکی سیاسەتمەدارە قەناعەت پێکراوەکانی ئەنجومەن پشتگیریی بکەن. کەس پێی وانییە ئەم کابینەیە هیچ پشتیوانێکی ماددی و سۆزی ڕاستەقینەی دەوڵەتی بە گشتی مسۆگەر کردبێ.

٢- ئەم بۆچوونانە هیچ جیاوازییەك بۆ کردارەکەی حکوومەت دروست ناکەن، چونکە ئەندامانی پارتی گەل هەر بیروڕایەکی تایبەتی خۆیانیان هەبێ دەبێ بە پێی ڕێنوێنی کۆبوونەوەی لیژنەی ڕێکخستنی پارتەکەیان دەنگ بدەن. کابینەی ئێستا کە سەرۆك پاڵپشتیەتی، لە چاوئەوەی پیشوودا کاریگەریی زیاتری دەبێ بۆ دابینکردنی ئارامی. قەیرانەکە مستەفا کەمالی بە ئاشکرا ناچار کرد هەست بەو سڵەمینەوەیە نەکات کە چەند مانگێکە کردوویە و، پێدەچێ وەکو فەرمانڕەوایەکی ڕاستەقینەی

وڵات دەربكەوێ. ناوبراو نەك تەنها خۆی (فەتحی)ی سەرۆوەزیری دەركرد بوو، بـەڵكو وەك لە بڕگەی چواری خوارەوەدا دەبینرێ، دەبوو بە ڕەسمی بەو ئیجرائاتانـەی كـە بە پێی یاسای نوێی نائاسایی بۆ بوژاندنەوەی نیزام و ڕیكو پێكـی وەرگیراون، ڕازی بێ. بەم جۆرەش بۆماوەی دووساڵ بەڕێوەبەرایەتیی D .O .R .A ی توركی[1] دەكات.

٣– بەیانیی چواری ئادار پارتەكە كۆبووەوەو، بەرنامەی حكوومەتی نوێی تێدا ڕاگەیەندراو، بڕیاری لەسەر دراو ، نیوەڕۆی هەمان ڕۆژ خرایـە بـەردەمی ئەنجومـەن .عیسمەت پاشا لەبارەی خواستی سەرجەم وەزیرەكانەوە بۆ پەیوەندیی دۆستانە لە دەرەوە و چاكسازی لە ناوخۆی وڵاتدا، دووا. سەبارەت بە پێداویسـتی هەنووكـەیش، دوو ڕێوشوێن كە بریتیبوون لە:

یەكەم: یاسای "سەقام گیر كردنی هێمنی"

دووەم: دامەزراندنی دوو دادگەی ئیستیقلال[2]، ڕاگەیەندران.

پارتی پێشكەوتنخواز بە توندی دژایەتیی هەردوو كردارەكەی كرد، بـەڵام بـێ هوودە بوو و، هەمان ڕۆژ كرانە یاسا، ئۆپۆزسیۆن ئاماژەی بەوە كرد كە فەتحی بەگ تەنها هەفتەیەكە بەكۆی دەنگ بڕوای پێبەخشراوە و، پرسی: دەبـێ چـی ڕوویـدا بـێ كە بووبێتە هۆی لە كارلابردنی. وەڵامی عیسمەت پاشا پێچەوانە بوو و، كەمێك زیـاتر لەو مامەڵە بەهێزەی وا تا ئێستا لە تەك قەیرانەكەدا كراوە، بە پێویست زانی.

٤– دادگـەكانی ئیسـتیقلال دوانـن و، یـەكێكیان لـە ئەنگۆرەیـە و، ئـەویتریان شوێنی دیاریكراوی نییە، بەڵام نیازوایە لە ناوچەكانی یاخی بووندا دابـنرێ. حوكمـی مـردن كەلەمـەی دواییانـەوە دەردەچـێ، دەبـێ خـێرا جێبـەجێ بكـرێ: هـی ئـەوەی ئەنگۆرەیش پێویستە ئەنجومەن بڕیاری لە سەر بدات. یاسای بووژاندنـەوەی نـیزام و ڕێكو پێكی، ماوەی دووساڵ كاری پێ دەكرێ. حكوومەت، بەم پێیە، لە سەر بڕیاری

---

[1] دەبێ كورتكراوەیەكی توركی بێت ساختەكرایەوە.

٢ لە بەرنەوەی لە ڕۆژنامەوانیی كوردی ئەو سەردەمەیشدا، ئەو دادگایە بە (ئیسـتیقلال) نـاوی ڕۆیشـتووە، پێویست بینرا هەروا بهێڵرێتەوە. (س)

سەرکۆمار و بە فەرمانێکی کارگێڕی دەشێ هەر ڕێکخستنێك یا دوور بینییەکی کاردانەوە یاخود یاخی بوون بۆ شێواندنی سروشتی سیستەمی کۆمەلایەتی و ئارامی و ئاسایشی گشتی قەدەغەبکات. ئەم جۆرە تاوانانەیش دەخرێنە بەردەم دادگەی ئیستیقلال.

٥- ئەنجومەن بەرهەڵستیی یاساکەی کرد، چونکە ئاڵۆز بوو. بێگومان ئاسان نییە هەست بەوە بکرێ کە چۆن تۆڕی سەر کوتکردن هەڵدەدرێ تا ڕووبەرێکی فراوانتر بگرێتەوە، لە بەرئەوەی حکوومەت بۆ ماوەی دووساڵ سەرپشك دەکات هەر نیازێکی هەبێ بە کردەوە جێبەجێی بکات. بەرامبەر کێکە، بووە تەقینەوەیەکی بەهێزی ڕەجەب بەگ بە ڕووی چاپەمەنیەکانی قوستەنتەنییەدا; بە قسەی ئەو، بیرۆکەی یاساکە ڕەوا بوو، ڕۆژنامەکان لانەی ماران بوون، دەبوو دەمکوت بکرێن و، لە ناو ببرێن و، پاك بکرێنەوە. تا ئەمانەیش نەکرێن، وڵات ئاشتی و ئارامی بە خۆوە نابینێ. کاریگەریی دیاری یاساکە لە سەر چاپەمەنیەکانە، حکوومەت وتبووی سانسۆر نییە، ئەوی ڕۆژنامەکان ئێستا، لەبەر ئەم یاسا نەرمەی چاوترسێنکردن بە دیمەنێکی دادگەیی و هەروەها ڕێوشوێنێکی نەرم بەر لە دانیشتنی دادگەی ئیستیقلال، لە هەل و مەرجێکی زیان لێ کەوتووی ئەنگۆرە دا دەیلێن، خۆ ئەگەر سانسۆرێکی توند و تیژ هەبێ، ئەوا بە دەگمەن دەوێرن بدوێن. ٦ ئادار و ڕۆژێك پاش دەرچوونی یاساکە، سێ ڕۆژنامەی قوستەنتەنییە داخران کە بریتی بوون لە (تەوحیدی ئەفکار) ی زمانی حاڵی ئیسلامیی موحافیزکار کە زۆرترین خوێنەری لە وڵاتدا هەیە و، دوو ئێوارە بڵاوکراوەی بچووکتر(سۆن تێلیگراف Son Telegraph) و (ئیستیقلال . ,Istiklal )دوو ڕۆژنامەیش لە تەرابزوون و، یەکێك لە ئەسکیشەهر و یەك لە ئەدەنە و سێ چوار بڵاوکراوە و گۆڤاریش، هەمان ڕیوشوێن لە دژیان گیرایەبەر. تا ئێستا ڕۆژنامەکان خۆیان لە بڵاو کردنەوەی هەندێ گوتار بە دوور دەگرن و، دووسێ ڕۆژی یەکەم زاتیان نەدەکرد هیچ هەواڵێکی ویلایەتەکانی ڕۆژهەلات بڵاوبکەنەوە. حوسەین جاهیدی (تەنین)ی تاکە ڕۆژنامەی ڕاستەقینەی تورکیا، ڕایگەیاند: ئیتر

بابەتی سیاسی بڵاوناکاتەوە و ستوونی سەرگوتارەکەی پڕبوو لە بیرەوەریی دوورخستنەوەی بۆ ماڵتا و، ئەم یادەوەریانەیش سەرزارەکی بوون و، دژی بریتانیا نەبوون.

٦- هیچ گۆڕانێکی دیاری زادەی ئەم ڕژێمە نوێیە، لە ڕووەکانی ترەوە، تێبینی نەکراوە. بەڵام ناشێ ڕێکخستنی شارو شارۆچکەکانی پارتی پێشکەوتنخواز، ئەگەر بە تەواوی هەڵیاننەوەشێننەوە، گەڕیان پێ نەکرێ. دادگەکانی ئیستیقلال دامەزرێنراون و، دادوەرەکان دیاری کراون کە هەموویان پشتیوانی توندڕەوی مستەفا کەمالن و، تەنها سەرۆك قلیچ عەلی لە برووسکەکانی پێشوودا ناوی هاتووە .تاکاتی نووسینی ئەمە، هیچ حاڵەتێك نەخرابووە بەردەم ئەم دادگە تازانە.

٧- پڕۆپاگەندەی زۆر لەبارەی یاخی بوونەکەوە هەن کە پشت ڕاستکردنەوەیەکی هێندە کەمیان هەیە ناتوانرێ متمانەیان پێبکرێ. دوو سێ ڕۆژ بوو چاپەمەنیەکان هیچیان نەبوو بیڵێن، ئەوە نەبێ کە هێزەکانی سەرکوتکردن بەم زووانە دەکەونە خۆ. ئەمڕۆ بەگشتی بڵاویان کردەوە کە (٥٠٠٠) یاخی پەلاماری دیار بەکریان داوەو، بەرپەرچیان دراوەتەوە. یا ئەوەتا ئەم هەواڵە و وێنەکەیشی لەلایەن حکوومەتەوە دراون، یاخود سبەینێ هیچ ڕۆژنامەیەکی قوستەنتەنییە نابینرێ و هەموویان دادەخرێن. مستەر نایتم نارد بۆ تەرابزوون بۆ ئەوەی هەندێ هەواڵمان دەست بکەوێ.

ئەوەی کە ئێستا لە ئارادایە لە ڕاپۆرتی ڕائید (هارینك) ی پاشکۆی عەسکەریی ئەم باڵیۆزخانەیەدا هاتووە، بە خۆشحاڵییەوە لەگەڵ ئەمەدا بۆتان بەرزدەکەمەوە[1].

ئاڕ. ئێس. لیندسەی

وەزارەتی دەرەوە ، ٢٦٢/٤٢٤ ، ل: ١١٢-١١٤، ژ: ١١٣

*** *** *** *** ***

---

[1] چاپ نەکراوە

## ژ: ۱۱

## لە مستەر لیندسەیەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلەین - (۳۰ مارس گەیشتووە)

## ژمارە (۲۱۹)

## قوستەنتەنییە ۲۳ ئاداری ۱۹۲۵

گەورەم،

لەو شەش ڕۆژەدا کە لە ئـەنگۆرە بەسەرم بردن، سێ گفتوگۆی سەبارەت بە بابەتی گشتی و تایبەتیم لەگەڵ عیسمەت پاشا و، بەلای کەمیشەوە سیانم لەگەڵ تۆفیق ڕوشدیی وەزیری کاروبارەکانی دەرەوەدا کرد. وەزارەتـی دەرەوە باش شارەزای ئەوەی پێشوویانە و، پێویست بە ناساندنی زیاتر ناکات. بەلام تۆفیق ڕوشدیی وەزیری دەرەوە، کارێکی باشی نەکردە سەرمن. بە ڕواڵـەت خۆش مەشرەبە، بێگومان نەویستراوترین شێوازی پیا هەڵدانی توانج ئامێزی هەیە، بەلام ڕاڕایە و، بڕوای بە خۆی نییە. چەنە بازەو قسەکانیشی بێ ناوەڕۆك و واتان. لە بەڵگە هێنانەوە و پێ داگرتنە نا دڵسۆزانە کانیشیدا، بە دڵ گەرمییەوە دەدوێ. لەوانەیە هەندێ لە قسەکانیتان پێ ڕاگەیەنم. بەلام لە یادم نییە باوەڕم بە هیچ کام لە قسەکانی کردبێ. ناوبراو خۆشبەختانە بایەخێکی ئەوتۆی نییە و، لە ڕاستیدا عیسمەت پاشا خۆی سیاسەتی دەرەوە بەڕێوە دەبات.

٢- ئەو باسانەی کە لە نێوان من و هەردوو وەزیردا وتوێژیان لە سەر کرا، بە پێی تەوەرەکانو هەر سەرنج و تێبینیەکی پێویستیشیان لە بڕگەکانی داهاتوودا بۆ دەنووسم. دووسێ بابەتیش بۆ ڕاپۆرتەکانی تر دەهێڵمەوە.

٣- عیسمەت پاشا لەوەلامی پرسیارە هەمە جۆرەکانمدا لە سەر ئاژاوە و یاخی بوونی کوردستان وتی: بە بارودۆخەکە نیگەران نییە. بە قسەی ئەو: یاخی بوونەکە لەو هێرشەی ئەم دواییانـەدا کـە کرابـووە سەر دیاربەکر و بە تـەواوی تێکشکابوو .گەیشتبووە لوتکە. هێزە عەسکەریەکان کۆکراونەوە و، یاخی بوونەکە بە ماوەیەکی

کورت دادەمرکێنرێتەوە. هەروەها ترسی نەبوو لە بلاوبوونەوەی نا ئارامی بۆ وان و بدلیس، چونکە دانیشتوانی ئەو ناوچانە دڵسۆز بوون. لەوەش زیاتر قایمکاریی باشی کردبوو. پێشبینیی گیروگرفتی لەو هەرێمانەدا نەدەکرد کە کوردنشین نەبوون. دەبوو نیزام و ئارامی لە هەموو جێیەکی ولاتدا بەرقەراربن. ئەو هێزە تایبەتانەیش کە حکوومەت بردبوونی، ئەو دڵنیاییەیان پێ بەخشیبوو. تێبینی ئەوەم کرد، بە پێی چاپەمەنیەکان، (٥٠٠٠ پێنج هەزار) یاخی تەنها لە دەرەوەی هەرێمی دیار بەکر بوون. دەبێ هۆکاری ڕیشەیی و قووڵ بۆ ئەو سەرهەڵدانە هەبن. گومانی تێدا نییە کە حکوومەت دەیتوانی زوو یاخی بوونەکە دابمرکێنێتەوە، بەلام پێشنیاریان چۆن بوو بۆ لەبن دەرهێنانی ڕەگ و ڕیشەی موحافیزکاریی خراپ و نەتەوە پەرستی و بۆچوونی دینی یان هەرشتێکی تر، تا بەر بە درێژەکێشانی نا ئارامی بگرن؟ من ئەم پرسیارەم کرد، چونکە لە بەرژەوەندیماندا نەبوو بێ سەرەو بەرەیی ناوخۆی تورکیا لە ڕێی پێکهاتنەوەی ئاشتیانە لابدات.

٤- عیسمەت لەوەلامدا وتی: هەرگیز نایەوێ دەست لە سیاسەتی پێشکەوتن، کە هەمیشە لە سەرەتاکانی پرۆگرامەکەیدا بووە، هەڵگرێ. لەلایەکی ترەوە ویستی بە پێداگرتن لە سەر ئەم سیاسەتە، کۆتایی بەو باسە بێنێ کە لە بارەیەوە دەدواین، دەیەکی ناوچەکوردنشینەکان لە لایەن سەر خێڵەکانەوە بەڕێوە دەبرێن و، بەمەش جڵەوی دەسەلاتیان بۆ درێژە پێدانی ڕژێمی خێلایەتی بە سەر جوتیاراندا گرتۆتە دەست. هەڵوەشاندنەوەی ئەمە، دەسەلاتی سەرخێڵەکانی سەرچاوەی هەموو گرفتەکان هەرەس پێ دێنێ. کشتیار، کاتێك بەرووبوومی خۆی دەدوورێتەوە، ئیتر هەست دەکات لە زەوت و بێزار کردنەکانی ڕابردوو ڕزگاری بووە. چاکسازیی ئابووری چارەیەکی پێویستی سانا بوو، گۆڕانی سیاسیی نەویست.

٥-هەرچەندە عیسمەت ئەمەی پێنەوتووم، بەلام هەل ڕەخساوە بۆ ئەوەی کە سیاسەتی تەواوکاری (تەکامول) بگیرێتەبەر. سەرۆکی دەستەکە بە پاشکۆی سەربازی ئیتالیای وت: ئێستا (٥٠٠٠٠) کورد لە تورکیادان و، بەم زووانە ئەم

ژمارەیە تەواو کەم دەبێتەوە. ئەوانەش کە دەمێننەوە، بۆ ئیشی کەرتی گشتی بەکەڵك دەبن. لە هەمان کاتدا تاکە شێخ یان ئاغایەك لە کوردستاندا ناهێڵرێ.

٦- ئەم گەشبینیەی عیسمەت، هەموو ئەو تورکانەی گرتۆتەوە کە قسەم لەگەڵدا کردوون، دیپلۆماتە ئەوروپیەکانی ئەنگۆرەیش، پێیان وایە ئەمە دێتەدی. من وتم هیوادارم تورکیا پەیوەندی بە کۆمەڵەکەوە بکات، مەسەلەکەم زۆر بە ئاسان لە قەڵەم داو، وتم: کۆمەڵە ناوەندی گشتیی کۆبوونەوە و وتووێژە کە نوێنەری هەریەك لە (٥٠) نەتەوەی جیاجیای تێدا دەتوانێ هەستێ و، ئەوەی دەیەوێ بیڵێ و ئەوانی تریش گوێی لێ بگرن. شتێکی بێ مانایە یۆنان و بۆلگاریا ئازادبن لەوەی کە هەستن و بدوێن، لە کاتێکدا کەسێك نەبێ نوێنەرایەتی تورکیا بکات و بیروراکانی دەربڕێ. بەلاّم باشترە تورکیا پەیوەندی بە کۆمەڵەکەوە بکات و، بە مەیش بچێتە ریزی برایەتیی نەتەوەکانەوە، نەك وەك ئێستا کە وا دەردەکەوێ دوورە پەرێزیی لە گۆشەگیرییەکی تەواودا بە پەسند تر بزانێ. بەمە یارمەتی کۆمەڵە دەدات، لە پەیوەندییە جیهانیەکانیدا بە دەوڵەتانی ترەوە، بڕوای بە خۆی زیاتر بێ. عیسمەت وتی: دوو دڵییەکی بنەرەتی لە پەیوەندی کردنی تورکیادا بە کۆمەڵەوە هەبوە، بەلاّم ئەم پرسیارەی کرد کە زەکیش لە تۆی کردبوو: ئایا تورکیا ناتوانێ کورسییەکی لە ئەنجومەنەکەیدا هەبێ؟ منیش لەوەلاّمدا، هەروەکوو تۆ وتم: هەموو وڵاتەکان ئەمەیان ویستووە و، پەسەند کردنیشیان کێشەیەکی کۆمەڵەکە بوو. ئەمجا هەندێ حەساسیەتی لەوەی کە ئەگەر تورکیا داوابکاو وەرنەگیرێ، دەربڕی. من وتم ناتوانم بە ڕاستی لێرە دڵنیات بکەمەوە، چونکە کۆمەڵەبڕیاری لە سەر دەدات، هەروەها وتم هەرگیز ڕێیتێناچێ ئەم داواکارییە ڕەتبکرێتەوە و، ڕاپایی تورکیایش لەم بارەیەوە هیچ پێویست نییە.

٨- کاتێك ئەم گفتوگۆیەم لەگەڵ تۆفیق ڕوشدیدا دووبارە کردەوە، پاش ئاماژە کردنی بەوەی کە ڕێباز و ڕێکخستنەکانی کۆمەڵە چەند کاری لە ئەو خۆی کردووە، لێی پرسیم: ئایا حکوومەتی خاوەنشکۆ پشتیوانی داوای تورکیا بۆ کورسییەك لە

ئەنجومەنی کۆمەڵەکەدا دەکات؟ منیش وتم: حکوومەتی خاوەنشکۆ ئەم داوایەی پێگەیشتووە و، بەگشتی پێی باش بووە پێش وەخت هیچ هەڵوێستێك وەرنەگرێ .باشترە تورکیا بچێتە کۆمەڵەکەوە و، ئەمجا بەهۆی بەشداریی لە کارە باشەکانیدا، جێی خۆی لە ئەنجومەندا بگرێ.

٩- وا هەست دەکەم حکوومەتی تورکیا دەچێتە کۆمەڵەکەوە و، پێشم وایە دواکار تا بڕیاری موسڵ دەرنەچێ، دەستی پێ ناکرێ. وا هەست ناکەم ئەمە چوونە ناو کۆمەڵەی تورکیا بە سروشتی بڕیارەکەوە ببەستێتەوە، چونکە تا ئێستا چاودێری پەسندکردنی بڕیارەکە دەکەم کە بە کردەوە پشت ڕاست کراوەتەوە. بەڵام تورکان حەز دەکەن جارێ خۆیان نەخەنە هیچ شتێکەوە سوور نەبن لەسەری و، ئەو مەسەلانە بۆ دواکات دوابخەن. بڕیاری کۆمەڵەیش کە لە ئان و ساتدایە، هەلێکیان بۆ دەرخسێنێ تا پەیوەندیکردنەکەیان دوابخەن. ئەمەش، ئەگەر بۆ کەس نەبێ، بۆ ئەمان جێی ڕەزامەندییە.

١٠- پەیوەندی ئابووری لەگەڵ بریتانیای مەزندا:

من بە عیسمەت و تۆفیق ڕوشدیم وت: هیوادارم تورکیا هەرچی زووە بە جددی بیر لە دامەزراندنەوەی پشتیوانەکەی لەگەڵ ئەورووپادا بکاتەوە و، سەبارەت بە بریتانیای مەزنیش ڕابردوو لە یاد بەرێتەوە. ئەوەم وە بیر هێنانەوە کە تورکیا زەبرێکی کوشندەی لەئەنجومەنی بەڵێندەران (حاملي العقود) ی دەرەوە و گرووپی هێڵی ئاسنی ئەنادۆڵ و کۆمپانیاکانی دەستەبەر کردن و برووسکەنێری ڕۆژهەڵات داوە. هەموو پسپۆڕێکی بەناوبانگی بەڕێوە بردنی دارایی‌ی شار لەفەرمانگەکانی ئەو گرووپانەدا هەبوون و، ئێستا کە وشەی تورکیایان لا باس دەکرێ، تەنها بیرەوەریی تاڵیان دێتەوە یاد.

١١- عیسمەت بە دڵ گەرمییەوە دەیگوت: پێشنیارێکی زۆر تەواوی سەبارەت بەقەرز لە لۆزان کردووە کە ڕەتکرایەوە. تورکیایش هەژارەوو ناتوانێ قەرزەکانی بداتەوە. من پێم وت: تۆ عەرەبانەکە لە پێش ئەسپەکە دادەنێی. تورکیا پێویستە

یەکەم جار دان بە پیرۆزیی بەڵێنەکاندا بنێ، ئەمجا باس لەمەسەلەی سووککردنی بارەکە بکات. لەوانەیە تورکیا ئەمەی بەلاوە گران بێ، بەڵام ئەگەر بیەوێ وەك هێزێکی توانا و سەرکەوتوو خۆی پێکبێنێتەوە، ئەوا پێویستە بیکات. هاوکات ئاگادار بووم لەوەی مەسەلەکانی برووسکەنێری ڕۆژهەڵات و هێڵی ئاسنی ئەنادۆڵ بەم زووانە هاتوونەتە پێش. هیواداربووم تورکیا بە وریاییەوە ئاگاداری هەردوکیان بێ و، دەروازەی بڕوای لەندەن لەخۆی بکاتەوە.

١٢– تۆفیق ڕوشدی وتی: ئاشکرایە "تورکیا" بەختێکی ڕەشی لەگەڵ ئەو ولاتە دا هەبوە. هاوکات ناوبراو ئەو باوەڕەی پەیداکردووە کە دەتوانرێ تەنها لە لەندەنەوە بڕێکی چاوەڕێکراوی سەرمایە بەدەست بهێنرێ. حکوومەتی تورکیا بە جددی بیری لە پشتیوان (اعتماد) ەکەی دەکردەوە و، بە کردەوەیش لەسەر تازەکردنەوەی مۆڵەتەکەی لەگەڵ بانکی عوسمانیدا ڕێکەوتبوو.

١٣– شارەزایانی ئەڵمانی بۆ باجی گومرگیی تورکیا:

بەتۆفیق ڕوشدیم وت: لەوکاتەوەی هاتوومەتە ئەنگۆرە، بیستوومە ئەوو عیسمەت پاشا لەو هەنگاوە دیبلۆماسیەی کە بۆ نوسرەت بەگم نابوو "بڕوانە برووسکەی ژمارە (پەنجا و چواری) شەشی ئادار"[1] و بە تایبەتیش لە وشەی ڕیسوا کردن کە بەکارم هێنا بوو نیگەران بوون، پێم خۆشبوو بزانم لەو بارەیەوە چی دەڵێ. ناوبراو بۆماوەیەکی درێژ کەوتە قسەی پڕ باق و بریق لە مەڕ نابەجێیی ئەو شتانەی کە لەسایەی سیستمی ئیمتیازاتی بێگانە دا ڕێیان تێ دەچێ و، ئەوەیش کە لێك جیاکردنەوەی مامەڵە لەلایەن شارەزایانەوە لە سێبەری ئەم ڕژێمەی ئێستای تورکیا دا گونجاونییە. منیش وەڵامم دایەوە و، وتم: دەست تێوەردانی ئەڵمانیا هاوتاو تەنانەت زیاتریشە لەوەی پێش جەنگ و، بازرگانانی بریتانی دامەزراندنی ئەڵمانییەکان بە دوا قفڵ دانی دەرگا بەڕووی بازرگانیی بەرتانیادا لێکدەدەنەوە و، کارێکی خراپیش دەکاتە سەر باری دارایی. ئەمە لە کاتێکدایە کە ئێمە، بۆ

[1] چاپ نەکراوە

گێڕانەوەی بڕوای هاوبەش، ئارەزووی پەیوەندی سیاسیانە دەکەین. وەڵامی بەڕێزتان ئەوەی بۆ دەرخستم کە ئەو سەرنجانەی وا دابوومن بە نوسرەت بەگ، لە بیری کردوون. وام هەست دەکرد بە ئاگادارکردنەوەی تورکیا لەو بۆچوونەی کەدەشێ بەسەریاندا تێپەڕبێ، کارێکی ڕاستم کردووە. دواتر ئەم قسانەم بۆ عیسمەت پاشا دووبارە کردەوە و، زانیم لە گفتوگۆکەم بێزارە، بەڵام وەڵامەکەی لە بارەی ئەو کێشانەوە کە بۆ بەگەڕ خستنی شارەزایانی بێگانە، لە چارەسەریان هیوای بڕوا بوو بوو تەنها قسەی زل بوو. پێم وایە باش نییە زیاتر لەسەر ئەم مەسەلەیە بڕۆم. لە بڕیاری حکوومەتی تورك دڵنیانیم و، دەبێ جارێ چاوەڕێ بکەین.

( پەیوەندی لەگەڵ هێزەکانی تردا)

١٤- لەگەڵ بریتانیای مەزندا:

بەعیسمەت پاشام وت چاوەڕێی بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکانم لە بارەی مەسەلەی موسڵەوە دەکرد و، پێشبینی ئەوەم دەکرد کە ئەم بڕیارە بێ ئومێدی هەردوو لا ناهێڵێ. هەر کە دەریشچوو، هیوا داربووم لاپەڕەیەکی نوێ هەڵبەینەوەو، بڕوامان بەیەکتر زیاد کات. وام هەست نەدەکرد بتوانرێ پەیوەندی ئەنگلۆ-تورکی بەم زووانە تەندو تۆڵبکرێ ، چونکە ڕۆژانێکی زۆری نزیکمان وا بەسەر بردووە، بەڵام بە تێپەڕ بوونی کات پەیوەندییەکان باش دەبن و، هاوکات باشترین شت بریتی‌یە لەگرتنە بەری سیاسەتێکی ئێجگار خراپ و، هەوڵدان بۆ بەرگرتن لە هەر گیر و گرفتێك کە لە نێوان هەردوو حکوومەتماندا دروست ببێ. ئەم وتوێژەم لە دوا چاوپێکەوتنی عیسمەت پاشادا کرد، ئەویش بە وردی گوێی لێ گرتم و، تەنها یەك دوو دەستەواژەی دووبارەی هەبوو و، هیچ وەڵامێکی تری وەك تێبینی نەبوو، بۆیە چووینە سەرباسێکی تر.

١٥- لەگەڵ هەرسێ هێزی هاوپەیماندا:

بە عیسمەتم وت: هەستم کردووە تورکیا، لەوکاتەدا کە هاوپەیمانەکان دەستیان بە دانوستان لەگەڵ یەکتردا کردبوو، تا چ ڕادەیەك هەستیار بوو. تورکیا هەمیشە وا بیری کردۆتەوە ئەوان پیلان لە دژی ئەو دادەڕێژن. هەر ئەمەیش مەبەستی سەردانەکەی کانوونی یەکەمی ڕابردووی پاریس و ڕۆمات بوو. لە ڕاستیدا وتم تاکە گفتوگۆ لە سەر تورکیا ئەوکاتە کێشایەوە بۆ بڕیاری بەشان و باڵدا هەڵدانی. تورکیا بەگشتی لە ئاستی وڵاتانی هاوپەیمان کە بیریان لە شتێکی تر، واتە مەسەلەی ئاسایش. دەکردەوە، نزمتر بوو. ئەمە وای لە عیسمەت کرد پرسیارم لەسەر پرۆتۆکۆڵی جنێف لێ بکات و، منیش بەگشتی ئەوەی کە لەو بارەیەوە ئەمزانی، پێم وت.

١٦- لەگەڵ یۆنان و وڵاتانی باڵکاندا:

عیسمەت پێی وتم زووتر کە لە پۆستەکەیدا بوو، هەمیشە بۆ پەیوەندیی باش لەگەڵ یۆنان تێکۆشاوە. لەو کاتەوە چەندین ڕووداوی دیاریکراو هاتوونە ئاراوە، بەڵام هێشتا جێی ڕەزامەندی نەبوونو، ئێستا هیواداره بگاتە سەقامگیرییەکی پەسند. هەروەها وتی، ناجێگیریی کابینەی یۆنان گرفتی سەرەکی بووە.

١٧- تۆفیق ڕوشدی پێی وتم: ئاگای لە هەموو مەسەلەکانی یۆنان هەیەو، چاوەڕێی دانوستانیان دەکات کە بواری تەواوی ڕێککەوتن و ئەنجامێکی سەرکەوتووی تێدا برەخسێ. کار هەڵسوڕێن (قائم بأعمال) ی یۆنان پێی وتم کە حکوومەت گۆڕا، چاککاری و پێشکەوتنی ڕاستەقینە ڕوویاندا. ئەمە لە کاتێکدا کە تورکیای سەردەمی فەتحی ئامادە نەبوو تەنانەت لەسەر مەسەلەی پاتریارکی گفتوگۆ بکات. تۆفیق ڕوشدی وتی: وەکو وەزیری دەرەوە، خۆی بۆ قسە لەسەر ئەم بابەتە ئامادەکردووە. بەڵام ئەمە، چوار ڕۆژ دواتر، کاتێ والیی قوستەنتەنییە جارێکی تر داوای دابینکردنی پەساپۆرتی بۆ ئەو کەسانە کرد کە بڕیارە لە پایتەختەکاندا دابنرێن، هەڵوەشایەوە. وا هەست دەکەم وپەیوەندیی تورکیا و یۆنان باش بووە و، ئەو گوشارەی کە یاخی

بوونی ڕۆژهەلاتی کورد خستوویەتییە سەر تین و تواناکانی حکوومەتی تورکیا، بە ئامانجی سروشتی و حەتمیی خۆی لە سنووری Thrace گەیشتووە.

١٨- لەگەڵ دەوڵەتانی باڵکاندا:

عیسمەت، بە بایەخ و کەمێك سووربوونەوە، لێی پرسیم: ئایا بەڕای من کێشە لە ناو ولاتانی باڵکاندا هەیە؟ پێم وت: ئەوان لەوە کفت و ماندوترن گرفت دروست بکەن. لەوە دەچوو گومانی کردبێ ئەو دەوڵەتانە لەدژی تورکیا یەکیان گرتبێ، بەلاّم نەمتوانی هیچی پێ بدرکێنم و، باسەکەمان کۆتایی هات.

١٩- دەستە (ستاف) ەکەم ، شان بەشانی دانوستانە سیاسیەکەی خۆم، لەگەڵ ئەندامانی ناسەرەکیی وەزارەتی کاروبارەکانی دەرەوەدا و لەسەر چەند تەوەرێکی جیاجیا سەرگەرمی وتوێژبوون. ئەوانیش زۆر بە ڕیزەوە مامەڵەیان لەگەڵدا کردن و، هیچ هەوڵێکیان نەدا خۆیان لەمەسەلەکان بدزنەوە، هەموو کارێکیان بۆ دەستەکەم ئاسان کرد، تا کارمەندە لێهاتوو و تایبەتمەندەکانی وەزارەتەکانی تر ببینن.

هاوکات ئەو وەزارەتانە، لە نوێنەرایەتی کردندا، زۆر وریا بوون. ئەوەی ئێستا ئەزانین ئەوەیە کە تەنها بابەتێك بڕیاری لەسەر دراوە و، بۆ ئەوانەی تر نامانەوێ جارێ لەسەریان بڕۆین، چونکە پێناچێ تا دوو سێ هەفتەی تر بزانین چیمان لەو مەسەلە بچووکانە بەدەست هێناوە.

٢٠- بە کورتی، بە کەشکۆڵێك بەڵێن و پەیمان و سەرنجی بێزاری و هیچی ترەوە گەڕاینەوە بۆ قوستەنتەنییە. پێشبینی هیچ ئاکامێکی خێراو بەرچاوم نەدەکرد. لە هەڵس و کەوتماندا لەگەڵ کارمەندان و ئەوانەی ئەنگۆرەدا، تێبینی گەورەترین ڕێزمان کرد کە هاوتای دوو ڕووییەکی تەواو بوو. هەمیشە، هەوڵم دەدا لە گفتوگۆکانم دا، بە ئینساف و ڕوون بم و، لەسەر بنەمای یەکسانی دانوستانیان لەگەڵدا بکەم و، دوورکەومەوە لەوەی کە وەك کەسێکی پایە بەرزتر قسەبکەم، چونکە تورکان نیمچە هەستیار ئاگاداری ڕاستیەکانن. هەروەها دەبوو هەر بەو جۆرە لەگەڵیاندا بدووامایە، چونکە ئەوان زۆرشانازی بەخۆیانەوە دەکەن. وا دیارە

کارەکەمان لە ئەنگۆرە بە تەواوکەر لەقەڵەم دراو، تورکەکانیش هەر بەو شێوەیە هەڵیانسەنگاند. دەبێ پێشبینی چەندین بێ هیوایی و کردەوەی بێ هۆی زیاتری حکوومەت بکەین. پێم وایە: هەفتەی ڕابردوو پەیوەندییەکی ڕاستەوخۆی لە نێوان باڵوێزی خاوەنشکۆ و ئەنقەرەدا دانەمەزراند، بەلام قۆناغێکی دیاری سەر ڕێگای گێڕانەوەی بڕوای نێوان هەردوو حکوومەتی دیاریکرد.

ئاڕ ئێس لیندسەی

وەزارەتی دەرەوە ، ٤٢٤/ ٢٦٢، ل: ١٢٥– ١٢٨ ، ژ: ١٢٨

***     ***     ***     ***     ***

## ژ: ١٢

## لە مستەر لیندسەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلەین- (٦ نیسان گەیشتووە)

(ژمارە: ٢٥٨)

قوستەنتەنییە ، ٣١ ئاداری ١٩٢٥

گەورەم،

بۆ تەواو کردنی راپۆرتی ژمارە ١٩٩ی ١٠ ئادارم خۆشحاڵم پێتان رابگەیەنم بارودۆخی سیاسیی تورکیا سێ هەفتەی رابردوو لە پرۆسەی رەوینەوەی شەکەتی و ماندوویەتیی خۆیدا بوو. ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانی بەردەوام و بە شێوەیەکی سەرەکی لە بەرامبەرکێی بودجەدایە. ئۆپۆزسیۆنێکی ئاوایش هیچ رۆڵێکی چ لە هۆڵی پەرلەمان و چ لە وڵاتدا نییە، جا ئەگەر بە تەواویش تێکنەشکێنرێن ئەوا هەردەمکوت دەکرێ. زستانی رابردوو جووڵانەوەکە کە دژی گەشەکردنی رژێمی پەرلەمانیی راستەقینە هەستی پێ کرابوو کتوپڕ هەڵچوو و، نەتوانرا لە بەرامبەر دەسەڵاتدارێتی دەوڵەتی تاکە کەسدا بشاردرێتەوە، ئاسان نییە هەست بەوە بکەین کە چۆن ئێستا بەبێ هەوڵدان بۆ بەکارهێنانی توند و تیژی بەردەوام پەرە دەسێنێ و ئەمەیش لە خۆیدا شتێکی ناکۆکە. هەرچەندە لەوانەیە خەڵك لە رابردوودا بە گومانەوە سەیری کۆششەکانی پێشخستنی سیاسییان کردبێ، بەڵام ناکرێ سۆزی دەرەنجامی سەرنجدانی ئەو کوێرە رێیە بێ ئومێدە کە ئێستا تورکیا گرتوویە بەر، رابگیرێ.

٢- دادگەی ئیستیقلالی ئەنگۆرە دەستی بەکارەکانی کردووە و، لەهەرێمە جیاجیاکانی تورکیا و بە تایبەتیش لە سیلسیاوە تاوانباری بۆ نێردراوە، دوو رۆژنامە نووسی ئەدەنە بە تاوانی نووسینی کۆنە پەرستانە و پرۆپاگەندەی نا دڵسۆزانە لە ناو سەربازاندا یەکیان بەسێ و ئەویتریان بە حەوت ساڵ زیندان حوکمدراون، ئەمەو والیش بە بیانووی ئەوەی کە لە شایەتیدا کەمتەرخەمیی کردووە، بە ٢٥٠ لیرەی

تورکی سزادراوە. ئەو دادگەیەی هەرێمەکانی ڕۆژهەلاتیش هێشتا نەکەوتۆتە گەڕ، بەلام خالێکی گومانلێکراو لە کۆبوونەوەی پارتی گەلدا، بۆ ئەوەی کات بە فیڕۆ نەدرێ، بڕیاری لەسەر دراوە. بەو پێیە: ئەو حوکمی مردنانەی وا دادگەی سەربازی لە هەرێمەکانی یاخی بووندا دەریاندەکات، دەشێ بە ڕەزامەندیی فەیلەقە عەسکەرییەکان و فەرماندەی فیرقەکان جێبەجێ بکرێن.

٣-سەرنجی جددی لە کارو بارە گشتیەکان لەم هەل و مەرجە خنێکێنەرە و چاپەمەنیەکاندا بە تەواوی‌ئیفلیج کراوە، حوسەین جاهیدی (تەنین) تەنانەت لە قسەی باشیش خۆی دوور دەخاتەوە، ستوونەکەی تەرخاندەکات بۆ بیرەوەریی دەستگیرکردنی لە مالتاز بە داخەوە دەڵێم: بە شێوەیەکی سەرەکی گلەیی و گازەندەی توندوتیژی تێدایە دژی ئەو گەمارۆیانەی کە لەو دوورگانەدا بەسەر خۆی و هاوڕێ زیندانیەکانیدا سەپێنرابوون. ڕۆژنامەکانی تر باس لە فرینی فرۆکە و شانۆی تورکی و ڕۆژوی ڕەمەزان و هەموو شتێکی جگە لە سیاسەتی ناوخۆ دەکەن. تەنها نوێنەری قوستەنتەنییە ماوەیەکی نا ئاسایی بێ ڕەخنەو هێرش بەسەردەبات.

٤- دوو ڕاپۆرتی ڕائید هارێنك، بە کورتەی زانیاریی ئەو ڕووداوانەوە کە ئێستا سەبارەت بە یاخی بوونی کوردستان ئێستا لەبەردەستدان، هاوپێچ دەکەم. هەندێ ئاماژەی تایبەت هەن ئەوە پێشاندەدەن کە شتەکان، بە پێچەوانەوەی ئەوەی وا پڕۆپاگەندە ڕەسمییەکان دەیانەوێ قەناعەتمان پێ بکەن، بە باشی بەڕێوە ناچن. شەڕ لە وارتۆ- باکووری خۆرهەلات - و سیلوانی باکووری ڕۆژهەلاتی دیاربەکر بەرپا بووەو، وا دەردەکەوێ یاخیەکان کوشتارێکی بەرچاوی خەلکە هاوسۆزەکانیان کردبێ. ڕۆژێك هەوالی دەست بەسەردا گرتنی مەلازگەرد لەلایەن کوردانەوە و نەمانی پەیوەندیی نێوان مووش و بدلیس بلاوکرایەوە، دوێنێ هاوکارە ئیتالییەکەم برووسکەیەکی بریکاری بەرپرسی قونسلخانەکەی کە تایبەت بوو بە پڕۆپاگەندەی ناوخۆ، لە تفلیسەوە پێگەیشت. بە پێی ئەو برووسکەیە یاخی بوون ئەرزڕۆم و وانی گرتۆتەوەو، سوپای ڕووس بۆ هاوکاریی تورك بەرەو سنوور جولاوە، بەڕای

بریکارەکە بۆلشەڤیکە ئەرمەنیەکان دەستیان لە یاخی بوونی کوردانددا هەیە بۆ "ئەوەی دەریبخەن دیاریکردنی سنووری تورکیا ڕووسیا پێویستە"، ئەمانە تەنها پروپاگەندەن و جێی متمانەنین، لەوانە گرنگتر بابەتێکی (حاکمیەتی میللی) ی نیمچە ڕەسمییە کە لە ئەنگۆرە دەردەچێ. دەڵێ: یاخیەکان لە نێوان دیاربەکر و سیوەرەکدا چالاکن و ڕێبەرە دینییەکان کاریان تێکردوون و بارودۆخەکەش هەرنا ئارام دەبێ، کۆمارەکە هەموو ڕێ و شوێنێکی پێویستی بۆ دامرکاندنەوەی یاخی بوونەکە گرتۆتە بەرو سەریش دەکەوێ، بەڵام نابێ ئەرکی زیاتر بۆ ڕیشە کێشکردنی پەتاکە ئە ئیجواناتی ژیرانەی چاکسازی ئیداری و کۆمەڵایەتی، پاش گەڕانەوەی سوپای سەرکوتکردن، لە یاد بکرێ و گومانیشی تێدا نییە کە نەخشەو پلان بۆ ئەو مەسەلەیە دڕێژراون، ئەم بابەتە بەبێ ڕەزامەندیی حکوومەت نەنووسراوە و، بایەخێکی تایبەتی هەیە، بە پێچەوانەی پڕۆپاگەندەی ڕۆژانەوە کە هەمیشە ئەمە دەگەینن: پاش ئەوەی هێزی پێویست کۆکرایەوە ئێستا یاخی بوونەکە خەریکە دادەمرکێنرێتەوە، ڕەشبینی دەڕەوێتەوە و، جەماوەر بۆ چاکسازی- بێگومان مۆڵەتی حکومیش بۆ خواستی ناوخۆ کە سروشتەکەی نە لە (حاکمییەتی میللی) و نە لە هیچ ڕۆژنامەیەکی تردا باس کراوە- ئامادە دەکرێ.

٥- گومانێکی کەم لەمەترسیداریی یاخی بوونەکەو ئەوەیش کە گوشارێکی زۆری خستۆتە سەر دەوڵەتی تورکیا، دەکرێ دەنگ لەسەر (١٠٠٠٠٠٠٠) دە ملیۆن، لیرەی تورکی بۆ سەرکوتکردنی دراوە و، ئەمەیش دەبێتە هۆی ئەوەی کە بودجەی ساڵی ١٩٢٥ و بەدواوە بۆ (٣٠٠٠٠٠٠٠) سی ملیۆن لیرە دابەزێ. دەیشبیستم ژمارەیەك کاری گشتیی گرنگی وەك دانانی هێڵی ئاسن ڕاگیراون. ئەگەر سەرهەڵدانەکە بە خێرایی دانەمرکێنرێتەوە، ئەوا دەبێ بڕی پارەی تەرخانکراو زیاد بکرێ، هەر کە کۆنترۆڵ و دەستیش بە چاکسازی کرا، وەك (حاکمیەتی میللی) دەڵێ، خەرجیی زیاتر پێویست دەبێ، ئەم گرفتە داراییانە و کارە عەسکەرییەکەیش بە پلەی یەکەم دەبێ لە بێهێزکردندا کاریگەر بن. ناشێ وا هەست بکرێ حکوومەت خۆی نەخشەی

یاخی بوونەکەی لە پێناوی ئامانجەکانی خۆیدا کێشابێ، سەبارەت بە هاندانی دەرەکیش، پێم وایە پێویست ناکات بە دوایدا بگەڕێین. گومان بەهۆی گوتاری (Cuibono[1]) وە تەنها لە سەر ڕووسەکان بوو. تاکە پشتگیریش بۆ ئەمە تەنها برووسکە بێ ماناکەی تفلیسی ئیتاڵیا بوو کە لەسەرەوە باسم کرد.

٦- تورکەکان، کە ئێستا یاخی بوون بەرپابووە، بۆ هارینی ئۆپۆزسیۆن کەوا لە سەرتاسەری وڵاتدا دژی خواستە عیلمانی و ڕادیکالییەکانی ڕژێم پەرەیان سەندووە و هەروەها بۆ بەهێز کردنی دیفاکتۆی تاك دەسەڵاتیی (ئۆتۆکراسی)ی مستەفا کەمال قۆستوویانەتەوە، ئەمە ئەو قازانجە کەم و نەویستراوەیە کە لە هەلو مەرجێکی نالەباریان کردووە. ئایا هەر کە یاخی بوون تێکشکا، بۆ هەڵگێڕانەوەی سوپاکەیان بە مەبەستی هەڕەشە کردن لە سنووری باکووریی عێراق، یان وەك لە دوا بڕگەی برووسکەی ژمارە پێنجی هاوپێچکراوی ڕانید هارێنکدا هاتووە بۆ هەوڵی کودەتایەکی سەربازی دژی موسڵ، ئەم هەلە زیاتر دەقۆزنەوە؟ تورکیا بۆ ئەم دووهەڕەشەیە پێویستە یەکەم جار و هەرچی زووە یاخی بوونی کوردستان تێکشکێنێ و، زانیاریشمان ئێستا چ لەسەر فراوانیی سەرهەڵدانەکەو چ لە سەر کاریگەریی ئەو ئیجرائاتانەی کە لە دژی وەرگیراون هێندە کەم و گومان لێکراوە، دوو دڵم لەوەی باسی هەر فەرمانێکی بڕیارلێدراو بکەم. ئەگەر تەواو دامرکاندنەوەی یاخی بوون، هاوکاتی بڕیاردانی مەسەلەی مووسڵ بێ دژی تورکیا و، سەربازی پێویستیش کۆکرابنەوە، پێم وایە کودەتا دژی مووسڵ لە ڕوانگەی عەسکەرییەوە ڕێیتێدەچێ، بۆیە دەشێ پێویست بێ پێش وەخت لە بەرچاو بگیرێ، سەرجەم بارەسیاسییەکانی مەسەلەکە دژی ئەم ئیحتیمالانەن، چونکەپێویست دەبێ تورکیا بە تەنها خۆی بکەوێتە دژایەتی کۆمەڵەی نەتەوەکان و، دوژمنایەتی بریتانیای مەزنیش بکات. ئەمە لە کاتێکدا وەك خۆی دەزانێ تەنها ڕووسیا پشتیوانیی دەکات و خۆیشی ڕەزایەکی گرانی هەیە. هەرچەندە لەوانەیە هەندێ تورك بەم قسە زلانە

---

[1] ئەم وشەیە نە ئینگلیزییەو نە فەڕەنسییە، ڕەنگە ناو بێ

ئاسوودە بن، بەڵام باوەڕم نییە فەرمانڕەواکانی وڵات بە جددی بیر لە مــە بکەنــەوە و، ئەم ڕێگا ترسناکە بگرنە بەر.

ئاڕ. ئێس لیندسەی

وەزارەتی دەرەوە ، ٤٢٤/ ٢٦٢، ل: ١٣٨– ١٣٩، ژ: ١٣٨

***   ***   ***   ***   ***

ژ: ١٣

**لە مستەر لیندسەیەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلەین- (٢٠ نیسان گەیشتووە)**

**(ژمارە: ٣٠٥)**

**قوستەنتەنییە، ١٥ نیسانی ١٩٢٥**

گەورەم ،

خۆشحاڵم لێرەدا ڕاپۆرتێکی تــری ڕائیـد هـارینکی پاشکۆی عەسکەریی ئـەم باڵوێز خانەیەتان لەسەر بەردەوامیی ئۆپەراسیۆنەکانی دژی یاخی بوونی کوردســتان پێشکەش بکەم.

٢– دەبێ بزانین کە هەموو هەواڵە دیـاریکراو و پـەیتا پـەیتاکانی هـەرێمی یـاخی بوون لە ئۆفیسـەکانی ئـەنگۆرەی حکوومەتـەوە دەگـەن، بۆیـە دەشـێ گومانیـان لێ بکرێ. زیاتر لە دووهەفتەیە زنجیرەیەك سەرکەوتن بـە دەسـت هـاتوون و، هێزەکـان شوێنەکانیان یەك لە دوای یـەك داگیر کردۆتـەوە، باوەڕناکـەم هیـچ هۆکـارێك هـەبێ وامان لێ بکات گومان لەم ڕاستیە بکەین، چونکە کوردە یاخیەکان هـۆی گواسـتنەوە و خزمەتی قۆمیسارێتییان نییـە و نـاتوانن هێزەکانیـان ماوەیـەکی زۆر بـۆ بـەرەنگار بوونـەوەی هـێزە نیزامیـەکان کۆبکەنـەوە. کەواتـە دەبێ هێزەکـانی دەوڵــەت بــە شێوەیەکی بەرچاو پێشڕەوی بکەن بۆ ناو هەرشار یــان گوندێك کـە قومـانداری بـاڵا فرمانی گرتنی بدات. ئێستا پرسیار ئەمەیە: ئایا یاخیەکان دەتوانن پارێزگـاری لـە

تین و توانەکانیان بکەن و، درێژە بەشەڕی پارتیزانی بدەن؟ ئەگەر بەڵێ، ئەی لە داهاتوودا تا چەند دەتوانن حکوومەتی پێ بێزاربکەن؟ من هیچ زانیارییەکی ووردم لەم بارەیەوە نییە. ڕۆژنامەکان یەك دوو هەواڵی شەڕی پارتیزانیان بڵاو کردۆتەوە و ، عیسمەت پاشایش هەفتەیەك لەمەوبەر لە ڕوونکردنەوەکەیدا بۆ ئەنجومەن (برووسکەی ژمارە ٢٨٩ی ٨ نیسانم) وتی: کردەوە عەسکەرییەکان هێشتا دوایی نەهاتوون. هەروەها پێشبینیی گواستنەوەی شەڕ و شۆڕی بۆ شاخەکان کرد.

٣- مەسەلەکە بۆ حکوومەتی خاونشکۆ بایەخی هەیە، چونکە ئەو پرسیارەی لەسەر دروست دەبێ کە ئایا تورکان دەتوانن هێزەکانیان بگێڕنەوە و، هەڕەشەی پێ بکەن لە عێراق؟ ئەم پرسیارەم لە بڕگەی شەشی برووسکەی ژمارە ٢٥٧ی ٣١ی ئاداردا باس کردووە. زانراوە زۆرێك لە تورکانی نامەسئوول ئەمەیان لە خەیاڵدایەو، وا دەردەکەوێ بابەتی سەرەکیی باس و خواسی ئەفسەرەکانیش بێ. ئەم ئاڕاستەیە دووهەفتەی ڕابردوو زیاتر تێبینی دەکراو، زاڵتر بوو بوو. چەند ڕۆژێك بوو هێرشێکی کەم دژی بریتانیا، بە تایبەتی لە مەڕ موسڵ لە چاپەمەنیەکاندا بەدی دەکرا .ئەمەش بەهۆی گەڕانەوەی جەواد پاشای یاریدەدەری لیژنەی کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە بوو لە عێراق و، ڕێی قسەی بۆ ڕۆژنامە نووسان خۆشکردبوو، ڕۆژنامەکان کە ناتوانن باس لە سیاسەتی ناوخۆ بکەن، خۆشحاڵن مافی هێرشکردنە سەر ئیمپریالیزمی ئێمە بە خۆیان بدەن، هێرشەکان زۆر توند نەبوون، بەلاّم بە بێ ئەژمار برووسکەی یەکپارچەیی خوازی پڕکرابوونەوە و، باسیان لە ئیجرائاتی سەرکوتکردنی تورك دۆستەکانی ویلایەتی موسڵ دەکرد. ڕاگەیەندرا کە چەند کاربەدەستێکی تورکی بێزار و دوورخراوەی (لیڤان – Livan) کۆدەکرێنەوە و لە عێراقەوە دەنێردرێنە هەرێمی یاخی بوو. ڕێگەیش بە نەستۆریەکان لە عێراق دەدرێ لە نزیك چاڵ (Chal) ەوە بکەونە پەلامار..

٤- قسەی ڕەجەب بەگ بۆ فەرماندە ئەیرەوان (بڕوانە برگەی پێنجی نووسراوی ڕائید هارنێك کە لێرەدا هاوپێچ کراوە[1]) بایەخی خۆی هەیە. ڕەجەب لە ناو جەرگەی حکوومەتدایە و ئەوەی دەیڵێ نا مەسئوولانە و بێ پێزنییە. هاوکات لەوە ئاگادارە کە لەوانەیە قسەکانی بۆ باڵوێزخانەی بریتانیا بگێڕدرێنەوە. لە ڕاستی قسەکانشیەوە دەتوانین بگەینە ئەو ئەنجامەی کە دەسەڵاتدارانی تورك بەلایانەوە گرنگ نییە حکوومەتی خاوەنشکۆ بەوە بزانێ وا ئەوان بیر لەوە دەکەنەوە کە هەڕەشە لە عێراق بکەن.

٥- سەبارەت بەمە ئەوەمان دێتەوە یاد کە زەکی بەگ داوای کردووە ڕاستەوخۆ کێشەی سنووری عێراق چارەسەربکرێ. باوەڕ ناکرێ بە جددی ئەم داوایەی کردبێ، چونکە هەرمانگێك پێشتر خۆت بەزەکیت وتبوو کە ئەمە پەسەند ناکرێ. پێدەچێ حکوومەتی تورکی ئەوەی لە ناو خۆیدا تاوتوێ کردبێ کە ئەگەر داواکەیان بخەنە ڕوو ئەوا هیچ زیانێك بەمەبەستەکەیان ناگەیەنێ؛ ئەگەر دواتریش ویستیان سیاسەتێکی دوژمنکارانە دژی موسڵ جێبەجێ بکەن ئەوا بۆ ڕای گشتیی تورکی سوود بەخشە ڕاستیی داواکەیان بڵاوبکەنەوە. کە داواکاریەکە کرا، لەبەرئەوەی کە لە (دەیلی مەیل- Daily Mail) دا چاپکرا بوو، هەواڵەکە لە برووسکەکانی لەندەنەوە گەیشتە ئێرە. پێم وایە باڵوێزخانەی تورکی لەوێ بڵاوی کردبووەوە.

٦- دواجار تورکان ئەوەیان دێتەوە بیر کە پایزی ڕابردوو خواستەکەیان لە باشووری ئامێدی Amadia و چاڵ بەسەرکەوتوویی جێبەجێ بوو، و گەورەترین بەشی دەستکەوتیان بە بەرچاوی کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە هەبوو و لەلایەن حکوومەتی خاوەنشکۆیشەوە بۆ دواجار ئینزار کران.

٧- ئەم ئیحتیمالانە شایەنی بایەخ پێدانن. ئەگەر تورکە جددییەکانیش بیری لێ بکەنەوەو، تەنانەت بەو هیوایە نەخشە بکێشن، هێشتا ئەوە ناگەیەنێ، کە

[1] چاپ نەکراوە

بڕیاریانداوە بکەونە هێرشبردن یان هەڕەشە لە عێراق بکەن. وا هەست دەکەم ئەمە تەنها گەمەیەك بێ، چونکە ولآت لە هەل و مەرجێکدا نییە پاساو بۆ سیاسەتێکی سەرکێشی بهێنێتەوە.

گومانم هەیە لەوەی کە هێرش دژی عێراق، وەك سیاسەتێکی بێ هوودە، بێزاری کەم بکاتەوە،لەگەڵ ناپاکەکاندا بۆهاوکاریکردنی حکوومەت یەکبگرێ.

ئاڕ ئێس لیندسەی

وەزارەتی دەرەوە ، ٤٢٤/ ٢٦٢ ، ل: ١٤٩– ١٥٠ ، ژ: ١٥١

*** *** *** *** ***

## ژ: ١٤

## لە مستەر لیندسەیەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلەین - ( ٢٧ نیسان گەیشتووە )

## ژمارە: ٣٢٢

**قوستەنتەنییە، ٢٢ نیسانی ١٩٢٥**

گەورەم،

خۆشحاڵم لە تەواوکاریی ڕاپۆرتی ژمارە ٣٠٤ی ١٥ی ئەم مانگەمدا پێتان ڕابگەیەنم کە شێخ سەعیدی سەرکردەی یاخی بوونی کوردستان و چەندشێخێکی تر و بیس کەسێك لە شوێنکەوتووانی گیراون و، بۆ وارتۆ نێردراون. دەڵێن ناوبراو لە دادگەی سەربازی خنسی زێدی باوباپیری و دادگەی ئیستیقلالی دیاربەکر، دادگەیی دەکرێ و، لە سێدارە دانیشی بەوهۆیەوە جێی گومان نییە. حکوومەت دەستگیرکرانی ئەو بەنیشانەی کۆتایی وادەی یاخی بوون دەزانێ و، ڕایشگەیەندرا کە ئیتر هیچ ڕاپۆرتێکی ڕەسمی لە بارەی کردەوەی عەسکەرییەوە دەرناچێ. تاکە هەواڵی تایبەت بەم مەسەلەیە کە هەفتەی ڕابردوو لە ڕۆژنامەکانەوە بڵاو بووەوە، پەرەوازە بوونی چەند باندێکی یاخیەکان بوو لە دەوروبەری سیلواندا حوکمی لەسێدارە دانی داداگای سەربازی زۆر جار باسی لێوە دەکرێ و، دادگەی ئیستیقلالی دیار بەکریش ئامادەیە دەست بەکاربێ. لێرەدا ڕاپۆرتی ڕووداوەکانی هەفتەی ڕائید هارینکی پاشکۆی سەربازیی ئەم باڵوێز خانەیەتان بۆ بەرزدەکەمەوە.

٢- ئەنگۆرە تێلیگرامز بە ئاشکرا دەڵێ هاندانی بریتانیا لە یاخی بوونی کوردستاندا بەهۆی بەڵگە نامە بەدەست هێنراوەکان و قسەی چەندشایەتێکەوە ئێستا سەلماوە. بەلاّم ئەم تاوانبار کردنە، ئەگەر تاڕادەیەك وردبین بین، بۆ ساڵانی ١٩١٩و ١٩٢٠ی دەمێك کە ئۆتۆنۆمی کوردستان ئێجگار لە ئارادا بوو، دەگەڕێتەوە. هیچ ڕاستییەکی خێراییی ئەم هەڵگیرسانەی دوایی ئێستا لەبەردەستدا نییە.

لەلایەکی ترەوە هەواڵی ئــەوە هەیـە کـە ئێستا بریتانیـا نەستۆری و ئەرمەنیـەکانی هانداوە تا لە باشوورەوە بچنە کوردستانەوە.

٣—هەمیشە پێشبینی ئەوەم دەکرد کە سیاسەتێکی سـەرکوتکاری پێدەچـێ لـە سەرتاسەری تورکیا دا بەردەوام بێ ١٦ی‌مارس قوستەنتەنییە پێـی سـەیر بـوو بـلاّو کـراوەی (تـەنین)ی حوسـەین جـاهید تـا کـاتێکی نادیـار ڕاگــیراوە و، سـێ کەسـی دەسـتەکەی بـۆ ئـەنگۆرە ڕاپێچکـراون. کـاتێك دادگـەی ئیسـتیقلال لێکۆڵێنــەوەی لەگەڵدا کردوون و وتویانە ئەوان تەنها لاوەکی بوون و فەرمانیان لە حوسەین جـاهید وەرگرتووە. ئەمجا ئەم دەستگیرکراوە و یەکسەر ڕەوانەی ئەنگۆرە کراوە کە ئێستا بەزیندانی چاوەڕێی دادگەیی دەکات. ئەزانم هاوڕێکانی لــە چارەنوسـی دڵنیـا نـین. هێشتا هیچ هۆکارێکی قەناعـەت پێکـەر بـۆ داخسـتنی (تـەنین) لـە بەردەسـتدانییە، چونکە چەند هەفتەی ڕابـردوو چاپەمەنیـەکان بـە وریاییـەوە خۆیـان لـە هـەر جـۆرە بابـەتێکی سیاسـی، وەك مـانگرتنێکی ڕۆژنامـە نووسـی کــە دەشـێ کاربەدەسـتان بورووژێنـێ، بـە دوور گـرت. لــە ڕاسـتیدا ئــەو بــەهۆی بۆچوونـە دژە حکوومیــە ناسراوەکانیەوە حوکم دەدرێ، بەلاّم گومانی تێدا نییە هەر کە دادگەییەکـە دەسـتی پێکرا هەندێ بەڵگەنامە بەردەست دەکەون کە دەتوانرێ لە سەریان تاوانبار بکرێ.

٤—بیستی نیسان و دوای کۆبوونەوەی ئاسایی کۆمیتەی ڕێکخسـتنی پارتییەکـە، ئەنجومەن کەوتە تاووتوێی مەسەلەی ڕژێمی ئایندەی ویلایەتـەکانی ڕۆژهـەلاّت. بـە ئاشکرا بڵێین: سیاسەتەکە سەرکوتکاریی هاوشانی سڕینەوەی نەریتی بەخشینی دە یەکە بەو ڕێژەیەی وا عیسمەت پاشا لە گفتوگۆی ئەنگۆرەمدا دیاریی کرد. حوکمـی عورفـی لــە ٢٤ی نیسـانەوە حــەوت مــانگی‌تر بــەردەوام دەبـێ و، دادگـــەکانی سەربەخۆیش شەش مانگ زیاتر لەوەی بڕیاردرابوو دەمێننەوە.

حوکمەکانی دادگەی ئەنگۆرە بەبێ گەڕانەوە بۆ ئەنجومەن ، کە پێدەچـێ ئـەمڕۆ دوابخرێ ، جێبەجێ دەکرێ.

پێشکەوتنخوازەکانی ئەنجومەن دژایەتی ئەو دوو بڕیارەیان کردو، دوازدە بەرامبەر هەژدە دەنگیان هەبوو. ئەنجومەن حکومەتی بە شێوەیەکی گشتی بۆ چاککردنی ئیدارەی ویلایەتەکانی ڕۆژهەلات سەرپشك کرد. هیچ شتێك نییە ئەوە پێشان بدات کە چۆن پێشنیاری بەکارهێنانی ئەو فراوانییەیان کردووە. ئەمە لەبەر ڕۆشنایی وتەکەی جەمیل بەگی وەزیری ناوخۆدا کە پێشبینی یەکخستنی ویلایەتە بچووکەکانی بۆ یەکەی گەورەتر و دەست نیشانکردنی یەك پارێزگاری گشتی یان زیاتری بە دەسەلاتێکی فراوانترەوە لەوەی والییەکانی ئەمڕۆ هەیانە کردبوو.

ئاڕ. ئێس لیندسەی

وەزارەتی دەردوە ٤٢٤/ ٢٦٢، ل: ١٥٣– ١٥٤ ، ژ: ١٥٦.

**********

## هاوپێچی ڕاپۆرتی ژمارە (١٤)
## لە ڕائید هارێنکەوە بۆ مستەر لێندسەی
## قوستەنتەنییە، ٢١ نیسانی ١٩٢٥

گەورەم،

خۆشحاڵم لێرەدا چەند کورتەیەکی هەواڵی ڕۆژنامەکان سەبارەت بە سەرهەڵدانی ویلایەتەکانی ڕۆژهەلات، بۆ زانیاریتان، بخەمە بەرچاوتان[1]. داوای لێبوردن ئەکەم لەبەر ئەوەی کە ئەم هەفتەیە لە سمیرنا نەبووم نەمتوانی زانیاری زیاتر لە سەر ئەم مەسەلەیە کۆبکەمەوە..

٢- دوا ڕاگەیاندنی ڕەسمی (١٥)ی مانگ دەرچوو و، دەڵێ: شێخ سەعید و چەند سەرکردەیەکی تر کە لە هەوڵی هەلاتندا بوون، بەرەو ڕۆژهەلات، لە باشووری وارتۆدا دەستگیر کراون. بەڵگەنامەی گرنگ و بڕێکی زۆر ئاڵتون لە کورتانی بار هەڵگرەکانی شێخ سەعیدا دۆزراونەتەوە. (گەنج)ی ناوەندی یاخی بوون لەلایەن هێزەکانمانەوە گیراوەتەوە. دەسەلاتی کۆمار لە سەرتاسەرەی هەرێمی ئاشارامدا سەقامگیر بووەتەوە. ئەو یاخیانەی کە بێ سەرکردە ماونەتەوە، خۆیان بە دەستەوە دەدەن، لەبەرئەوەی بەرگری کۆتایی هاتووە و، کردەوە عەسکەرییەکان ڕاگیراون، ئیتر هیچ ئیعلانێکی ڕەسمی دەرناچێ.

٣-لەو ڕۆژەوە هەواڵەکان کەم بوونەتەوە، هێشتا چەند دەستەیەکی کەمی پەڕاگەندە لە ناوچە ئێجگار سەختەکاندا بەرگری دەکەن، بەلام چاپەمەنیەکان جەخت لە سەر ئەوە دەکەن کە ئەمانە بەزووترین کات چارە دەکرێ. ڕۆژنامەکان خۆیان چالاکی دادگەکانی ئیستیقلال و عەسکەری و ناوی دادگەیی کراوان و لە سێدارە دراوان تەرخان دەکەن. کاربەدەستان وتوێژ لە سەر چاکسازیی ئیدارەی

[1] چاپ نەکراوە

ئەو هەرێمانە دەکەن. چەند کۆمسیۆنێکیان بۆ لێکۆڵینەوەی بارودۆخەکە و راپۆرت بەرز کردنەوە لەسەری ناردووە. پێویستە خێرا بڕیار لەو ریفۆرمانە بدرێ و .ئەنجومەنیش رازی بووە دادگەکانی ئیستیقلال شەش مانگ زیاتر لەو ماوەیەی مەبەست بوو، درێژە بە کارەکانیان بدەن.

٤- ئاشکرایە ئەو بەڵگەنامانەی کە لە ئۆپەراسیۆنەکەدا بە دەست کەوتوون. ئەوە دەگەیەنن کە دەسەڵاتدارانی بریتانی لە عێراق ئەگەر بە راستی هاوکاریی سەرهەڵدانەکەیان نەکردبێ، پێی رازی بوون. ئەمانە هێشتا بە تەواوی سەیر نەکراون، بەڵام کورتەکانیان کە ئێستا بڵاوکراونەتەوە جگە لە خودی کوردەکان کەسی تر تاوانبار ناکەن. تووڕەییەکی زۆریش بەرامبەر کاری دەسەڵاتدارانی عێراق، بۆ جێگیر کردنی نەستۆریەکان بە درێژایی سنووری تورکیا لە ئارادایە.

٥- دەکرێ وا دابنرێ کە سەرهەڵدانە رێکخراوەکان لەم کاتەدا دواییان هاتووە. بەڵام ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە خواستی سەرکردەکانی کورد بۆ دامەزراندنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ نەماوە. یاخود بنەبڕکراوە. ئەوەندە ماوە ببینرێ کە ئایا تورک دەتوانێ ئەو چاکسازییانە بکات کە کورد پێیان رازی بێ؟

ئار. ئی. هارێنك

وەزارەتی دەرەوە: ٢٦٢/٤٢٤، ل: ١٥٤-١٥٥، ژ١٥٦/١

---

## ژ: ١٥

## لە مستەر لیندسەیەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلەین _ (٢٩ نیسان گەیشتووە)

## (ژمارە: ٦٦)

**قوستەنتەنییە، ٢٨ نیسانی ١٩٢٥.**

گەورەم،

باڵیۆزی ئیتاڵیا پێم دەڵێ لە سەرچاوەیەکی بڕوا پێکراوی ئەنگۆرەوە بیستوویە کە ناوەندەکانی حکوومەت زۆر لە کاروباری هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات ڕازین .ژمارەیەکی زۆر سەربازیان لەو ناوچانەدا کۆکردۆتەوە. (دەڵێ ٦٠٠٠٠ هەزار چەکدار دەبن). ئەمە جگە لە ڕێکخستنی ناوخۆ گوشارێکی گەورە دەخاتە سەر نەك تەنها حکوومەتی خاوەنشکۆ بەڵکو کۆمەڵەیش. کە وەك هیوادار بوون، بەم جۆرە ناچار دەکرێ بڕیارەکەی بەقازانجی تورکیا بدات. من بڕوام بەو قسانەی سەرەوەی باڵوێزیئتاڵیانییە، پشتگیرشم نەکردوون. ئەو ئەوەیشی لەسەرچاوەیەکی بڕواپێکراوەوە وەرگرتبوو کە سەروەزیر لەکاتێکدا دەیویست ئەم فشارە بەردەوام بێ، بە تەواوی دژی هەرکارێك بوو ببێتە مایەی کێشەی ترسناك لەگەڵ حکوومەتی خاوەنشکۆدا.

وەزارەتی دەرەوە: ٢٦٢/٤٢٤ ، ل: ١٥٥، ژ: ١٥٨

*** *** *** *** ***

## ژ: ١٦

## لە مستەر لیندسەیەوە بۆ مستەر چامبرلەین - (٤ مایس گەیشتووە)

## (ژمارە: ٣٣١)

**قوستەنتەنییە، ٢٨ نیسانی ١٩٢٥**

گەورەم ،

بۆ تەواو کردنی برووسکەی ژمارە ٣٢٢ی ٢٢ی ئـەم مانگـەم، ئەمـەوێ پێتـان ڕابگەیەنم کە ٢٣ی مانگ کۆبوونەوەی ئەنجومەن بۆ کۆتاییی مانگی تشرینی یەکـەم دواخـرا. بڕیـاری بودجـە لـە کـاتی گونجـاو دا درا، بـەڵام هێشـتا دوا ڕادەی ئاشـکرا نەکراوە. چاوپێکـەوتنێکی وەزیـری دارایـی لەچاپەمەنیەکانـەوە بـڵاو بـووەوە، ئەمـە بەشێکی قسەکانیەتی بەفەڕەنسی.

"ناکرێ بە تەواوی باسی کورت هێنانی بودجە بکرێ. تیوریە کۆنەکان وبۆچوونـە کلاسیکیەکان سەبارەت بەبودجە چیتر بیانووی مانەوەیان نەماوە"

"کەم و کوڕی لە بودجەماندا لە چ ئاستێکدایە؟"

"هیچ ژمارەیەك لەبارەی ئەم بابەتەوە نازانم تا بتدەمێ"[1]

هەوڵ ئەدەم درێژەی ئەم بابەتە بە دەست بخەم و، بۆ بـەڕێزتانی بەرزبکەمـەوە .بەڵام بە قسەکانی وەزیر و بەهۆی بێدەنگیی ڕۆژنامەکانەوە، لەوانەیە کارێکی هەروا ئاسان نەبێ.

٢–سەبارەت بە یاخی بوونی کوردستان شتێکی وا نییە شایەنی باس بێ،ئەوە نەبێ کە بارودۆخەکە خەریکە ڕێچکەی ئاسـاییی خـۆی دەگرێتـەوە. تـاقمی یـاخیی دەوروبەری سیلوان تێکشکاون و، دەیشڵێن لە هەموو لایەکەوە شێخ و کشتیاران بـە

---

[1] ئەم برگەیە فەرەنسییە.

پەلە خۆیان بە تەسلیم دەکەن و، بەڵێنی ئەمەکداری دەدەن. ژیان بەرەو ئاسایی بوونەوە دەچێ و، ڕۆژنامەیەکیش نووسیویەتی بەشێکی هێزەکانی دامرکاندنەوە دەکێشرێتەوە، بەلاّم ئەمەیان دەشێ جێی گومان بێ، دەسەلاّتدارانی تورك پێناچێ تەنها ساتێکیش نە واز لە و دەستکەوتانە بێنن کە پێیان وایە بە درێژەپێدانی گوشارەکانیان بۆ سەر سنووری عێراق لە ڕێگەی ئەم مۆڵدانە عەسکەریەی ئێستاوە بەدەستیان دێنن و، نە دەیشیانەوێ ئەم هەلەی ئێستای سڕینەوەی ڕەگەزنامەی کورد لەدەست بدەن پێناچێ پێوەرێکی بڕواپێکراومان لە بارەی ئەوەی وا چەند هەفتەیەکە لەو هەرێمانەدا ڕوودەدا، یان ڕێ و شوێنەکانی سزادانی وەك لەسێدارەدان کە ئەمەیان بە دڵنیاییەوە تەواو زۆرەو، هەڵبەت پێویستیشی بەهێزی زیاتر دەبێ، چنگ بکەوێ .

٣- ئەم سیاسەتەی سەرکوتکردن دەبێ پەیڕەو بکرێ و، بەڵگەیش بۆ ئەمە لە قسەکانی دوێنێی عیسمەت پاشادا دەردەکەوێ کە لە کۆنگرەی (ئۆجاغی تورك)ی یانەکانی ڕاگەیاندنی ڕۆشنبیریی تورکیدا وتبووی:

(ئێمە بە ئاشکرا نەتەوە پەرستین. . . ناسیونالیزم تاکە هۆکاری یەکێتیمانەو، هیچ ڕەگەزێکی تر جگە لە زۆرینەی تورك، نفووزی نییە. ئەبێ بە هەر نرخێك بێ هاونیشتمانییەکانمان بکەین بەتورك و، ئەوانە لەناوببەین کە دژایەتیی تورك و تورکایەتی دەکەن. ئەمانەوێ ئەوانەی خزمەتی ولاّت دەکەن، تورك و تورك پەرست بن، ئەڵێن گوایە ئێمە گرووپە دینییەکانمان فەرامۆش

کردووە، بەڵام ئێمە هەرکەسێك لەڕووماندا ڕابوەستێ و دین بکاتە ئامێرێك بۆگەیشتن بەئامانجەکانی، لەناوی دەبەین).

ئەم قسەیە بۆ ئەم کاتە سروودێکی سەیری سەرکەوتنە.

٤- حوسەین جاهید کە لەلایەن دادگەی سەربەخۆی ئەنگۆرەوە دەستگیر کراو، لەبڕگەی سێی ڕاپۆرتی ژمارە ۳۲۲ی هەفتەی پێشوومدا پێم ڕاگەیاندن، دوێنێ دادگەیی کرا، بەڵام کێشەکەی دواخرا. بە پێی ئەوەی کە ئەمڕۆ لەسەری بڵاوکرایەوە، وا دیارە یەکێك لە تاوانەکانی ڕۆژنامەکەی بووە کە لە سەردێڕی هەواڵی کارێکی پۆلیسدا دژی نوسینگەی قوستەنتەنییەی پارتی پێشکەوتنخواز ڕووداوەکەی بە "پەلامارێکی سەیر" لەجیاتی "ڕاست کردنەوەیەکی پێویست " ناوبردووە من پێشتر ئەمەم بیستبوو، بەڵام لەبەرئەوەی زۆر بێ مانا دیار بوو نەمویست بۆتانی بنووسم. سەرەڕای ئەوەی کە جاهید لە هەر ڕەخنە و باسێکی ئازاردەری سیاسی خۆی بواردبوو، ئەمە بۆ پاساوی دادگەیی کردنی بەسە.

٥- ڕاپۆرتێکی گرنگم لەم بارەیەوە بیستووە کە بەوپێیە حوسەین جاهید لەئەنجامی داوایەکی سەرۆکی دادگەی ئەنگۆرە دا بۆ غازی پاشا فەرمانی گرتنی دراوە و، تا ڕوودانی کارەکەیش عیسمەت پاشا لەمە بێ ئاگا و، پێشی ناخۆش بووە. ئەمەیش بێ گومان بە شێوەیەکی گشتی بێ سەرە و بەرەیی کاری سیستەمی حکوومەت و دەسەڵاتی فراوانی سەرۆك پێشاندەدات. هەروەها دەشێ ئەوە بگەیەنێ کەعیسمەت پاشا دەسەڵاتی خۆی لەدەست داوە، بەڵام باشترە جارێ حوکم لەسەر ئەمە نەدرێ.

٦–زۆر ڕێیتێدەچێ مانگی ئایندە غازی پاشا بێتە قوستەنتەنییە و، چەند هەفتەیەك لەکۆشکی بەگلەربەگ ، بەری ئاسیا، کە دەتوانرێ بە ئاسانی پاس بکرێ، بمێنێتەوە. لەمەوبەر چەند ڕاپۆرتێك لەسەر ئەم سەردانە لە ئارادا بوون، بەڵام ئەمڕۆ دەمو دوویەکی نوێی شیاو و ڕاستیان لە خۆگرتووە. مانگی ڕابردووکە لە ئەنگۆرە بووم (لە تیفەخانم) پێی وتم: ئەوو پاشا خوازیان ئەم هاوینە سەردانی قوستەنتەنییە بکەن. ئەمەیش لە خۆیدا پشت ڕاستکردنەوەیەکی ئەم هەواڵانەیە، سەرەتا دەوترا سەرۆك لێرەوە بۆ فەڕەنسە دەچێ، بەڵام چەند ڕۆژێك پێش ئێستا ئەمە بەدرۆ خرایەوە.

ئار ئێس. ليندسەی

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤ / ٢٦٢، ل: ١٥٦– ١٥٧ ، ژ: ١٦٠

***   ***   ***   ***   ***

ژ: ١٧

**لە مستەر ليندسەيەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلەين - ( ٨ مايس گەيشتووە )**

**ژمارە: ٤٣٥**

**قوستەنتەنييە، ٢ حوزەيرانی ١٩٢٥**

گەورەم ،

بۆ تەواوکردنی برووسکەی ژمارە ٣٨٦ی ٢٠ مانگی مایسم، پێتان ڕادەگەینم کە دادگەکانی ئیستیقلالی ئەنگۆرە و دیاربەکر بێ پسانەوە لەچالاکیەکانیاندا بەردەوامن. کێشەی سەرەکیی دووهەفتەی ڕابردوو هی سەید عەبدولقادری سیناتۆری پێشووی کورد بوو کەساڵانی ١٩١٩–١٩٢١ پەیوەندییەکی باشی بە بزوتنەوەی ئۆتۆنۆمیی کوردستانەوە هەبوە. ناوبراو چەند مانگێك بوو لە قوستەنتەنییە دوور نەکەوتبوەوە، بەڵام لەگەڵ شەش کەسی تردا خرانە بەردەم دادگە و، دادگەیش بۆی

دەركەوت كە ئەم بە ڕاستی دەستی لەم هەڵگیرسانەی دواییدا هەبوە. هەر بۆیە لەگەڵ هاوڕێكانیدا لە سێدارە درا. ئێستا باس باسی دادگەیی كردنی خودی شێخ سەعید و بیست كەسێكە كە لە گەڵیدا گیرابوون. ئەمانە چەند ڕۆژێك پێش ئێستا خرانە بەردەم دادگەی دیاربەكر.

٢- ناكرێ ئەم دادگەییانەت بەدرێژی بۆ بنوسم. هەرچەندە ئەوانەی دادگەی دیاربەكر تاڕادەیەكی زۆر چاپەمەنیەكانیان داگیر كردووە، بەڵام هێندە پچڕ پچڕن، پشتیان پێ نابەسترێ و، خوێنەریش ناتوانێ بیرێكی یەككگرتوو لە بارەی ڕووداوەكانەوە گەڵاڵە بكات. بە پێی ڕۆژنامەكان بە گشتی چەند خاڵێك دەردەكەون:

أ- چاپەمەنیەكان شێخ سەعید بەكەسێكی توند و تیژ و نیمچە نەفام و شایستەی پێ ڕابواردن لە قەڵەم دەدەن. قسەكانی كە نووسراون لە هی كەسێكی سادە دەچن و، بە كاریگەیی هەڵسوڕاوێكی دینی مامەڵەی كردووە، بینیویەتی ویستەكانی حكوومەت هەڕەشە لە ئیسلام دەكەن و، بێگومان بە ئەركی خۆی زانیوە هەستێ و بجەنگێ.

ب- تاوانباران بەدەستەی پێنج شەش یان بیست سی كەسی دەهێنرێنە دادگە. وا دیارە زۆر بەتوندی یەكتر تاوانبار دەكەن. هەریەكەیان دەیەوێ ئەوە بخاتە ڕوو كە كەسێكی تر زۆری بۆ هێناوە تا چەك هەلگرێ، ئەم یەكتر تاوانباركردنانە هیچ لەمەسەلەكە ناگۆڕن و، تەنها دادگە دەخەنە پێكەنینن و ڕێی ئاشكرا بوونی بڕیارەكانی تاوانباری بۆ خۆش دەكەن. .

ج- شتێكی سەیرە وا تەنها كەمێك لەسەر دەست تێوەردانی بریتانیا لەجووڵانەوەی كورددا وتراوە یان هێڵراوە بوترێ. ئاماژە بە تامپلی Tampli یان تامپلین Tamplin ناوێك كراوە كە واهەست كراوە وەكیلی بریتانیا بووبێ، بەڵام ئاشكرا بووە كە كاری سیخوڕیی بۆ تورك كردووە و نازانم ئەم پیاوە كێیە. دەڵێین شێخ سەعید ویستوویەتی پاش گرتنی دیاربەكر لە ڕێگەی جزیرەوە پەیوەندی بە

دەسەلاَتدارانی بریتانیاوە بکات. ئەمانە هەموو ئەوانە بوون کە لە بارەی کارەکانی بریتانیاوە تا ئێستا لە ڕۆژنامەکانەوە بلاَو کراونەتەوە.

٣- ٢٦ی مانگی مایس قسەیەکی ڕەجەب بەگی وەزیری بەرگریی نیشتمانی لەسەر هەڵوەشانەوەیسووکە ڕەشبگیری ( نفیر جزئی) و گێڕانەوەی ژمارەیەك هێزی یەدەگ بە لیواکانیانەوە بۆ ناوچەکانی خۆیان بلاَو بووەوە، بە پێی قسەی ناوبراو هاوکات دەبێ شوێنی ئەمانە بەو سەربازە نوێیانەی وا لە باری ئاسایی‌و هەرێمەکانی خۆرئاوادا بانگ کراون و ئێستا بەرەو ڕۆژهەلاَت دەهێنرێن، پڕبکرێتەوە بۆ ئەوەی سەربازی ئەم ناوچانە زۆر کەم نەبنەوە، بەم جۆرە ئەم بارودۆخە هێشتا ڕوون نییە، لێرەدا برووسکەی ڕائید هارێنکی پاشکۆی عەسکەریی ئەم باڵوێزخانەیەتان لە بارەی ئەم مەسەلەیەوە پێشکەش دەکەم.

٤-دوێنێ ڕاگەیاندنێکی غازی پاشا لەسەر ئەم بابەتە بلاَو کرایەوە کە بەخۆشحاڵییەوە پێتانی ڕادەگەیەنم. تکایە سەرنجی ئەو دەمو دووە هەڕەشە ئامێزە سەیرە بدەن کە ڕاگەیاندنەکەی داگیر کردووە. لەبڕگەی یەکەمدا دەڵێ: سەربازە تازەکان بۆ (تەواو کردنی ) فیرقە کاتییەکان کە بەهۆی تەسریح بوونەوە بێ هێز بوون، بەکاردێن. غازی ئەوەی یادی جەماوەر هێنایەوە کە دادگەکانی عەسکەری و ئیستیقلال هەر لە کاردا دەبن و، پاش پیرۆزباییکردنی لە سوپاو سەرۆکی ستافەکە، هەمیشە زۆر ڕێزی فەوزی پاشا دەگرێ، سێ جار زیاتر ئەوەی وتووەتەوە کە یەکەم ئەرکی سەرشانی سەربازانی یەدەگی تورك ئەوەیە کە بە خێرایی و خۆشحاڵییەوە بە پیر بانگێشتی چەك هەڵگرتنەوە بچن.

٥-ئەم شێوە زمانە هەڕەشە ئامێزە لە ئاستی ئەم کێشە ناوخۆییەدا قازانجی خۆی هەیە. هەروەها ئاڕاستەی بریتانیا بە پلەی یەکەم و فەڕەنسەیش، کە حکوومەتی تورك دەشێ حەزبکات لێی دڵنیا نەبن، کراوە. تورك تەنانەت بۆ هێشتنەوەی یەدەگەکان لەڕیزەکانی سوپادا، پارە خەرج دەکەن. دواخستنی بڕیاری کۆمەڵەی نەتەوەکانی تایبەت بە سنووری عێراق ئەو فشارەی کە لە سەر

سەرچاوەکانی تورکیایە و بەشداریهێشتنەوەی ئەو هێزە زۆرەی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتە، سێ مانگی تر درێژ کردووەتەوە. پێدەچێ تورکیا پێی باش بێ ئەم گوشارە لە سەرخۆی لاببات، بەڵام بە پێویستی نازانێ هیچ دڵە ڕاوکێیەك كە دەشێ دراوسێکانی باشووری هەستی پێ بکەن، بڕەوێنێتەوە.

ئاڕ ئێس لیندسەی

وەزارەتی دەرەوە ، ٤٢٤/ ٢٦٢، ل: ١٦٨ ، ژ: ١٧٥

***   ***   ***   ***   ***

## هاوپێچی ڕاپۆرتی ژمارە ١٧
## لە ڕائید هارینکەوە بۆ مستەر لیندسەی
## قوستەنتەنییە، ٢ حوزەیرانی ١٩٢٥

گەورەم ،

دەمەوێ ئەوە بە بەڕێزتان ڕابگەیەنم كە نەمتوانیوە هیچ زانیارییەك بۆ سەلماندنی بەڕاستی كەوتنە تەسریحكردنی سەربازە یەدەگەكان بەدەست بێنم.

٢- ئەو زانیاریانەی كە لە سەرچاوەیەكی باوەڕپێكراوی ئێرەوە دەست كەوتوون دەڵێن: ٢٤ی مایس جموجۆڵێكی بەرچاوی سەربازی لە ناوچەی سمیرنا بەدی كراوە و ، ٢٤-٣٠ مانگ دوو شەمەندەفەری سەربازی كەوا مەزەندە دەكرێ (١٠٠٠ هەزار) كەسێكیان گواستبێتەوە، ڕۆژانە بە نێوان داربیسیە و موسلیمیەدا تێپەڕیون، بەڵام بە پێی زانیارییەكی قونسڵی حەڵەبی بریتانیای خاوەنشكۆ ئەو شەمەندەفەرانە بەتاڵ بوون و ، بۆ بەرەو ڕۆژئاوا گواستنەوەی ئەو یەدەگانە تەرخانكرابوون كە لە ویلایەتەكانی ڕۆژهەڵات پێویستیان پێیان نەمابوو. ئەم قسەیە لەگەڵ ڕوونكردنەوەی وەزیری جەنگی توركیدا كە وتی ، ئەو یەدەگانەی (وا بەدەم داوای لیوای ناوچەكانی خۆیانەوە هاتبوون و كۆببووبوونەوە) ئێستا بۆ هەرێمەكانی خۆیان دەگێردرێنەوە، یەكدەگرێتەوە. لەلایەكی ترەوە باڵیۆزخانەی فەڕەنسی هیچ زانیارییەكی لەسەر بارودۆخەكەوە نەبووە، كەچی ئێستا پاشكۆی عەسكەریی فەڕەنسە لە هەركەسێكی تری قوستەنتەنییە زیاتر زانیاری لە سەر جموجۆڵە عەسكەرییەكان هەیە. بۆیە ئەگەر حكومەتی توركی بەڕاستی ویستبێتی یەدەگەكان تەسریح بكات، ئەوا ئەمە لە فەڕەنسە شاراوەنییە.

٣-زانیاری سەرجەم ئەم قوتابخانە عەسكەرییانەی كە هەفتەی ڕابردوو سەرم لێدابوون، دەریانخست ژمارەی بەتالیۆنەكانی فەوجێكی پیادە لە دووەوە كراون بەسێ، ئەو پۆلە بە سەربازگیراوەی ئەمساڵ و ١٩٢٣ تا پایز دەمێننەوە، هەر

فەوجێك بەلای کەمەوە (٢١٠٠) و هەر فیرقەیەکیش (٦٣٠٠)سەربازیان هەیە .فیرقەکانی: ٢، ٥، ٧ ، ١٢ ، ١٧، ٤١ و فەوجی ٢٨ لەویلایەتەکانی ڕۆژهەلأت جێگیرکراون. بەم جۆرە، سەرجەمیان دەکاتە (٣٧٨٠٠) نێزەدار و (٣٠٠٠) شیروەشێن .خۆ ئەگەر فیرقەکان هەموو تۆپەکان (واتە ١٩٢ تۆپ) یان نزیکەی (٤٦٥٠٠) پیاویان هەبێ ...[1]

٤- ئەگەر ئەو یەدەگانە کە بۆ دامرکاندنەوەی شۆڕشی کورد بانگ کرابوون تەسریحیش بکرێن، هێشتا نیوەی لەشکری تورك لە سێ گۆشەی دیاربەکر -بدلیس- جزیرەی ئیبن عومەر[2]دا هەر لە حاڵەتی شەڕدا دەمێننەوە. ئا لەم کاتەیشدا هاوشێوەی ئەیلوولی ١٩٢٣ لە خۆیان ڕازین.

ئاڕ ئی. هارینك

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤، ٢٦٢، ل: ١٦٩ ، ژ: ١/١٧٥

*** *** *** *** ***

---

[1] ئەم ڕستەیە بە ناتەواوی چاپکراوە

[2] مەبەست ناوچەی " جزیرا بۆتان"ە. (س)

## ژ: ١٨

## لە سێر ئاڕ لیندسەیەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلەین- (١٥ حوزەیران گەیشتووە)

## (ژمارە: ٤٦٨)

**قوستەنتەنییە، ٩ حوزەیرانی ١٩٢٥**

گەورەم ،

لەدووی حوزەیرانەوە کە برووسکەی ژمارە ٦٣٥ م ناردووە سەرنج ڕاکێشترین ڕووداو فەرمانی ڕەسمیی داخستنی ئۆفیسی سەرەکی و لقەکانی پارتی پێشکەوتنخواز بوو، ئەم بڕیارە ٣ی حوزەیران دراو، ڕۆژی دواتر بڵاوکرایەوە، دادگەکانی ئیستیقلال بۆیان دەرکەوت ژمارەیەك پێشکەوتنخواز، بە سوود وەرگرتن لە برگەی (ڕێزگرتنی بیروڕای دینی و داب و نەریت)ی پەیڕەو و پرۆگرامی پارتییەکە کاری کۆنە پەرستانەیان ئەنجامداوە، ئەمانە لەلایەن پیاوەکانی سوڵتان واحیدەدەین(Vahideddin)[١] ی پێشووەوە بزوێنراون و، ئێستایش حکومەت دەبێ دەست لە میانڕەویی خۆی هەڵگرێ و، دوایی بە ڕێکخستنەکانی ئەو پارتییە بێنێ، حکوومەت هاووڵاتیانی کۆمار لە بەکارهێنانی دین (ڕێگەی پەیوەندیی ڕۆح و پەروەردگار) وەك ئامێرێکی سیاسی بۆ بەدی هێنانی ئامانجی تایبەتی ووریا دەکاتەوە،ئەم پێناسە عیلمانی و نوێیەی دین جێیسەرنجە و، دژی قسەکانی دادگەی دیاربەکری شێخ سەعیدە کە لە چاپەمەنیەکانەوە بڵاویووەوە، شێخ، بۆ پاساوی ڕاپەڕینەکەی، وتوویە: بەر لە هەموو شتێ بە پێی ئەو نامیلەکەیەی کە خوێندوویەتیەوە ناسیونالیستەکان وەك ئاژەڵ سەیری خەلیفەیان کردووە،

---

[١] مەبەست سوڵتان محەمەدی شەشەم (١٨٦١-١٩٢٦)ی دواهەمین سوڵتانی دەوڵەتی عوسمانییە لە (١٩١٨-١٩٢٢) کەخەلافەت لەسەردەمی ئەودا هەڵوەشێنرایەوە.(المنجد ق الاعلام، حکومەتی ٦٣٨). (س)

خواجەیەك کە لە ئزمید بێ ئەدەبانە لە بارەی پێغەمبەرەوە دوواوە و سەرەنجام بە باجی (١٠٠سەد) لیرەی تورکی سزادراوە، ئەنگۆرە حوکمەکەی هەڵوەشاندووەتەوە .هەروەها شێخول ئیسلام لە قوستەنتەنییە ڕاپێچ کراوەتە قوتابخانەیەکی کچان کە پیانۆی تێدا لێدراوە و، سەماکراوە.

٢- دادگەکانی ئەنگۆرە و دیاربەکر لە کارەکانیان بەردەوامن، بەڵام دادگەیی شێخ سەعید تەنها کەمێك چووەتە پێش و، کێشەکانی تر ناوکێش دەکرێن .ڕۆژنامەکان دەڵێن دەسەڵاتداران سەرگەرمی دۆزینەوەی ڕێکخستنێکی فراوان و نهێنین کە کاریان بۆ واحیدە دین کردووە و دادگەیی کردنیشیان هەندێ ڕاستی دەخاتە ڕوو.

٣-ڕۆژنامەکان هەندێ وردەکاریی باشیان لەسەر هۆکانی تاوانبار کردنی سەید عەبدولقادر و هاوڕێکانی بڵاو کردووەتەوە. پارچەیەکی (ئاکشام Aksham) کە ئەم ئاشکرا بوونانەی تێدایە و، وێنەی لە سێدارە دانێکی بەوردی جێبەجێکراوی لە پێشەوەیە، هاوپێچ ئەکەم، ( لە برووسکەی ژمارە ٤٣٥ی ٢ی ئەم مانگەو بڕگەی یەکەمدا ئاماژەم بەم بابەتە کردووە، وەکیلێکی (کور سەعدیKeur Sadi) ناوی سەید عەبدولقادر پەیوەندیی بە (تامپلینگ – Tampling) ەوە هەبووە. تامپلینگ بە ناوی وەکیلی بریتانیاوە کاری کردووە، بەڵام لە ڕاستیدا ئیشی بۆ پۆلیسی تورك کردووە) .ناوبراو کور سەعدیی لە خشتە بردووە و، چەند پێشنیارێکی نووسراوی شێوە ڕێککەوتنی ئاست بەرزی لێ وەرگرتووە.

٤- دەزانم تامپلینگ سەرەتا لێرە پۆلیسی هاوپەیمانان بووە، بەڵام وازی هێناوە و وەك ئەندامێك بووەتە هەواڵدەر (مخابر) ی (Hulse)ناوێك. دەسەڵاتدارێتیی بریتانیا بە چاوێکی زۆر جیاوازەوە سەیری ئەمانەی کردووە، چونکە زانیویەتی دەیانەوێ کار بۆ بێگانە بکەن، بەڵام هەندێ جار (سێر ئەی. بلۆك Sir A .Block) لە

سەر چەکی ساختەی بانك کاری پێ کردوون. ئەمانە بە دڵنیاییەوە پەیوەندییان بە پۆلیسی تورکەوە هەبوە. پێناچێ تامپلینگ لێرە مابێ، بەڵام (Hulse) هێشتا لێرەیەو، کار بۆ بۆڵشەڤیکە ڕووسەکان دەکات و، مووچەکەیشی لەوان وەردەگرێ.

ئار. ئێس لیندسەی

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٢/٤٢٤. ل: ١٧٣ ، ژ: ١٨٠

## ژ: ١٩

## لە مستەر هۆرەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلەین — (٧ تەمموز گەیشتووە)

(ژمارە ٥١١- نهێنی)

تیراپیا، ٣٠ حوزەیرانی ١٩٢٥

گەورەم ،

خۆشحاڵم ئامـاژە بـە برووسـکـەی ژمـارە ٨٧ی ١٧ی ئـەم مانگـەم سـەبارەت بـە جموجۆڵی عەسکەریی تورك، راپۆرتی پاشکۆی عەسکەریتان بـۆ بـەرز بکەمـەوە کـە تێیدا هاتووە: بە پێی ئەو زانیاریانەی کە توانـراوە دەسـت بخرێن، زیاتر لـە (٥٠٠٠٠ پەنجا هەزار) سەرباز لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتدان.

٢- رائید هارێنك دەڵێ: بـاوەڕی وایـە ئەگـەر بڕیاری موسـڵ بـە قـازانجی عـێراق بدرێ، ئەوا تورکەکان بۆ هەڵگێڕانـەوەی کاریگـەری بڕیارەکـە، بـیر لـە دروسـتکردنی چەند دەستەیەکی بەهێزی (چەتە) دەکەنـەوە و، پێشـدەچێ لـە سـەربازانی نزیکـی سنوور کە بۆ ئەو مەبەستە تەسریح دەکرێن پێکبهێنرێن. بێگومـان ویژدانـی سیاسـی تورك هێنـدە لاوازە دەیـەوێ لـە رێگـەی ئـەو باندانـەوە، بـە شـێوەیەکی نـاڕەسمی، عـێراق داگـیر بکـات، ئەمـە لـە تێبینـی هـاوپێچراوی راپۆرتـی ژمـارە ٤٦٩ی ١٠ی حوزەیرانی سێر ئاپ لیندسەیدا زۆر بە ڕەهایی پشت ڕاست کراوەتەوە.

٣- سەرەڕای ئەمانەیش هێشتا زۆر زووە بڵێین خواستێکی هەڕەشە یـان جـەنگ دژی عێراق لە ئارادایە. ڕەوتی دادگەی ئیستیقلالی دیاربەکر و حوکمی درندانەی تورك لە بەرامبەر شێخانی کوردی تاوانبار بە بەشداری لەم ڕاپەڕینەی دواییدا بیانوویان بۆ مانەوەی هێزەکان لەو بەشەی وڵاتدا دروست کردووە، دواتر ڕاپۆرتێکی جیاتـان لـە سەر حوکمدانی شێخانی کـورد لەلایـەن تورکـەوە بـۆ بـەرز دەکەمـەوە ئەگـەر چـەند

هەفتەی ئاینده هیچ لە کوردستان ڕووی نەداو سەربازانی سەر سنووری عێراق کەم نەکرانەوە، دەبێ داوای بەڵێنی بەهێزتر، نەك دۆستانە، بکەین. بەڵام ئێستا پێم وایە تاکەمتر لە سەری بڕۆین باشتر بێ.

٤– پێویستە ئەوەیش بڵێم کە ماوەی دووهەفتەی ڕابردوو چاپەمەنیەکان دووجار ناردنەوەی بەرەو ڕۆژهەڵاتی سەربازانیان بۆ تەسریح کردن ڕاگەیاندووە. ڕێ بە هیچ نیشانەیەکی گواستنەوەی سەرباز نەدراوە، بۆیە لەم حاڵەتەدا هیچ گومانی تێدا نییە کە ئەم نوسینانە دڵسۆزانە و بۆ بەرژەوەندی ئێمە چاپ نەکراون.

٥– کۆپییەکی ئەم ڕاپۆرتە بۆ بەغدا و بەیرووت دەنێرم.

ئار. ئێچ. هۆر

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٣/٤٢٤. ل: ١ ، ژ: ٢

*****

## هاوپێچی (١)ی ژمارە ١٩
## لە ڕائید هارێنکەوە بۆ مستەر هۆر

(ژمارە ١٦)

تیراپیا، ٢٥ حوزەیرانی ١٩٢٥

گەورەم،

خۆشحاڵم ژمارەی هێزەکانی تورکتان لە ٢٠ی ئەم مانگە و ئەو جێیانەدا کە بە ویلایەتەکانی ڕۆژهەلاَت ناسراون، پێ ڕابگەیەنم. زانیاریەکانی پێش یاخی بوونی کوردستان لە وەزارەتی جەنگی فەیلەقەکانی سوپای تورك لەو ناوچانەداو هی ئەو یەکە جۆراوجۆرانەیشەوە کە لە سەرهەڵدانەکەوە بۆیان نێردراون، لە چەند سەرچاوەیەکی بڕواپێکراوەوە وەرگیراون. ئەمە فەیلەقی پێنجیش دەگرێتەوە کە ڕۆژنامەکان دەڵێن گوایە نێردراوەتەوە بۆ شوێنیپێشووی. بەلاَم تا ئێستا بەو بەشەی هێڵی ئاسنی بەغدادا کە دەکەوێتە ناوچەی ماندەیت (ئینتیداب)ی فەرەنسەوە نەپەڕیوەتەوە.

کۆی گشتی بریتی‌یە لە ١٧٥٠ شیر و ٤٩٠٠٠ تفەنگ و ١٠٨ تۆپ. لە ڕاپۆرتەکانی ژمارە (٥، ١٤، ٧)مدا بۆ باڵوێزی بریتانیای خاوەنشکۆ لە قوستەنتەنییە، باسی بەکارهێنانەکانی ئەم ژمارە گەورەیەی سەربازانم کردووە، ئەو ئەنجامەم دەستگیر بووە کە تورکان پێیان وانییە کێشەکە شایستەی ئەوە بێ ئەمان هێرش بکەنە سەر عێراق.

هێشتنەوەی ئەو سەربازانەیش دوای یاخی بوون، لە سەرێکەوە بۆ ئەوە بووە کە دەستیان بە چاکسازی کرد هێزێکی زۆریان لە ولاَتدا جێگیر کردبێ، پەیوەندیەکان بە گشتی باشکراون و، ولاَت مەدەنی کراوە، هەروەها لەوانەیە دەسەلاَتدارانی تورك ئەوەیان لە خەیاڵدا بێ کە کاتی بڕیاری ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان ئەو هێزە زۆرەیان لە نزیك سنووری موسڵ هەبێ.

کاتێك ڕاپۆرتەکانی (٥ ، ٧)م لە سەر ئەم مەسەلەیە نووسی، چاپەمەنیەکانی تورکیا کە کەم و زۆر شتەکانیان لە حکوومەتەوە وەردەگرن، باوەڕی تەواوی خۆیان لە چەند بابەتێکدا سەبارەت بە بڕیاری کێشەی سنووری موسڵ بە قازانجی تورکیا پێشان دا، بەڵام دوێنێ لە سەرچاوەیەکی تەواو بڕواپێکراوی ئێرەوە زانیم، ئەو بەرپرسانەی کە ئاڕاستەی سیاسەتی تورکیایان بە دەستە، نەك هەر لە ئاکامی کێشەکە دڵنیا نین، بەڵکو بە کردەوە باوەڕیان بەوە هێناوە کە بڕیارەکە بە قازانجی عێراق دەبێ.

ئەگەر ئەم زانیارییە ڕاست بێ، ئەوا ئەمە چارەسەرێکی باشە بۆ گرفتەکە .فەرماندەیی بالای تورك پێی وایە هێزە گەورە تورکیەکەی نزیك (چاناك Chanak)[1] بوو کە زۆری بۆ دانوستانەکانی (مودانیە) هێنابوو. کە مالەدین سامی پاشا وتی ئێمە لە دەرەوەی چاناك ترسێنراین. ساڵی ١٩٢١ فەرەنسییەکان بە تاکتیکی تورك بە دروست کردنی باندێکی زۆری چەتە و، دابینکردنی ڕەشاش و بڕنەوو تەقەمەنی بۆیان و، بێ دەنگکردنی ئەفسەرانی نیزامی لە ئاستیانداو، پشتگرتنیان لەلایەن هێزێکی توانای تورکەوە ناچارکران لە (مەرعەش Marash و عەینتاب Anitab) بکشێنەوە. وا دەردەکەوێ ئیحتیمالێکی کەمی ئەوە هەبێ کە فەرماندەیی بالای تورك، بەم دووکارە، بیەوێ بیر لە دوو بارەکردنەوەی هەمان مانۆڕی، بەڕای خۆی، سەرکەوتووی سالانی ١٩٢١ و ١٩٢٢ بکاتەوە.

پێم وایە ئەگەر هیچ هەواڵێکی ناردنەوەی فەیلەق و فیرقەی پێنج نەبێ، ئەوا زۆر ڕێتێدەچێ تورك شالاوێکی چەتەیی هاوشێوەی ئەوەی کە بردییە سەر سیلسیا، بکاتە سەر عێراق.

ئاڕ. ئی. هارێنك

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٣/٤٢٤، ل: ٢ ، ژ ١/٢

****

---

[1] ڕەنگە مەبەست چەناق قەلعە بێ. (س)

## هاوپێچی (٢)ی ژمارە (١٩)
## ژمارە سەربازانی تورك لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتدا

٢٠ حوزەیرانی ١٩٢٥

هێزەکانی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات –١٥ی شوباتی ١٩٢٥: –

| فەیلەقی (٧) : | شیر | تفەنگ | تۆپ |
| --- | --- | --- | --- |
| تیپی (٨)ی سوارە | ٥٠٠ | --- | ٨ |
| فەوجی (٢٨)ی پیادە | --- | ٥٠٠ | --- |
| تیپی (١)ی سوارە | ٥٠٠ | --- | ٨ |
| تیپی (١٤)ی سوارە | ٥٠٠ | --- | ٨ |
| تیپی (٢)ی پیادە | ٥٠ | ٣٠٠٠ | ٢٤ |
| تیپی (١٧)ی پیادە | ٥٠ | ٣٠٠٠ | ٢٤ |
| سەرجەم | ١٦٠٠ | ٦٥٠٠ | ٧٢ |

ئەو هێزانەی کە بە شەمەندەفەر بۆ ئەو هەرێمە نێردراون:

| أ- فەیلەقی پێنج | شیر | تفەنگ | تۆپ |
| --- | --- | --- | --- |
| تیپی (٧)ی پیادە | ٥٠ | ٦٧٥٠ | ٢٤ |
| تیپی (٤١)ی پیادە | ٥٠ | ٦٧٥٠ | ٢٤ |
| سەربازانی فەیلەق | --- | ١٥٠٠ | --- |
| سەرجەم | ١٠٠ | ١٥٠٠٠ | ٤٨ |

ب-بەهێز کردنەوەی فەیلەقی (٧)

| | شیر | تفەنگ | تۆپ |
|---|---|---|---|
| کۆکردنەوەی فەوجەکانی پیادە بۆ بەرگری | -- | ٩٢٥٠ | --- |
| بۆ فیرقەی (١) سوارە کەسەرەتای یـاخیبوون | ٥٠٠ | --- | --- |
| تەفروتونا بوو بوو هەمووی | ٥٠٠ | ٩٢٥٠ | -- |
| سەرجەمی أ+ ب | ٦٠٠ | ٢٤٢٥٠ | ٤٨ |

ئەگەر دەستەیەکی تۆپخانە ١٠٠ کەسەبێ. کۆی گشتی ئەو هێزانەی کە بە سەر هێڵی ئاسنی بەغدادا هێنراون، بە زیاد کردنـی ١٢٠٠ بـۆ دەسـتەی تۆپخانـە، دەکاتـە ٢٥٤٥٠، ئەمەیش نزیکی ئـەو ژمارەیەیـە کـە ئەفسـەری پەیوەندیـەکان لـە بەیرووت داویەتی.

گومـانی تێـدا نییـە کـە فیرقـەی (٥) لــە هــەرێمی تۆقاتــەوە بەشــداریی ئۆپەراسیۆنەکانی کردووە، کەواتە هێزەکان کاتی شەڕ بەم جۆرە بوون: -

| | شیر | تفەنگ | تۆپ |
|---|---|---|---|
| فەیلەقی (٥) | ١٠٠ | ١٨٥٠٠ | ٤٨ |
| فیرقەی (٥) | ٥٠ | ٦٧٥٠ | ١٢ |
| فەیلەقی (٧) | ١٦٠٠ | ١٥٧٥٠ | ٤٨ |
| سەربازی فەیلەقەکان | --- | ٣٠٠٠ | --- |
| سێ بەتالیۆنی بەرەی شەڕ | --- | ٣٠٠٠ | --- |
| جەندرمە | --- | ٧٠٠٠ | --- |
| سەرجەم | ١٧٥٠ | ٤٩٠٠٠ | ١٠٨ |

کۆی گشتی بە زیاد کردنی ٢٧٠٠ ی تۆپخانە دەبێتە (٤٩٤٥٠)[1].

ئەم ژمارەیە، بە شێوەیەکی بەرچاو، کەمترە لەوەی جەنەراڵ[2] (سەرایل – Sarrail) (برووسکەی ژمارە ٢٨٧ی ٤ حوزەیرانیکۆمیساری باڵا لە بەغدا، بۆ سکرتێری وڵات بۆ کۆلۆنیەکان و هەروەها بە ژمارە ١٩٥ بۆ قوستەنتەنییە) وا هەست دەکەم دەزگای هەواڵگری (مخابرات)ی فەرەنسی ژمارەی یەکە پیادەکانی فەیلەقی (٧) ی زۆر زیاتر داناوە.

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٣/٤٢٤ ، ل: ٢-٣، ژ ٢/٢

***   ***   ***   ***   ***

---

[1] هەڵە لە ژمارەکانی ئەم خشتەیەدا هەیە.

## ژ: ٢٠
## لە مستەرهۆرەوە بۆ مستەر چامبرلەین- (٧ی تەمووز گەیشتووە)
(ژمارە/ ٥٢٢)

### تێراپیا، ١ی تەممووزی ١٩٢٥

گەورەم، بۆ تەواو کردنی ڕاپۆرتی ژمارە ٤٦٨ ی ٩ی مانگی ڕابردووی سێر ئاپ .لیندسەی ئەمەوێ ئەوەتان پێ ڕابگەیەنم کە ٢٣ی مانگی پێشوو دادگەیی شێخ سەعید و ئەوانەی وا لە یاخی بوونی کورددا دەستیان هەبوو، پاش ئەوەی مانگێکی خایاند، کۆتایی هات. درێژەی هیچ بایەخێکی گشتیی ئەو بەڵگانەی کە لەماوەی ئەو دادگەییانەدا خراونەتە ڕوو، بڵاونەکراوەتەوە، شێخ سەعید و چل کەسی تر بە مردنو ژمارەیەکی کەمتریشیان بە زیندان و کاری قورس سزادران. ڕائید قاسمی خێڵەکی کە لەماوەی دادگەییەکەیدا بەڵگەی بە دەوڵەت دابوو لەگەڵ ١٥–٢٠ کەسی تردا ئازاد کران. لەگەڵ ئەمانەیشدا دادگە فەرمانی دا خانەقاو خەڵوەتکەی ویلایەتەکانی ڕۆژهەلات. بە بیانووی ئەوە کە گوایە شێخەکان بۆ سەپاندنی دەسەلاتێکی ئەفسانەیی بێ مانا بەسەر خەڵکی نەفامدا بە کاریان هێناوە دابخرێن.

٢– ئاژانسی ئەنادۆڵ ڕایگەیاند کە سەرۆکی دادگە پاش دەرکردنی حوکمەکە بەم جۆرە لەگەڵ تاوانباراندا دوواوە:

" ئێوە هەندێکتان بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی خۆتان کۆبوونەوە، ئەوانی تریشتان دوای پڕۆپاگەندەی بێگانە و ئارەزووی سیاسی کەوتن و هەمووتان بۆ هەمان ئامانج کە بریتی بوو لە دامەزراندنی کوردستانێکی سەربەخۆ کارتان دەکرد، ئێوە بە ڕێکخستنی سەرهەڵدانێکی گشتی کە چەند ساڵێك بوو بیرتان لێ دەکردەوە، ئەم هەرێمەتان تووشی شەڕکرد، یاخی بوونەکۆنە پەرستانەکەیشتان بە هۆی کاری بەهێزی حکوومەتی کۆمار و زەبری کەمەر شکێنی سوپای کۆمارییەوە بە زوویی دامرکێنرایەوە. ئێوەیش هەمووتان گیران و هێنرانە ئێرە، تا لە سایەی یاساو داد

پەروەریدا حسابتان لەگەڵدا بکرێ، دەبێ هەمووان ئەوە بزانن کە حکومەتی ئەم کۆمارە ساوایە هیچ جۆرە ئاژاوەو کارێکی خراپ دەرنابات و، بە هیچ شێوەیەکیش ڕێ بەم تاوانانە نادرێ خەڵکی بێ بەخت و دەرفەتی ئەو هەرێمانەی کە چەندین ساڵە لە ژێر ستەمی شێخ و ئاغاو بەگەکاندا هاڕدراون و سەروماڵیان کراوەتە قوربانیی ئەو کەسانە و، دواجاریش لە دەسەلاتی شەڕەنگێزی ئێوە ڕزگار کراون، بە درێژایی‌ی ڕێگەی خۆشگوزەرانی و بەرەوپێشچوونی کۆمارەکەمان لە ئاشتی و بەختیاریدا پێشدەکەون. هاوکات ئێوەیش لە بەرامبەر ئەو خوێنەی کە ڕشتووتانە و ئەو خانوانەی کە وێرانتان کردوون، ئەبێ پەتی سێدارەی دادپەروەری بکەنە ملتان، بەڵێ ئەم ەحوکمی یاساکانی کۆمارە".

٣-حاکمی گشتی دادگەی ئاگادار کردەوە: ڕازی نییە جێبەجێکردنی حوکمەکە سێ ڕۆژ دوابخرێ، بۆیە پێش بەرەبەیانی ٢٩ حوزەیران ئەو سزادراوانە بە مردن ، لە شوێنێکیئاوەڵای نزیك دەروازەی کۆنی حەڵەب لەدیار بەکر لە سێدارە دران.

٤-ڕۆژنامە ناوخۆییەکانی تورکیا لە هەواڵی سزا توندەکانی لە سێدارەداندا کە پەیامنێرە تایبەتییەکانیان دەیاننارد، بە شێوە زمانی توندی خۆشحاڵی پیشاندەدا کە چۆن ئەو ڕۆژنامە نووس و پیشەکارانە و خەڵکانی تریش لەکێ بەرکێدا بوون بەشداریی تایبەتیان لە لەسێدارە دانەکاندا هەبێ و، بە درێژیش تێبینی و هەڵس و کەوتی تاوانبارانیان بڵاو کردەوە. چاپەمەنیەکان سەبارەت بە لەسێدارە دانی ئەو سەرکردانەی ئاژاوەکەی کورد، گەیاندیانە ئەو پەڕی و هیچیان نەهێشتەوە. ئەمەیش لە برووسکەی ژمارە ٤٣٥ ی ٤٢ حوزەیرانی باڵوێزی خاوەنشکۆدا ئاماژەی پێکراوە.

ئاڕ. ئێچ. هۆر

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤، ٢٦٣، ل: ٣-٤ ، ژ/٢

*** *** *** *** ***

## ژ: ٢١

## لە مستەر هۆردوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلەین — (١٠ ئاب گەیشتووە)

### (ژمارە ٦٠٢)

### تێراپیا ، ٩ ئابی ١٩٢٥

گەورەم ،

خۆشحاڵم پێتان ڕابگەیەنم: ٢٣ی مانگی ڕابردوو کۆبوونەوەیەکی نا ئاسایی لە تەلاری ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانی لە ئەنگۆرە کراو، سەرجەم نوێنەرەکانی سەر بە پارتی گەلی بە نامەی بەپەلە بۆ داواکران و ، سەرکۆمار و سەروەزیر و ئەو وەزیرانەی کە لە ئەنگۆرە بوون بەشدارییان تێدا کرد و، تا نیوەڕۆی خایاند. عەلی سائیب بەگی نوێنەری (کۆزانKozan) و ئەندامی دادگەی ئیستیقلال بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژهەلات و ، فەیزی بەگی نوێنەری دیاربەکر و وەزیری کەرتی گشتی کابینەکەی فەتحی بەگی پێش ئەم کابینەیە، ئامادەی کۆبوونەوەکە بوون. لەبەرەئەوەی ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانی ئێستا لەوەرزی پشوویەکی درێژدایەو، لەم حاڵەتەیشدا کەس لە ئەنگۆرە نامێنێتەوە، هەرچەندە ئەتوانن ئەمە نەکەن، ژمارەی ئامادەبووانی کۆبوونەوەکە تا ڕادەیەك کەم بوو

٢- مەبەستی کۆبوونەوەکە، بە پێی ئەو ڕاپۆرتانەی وا گەیشتوونەتە قوستەنتەنییە. ، وتوویژ بووە لە سەر، بە شێوەیەکی گشتی، ئەو ڕێبازەی کە دادگە دەیەوێ بۆ چارەسەرکردنی دەرەبەگایەتی بیگرێتە بەر و، بە تایبەتیش ئەو مەسەلەیەی کە لە ئەنجامی بەڵگەیەکی بەرچاوی دانیشتنی ڕۆژی ٢٢ حوزەیرانی دادگەی سەربەخۆی دیاربەکردا هاتبووە ئاراوە.

٣-ئەمە کورتەیەکە سەبارەت بەو مەسەلەیە کە (ئۆغلوو حوسەین) ی تاوانبار بە بەشداری لە یاخی بوونی کوردا، ورووژاندوویەتی. کاتێك ناوبراو هێنراوەتە بەردەم دادگەی ئیستیقلال و، عەلی سائیب بەگ پرسیاری لێ کردووە، ئاشکرای کردووەکە

فەیزی بەگ گفتوگۆی لەگەڵ گوندنشینێکی هەرێمی دیاربەکردا هەبوە. هەروەها لەوەلاّمی پرسیارێکدا لەسەر ڕژێمی نوێی کۆمار، وتوویە: دین لە دەوڵەت جیاکراوەتەوەو، غازی پاشا نوێژ ناکات و، دەخواتەوە. پرسیارەکانی تری عەلی سایب بەگ بۆ ئەوە بوون کە تێوەگلانی فەیزی بەگی لە یاخی بوونەکەوە بۆ پشت ڕاست ببێتەوە. (٢٤) حوزەیران فەیزی بەگ ڕەتکردنەوەی ئەم پڕۆپاگەندانەی بلاّوکردەوە، ئیتر مەسەلەکە ماوەی مانگێك دامرکایەوە. پێم وایە لەو مانگەدا حکوومەت لە گفتوگۆی ئەوەدا بوو بێ کە ناوبراو دادگەیی بکرێ یان نا؟ بە ئاشکرا بڕیاردرا: لە بەرئەوەی دانیشتووی دیاربەکرە باشترین ڕێگە ئەوەیە کە هەلێکی شیاوی بۆ بڕەخسێنرێ تا دان بە ئەمەکداریی خۆیدا بنێ و، پێشانی بدات نوێنەری دیاربەکر پشتیوانی ئەو بیر و ڕایانەی نەکردووە کە بوونەتە مایەی یاخی بوونی کورد، لە بەرئەوە، بانگهێشت کرا تا لە کۆبوونەوەکەدا قسە بکات. ئەویش لە وتەیەکی درێژدا جارێکی تر تۆمەتەکەی ڕەتکردەوەو ڕێزی خۆی بۆ سەر کۆمار و عیسمەت پاشا دەربڕی.

٤–ئەمجا کەوتنە باسی بارودۆخی ویلایەتەکانی ڕۆژهەلاّت و، ڕاگەیاندرا کە بەکۆی دەنگ بڕیاری ڕیشەکێش کردنی (پاشماوەی دەرەبەگایەتی) یان لەو بەشەی ولاّتدا داوە.

٥–(وەقت) ی ٢٩ و (ئاکشام) ی ٣٠ تەمووز سەرگوتارەکانیان بۆ ئەم بابەتە تەرخانکرد بوو، ئەوەی پێشوو ڕایگەیاند ئەگەر حکوومەت بیسەلمێنێ جگە لە یاساو دادپەروەری هیچ دەسەلاّتێکی تر لە ولاّتدا نییە، ئەوا دەرەبەگایەتی لە ڕووی چاکسازیدا هەرەس دێنێ. ئەوەی دوایش دەری خست: بەگ و ئاغا و شێخەکان نەك هەر زیادەن، بەڵکو سەرچاوەی تێکدانی سیستەمی کۆمەلاّیەتین، ڕزگار بوون لە دەست ئەمانەکارێکی ئاسانە و، شۆڕشی تورکی پاشماوەی گرنگتری وەك خەلافەتی سڕیوەتەوە. ڕۆژنامەکە دەستخۆشیی بڕیارەکەیشی لە حکوومەت کرد.

٦- لەم بارەیەوە دەڵێم: هەفتەی یەکەمی مانگی تەمووز، جەمیل بەگی وەزیری ناوخۆ لەگەڵ ڕەفیق بەگی وەزیری تەندروستی گشتیدا بە گەشتێك ئەنگۆرە ی بەرەو ناوچەکانی ڕۆژهەلات بەجێهێشت. ١٧ تەمووز کۆنفرانسێکی لەگەڵ والییەکانی هەرێمەکەو، زەکی بەگی فەرماندەی جەندرمە و مدحەت بەگی توێژەری کۆمەلایەتی کە لە شیاوترین شێوازی دابەشکردنی هەرێمەکەی دەکۆڵییەوە بۆ مەبەستی ئیداری، سازدا. ٢ ی ئەم مانگە جەمیل بەگ گەڕایەوە ئەنگۆرە و بە دڵنیاییەوە هەرکە ئیجرائاتەکانی ویلایەتەکانی ڕۆژهەلات، وەك عیسمەت پاشا لە قسەی ٧ نیسانی ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانیدا پێشبینیی کردبوو، بڕیاریان لە سەردرا، ئەوا ڕاوبۆچونەکانی، بە دڵنیاییەوە، جێی خۆیان دەگرن (برووسکەی ژمارە ٢٨٩ی نیسانی سێر ئار لیندسەی).

ئار. ئێچ. هۆر

وەزارەتی دەرەوە ، ٢٦٣/٤٢٤ ، ل: ١٦، ژ: ١٦

*** *** *** *** ***

## ژ: ٢٢

## لە مستەر هۆرمەوە بۆ مستەر چامبرلەین (٢٤ی ئاب گەیشتووە)

**ژمارە: ٦٣٨**

**تیراپیا/١٧ای ئاب ١٩٢٥**

گەورەم،

خۆشحاڵم، ئاماژە بەڕاپۆرتی ژمارە( ٦٢٣)ی (١١)ی ئەم مانگەم بدەمو، پێتان ڕابگەیەنم کە دادگای ئیستیقلالی ئەنگۆرە (٧) کەسی، بەتاوانی پێڕەویی "تەریقەتی سەلاحیە"و ئاڕاستەکردنی دژی کۆمار، دادگایی کردووە. بڕیاری دادگاکە خوێندرایەوەو، لەدواییدا باسی بەرهەڵستییەکانی "تەریقەتی سەلاحیە"ی کردو، جەختی لەسەر ئەو ڕاستییە کردەوە کەتەنها تاوانو ناپاکیی دوای ڕاگەیاندنی لێبوردنی پاش ڕێکەوتنی لۆزان، ڕەچاو کراون. نامەکەی مستەفا کەمال پاشایش کەبۆ دادگا نێردرابوو وتێیدا هاتبوو: خۆی دەستی لەداوای دادگای لوتفی فیکری بەگ هەڵگرتووە، خوێندرایەوەو، سەرجەم چاپەمەنیەکان بەگەرمی پێشوازییان لەم بڕیارە کرد. سەرەڕای لوتفی فیکری بەگ، (٣٥) کەس لە تاوانبارکراوەکان ئازادکران. دادگایی موزەففەر ئەمین بەگ (کە لە بەغداو موسڵ دژی تورکیا درێژە بەکارەکانی دەدات)، ئاڕاستەی دادگای ئیستیقلالی هەرێمەکانی ڕۆژهەڵات کرا. موستەفا بەگی نوێنەری پێشووی یەمەن، ڕەگەزنامەی تورکیی لێ سەندرایەوەو، حەوت کەس بە (٥)و شەشیش بە (١٠) ساڵ زیندانیو حەوت بە (١٦) ساڵ زیندانیو کاری قورسو زیادە بەمردن سزا دراون. هەروەها دادگا بڕیاریدا (بکوژانی دکتۆر ڕەشید پاشا) بەجیا دادگایی بکرێن.

٢- یازدە کەسە حوکمی مردن بەسەردا دراوەکان، بەیانی(١٦)ی ئەم مانگە لە باخێکی بەرامبەر ئەو بینایەی کە پێشتر شوێنی کۆبونەوەی ئەنجومەنی

مەزنی نیشتمانی بوو و ئێستایش سەرکردایەتیی پارتی گەلە، لەسێدارە دران‌و، ئەمانە کەمال بەگی سەرۆکی شارەوانیی "یەنی کۆی"و عیسمەت بەگی ئەفسەری ئەرکانی جەنگی (قیراز-kiraz )و حەمدی پاشاو نووری عوسمان‌و داوەری فرۆشیاری دەرمانی نەخۆشی-dystol- یان تێدایە.

٣- هەفتەی رابردویش، دادگای ئەنگۆرە کۆتایی بەدادگایی بیست کەسی‌تر بەتاوانی پڕۆپاگەندەی کۆمۆنیستی هێنا. سێ کەس لەمانە ئازادکران‌و، ئەوانی تر بە(٧-١٥) ساڵ زیندانی حوکم دران. ئەمانە تەنها دکتۆر شەفیق حوسەینییان ناسراو تێدایە کە چەند مانگێك لەمەوبەر نامیلکەیەکی بەناوی( یەکی ئایار) چاپکردووەو، هانی کرێکارانی تورکیای تێدا داوە تا یاخی ببن‌و، بەمیش ناوبانگی دەرکردووە. شەفیق حوسنی، لە پاشملە، حوکمی پازدە ساڵ زیندانیی بەسەردا درا.

٤- هەفتەی پێشوو، دادگای ئیستیقلالی هەرێمەکانی رۆژهەڵات چەند دانیشتنێکی کەمی هەبوون‌و، لێکۆڵینەوەیان تێدا لەگەڵ رۆژنامەوانان: فەوزی لوتفی‌و سەدری ئەدهەم‌و عەبدولقادر کەمالی‌و وەلید بەگدا کرابوو. دادگاییەکان کەلە چاپەمەنییەکانەوە بڵاو دەکرێنەوە، تەواو جێی سەرسامین، بەڵام مەبەستی سەرەکی دیارەو، دەیانەوێ هەروەك حوسەین جاهید کەلەڕاپۆرتی ژمارە( ٣٨٦)ی ٢٠ مایس "سێر ڕۆلاند لیندسەی" دا هاتووە، ڕێوشوێنێکی بەرپرسانەیان لەسەر راپەڕینی کورد لەتەکدا بگرنەبەر.

ئاڕ. ئێچ. هۆر

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤/٢٦٣، ل: ١٩، ژ: ١٩

## ژ: ٢٣

## لەسێر ئار. لیندسەیەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلەین( ٢١ی ئەیلوول گەیشتووە)

(ژمارە ٧١٧)

تیراپیا، ١٦ی ئەیلوولی ١٩٢٥

گەورەم،

ڕۆژانی ڕابردوو چەند نیشانەیەکی ئـەوە هـەبوون کـە حکومـەتی تـورك توندیی سیاسەتە سەرکوتکارییەکەی تاڕادەیەك کەم کردووەتەوە.

٢ـ پێش هەموو شتێ، ئەو ڕۆژنامەوانانەی کە بەتاوانی هاندانی کـوردان بەنووسـینەکەیان خرانـە بـەردەم دادگـای ئیسـتیقلالی ویلایەتـەکانی ڕۆژهەڵات(بڕوانە ڕاپۆرتی ژمارە(٦٢٣)ی ١١ ئابی مسـتەر هـۆر[1] یـەکێکیان نەبێ، هەموویان ئازاد کران. ئەو کەسەیش سەرنووسەری (تـۆك سـەوز-Tok Seuz) ی ئەدەنەیە کە دادگـا درەنگـانێك بڕیـاری دا ڕەوانـەی دادگـای ئەنگۆرەی بکـاتو، ئێسـتا کێشـەکەی حەواڵـەی ئـەوێ کـراوە. سـەبارەت بەڕۆژنامەوانـەکانی تریـش، وابـڵاوە کـەچوار لەسـەرکردەکانیان، ڕۆژانـی سەرەتای گیرانیان، داوایەکی درێژیان بۆ سەرکۆمار ناردووە کەشـێوە دان پێدانان (ئیعتیراف) ێکی لەخۆگرتووەو، جگەلە پیاهەڵدانێکی دوو ڕووانەی غازی، ناڕازی بوون لـەوەی کەهەسـتی کۆمـار خـوازیو ئەمـەکدارییان بـۆ حکوومـەت خـاوێن نـەبووە. هـەروەها دانیـان بەسروشـتی لـەڕێلادەری هەندێ لەنوسینەکانیاندا ناوەو، وتیان ئەگـەر کـاتی خـۆی ڕاستییەکەیان بزانیایە، ئەوانـەیان نەدەنووسـی. ئەوەیشـیان خسـتووەتە ڕوو کـەنیازیان

---

[1] چاپ نەکراوە

وایە دەست لەڕۆژنامەوانی هەڵگرن. ئەم بروسکەیە هیچ بایەخێکی پێنەدراوەو، دادگاییەکە چەند ڕۆژێکی‌تر بەردەوام بووە. تاوانبارەکان ئاسایی پرسیارو لێکۆڵینەوە لەوەڵامەکانی پێشوویان وبیروڕاو نووسینەکانیان کراوە. لەکاتێکدا دادگاییەکە بەرەو کۆتایی چووە، ڕۆژنامەوانەکان بروسکەی دووەمیان بۆ غازی ناردووەو، ئەمجارەیان هەردوو لایان ئیمزایان کردووە. ئەمەیان لەوەی زوو زۆر کورتترەو، دان پێدانانێکی کەمتریشی پێوە دیارەو، لەڕوویەکەوە پێچەوانەی ئەوی پێشووە: ڕۆژنامەوانەکان خۆیان بەخزمەتکارو ئەمەکداری کۆمار ناوبردووەو، داوای لێبوردن‌و میهرەبانیی سەرۆکیان کردووە بۆ ئەوە کە بەوریایی‌و نیاز پاکییەوە بگەڕێنەوە سەر کارەکانیان. نووسیویشیانە کە ئازادکردنیان بێ فەزڵ‌و لێبوردنی بەرێز بەس نییە. ئەمجا هەرزوو ئازادکران.

٣- وەلید ئەبو زیازەیدی سەرنووسەری" تەوحیدی ئەفکار"ی ڕۆژنامەی ئیسلامی‌و نەتەوە پەرست‌و موحافیزکاری لەپێشدا داخراو، بەگرنگترین کەسی ئەو ڕۆژنامەوانانە دادەنرێ. ناوبراو کەسێکی کەللە ڕەقەو ناکۆکییەك لەنێوان ئەو سەرۆکدا هەیە، چونکە کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٤ کە مستەفا کەمال ویستی خەلیفە دوور خاتەوە، سەرجەم ڕۆژنامەوانانی بۆ چاوپێکەوتن لە سمیرنا بانگ کردبوو، بەڵام لەبەر ئەوەی کەوەلید ((قایل نەبوو داوای بەپیرەوەچوونی ئەم کارە لەخەڵك بکات))، بەشداریی ئەو کۆبوونەوەی نەکردبوو. ناوبراو تەنها بروسکە کورتەکەی دووەمی ئیمزا کردووە. وامەزەندە دەکەم حکومەت لەئازادکردنی ئەو ڕۆژنامەوانانە دوو دڵ نەبووبێ‌و، وەك هەنگاوی یەکەم پێی لەسەر پەشیمان بوونەوەیان داگرتبێ. برووسکەی یەکەم، چونکە ئیمزای وەلیدی پێوە نەبوو، بەناتەواو لەقەڵەم دراوە. ناوی ئەم ڕۆژنامەوانە، لەوی

دووەمدا، هاتووەو، حکومەتیش بەپەرۆشەوە چاوەڕێی ئەمەبوو. بێگومان دیارە وەلید نەیویستووە، بەهۆی سەرسەختی ئەوەوە، هاوەڵە گیراوەکانی دووچاری هەمان چارەنووسی ئاشکرایی خۆی بکات.

٤- دادگایی ئەندامانی کۆمەڵەی خێرخوازی عەرەبیش، بەهەمان شێوە، بەئازادکردنیان دوایی‌ی هات. درێژەی ئەمەیش، هەروەك ئەوانی‌تر، لێڵ‌و ناڕوونەو، هەرچەندە رۆژنامەکان چەندین ستوونیان بە پرسیارو وەڵام پڕکردووەتەوە، ئێمە لێرە تێیان ناگەین. ئەوشتانەی کەزۆر جێی بایەخ بوون، رێی بڵاوبوونەوەیان نەدراوە.

٥- قلیچ عەلی بابەتێکی سەیری لە" حاکمییەتی میللی"دا بڵاوکردووەتەوە. ئەم، دۆستێکی سەرکێش‌و شانازیکەری مستەفا کەمال پاشاو ئەندامی دادگای ئیستیقلالی ئەنگۆرەیەو، بە(پاڵەوانی عەینتاب) ناسراوە. هەرچەندە پێم وایە، نەك بەشمشێر، بەڵکو بەسێدارە خەڵکێکی زۆری لەناو بردووە. ئێستایش دەنەڕێنێ‌و بەچاپەمەنیەکانی تورکیا دەڵێ: ئەوان درێژە بەدڵەڕاوکێیەکی نەخوازراو دەدەن. پێویستە لەپارە وەرگرتن‌و کەسایەتی‌و شوێنی ژیانی کارگێڕی‌و کۆمەڵایەتیی وڵات دوورکەونەوەو، لادانەکانی کارمەندانی حکومەت بخەنەڕوو. ئەبێ دادگاکان بزانن رێگەی پێشکەوتن دانەخراوە، بەڵکو ئەوە رۆژنامەکانن کە لە بارودۆخ‌و کاروباری رۆژ بێدەنگن.

٦- میانڕەویی حکوومەت تەواو ئاشکرایەو، دەکرێ باس بکرێ، بەڵام ئێستا نازانرێ بایەخی چەندە. پێم وایە بارودۆخەکە پێویستە زیاتر هێور بکرێتەوەو، ئەمان لەم کاتەدا دوژمنەکانیان ببەخشن بۆ ئەوەی کاتێك ئەنجومەن دەیبینێ بڕیاری دادگایی‌ی سەرکردەکانی پارتی جوانە مەرگی پێشکەوتنخواز دەدرێ، زۆر هەوڵی تۆڵە سەندنەوە نەدرێ.

ئاڕ.ئێس. لیندسەی

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٣/٤٢٤، ل: ٢٨-٢٩، ژ: ٣١

ژ: ٢٤

**لە سێر ئار. ليندسەيەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلەين(١٢ی ئۆکتۆبەر گەيشتووە)**

**ژمارە: ٧٥٦**

**قوستەنتەنييە، ٦ی تشرينی يەکەمی ١٩٢٥**

**گەورەم،**

برووسکەی ژمارە (١٢٥) ی يەکی ئۆکتۆبەری بەرێزتان ، کە ئاماژەتـان تێدا بـۆ هـەواڵی ياخی بوونـەوەی ئـەم دواييـەی کـوردان کـردووەو، پرسـيوتانە ئايـا هيـچ زانيارييەکم لەمەڕ راست و دروستی ئەم هەواڵە هەيە،پێم گەيشـت. بەداخـەوە ئـەڵێم هيچ هەواڵێکی تايبەت بەم مەسەلەيە نييە ، ئەويش چونکە ئەورووپيـەکان زياتر لـە شاری سەر کـەناراوەکاندان و ، لـەو ناوچانـە دوورن‌و ،ڕۆژنامـە توركيـەکانيش هيـچ پەيامنێرێکيان لەو هەرێمانەدا نييە .تەنانەت هەواڵەکانی کاتی گـەرم وگوڕيـی ياخی بونەکەيش ، حکومەتی ئەنگۆرە دەيداتە ڕۆژنامەوانانی ناوخۆ .

٢-زۆرجار لـێرە دەبيستم، دەڵێـن: دەسـەلأتدارانی تـورك هێشـتا گومانيـان لـە بارودۆخی کورد هەيە .تۆفيق ڕوشدی بەرلەوە بچێتە جنێڤ ،لە گفتوگۆيەکدا دڵنيای کردمەوە کە حکومەت پێويستە چاودێری وردی گشت ياخييەکان بکـات . ماوەيەکـە ،لەسەرچاوەيەکەوە کەپێم وايە بڕواپێکراوبێ ، لەبارەی کوردەکانەوە بيستوومە کـە دۆخەکە بەم جۆرەيە : تەنيا چەند خێڵێکی کەم بەشـداريی ياخيبونەکـەيان کـردووە و،تـيرەو سـەرۆکە بەناوبانگـەکان‌و، بەتايبـەتيش ئەوانـەی ناوچـــەی دەرسـيم، دوورەپەرێزبوون . بۆيە لەسەرکوتکاری پاش شکانی شێخ سەعيدو شوێن کەوتووانی قوتار بوون، بەلأم هەمان تووڕەيی‌و بێزاريی ياخييەکانيان هەبووە. دەڵێن حکومەتی تـورك نـاوێری هـەوڵی تێکشـکاندنی تـين‌و توانـی ئـەو خێڵـە بەهێزانـە بـدات، نـەبا سەرهەڵدانێکی ترسناکتر لەسەر دەستی ئەمان‌و لەم کاتە ناسکەدا بقەومێ.

٣- ديـارە هيـچ زانيارييەکيشـم لـە مسـتەر نـايتی کونسـوڵی تەرابزوونـــەوە پێ‌نەگەيشـتووە. ئـەو لـەوە ئاگـادارە کەحکوومـەتی خاوەنشـکۆ ئـەبێ ئاگـای لـــەم مەسـەلەيە هـەبێ‌و، وابـزانم لـەکاری ئـەم وەزيـرەدا چـەند زانيارييـەکی ئـەرزڕۆم کۆدەکاتەوە.

ئارـ ئێس. ليندسەی

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤/٢٦٣، ل: ٣٧-٣٨، ژ: ٤٦

## ژ: ٢٥

## لەسێر ئار. لیندسەیەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلەین-( ٢٦ی تشرینی یەکەم گەیشتووە)

(ژمارە: ٧٨٥)

**قوستەنتەنییە، ١٦ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٥**

**گەوردم،**

تورك هەرگیز لەوە ماندوو نابێ کەبڵێ موسڵ تاکە کۆسپی ڕێی دۆستایەتیی ئەنگلۆ- تورکییەو، ئەم دەستەواژەیەش، تەنها ژاوەژاوی تووتی نییە، بەڵکو تاڕادەیەك ڕاستە. ئەمەیش ڕێیتێدەچێ، چونکە چەند ساڵی ئایندە هەلومەرجی گشتی سیاسەتی جیهانی، بۆ گێڕانەوەی بڕواو پەیوەندیی ئارەزوومەندانەی نێوان تورکیاو بریتانیای مەزن لەباردەبێ.

<u>روسیا :</u>

٢- تورکیا سەرباری خواستو پەرۆشیی دوای ساڵی (١٩٢٠)و پەیوەندیی توندوتۆڵی ئەمڕۆ، ئاگاداری چالاکیەکانی روسیایە بەرامبەر بەباشووروو، گۆڕانکاری لەدروشمەکاندا دەکاتو، پەی بەوە دەبات کە جیاوازییەکی زۆر لەنێوان سیاسەتی یەکێتی سۆڤیەتو ئیمپراتۆریەتی کۆندا هەیە. هیچ هیوایەکی ئارامی لە داهاتوو بەدی ناکرێ، چونکە پێشبینی ناکرێ بیری سیاسیی رووس، لەکاتێکدا بەلای ڕاستدا دەڕوات، بەرەو چەپ بگۆڕێ. ئەگەر ئینتەرناسیونالیزمی ئاشکرای ئێستا نەمێنێ، ئەوا تەنها بەدەستکەوتە دیارەکانی ڕۆژانی زوو جێگەکەی پڕدەکرێتەوە. ئاوابوونی ئەڵمانیاو لەبەریەك هەڵوەشانی ئیمپراتۆریەتی هەنگاری- نەمسایی، لە لایەکیترەوە، دوو دەستکەوتیان لەناوبرد کە رووسیا سەبارەت بە تورکیا مەبەستی بوون.

بەریتانیای مەزن:

٣- پەیوەندی تورکیاو بریتانیای مەزن، دەبوو بەهەمان شێوە تاڕادەیەك سیمای جارانی وەرگرێتەوە. پێشبینییەکانی نوێنەرانی ئینگلیز لەقوستەنتەنییەوە تا (ڤلادیڤۆستۆك- Vladivostok)[1]، هەروەك هی ئەوانەی زووە. ئەوە بەقازانجی ئیمپراتۆریەتە کە هاوکاریی دەوڵەتانی بێلایەن بکات. ئەو دەوڵەتانەیش، بەهەڕەشەو گوڕەشەو دەست بەسەرداگرتن و بەگژیەکداکردنی بێسنووری باکوورو باشوور، ئەوە دەسەلمێنن کەنفووزی بریتانیا لەسەربوونی نەتەوەیی ئەوان خۆپارێزی دەگەیەنێ، هی رووسیش واتە داخوران. دامەزراندنی پەیوەندییەکی باشی ئەنگلۆ-تورکی، لەوانەیە بۆ بریتانیا ئاسانتربێ، چونکە کێشەی کەمینە مەسیحیەکان کەم بووەتەوە، ئەو کاریگەریەی جارانی نەماوە. لەلایەکی تریشەوە، پێویستی ئەمە، لەبەربوونی ناسیۆنالیزمی سیاسی- دینی لەهندستان و چەند شوێنێکی تری موسوڵمان نشیندا، زیاترە.

تورکیا:-

٤- ئەمرۆ کۆماری ساوای تورك لەگەڵ سەرتاسەری جیهاندا، پاش دەرس و پەندی پازدە ساڵی جەنگ، ئەیەوێ پشوویەك بداتو، گەورەترین قازانجی لێوەرگرێ. تازەگەری، ناوەرۆکی سیاسەتیەتی و، ناسیونالیزم و عیلمانییەت دوو خزمەتکاری پێویستین. شێواندنێکی زۆر لەمانەی کە تورك لەوێ دەیانکات، هەن و هەردەشبن، بەلام بۆ چوونیان راستەقینەیەو، بەسۆزو عاتیفە لەشتەکان دەڕوانن. ئەمان لەبەشی تازەگەریی بەرنامەیاندا، نموونەی ژاپۆنیەکانیان خستووەتە بەرچاوی خۆیان و، نایەنەوێ تەنها بەوانە ئاشنابن کە بەرهەمی هەڵم و نەوت و کارەبان، بەڵکو مەبەستیشیانە دەستوورو دەزگا کۆمەلایەتی و کارگێڕییەکانیان سەرلەنوێ دابڕێژنەوە. نابێ عیلمانییەت، وەك دەست دانە بێ باوەڕییەکی تەواو وڕەها، تەماشا

---

[1] شارێکی ئەوپەڕی رۆژهەلاتی رووسیایە لەسەر دەریای ژاپۆن.(س)

بکریّ. ئەمە وەك کارێکی خۆویستی وڵات، بۆ جێبەجێکردنی پرۆگرامی تازەگەری دانراوە، چونکە نووسەرە ئەورووپییەکان بەمە گوێیان پڕکردوون و، تورکەکان تێگەیشتوون کە ئیسلام بەرگێکی تەسکەو، چاکسازیی تێدا تاسێنراوە بیری نەتەوەیی چەند ساڵێکە لەئارادایە، بەڵام ڕووداوەکانی ئەم دواییە لەدڵی خەڵکدا کردیانە هیوایەکی زیندوو. ئەمە بەگشتی، ئێستا، بووە هێزی هەڵسوڕانی پرۆگرامەکەی حکومەت. لەمەیش گرنگتر ئەوەیە کەخەڵکی ئاسیا چییان لەڕێگەی عیلمانییەتدا لەدەست چووبێ، هەندێکیان بۆ قەرەبوو دەکاتەوە. ئامانجی سەرەکی حکومەت: دروستکردنی دەوڵەتێکی پتەوی لاکێشەی ئەنادۆڵە کە ئامێز بۆ هەر کشتیارێکی بەتورکی قسەکردوو لەجیهاندا بکاتەوە و، هاوپەیمانانی ناویّ، بەڵام کوردەکان بەخراپەکارێکی پێویست دەزانێ، ئومێد وایە بەم پرۆگرامە، کەبەندەکانی بەتوندی پێکەوە بەستراون، تورکیا لە چەند ساڵێکی کەمدا وای‌لێبێ بەتەواوی بڕوا بەخۆبوونەوە بتوانێ بەرەنگاری هەر هەڕەشەیەکی باکوور یان باشوور ببێتەوە. ئێستا هیچ دوژمنکارییەك لەسیاسەتی دەرەوەی تورکیادا نییە، جائەگەر حکومەتی خاوەنشکۆ دەزانێ لەئایندەی ئەم خاڵە دڵنیاکراوەتەوە، ئەوا لەقازانجیدایە ئەم هەوڵەی تورك سەربگرێ.

<u>کوردستان:</u>

٥- یاخیبوونی بەهاری کورد زەبرێکی ترسناك بوو بۆ ئەم سیاسەتە. هەستێکی نەتەوەپەرستی لەکوردستاندایە، بەڵام کوردییە نەك تورکی. ناسیۆنالیزمی تورکی، کە حکومەت حسابی بۆ نەکردووە، هێندە تەسك و بەسیفەت تیرەگەرە، ناتوانێ کوردە کۆنەپەرستەکان بەبەرنامە بێزراوەکەی عیلمانییەت ڕازی بکات. بۆیە گەلێ کەمن ئەوانەی کەیاخی بوونی خێڵەکییەکانیان پیّ‌سەیرە. حکومەت، بۆ زیاتر قەناعەت پێکردن، کەوتووەتە چاکسازیی دارایی (( واتە: هەڵوەشاندنەوەی دەیەك)). هەروەها هەست دەکات ئەم جۆرە شەڕو شۆڕانە هەموو پرۆگرامەکەیان خستووەتە مەترسییەوە و، ئەبیّ بەهەرنرخێك بیّ ناسیۆنالیزمی کورد سەرکوت بکات. دەیشزانێ

حکومەتی خاوەنشکۆ نەخشەی دامەزراندنی نیشتمانی نەتەوەیی کورد لەوبەری سنووری باشوری ئەواندا دەکێشێ ، ئەمەیش هەڕەشەیەکی ڕاستەوخۆیە بۆ سەر سیاسەتی تورکیا. دوورەپەرێزی حکومەتی خاوەنشکۆ و، بەگوێرەی توانای ، کەم ڕەفتارکردن لەگەڵ تورکیادا شتێکەو ، ئاراستەکردنی گۆڕینی کاریگەریش لەمەبەستەکە شتێکی ترە . لێرەدا دەچینەوەسەر ئەوخاڵەی سەرەتا کەمەسەلەی موسڵ تاکە کۆسپی ڕێی دۆستایەتی بریتانیاو تورکیایە. پاش دڵەڕاوکێی یەك دوو مانگی پێشوو، تۆپەکە، وادەردەکەوێ ، لەدەستی حکومەتی خاوەنشکۆدابێ و ، ئەتوانێ چۆنی بوێ ، هەڵیسوڕێنێ ، بەلاّم باشترە ئەوە بزانێ کە نەك هەر مێڵی سنوور ، بەڵکو زیاتریش لەمەترسیدان . بێگومان ، حکومەتی خاوەنشکۆ بەناچاری بیری نەتەوەیی (ناسیونالیزم)ی کوردستانی باشووری پەروەردەکردووە ، ئەگەرنا ! هۆکاری بەهێزتر هەن کە بمانەوێ کۆمەڵەی نەتەوەکان هیچ مەرجێك بەسەرمێزی دەسەلاّتداردا نەسەپێنێ .کۆپییەکی ئەم ڕاپۆرتەم بۆ کۆمیساری باڵای حکومەتی خاوەنشکۆ لە عێراق ناردووە .

ئار.ئێس لیندسەی

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٣/٤٢٤/ل: ٤١–٤٢،ژ:٥٠

## ژ:٢٦

## لەسێر ئار. لیندسەیەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبیر لەین ( ٢٦ی ئۆکتۆبەر گەیشتووە )

(ژمارە: ٧٩١)

**قوستەنتە نییە ، ٢٠ی تشرینی یەکەمی ١٩٢٥**

**گەورەم ،**

چەندتێبینیەکم لەسەر پەیوەندیەکانی داهاتووی تورکیا– بریتانیا کە تا مەودایەکی دیاریکراو بەسیاسەتی ناوخۆی ئەم وڵاتەوە بەستراوە، لەراپۆرتی ژمارە(٧٨٥)ی (١٦)ی ئەم مانگەمدا بەرزکردەوە. وا لە راپۆرتێکی جیادا،بەتایبەتی درێژە بەوڕایانە دەدەم کەلێرە سەبارەت بەناسیونالیزمی تورکیی، ئەمڕۆ، لەئارادان.

٢– خەریککردنی مێشکی خەڵکی بەلەخۆپرسینەوەوە، زیاتر کارەساتە وەك لەوەی خۆشگوزەرانیو سەرکەوتن بێ، بێسەرەو بەرەییو نائارامیی کاروبارە نیشتمانییەکان، باشترین هەلی داماڵینی گەندەڵی لەجەستەی دەوڵەت بۆ ریفۆرمخواز دەرەخسێنێ. ئەم بیست ساڵەی دوایی، ئەو بیرانەی کەدەشێ پێیان بوترێ ناسیونالیزمی ڕۆژهەڵاتی ، چەندین وڵاتیان گرتەوە. کەچی لەگەڵ ئەوەیشدا کەئەوانیتر ژیانێکی سەلامەتیان بەسەربرد، تەنها تورکیا لەدەمی گوشارەکاندا کەوتە بەرکاریگەری ئەم. ئەمە جگە لەوە کەسیاسەتو توانایی تورك، لە پشتیوانیی چاکسازیی خاکی ڕۆژهەڵاتدا، لە ریفۆرمخوازەکان زیاتر دەستیان ڕۆیشتووە، تەنانەت لێرە، پێش جەنگی گەورە، شتیوا کراوە کە بۆ نموونە لە میسری ئەرتۆدۆکسیدا هەرگیز ڕێی تێنەچووە. کاتی شەڕ، تەنها تورکیا لە وڵاتانی موسوڵمان، پشتگیریی لایەنە چەوتەکەی کرد. ئەو نەهامەتیو چەرمەسەرییانەی کە لە داگیرکردنی قوستەنتەنییە لەلایەن هاوپەیمانانەوەو ئەنادۆلی ڕۆژهەڵاتیش لەلایەن یۆنانییەکانەوە کەوتنەوە، بەشێوەیەکی فراوان هاندەری پێکەوە بەستنی میللەتو

کارئاسانیی تازەکردنەوەبوون. هاوکات تورك هێندە کەم هەست کرابوو، سەرەڕای ناچالاکیی و کارلەسەرکراویی خۆی، هیچ هەستی بەو زەبرە کاریگەرانە نەدەکرد کە رژێمەلاتی دووریان دەهەژاند. ئەبێ ئەوەیشمان لەبیربێ کەئێستا ئەم، لەچاو هاوڕێنە سەرکەوتووەکانی ناوچە بەختەوەرەکانی تردا، ئەتوانی زیاتر خۆی ڕاگرێ.

٣- ڕۆژانی زوو دەوڵەت وەکو موڵکی تایبەتی خێزانی عوسمانی سەیردەکراو، سەرزیاری تورك بۆ سەربەرزیی بنەماڵەی فەرمانڕەواو ئەو دینەی کەسەرۆکەکەی سەرکردەیەکی دان پێدانراو بوو، دەجەنگی. واقیعرکرابوو بەخۆی بڵێ عوسمانیی و وشەی (تورك) یەکێك بوو لە نەنگییەکان. ئەمانەیش کاری بەربەریی و کۆنەپەرستانەبوون. هیچ شتێکی نەتەوەیی لە ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا نەبوو، بەڵکو لەڕاستیدا دژە نەتەوەییبوو. چەند ساڵێك پێش ئێستا پرۆسەی دژ بەعوسمانیچێتی لەڕێچکەیەکەوەو لەشێوەی جوولانەوەیەکی ئەدەبیدا دەست پێکرا. هەرچەندە دەستەی کۆمسیۆنی سەرەکیی ئیتیحادو تەرەقی ناساوی عوسمانییان بۆ خۆیان هەلگرت، بەلام وشەی (تورك)یان بەپلەو پایەیەکی نوێوە، سەرەڕای بەرزکردنەوەی نەتەوە، نەك ڕێبەرە خەیاڵییەکەی، وەك ئامانجێك کەتازانجی سەرجەم هەوڵە نیشتمانییەکانی لەپێناودا بخرێتەگەڕ، خستەناو سروودە نیشتمانییەکانیانەوە. وڵاتانیتر بەسەرکەوتوویی بنەماڵە شاهانەکانیان بەتەواوی بەگەلەوە بەست، بەلام هیچ هەوڵێکی بەم ئاراستەیە لەتورکیا نەدراو، ئەمەیش دۆکەی ئازادەیەك بۆ سیفەتی بێکەڵکیی شازادەکانی عوسمانی دەگەڕێتەوە، چونکە خەلیفە بەشێوەیەکی سەرەکی وەك سەرکردە دینێکیتوندوتیژ چاوەڕێی لێ نەدەکرا ڕابەریی جوولانەوەیەکی چاکسازیی وا بکات کەخەسڵەتێکی عیلمانیی هەبێ. بەڕاستی، ڕێی پێچەوانە، بەتایبەتی لەم ساڵانەی دواییدا، گیرایەبەر. هەموو کۆششێك لەپێناوی نزمکردنەوەی شانوشەوکەتی بنەماڵەی عوسمانیدا دراو، بەئاسانیش سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. چ مێرێك لە ڕووداوەکانی ئەم دەساڵەدا کە نەتەوەیان لە بناغەوە بزواند، بچووکترین پلەو پایەی تایبەتی دەستکەوتووە؟

ڕۆژنامەیەك وێنەیەکی شازادەی بچووکی وەك شتێکی تەنز ئامێز بڵاوکردووەتەوەو، لەژێریدا نووسیویەتی ((ئەمەیە نەوەی سەلیمی مۆن؟)). سڕینەوەی عوسمانیچێتی ڕێگەیەکی زۆری بڕیو، خێزانی عوسمانی لە قوڕدا نوقم کرانو، شانو شکۆیان لە دەست داو، هیچ دۆستێکیان لە ڕۆژهەڵاتدا نەبوو. لەلایەکی ترەوە، ((تورکیزم)) هەروەکو پێی دەڵێن، بەپێچەوانەوە بەرزکراوەتەوە. فەرمانڕەواکانی ئەمڕۆ هەموو هەلێك بۆ خۆناساندنیان بەمیللەت دەقۆزنەوە. تەنانەت لادێییەکانی ئەنادۆڵ دەزانن مستەفا کەمال یۆنانی فڕێدایە دەریاوەو، شارنشینەکانیش هەر ئاگادارن عیسمەت ڕێکەوتنی لەگەڵ هاوپەیماناندا ئیمزاکردو، بەهۆیەوە هاوڵاتییەکانیان لەدەرەوە ئیمتیازە بێزراوەکانیان لەکۆڵ بووەوە.

ناسیۆنالیزمی ڕۆژهەڵات ئامانجی دیاریکراوو خاسیەتی ڕاستەقینەی نیشتمانپەروەریی زیاتری لەتورکیا، لەچاو وڵاتانی تری ئیسلامیدا، دەستەبەرکرد. بناغەی پتەوی وا دانرا کە بتوانرێ بەشەکانی سەرەوەی لەسەر هەڵبچنرێ.

٤- پێویست ناکات ئەوە بێنینە بەرچاومان کە پرۆگرامی ئەو بەعیلمانی کردنو نوێکردنەوە بە بەربڵاوی جێبەجێکراوەی ئێستا، تورکیا دەکاتە دەوڵەتێکی بەهێز، چونکە هەرچەندە دەشێ ڕای سەرەکیی حکومەتی ئێستا بناغەی پتەوی بێ، بەڵام هێشتا تورك بەوەناسراوە کە ئامانجی ڕوون نییەو، شێوایو ئیدارەی خراپو گەندەڵییش وەك هەمیشە زۆرن. پەیامبەرێکی چاکسازی لەجیاتی قسەی پڕوپووچی لەڕاددەبەدەر، باشتربوو هاوار لەخەڵك بکاتو بڵێ: ((دڵتان بدڕن، نەك جلەکانتان)).

٥- کەس جەخت لەسەر ئەوە ناکاتەوە کە ڕیفۆرمە توندو تازەکان، لەخۆیاندا، ئاشکراو زانراون. بچووکترینو دیاریترین بێزارییە بۆ خەڵکی هەژار کەپێویستە پارە لەجلوبەرگی تازەدا بەخەرج بدەن. زۆرێکیش هێشتا هۆگری تەکیە بەزۆر داخراوەکانن. بەڵام عەقڵانییەت یاخود بێدینی لەوچینەدا، کەلەبەر نەبوونی نەخشەیەکی باش لەوانەیە پێی بوترێ((ڕووناکبیری))، بەجۆرێك بڵاوبووەتەوە کە

دۆزینەوەی سەرکردەیەکی بۆ کاردانەوەی دینیی دژی سیاسەتی توندی سەپاندنی ئەم حکومەتەی لە ڕۆژئاوای ئەنادۆڵدا سەخت و گران کردووە. هەروەها پێدەچێ یاخیبوونی ئیسلامی، بەهۆی ئاڵۆزیی تێکەڵیی بەبنەماڵەی ئیمپراتۆریەتی پێشووەوە، ئاستەنگی خرابێتەرێ. شازادەی عوسمانی ئەمڕۆ، جگە لە کوردستان، لەهیچ جێگەیەکیتر نرخی نییە. هاوکات خولی ئێستای پرۆگرامی تازەکردنەوە هیچ گۆڕانێکی لە سوپادا نەکردووە، بەڵکوو چ ئەفسەرو چ سەربازەکانی دیارترین و،لەئاست پڕۆپاگەندە نەتەوەیی و نیشتمانیەکاندا هەستیارترن. ئەفسەرەکان، لەچاو کارگوزارەکانی تری حکومەتدا، مووچەی زیاتریان پێدەدرێ و هیچ هۆیەك نییە تاوا دابنێین دوو دڵن لە لەناوبردنی داواکەرانی یاسای شەرعی، وەك ساڵی (١٩٠٩) کردیان. مردنی سەرۆکی دەوڵەت، بەدڵنیاییەوە، ئەبێتە مایەی بێهێزیی کۆمارەکە. ئاسان نییە ببینین چۆن کاردانەوەیەکی دینی، هەرچەندە عەقڵ نایبڕێ، تەنها وەك دەرەنجامی چەند کارەساتێك کە وڵاتیان گرتبووەوە، توانیوەتی بێتە ئاراوە. ئەمە بە لەبەرچاوگرتنی سووربوونی کاربەدەستانی ئەنگۆرەو ئەو شێوازەی کەبەهۆیەوە سەربازو ئەفسەرەکانیان بەسەرکەوتوویی لەدەوری ئاڵا نوێکەیان کۆکردەوە.

٦- کوردستان ترسناکترین هەڕەشەیە بۆ سەر ئەم رژێمە. عەبدولحەمید بەشێوەیەکی سەرەکی مامەڵەی لەگەڵ ناسیۆنالیزمی کورددا دەکرد بۆ کشکردنی[1] ئەرمەنیەکان، بەڵام لە ڕێی سوارەی حەمیدییەیشەوە هەوڵی ئەدا کوردان بۆخۆی راکێشی و، خێڵ و سەرە ناکۆکەکان بەگژیەکدا بکات. تورکەلاوەکان، تەنانەت بەر لەکۆتاییی فەرمانڕەواییی عەبدولحەمید لەگەڵ ناسیونالیزمی کورددا هەر لە کێشمەکێشدا بوون و، هەر کە ئەرمەنییەکان نەمان، دوا هۆکارەکانی تەحەممولکردنی کوردیش رەوینەوە. حکومەتی ئیسلامی لەوەبوو حسابی بۆ بکردایە، بەڵام ئەم و کۆماری ساوای عیلمانی، جگە لەدوژمنایەتیی شەڕخوازانە هیچیتر لە نێوانیاندا

---

[1] کشکردن: زاراوەیەکە لە یاریی شەترەنجدا بۆ ترس خستنەبەر دێ.

نییە، تاکە پرسیار ئەوەیە: ئایا لەبارێکدا کەکۆمار بەردەوام بێ‌و هیچ شتێکی وارووو نەدات لەبناغەوە لەگەڵیدا ناکۆك بێ، زنجیرە یاخی‌بوون‌و سەرکوتکردنێکی‌تر ئەبینین؟ یان وەزعەکە بۆ ئیمکانیەتی حکومەت زۆر گەورەیەو، کوردستان بەتەنیا لەگەڵ ئیدارە ناوخۆییەکەی‌و شێخ‌و بەگەکاندا، وەك ئەلبانیای زوو، دڵڕەقانە فەرامۆش دەکرێ؟

٧- کۆپییەکی ئەم نووسراوە بۆ کۆمیساری باڵای خاوەنشکۆ لەعێراق دەنێرم.

ئاڕ. ئێس. لیندسەی

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٣/٤٢٤، ل: ٤٢-٤٤، ژ: ٥٢

## ژ: ٢٧

## لەمستەر ئۆستن چامبرلەینەوە بۆ سێرئار. لیندسەی( قوستەنتەنییە )

**(ژمارە: ١١٥١)**

**وەزارەتی دەرەوە، ٣٠ی نۆڤەمبەری ١٩٢٥**

**بەڕێز،**

ڕاپۆرتـی ژمـارە(٧٨٥)ی (١٦) ئۆکتۆبـەرتم پێگەیشـت کـە لـەدوا بڕگـەیدا نووسـیبووت: هـۆی بـەهێز هـەن وا لەئەنجومـەنی نەتـەوەکان دەکـەن بـۆ پەروەردەکردنی ناسیۆنالیزم لە کوردستانی باشوردا، بەهیچ جۆرێـك تـەنگ بـەهێزی ئینتیدابی سەر عێراق هەڵنەچنێ.

٢- من بەتـەواوی ئەو قسـەیەت هەڵئەسـەنگێنم کـە دەڵێـی: پەیوەندییـەکانی بریتانیا- تورکیا ، ئەگەر ڕێگەی نەهێشتنی(( هەڕەشەی ڕاستەوخۆ بۆسەر ناوەندی سیاسەتی تورکیا)) کە لە پرۆژەی دامـەزراندنی جۆرێك لـە نیشـتمانی نەتـەوەیی کوردیـدا لـە بـاکووری عێراقو بەرامبـەر بـە سـنووری باشـووری ڕۆژهـەڵاتی تورکیـا هاتووە، بدۆزرێتەوە، ئەکرێ لەسەر بنەمایەکی پەسەند دابنرێ.

٣- حکوومەتی خاوەنشکۆ، تاڕادەیەکی دیارو بەرچاو، لەم مەسەلەیەوە گلاوە. ئـەو لیژنەیـەی کـە ئەنجومـەنی کۆمەڵـە دیـاری کـردووە، لـەدوا ئەنجامـەکانی ڕاپۆرتەکەیدا وەك مەرجێکی بنەڕەتی بۆ یەکگرتنی هەموو هەرێمی باشـووری هێڵـی Brusel [1] لەگەڵ عێراقدا ، ئەوەی چەسپاند کە ((ئەبێ خواستی کوردەکان بۆ دانـانی

---

[1] برۆکسیل کە هێڵی سنووری باکووری نێوان عێراقو تورکیایە. سەرەتای دامەزرانی دەوڵەتی عـێراق، دوای چـەندین کێشـەی ئـەو دوو وڵاتـە لـەو بەشـەی سـنووردا، ئەنجومـەنی کۆمەڵـەی نەتـەوەکان بـە بەشـداریی نوێنەرانی ئیسپانیاو ئۆرۆگوای ١٥ تشرینی دووەمی ١٩٢٤. بڕیاری یەکجاریی لێدا( الدکتور فاضل حسـین، مشکلە الموصل، ط٢، مطبعة لسعد- بغداد ، ١٩٦٧، ص ٥٥-٥٨). (س)

کارمەندی کورد لەفەرمانگەکانی ناوچەکەیانداو، دابەشکردنی دادوەریو خوێندنی قوتابخانەکانو، بەکوردی بوونی زمانی رەسمیی ئەو دەزگا خزمەتگوزارییانە)) رەچاو بکرێ. کۆمسیۆنەکە پێی داگرت کەئەگەر ئەو مەرجە جێبەجێ نەکرێ، یان پێویست بێ سالی(١٩٢٨) و کۆتایی رێکەوتننامەی ئێستای ئەنگلۆ عێراقی، کۆنترۆلی کۆمەڵەی نەتەوەکان دوایی بێ، باشترە ناوچەکە لەسایەی سەرداریی تورکیادا بمێنێتەوە. ئاشکرایە، ئەنجومەنی کۆمەڵە نایەوێ رێنوێنییەکانی لیژنەکە کە بۆمەبەستی ئاشکرای خستنەرووی (( هەرزانیاریو پێشنیارێکی یاریدەدەری گەلاڵەکردنی بریارێك ))دەست نیشانی کردووە، فەرامۆش بکات . بەوپێیە مستەر ئێمری (AMERY ) سێی ئەیلوول ئەنجومەنی ئاگادارکردەوە : (( حکومەتی خاوەنشکۆ بە خۆشحالییەوە دوپاتی دەکاتەوە: ئەم سیستمەی ئێستا کە تا ئاستێکیباش فەرمانی کۆمسیۆنە کە جێبەجێ ئەکات، بەردەوام وئایندەش کاریگەر تردەبێت. ))رۆژیدوایش (٤ئەیلوول ) بەهەمان جیدێتییەوە وتی ((ئێستا گەلی کورد ئۆتۆنۆمییەکی نەژادییان پێبەخشراوە و، ئەمانەوێ فراوانی بکەین .)) تێبینی ئەکەم نوێنەری لەهیچ کام لە قسەکانیدا نەیوتووە:ئەگەر ئەو ناوچەیە بدرێتە تورکیا ئەوا ئەم وڵاتە ئەو ئیمتیازانە دەداتە کوردان . بۆیەپێویست بوو بپرسم :ئایا حکومەتی تورکیا ئامادەیە کۆمەڵە دڵنیا بکاتەوە لەوەی ئێمە چیمان بەکوردبەخشیوە ) ئەوەیان بداتێ (ئەوانەی کەلە تورکیان یادەشێ بێنە تورکیاوە)؟ تۆفیق رۆشدی لە دوا وەلامیدا ئەم خالانەی رەتکردەوە .

٤-ئێستا حکوومەتی خاوەنشکۆ ناتوانێ لەم پەیمانانە پاشگەزبێتەوە و، بێگومان دیارە گەر ئەمە بکات ، یا راگەیاندنی جنێف رەتکاتەوە ، ئەوا وا لە ئەنجومەن دەکات ئەو ناوچەیەی ناکۆکییە ، بەپێی رێنوسیی کۆمیتەکە وەك لەسەرەوە باسکرا ، بداتە تورکیا .

٥-قازانجی تایبەتی بریتانیا ، لەروانگەی دیپلۆماسییەوە ، لە کەمکردنەوەی ئەو کوردانەدایەکە کاربەدەستانی عێراق بەرپرسی بەرێوەبردنیانن و، لەرووی

کارگێڕیشەوە، دەستەی تێکدەری کوردی باکووری عێراق بەردەوام سەرچاوەی گیروگرفتن. هێشتنەوەی هەرێمی کوردان کەزۆرترین بەشی ویلایەتی موسڵ پێکدێنێ ، مەرجێکی پێویستی هەرعێراقییەکە. ڕاگوێزانیشیان ئەو بارو دۆخە ئەخوڵقێنێ کە مستەر ئێمری لە جنێڤ بەرچاوی خستووە:

(( هەر سنوورێك عێراق لەناوچەی دانەوێڵەو بەشی پێویستی داهاتیو باشترین ماددەی مرۆیی بۆ هێزەکانی بێبەش بکات و، لەڕوی عەسکەریو داراییەوە بە لاوازی و لە کێشەی پارێزگاری ئەوسنوورەدا کە لەڕووی ستراتیجییەوە بەرگریکردنی گرانە ،بهێڵێتەوە ،ئەوا شتێکی بەسەردا ئەسەپێنێ کە لە وزەی ئەم بەدەرە . بۆئەمەش کۆمەڵە نەیتوانیوە پێشبینی ئەوە بکات کە حکومەت یان باجدەری بریتانی خۆیان بەلێپرسراوی بزانن)).

٦-بێگومان دۆزینەوەی ڕێگەچارەی هێورکردنەوەی ترسی تورك لە کوردستانی نیمچە ئۆتۆنۆمی بۆ سەر سنوورەکەیان، چ بۆپەیوەندیەکانی تورکی بریتانی بەگشتی و چ دەستەبەرکردنی ئارامییەکی پەسەندی سنووری ناکۆکی عێراق ، مایەی قازانجە . پێم وایە سەبارەت بەو پرۆژەو پێشنیارانەی کە حکومەتی خاوەنشکۆ بۆ بەرپرسیارێتی عێراق بەکۆمەڵەی نەتەوەکانی داوە ، ناشێبەسەندنەوەی ئۆتۆنۆمیی بەخشراو بەکوردی عێراق یان فراوانکردنی بەپێی ڕوونکردنەوەکەی جنێڤی مستەرئێمری ، ئەم ئامانجە بپێکین .سەرەڕای ئەوەش ، هیچ، بیرێك بۆدروستکردنی شێوە دەوڵەتێکی ئۆتۆنۆمیی کورد لە هەرێمی کوردنشینی عێراقدا یاخود ژیاندنەوەی ئەو بەرنامەیەی کەلە ڕێکەوتننامەی سیڤەردا بیری لێکرابۆوە، لەئارادانیە .وابزانم هیچ بیانویەك نییە، لەکاتێکی شیاودا ئەمە بۆ تورك ڕووننەکەیتەوە.

ئۆستن چامبرلەین

وەزارەتی دەرەوە،٤٢٤/٢٦٣،ل: ٦١-٦٢،ژ:٦٣

## ژمارە : ٢٨

## لەمستەر هۆرەوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلەین-( ٢٢ی ئادار گەیشتووە )

(ژمارە: ١٢٠)

قوستەنتەنییە، ١٧ی مارسی ١٩٢٦

گەورەم،

خۆشحاڵم پێتان ڕابگەیەنم، (٢٨) ی مانگی پێشوو، ئەنجومەن خێراو بێدوو دڵی پێشنیاری حکومەتی بۆ درێژکردنەوەی ماوەی دادگاکانی ئیستیقلالی بۆ شەش مانگیتر پەسەند کرد. ئەم دادگایانە کە ئێستا لە ئەنگۆرەو ئەلعەزیزن، بەردەوام ئەرکەکەیان بۆ نەهێشتنی هەموو جۆرە بەرهەڵستییەکی دژی حکومەت جێبەجی ئەکەن.

٢- تشرینی یەکەم کاتێك لە قوستەنتەنییە بووم، دادگای ئیستیقلالی ئەنگۆرە ڕایگەیاند: لێرە پیلانێکی بۆ دەرکەوتووە کە لقو پۆپێکی فراوانی لە ئەرزرۆمو مەرعەشو چەند شوێنێکیتر هەن. قەشەیەکی پیری ئەستەمبووڵ کە وەك لەڕاپۆرتی ژمار (٩٣٩)ی ٣٠ کانوونی یەکەمی سێر ئار. لیندسەیدا ئاماژەی پێکراوە، چەند ساڵێك لەمەوبەر نامیلکەیەکی دژی بیری ڕۆژئاوایی بڵاوکردبووەوە، لەگەڵ موفتییەکدا کە لە چەند ڕوویەکەوە هاوڕایبووە، لە سێدارە درا. چەند کەسێك، بە بەهانەی ئاژاوەگێڕی: هاندانی کڵێسەو مزگەوتەکان بۆ دەرپەڕاندنی فەرمانبەرانی خۆجێییو شکاندنی زیندانەکانو کۆنترۆڵکردنی شارەکەیان، لەمەرعەش دەستگیرکرانو، بیست کەسیان خنکێنران. بەهەمان شێوە، ژمارە یەکیش لە برووسە گیرانو، چواریان بەتاوانی((کۆنەپەرستی)) لەسێدارەدران.

.... کە دەڵێن دوژمنی هەرە دیاری مستەفا کەمال پاشایە لەوێ، کتوپڕ بۆ دادگایی نێردرایە ئەنگۆرە، بەپێچەوانەی ئەوەی کەچاوەڕێ دەکرا، فەرمانی دوور

خستنەوەی لەتەرابزوون درا [1] . نفوونزی ئەم لەو ناوچەیەدا دادگای خستبووە گومانەوە، ئایا لەوێ وازی لێبێنێ یا لەسێدارەی بدات. هەروەها هۆی ئازادكردنی عەبدولقادر كەمالی بەگی ڕۆژنامەوانی ئازادیخوازی ئەدەنەو ژمارەیەكی تری هەمان شار، نادیارە. ئاشكرابووە بەكر سامی بەگ كەزووتر وەزیری كاروباری حكومەتی كەمالی بووەو ئێستاش نوێنەرێكی نەناسراوە، بەشداری هەوڵی دامەزراندنی حكومەتێك بووە كە كەم و زۆرنوێنەرایەتی خەڵك بكات. تەنها هەفتەیەك پێش ئێستا، سەرۆكی شارەوانیی گوندی میلاس(( Milas)) ی ئەوپەڕی خوارووی ڕۆژهەڵاتی ئەنادۆڵ و چەند كەسێكی تری ئەوێ خنكێنران و، هۆكەیشی ئاشكرانییە، بەلام وادەردەكەوێ نارەزاییان دژی ڕۆژئاوایی‌بوون و ڕژێمی كەمالی بەگشتی دەربڕیبێ.

٣- ئەوكەسانەی وا پەیوەندییان بەتوركە دوورخراوەكانی دەرەوەی وڵاتەوە هەبوو، ئیجرائاتیان لەگەڵدا كرا. چەند ئەفسەرێكی خانەنشینی كۆتایی‌ی كانوونی دووەم، بەهۆی پیلانگێڕان لەتەك ئەدهەم چەركەسیی نەیاری كەمالیی بەناوبانگدا كەئێستا لەئەسینایە، لەسێدارە دران. هەفتەی دواتر، ڕایگەیەندرا دووان لەناپاكەكانی میسر، قوبروس، یۆنان، سووریاو... هتد (موفتی و نوێنەرێكی پێشوو) بێئاگا گەڕاونەتەوە بۆ توركیاو گیراون، چونكە نامیلكەیەكی ((دژی كۆمار)) یان لەمیسر بڵاوكردبووەوە جارێ ئاكامیان نادیارە.

٤- ... لەم خنكاندنە ناو بەناوانەی ناڕازییانی، سەرجەم چینەكان لەئەنگۆرە هێزیان لەو ئیجرائاتانەوە وەرگرت كەپێیان وایە بۆ قازانجی نەتەوەن... [2] . نوێكردنەوەی زیاتر كەئێستا لەچاپەمەنییەكاندا تاووتوێ دەكرێ، لەئەلفوبێی ئەورووپی و توركی و قورئانی توركییەوە، نەك لەنوێژكەرانی عەرەبی ناو

---

[1] ئەم ڕستەیە ناتەواوە.

[2] ئەم رستەیە ناتەواوە.

مزگەوتەکانەوە، وەرگیراوە.قورئانەکانی تورك هەردەم لە کڕینو فرۆشدا بوونو، ئەوەش ڕاگەیەندرا کە نوێژکردن بەتورکی، هەرچەندە بەزۆرنییە، بەڵام ڕێی پێدراوە.

٥- دزێوترین کوشتنی یاسایی‌ی دادگاکانی ئیستیقلال، ئەوی" نیکۆلا یەڤگینۆ پاولۆ"ی ڕووس بوو کە نووسینگەیەکی زانیاریی بازرگانیی لەغەڵەتە (Galata)[1] هەبوو و، زیاد لەپێویست زانیاریی لەسەر مەسەلەی قازانجی ئابووری‌و یاسایی‌و مێژوویی بۆ بازرگانو ڕۆژنامەوانو کەسانی‌تر دابین کردبوو. ئەم پیاوە بێزیانە، وەك پەندێك بۆ تاوانبارانی ڕاستەقینە، بەتاوانی سیخوڕی لەسێدارە درا. دادگای ئیستیقلال، لە هەوڵێکدا بۆ پینەکردنەوەی ئەم کارە نابەجێیەی خۆی، میهرەبانییەکی زۆری لەئازادکردنی دوو یۆنانیی تری تاوانبارکراودا تەنها بە ڕەخنەگرتن لەخاپوورکردنی کڵێسەیەك لەلایەن شارەوانییەوە، نیشان دا.

٦- لەکاتێکدا یەکێك لە دادگاکان بەم جۆرە لەئەنگۆرە سەرقاڵە، ئەویتریان لە ئەلعەزیز سەرگەرمی دەرەنجامەکانی یاخی‌بوونی پاری کوردە. فەرمانی خنکاندنی ناوبەناو دەردەکرێ. ڕۆژێك (١٨) کورد کە زیانی گەورەیان لە فەوجێك دابوو، لەسێدارە دران. حکومەتی تورکیا پێویستیی بەم دادگایەیە بۆ ئەوەی کورد بەئارامی بهێڵێتەوە، بەهەمان شێوەیش ئەوی ئەنگۆرەی بۆ سەرکوتکردنی بەرهەڵستیی تورکان مەبەستە.

٧- کۆپییەکی ئەم نووسراوە بۆ جێگری کۆمیساری باڵا لەعێراق دەنێرم.

ئارِ. ئێچ. هۆر

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٤/٤٢٤ ، ل: ٤٤-٤٥، ژ: ٤٥

---

[1] غلگە، ناوچەیەکی ناو ئەستەموولە.(س)

## ژ: ٢٩

## لەمستەر هۆردوە بۆ مستەر ئۆستن چامبرلەین-( ٢٩ی ئادار گەیشتووە )

( ژمارە: ١٣٠ )

قوستەنتەنییە، ٢٣ی مارسی ١٩٢٦

گەورەم،

پێم خۆشە، ئاماژە بە برگەی پێش کۆتاییی راپۆرتی ژمارە(١٢٠)ی (١٧)ی ئەم مانگەم ، ئاگادارتان بکەمەوە کە، ئەوەی وائاشکرایەو لەسەر دەستی کوردان بەسەر سەربازانی تورکدا هاتووە، بەپێی چەند زانیارییەکی بەرچاوخراو، کارەساتێکی مەترسیدارە. وادیارە ئەمە دەورووبەری دواییی کانوونی دووەم یان (٥) شوبات روویداوە. بەرەسمییش نکوڵی لەوە کراوە کە (٢٠٠) کەس تیاچووبن. لەگەڵ ئەمەیشدا ئەوە کە کوردەکان لە باتمان (نزیك حەزۆ)ی نیوەی رێی نێوان بدلیس — دیاربەکر، داویانە بەسەر قەوجێکداو، فەوجەکە چەکەکانی لەدەست داوەو، ژمارەیەك کوژراوو برینداری هەن‌و، زیاد لە (١٠٠) کەسیش لەئاودا خنکاون‌و، دانی پێدانراوە. وەك دەردەکەوێ تەفرو توونا بوون. کەواتە هەرچۆنێك بێ لەوکاتەدا جۆرە بەرەنگارییەکی رێکخراو لەکوردستاندا هەبوە. حکومەت، بە دڵنیاییەوە، دەسەڵاتی ئەو هەرێمەی وەرگرتووەتەوە، چونکە دادگای ئیستیقلال رایگەیاندووە: زیاد لە (١٠٠٠ هەزار) کەس گیراون‌و، هەروەها دەیەوێ بەو ناوچانەدا بگەرێ بۆ چارەکردنیان. ئەوەیش کە دوو مانگ‌و نیو پێش (١٥)ی شوبات، زیاتر لە (٩٠٠) کەس، نیوەیان بەبێ ئامادەبوونی خۆیان دادگایی کراون‌و (٥٧)یش لەسێدارە دراون، دانی پێدانراوە. بێگومان حکومەت ئەبێ بۆ ماوەیەکی درێژخایەن بەتوندی کۆنترۆڵی ناوچە کوردییەکان بکات.

٢— کۆپییەکی ئەم راپۆرتە بۆ کۆمیساری باڵا لەعێراق دەنێرم.

ئار. ئێچ. هۆر

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٤/٤٢٤، ل: ٤٩، ژ:٥٢

## ژ: ٣٠

**لە سێر ئار. لیندسەیەوە بۆ سێر ئۆستن چامبرلەین..(٥ی تەمموز گەیشتووە)**
**(ژمار: ٣٢٨)**

نوێنەری قوستەنتەنییەی خاوەنشکۆ بەشی تەواوکەری ئیشەکەی دەخاتە بەردەم وەزیری بۆ کاروباری دەرەوە، هەروەها کۆپیی برووسکەیەک و دوو راپۆرتی کونسولی تەرابزوونی خاوەنشکۆو کورتەی نامەیەکی ئەنگۆرەی مستەر نۆکسی سەبارەت بەبارودۆخی ئەنادۆلی رۆژهەلات ناردووە.

قوستەنتەنییە، ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٢٦

**** **** **

## هاوپێچی(١)ی ژ: ٣٠

**کۆپیی برووسکەیەکی تەرابزوون بۆ قوستەنتەنییە.**
**(ژمارە: ٢٢)**

**٢ی حوزەیرانی ١٩٢٦**

لەسەرچاوەیەکی بڕواپێکراوەوە بیستوومە: (١٠) رۆژی پێشوو کوردانی بایەزید کە هاوولاتیانیان لە ئێرانەوە هێزیان بۆ دەنێرن، یاخیبوون و، تۆپخانەیەکیان تێکشکاندووەو، فەوجێکی ناوخۆیان پەرەوازە کردووە.

* * * *

## هاوپێچی (٢)ی ژ: ٣٠
## لەکونسوڵ (نایت)ەوە بۆ سێر ئار. لیندسەی

(ژمارە: ٢٤)

**تەرابزوون، ١٥ی حوزەیرانی ١٩٢٦**

**گەورەم،**

هەموو ئەفسەرە بڕوا پێنەکراوەکانی پێشوو کە بوونەتە هاووڵاتی تورك، لە قارس و ئیغدیر( Igdir)[١] و شارەکانی تری سەر سنوورەوە کە زووتر هی روسیا بوون بۆ قەستەموونی (Castamuni)[٢] دوور دەخرێنەوە. ئەڵێن نزیکەی دوازدە خێزان گەیشتوونەتە ئەو جێیەو، هەندێکی تریش بەڕێوەن و، ئەوانەی کەماون ئەبێ پێش تەمموز ئەو ناوچانە جێبێڵن. ئەم راگوێزانە کە لە هەلومەرجێکی ئێجگار سەختدا بەڕێوە دەچێ، دەرهاویشتەی ترسی تورکەکانە لە فرۆفێڵی بۆڵشەڤیکەکان، یان بەپێچەوانەوە، لەژێر فشاری سۆڤیەتدایە.

ئاشکرایە شۆفێرانی روسیای سپی، لێرە رێیان دەدرێ بێنە ناوەوە، بەڵام ئەوانەی کە پارێزگاریی سۆڤیەتیان پەسەند کرووە، مۆڵەتیان نادرێ. هەرچەندە گەشتیارانی رووسیای سپی بەئازادی لە "سامسون" دادەبەزن، کەچی رووسی هەڵگری پەساپۆرتی سۆڤیەت، لە رێگەیاندا بەرەو "باتووم"[٣]، نەهێڵرا لەوێ لابدەن.

دەبلیوو. ئێل. کەی. نایت

* ****** *

---

[١] قەزایەکی باکووری ویلایەتی بایەزیدە، نزیکی چیاکانی ئاگری. (س)

[٢] ویلایەتێکی بەشی سەرووی ناوەراستی تورکیایە لەسەر دەریای رەش. (س)

[٣] شارێکی گورجستانە لەسەر دەریای رەش نزیکی سنووری تورکیا.(س)

## هاوپێچی (٣)ی ژ: ٣٠
## لەكونسوڵ(نایت)ەوە بۆ سێرئاپ. لیندسەی

(ژمارە:٢٥)

ئەرابزوون، ١٦ی حوزەیرانی ١٩٢٦

گەورەم،

ئاماژە بەبرووسكەی ژمارە(٢٢)ی ١٠ حوزەیرانم، راپۆرتەكان لە بایەزیدەوە ئەوە ئەگەیەنن كە گرفتەكە هێشتا ماوە، بەلام زانیارییەكی ئەوتۆ لەمەڕ رووداوەكان نییە. دەڵێن: فیرقەیەك لە قارس و ئەرزرۆمەوە، لەگەڵ (١٢) تۆپی (٦)و(٨)ی (١٢)گرێ (ئینج)ی بەجێهێڵراوی روسەكاندا، بۆ دامركاندنەوەی ئەو یاخیبوونەی كە بۆ بەرەنگاریی راگوێزان بەرپابووە، نێردراوە. ئەم ئیجرائاتە جێی ناڕەزاییە، چونكە كوردەكانی بایەزید بەشدارییان لە یاخیبوونی پاردا (نە؟) كردووە.گەشتیاران رایانگەیاند ژمارەیەكی زۆر كوردیان بەخاوو خێزان و مالاتیانەوە ، كە دەشێ بەرەو ئەنگۆڕە و ئەنادۆڵی رۆژهەلات چووبن، بەدرێژایی رێگەی ئەرزرۆم– ئەرزنجان بینیوە. سەرجەم گوندەكان راگوێزراون و، بازرگانی لەهەرێمێكی فراواندا پەكی كەوتووە.

لەسەرچاوەیەكی بڕواپێكراوەوە زانیومە، كارگەیەكی دروستكردنی گوللەی تفەنگ و تۆپ لە ئەرزرۆم هەیە.

دەبلیو. ئێڵ. كەی. نایت

* *******

## هاوپێچی (٤)ی ژمارە: ٣٠
## کورتەی نامەی ئەنگۆرەی مستەر نۆکس

١٧ی حوزەیرانی ١٩٢٦

نوێنەری پۆڵەندی پێی وتم لەزمانی(( سووریتز Suritz )) ەوە بیستوویە: لێپرسراوانی تورك لە ئیمزاکردنی رێکەوتننامەکەوە گفتوگۆیەکی باشیان بۆ چارەیەکی خێرای مەسەلەی کەمینەی کورد بەرێگە تەقلیدیەکان لەناو خۆیاندا کردووە. بەیدەر(Bader ) خۆی داوای مۆڵەتی بۆ چەند کەسێك لە کۆمسیۆن( مفوضية) ی پۆڵەندی لە تاران کردبوو کەبە بایەزیددا بۆ ئەورووپا بچنەوە، بەڵام راستەوخۆ "لەبەر هۆی سەربازی" رەتکرابووەوە.

١٩ی حوزەیرانی ١٩٢٦

دوێنێ، کە وتووێژێکی کورتم لەگەڵ" سووریتز" دا کرد، بوارم بۆ رەخساو لێم پرسی: ئەزموونەکەی لەکاری عەمەلیی کێشە خێڵایەتیەکانی سەرسنووری تورکیا– روسیادا چۆن بووە؟ ئەویش لە وەڵامدا وتی: جێی خۆشحاڵی نەبوە. کۆمیتەی دیاریکردنی سنوور، پێناچێ هیچ پێشکەوتنێکی بەدەست هێنابێ و، سەرەرای رێکەوتنی ئێستای لەوەرگاکان کە هێشتا وادەردەکەوێ پێشێلکرابێ، یاخرابێتە لاوە، بەردەوام لەسەر ئەو زەویانە ناکۆك بوون. قسەکانی زۆر بەسوود بوون، بەڵام بەداخەوە گفتوگۆکەیان پێبڕین.

## ژ: ٣١

## لە سێر ئاڕ. لیندسەیەوە بۆ سێر ئۆستن چامبرلەین (١٢ تەممووز گەیشتووە)
(ژمارە: ٣٣٩)

قوستەنتەنییە، ٥ تەممووزی ١٩٢٦

گەورەم،

خۆشحاڵم، ئاماژە بەڕاپۆرتی ژمارە(٣٢٨)ی ٣٠ حوزەیرانم، تایبەت بەمەسەلەی کورد، رایبگەیەنم: مستەر نۆکس ئاگاداری کردوومەتەوە کە لە ئەنگۆرە لە نوێنەری ئەلبانیای بیستووە، حکومەتی تورکی لە هەوڵدایە لەگەڵ حکومەتی سرب- کروات- سلۆڤیندا رێك بکەوێ بۆ گواستنەوەی موسوڵمانە ئەلبانی نەژادەکانی هەرێمی کۆسۆڤۆ بۆ تورکیا.

٢- مەبەست لەمە ئەوەیە: ئەم پەنابەرانە جێی ئەو کوردانە بگرنەوە کە بڕیارە بۆ ئەنادۆڵی رۆژهەڵات رابگوێزرێن. ئەمە لە کاتێکدایە کە، وەك دەوترێ، زەویی بەگە راگوێزراوەکانیتر بەخۆڕایی بەسەر جوتیاراندا دابەش کراون.

٣- کۆپیی ئەم نووسراوە راستەوخۆ بۆ کۆمیساری بەغدای خاوەنشکۆو نوێنەری خاوەنشکۆ لەتاران ئەنێرم.

ئاڕ. ئێس. لیندسەی

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٥/٤٢٤، ل: ٥، ژ: ٤

**** ****

## ژ: ٣٢

## لەسێرجی کلارکەوە بۆ سێر ئۆستن چامبرلەین( ٦ی دیسەمبەر گەیشتووە )

(ژمارە: ٦٢١ )

ئەنگۆرە، ٢٤ی نۆڤەمبەری ١٩٢٦

گەورەم،

ئاماژە بەراپۆرتی ژمارە(٦٢٠)ی ئەمڕۆم، یادداشتێکی سێر هێنری دۆبسی کۆمیساری باڵای عێراقتان لەسەر چاوپێکەوتنی لەگەڵ وەزیری کاروباری دەرەوەو سەرکۆماردا بۆ دەنێرم.

٢- ئەترسم قسەکەی پاش نانخواردنی دوێنێ شەوی تۆفیق روشدی بۆ سێر هێنری دۆبس، زۆر جێی بەو هاوسێیەتییە باشە لەق کردبێ کە ڕەنگ بوو ئەم گفتوگۆیانە هاندەری بوونایە. قسەکەی تۆفیق لەو بارەیەوە بووە کە حکومەتی تورکی سوورە لەسەر ڕامالینی کورد لە دۆڵەکانیدا کە ئەمڕۆ دەوڵەمەنترین بەشی تورکیان و، جێگیرکردنی کشتیارانی تورك لەجێی ئەوان. بەڕێزی هەروەها وتوویەتی بەهەمان شێوەی ئەرمەنیەکان مامەڵەیان لەتەکدا دەکرێ.

٣- پێناچی کورد هەروا بێدەنگ و دەست بەستە ئەمە قبووڵ بکات، بەڵام ئەگەر لە وڵاتی خۆیان وەدەربنرێن، بەئەستەم دەتوانن بەسەلامەتی خۆیان بگەیەننە عێراق یان ئێران. ئەو کێشەیەی کە لەم جووڵانەوەیەوە بۆ ئەو دوو وڵاتە دروست دەبێ، ئەگەرچی نازانرێ چەند کاریگەری دەبێ، دەشێ پێشبینی بکرێ. ڕەنگە تۆفیق روشدی ئەم قسانەی بەجیددی کردبێ، بەڵام لەوەناچێ بتوانرێ ئەم نەخشەیە بەو فراوانییە جێبەجێ بکرێ. ئەگەر دەرفەت هەبوو، هەوڵ ئەدەم وەزیری کاروباری دەرەوە زیاتر لەم مەسەلەیە ئاگادار بکەمەوە.

٤ـ پێویستە ئەوەیش بڵێم کە سەردانەکەی ئەنگۆرەی سێر هێنری دۆبس، سەرکەوتووبووە، تورکەکان خۆشحاڵ بوون پەیوەندیی شەخسیی پێوە بکەن و،

هەموو تین‌و توانێکیان بخەنە گەڕ، ئەمە لەکاتێکدایە کە بەڕاشکاوی نەك هەر کارێکی باشی کردووە، بەڵکو بناغەیەکی دۆستانەی وای دامەزراندووە کە پەیوەندیی داهاتووی عێراق –تورکیا کەهەلومەرج ئاڵۆزی کردووە، وەك ئومێد دەکرا، بەنیاز پاکییەوە لەلایەن هەردولاوە دانوستانی لەسەربکرێ.

٥- کۆپییەکی ئەم نوسراوە بۆ بەغدا دەنێرم .

جۆرج ئاڕ. کلارك

وەزیری دەرەوە، ٤٢٤/٢٦٥، ل: ٥٠، ژ: ٤٦

* * *

## هاوپێچی ژ : ٣٢

## یاداشت

نیوەڕۆی ٢١ی تشرینی دووەم بەر لەوەی سەرۆك ببینم، وتووێژێکی کورتم لەگەڵ وەزیری دەرەوەدا کرد.

تۆفیق بەوە دەستی پێکرد کە بەپەرۆش بووە بۆ ناسینم، چونکە چەندین ڕووداو بەردەوام لەسەر سنووری عێراق – تورکیا دەقەومێن‌و، دیارە هێورکردنەوەی بارودۆخێکی لەم جۆرەش، ئەگەر کەسێتی ئەو دیوو پەیوەندییەکە بناسرێ، ئاسانترئەبێ. هەروەها هیوادار بوو ئەو ڕووداوە بچوکانە، هەرچی زووە، کەم ببنەوە، حکومەتی تورکی فەرمانێکی توندوتیژی لە پێناو کۆنترۆڵکردنی خێڵەکاندا بۆ کارمەندەکانی خۆی دەرکردبوو، لەو زانیارییە گەیشتووانەی عێراقیشەوە زانیبووی کەئیدارەی ئەوێ دەسەڵاتی تەواویان بەسەر خێڵەکاندا هەیە. خۆزگەی خواست من دەرك بەوە بکەم کە وەزعی حکومەتەکەی ئەو قورسترە لەوەی ئیدارەکەی عێراق، چونکە حکومەتی تورکی سیاسەتی مامەڵەی ڕاستەوخۆ لەگەڵ تاك‌و تێکشکاندنی هێزی سەرۆك هۆزەکانی گرتووەتە بەر، بەڵام عێراق توانیویە

مامەڵە لەتەك سەرۆکەکاندا بکاتو دەسەڵاتیان بەسەر تیرەکانیاندا بەکاربێنێ. تورکیا بۆیە ئەم سیاسەتەی ئێستای گرتووەتەبەر کە رێی پرۆپاگەندەی رووسەکان لە وڵاتەکەی بگرێ. هەڵبەت ئەوە بەئارەزوو دژی دەسەڵاتدارێتیی ئەم وڵاتە دەیانکرد، بەڵکو ئەگەر بەسیاسەتی لیبراڵو دیموکرات کاریگەریی سیستمی سۆڤیەتیی لەخۆی دوور نەخستایەتەوە، ئەوا تەنها رۆڵی پروپاگەندەیەکی شۆڕشگێرانەی لەسەر سنوورەکەی دەبینی.

ئاشتی قازانجی هەرە گەورەی تورکیایەو، ناوبراو لەوە دڵنیابووە کە هی بریتانیای مەزنیشە کەوا ئێستا خواستی سەرەکیەتیو، ئەتوانێ بەرژەوەندییەکانی ئەم کاتەی پتەوبکات، ئەو سەرنجی بۆ ئاکامە نایابەکانی باش لێککەیشتنی تورکیاو فەرەنسە، سەبارەت بەسنوور، راکێشام، لەو کاتەوە کەئامادەکاری لەگەڵ مسیۆ دوژفونێڵ (de Jouvenel)دا کراوە، تورکیا ئەرکەکانی خۆی لەسەر سنووری سووریا دەزانێو، سەرەنجام ئێستا حەڵەبو باشووری سووریا تاکە ناوچەن کەفەرەنسییەکانیان تێدا ئارامە.

لەوەلامدا وتم: خۆشحاڵبووم ئەم خواستو ئاواتە دۆستانەیەمان بۆ ئایندە دەربڕیو، وتووێژمان لەسەرکردن، زانیم دڵە راوکێیەك، لەبارەی سیاسەتی ئیدارەی عیراقەوە بەرامبەر بەکورد، لەدامو دەزگاکانی حکومەتی تورکیا هەستی پێ دەکرێو، من بەشێوەیەکی تایبەتی ویستم لەم مەسەلەیە دڵنیای بکەمەوە. بەڕێزی لە رێنوییەکانی ئەنجومەنی کۆمەڵەی نەتەوەکان سەبارەت بەو کوردانەی کەخرابوونە سنووری کارگێڕیی عیراقەوە، ئاگاداربووە، عیراق ئەبێ، بەهەموو تینو توانێکەوە، ئەو رێنوێنیانە جێبەجێ بکاتو، هەروەها بەرنامەی دامەزراندنی فەرمانبەری کورد، تابکرێ لە ناوچە کوردنشینەکانو، رێدان بەبەکارهێنانی زمانی کوردی، پێڕەو بکات.

بەلام ئیدارەی عیراق دژایەتیی هەموو جۆرە ئۆتۆنۆمی یان رەگەزنامەیەکی جیایی خوازی کوردی، جا ئێرانی بێ یا تورکی، کردووەو، تەئکید دەکاتەوە کە

کوردان ناتوانن یەك بگرن‌و، سەربەخۆیشیان دەبێتەمایەی چەتەیی‌و تاڵانچییەتی لە هەرێمە سنوورییەکاندا.

تۆفیق وتی بەم دڵنیاکردنەوەیە دڵخۆشەو، ئێستا حکوومەتی تورکیا گومانی لە کوردی عێراق نییە، بەڵام ترسی لە کوردەکانی ئێران جێی هەڕەشەیە بۆ سنووری شەمزینان کە کۆنترۆڵی ئێرانی تێدا زۆر کزە، ئەمجا لەبارەی ژێرخانی سوپای ئێرانەوە درێژەی بەقسەکانی داو، پێی وابوو ناتوانێ ئاسایشی ناوخۆ سەقامگیرو کەمترین بەرگری لە بەرامبەر هێرشی دەرەکیدا بکات. هەروەها وتی: نەتەوەیەکی وەك فارس نەیتوانیوە دەرك بەو قوربانییە ترسناکانە بکات کە سوپای نوێی سێیەکی داهات تێدا خەرجکراوی تورکیا بەهۆی زیادە پارێزییەوە دەیاندا.

پاشان پرسیم، ئایا بە وتووێژەکانی لیژنەی هەمیشەیی سنوور کە لە زاخۆیە، رازییە، وتی: بەڵێ. دەرەنجامی نایاب بەدەستهاتووەو، نوێنەری تورك رایگەیاندووە کەنوێنەری عێراق زۆر دۆستانە هاتووە پێش. بەقسەی ئەو، تەنها یەك شت بەناجێگیری مابووەوە، ئەویش هەرچەندە زۆر روونی نەکردەوە، بەڵام خۆم تێگەیشتم کەمەسەلەی بازرگانیی ترانزێتیی نێوان تورکیاو ئێرانە بەناو عێراقدا، هەروەها وتی: ئەبێ جارێ چاوەڕێی بکەین، تاعێراق‌و ئێران لەسەر ئەم مەسەلەیە رێك دەکەون.

من وتم: چارەی ئاوارە کوردەکانی (گۆیان) بۆ عێراق زۆر گرنگە، ئاسان نییە ئەم وڵاتە بەزەبری هێز ئەو ژمارە زۆرە لەسنوور راماڵێ‌و، بوونیشیان لەوێ هەڕەشەیەکە بۆ ئاسایشی سنوور، ئێمە بێ هیوابووین، چونکە تورکیا نەیدەویست وەریانگرێتەوە، تۆفیق وتی: (بەداخەوە ناتوانین خۆزگەکانتان بۆ ئەم مەسەلەیە بێنینەدی)و، هیچ پاساوێکیشی نەهێنایەوە، بەڵام دڵنیا بوو لەوە کە باری ئابووری وردە وردە ئاوارەکانی گۆیان ناچار دەکات دوور لەسنووری تورکیاو لە دەشتەکانی عێراقدا بژێویی خۆیان پەیدا بکەن، بەم جۆرەیش، پێدەچێ کێشەکە نەمێنێ. من وەڵامم

دایەوەو وتم: لەوانەیە ئەمە ڕاست بێ، بەڵام پرۆسەیەکی خاوەو، هاوکات، ئەترسم ببنە مایەی سەر ئێشەی هەردوو حکومەت.

جالەبەرئەوەی کە ئەمزانی خۆیان بەبێ ئاگاداریی رەسمیی دەسەڵاتدارانی تورك کەم کەم دەکەونە گەڕانەوە بۆ تورکیا، ئیتر زۆر لەسەر ئەمە نەڕۆیشتم.

لەتۆفیقم پرسی: کەهێڵی ئاسنی عیراق گەیشتە موسڵ، ئایا هیچ کارئاسانییەك بۆ بازرگانیی نێوان قوستەنتەنییەو نسێبین دەکرێ؟

ئەمە پرسیارێکی گرنگ بوو وتی: پەرەپێدانی هێڵی ئاسنی نسێبین - حەڵەب، بەهۆی کێشەی دارایی ئەو کۆمپانیا فەرەنسییەی وا ئەو بەشەی هێڵەکە بەڕێوە دەبات، تەواو سست بووە.

ئەمجا تۆفیق بەرقێکی زۆرەوە لەویستی هاوچەرخی عەرەب دووا، بەقسەی ئەم، ئەوان هێشتا سروودەکانی سەردەمی عومەر دەڵێنەوەو، پێیان وایە ئەتوانن شکۆی هاروونە رەشید بگێڕنەوەو، دەست بەسەر ئاسیادا بگرن، ئەوان چەندین سەدە لەدواوەن، تاکە فەرمانڕەوای عەرەب (ئیبن سعوود Ibn Saud)ە کە ئەم پەیوەندیی توندوتۆڵی لەگەڵدا هەیە، ئیبن سعوود ئەزانێ هێزەکەی لەبەرامبەر سوپای نوێدا کەلکی نییە، بۆیە ئەبێ تینو توانی خۆی بۆ نیوە دورگەکەی کەم بکاتەوە. سیاسەتیشی، بەهۆی شوێنی جوگرافیی لەگەڵ بریتانیای مەزنداو کاری ماددیو مەعنەویی تورکیاوە کە تائێستا لەو ناوچانەدا هەیەتی، بریتییە لە دامەزراندنی پەیوەندیی دۆستانە لەگەڵ ئەم دوو وڵاتەدا.

دوایی تۆفیق بە ئۆتۆمبیلەکەی بردمی بۆ ماڵی سەرۆكو، بەوی ناساندم. سەرۆك بەتورکیو منیش بە فەرەنسی قسەم دەکردو، تۆفیق رۆڵی وەرگێڕی دەبینی. دانیشتنەکەمان نزیکەی دوو سەعاتی خایاندو، هەر سەرۆك قسەی دەکردو، منیش جارجار بەقسەی کورت هەڵمدەدایو دەمبزواند.

سەرۆك زۆر دڵخۆش دیاربوو و، ناوبەناو زەردەخەنەیەکی دەگرت، ئەویش، وەك تۆفیق، بەباسی قازانجی ئاسینی شەخسی دەستی پێکرد.

پاشان تۆفیق ناوەڕۆکی قسەکانی تایبەت بەسیاسەتی کوردی بۆ دووپات کردەوە، سەرۆك وتی: ((خۆشحاڵم ئەمە ئەبیستم)). ئەکرێ زۆر لەسەرمافی چارەنووس و مافی کەمینەکان بڕۆین، بەڵام ئەبێ لە مافەکانی زۆرینە جیا بن، کورد، بەقسەی ئەو، بۆ چەند نەوەیەکی تریش ناتوانێ خۆی بەڕێوەببات، ئەمجا هەمان ترسی تۆفیقی لەمەڕ مەترسیی کوردانی ئێران بۆ سەر سنووری شەمزینان دەربڕی، لێرەوە کەوتە نیشاندانی سیاسەتەکەی. سەرۆك پێی وابوو هەڵەی ڕۆژهەڵات ئەوەیە باوەڕی بەتیۆری هەیەو لەراستییەوە دوورە، ئیمپراتۆریەتی تورکی بە باوەڕە خەیاڵییەکەی کە کۆکردنەوەی هەموو گەلانی موسڵمان بوو لە یەکێتییەکی سەرتاسەریی ئیسلامیدا، هەرەسی هێنا، ئەمەیش گومانی لای هێزەکانی تر دروستکرد. جا بۆ ئەوەی ئەم بێ عەقڵییە دووبارە نەبێتەوە، خەلافەتی هەڵوەشاندەوە. هەمیشە زۆر لە پێش شەڕەوە وتوویە: پێویستە تورکیا لە ئەلبانیو بولگاریو عەرەب دوور کەوێتەوەو، زیاتر خۆی بگونجێنێ، ئەم پێشکەوتنانەی دوایی زادەی سیاسەتەکەی ئەمن، بەڵام ئەمە وەزعێکی روو لە هەورازو سەختە. مێژوو نووسێکی ئینگلیزی وتوویە: ئیمپراتۆریەتی تورکی هێندەی ماوەی نێوان مەسیحو محەمەد لە دواوەی گەلانی رۆژ ئاواوەیە، ئەو کاتە لەدەست چووەیش، ئەبێ ئێستا قەرەبوو بکرێتەوە. ئەمە مەسەلەی هێڵی ئاسنو کارگەو تەلەگراف نییە، بەڵکوو هی گۆڕانی ریشەییی بیروهۆشی خەڵکە. سەرۆك پێی وابوو تورکیا ئەو یارمەتییە خێر خوازییەی بریتانیای ، بەو برە زۆرەی کە داوا دەکرێ، پێدەگات.

من وتم: دەکرێ بەڕێزی هەڵویستی بریتانیای مەزن لەزاری باڵوێزی ئینگلیزەوە بزانێ، بەڵام بەش بەحاڵی خۆم بەپچڕانی پەیوەندیی کۆنی ئەنگلۆتورکی زۆر نیگەرانو، بەم بووژانەوەیەی دواییش دڵخۆش بووم.

ئەبێ، ئەوەندەی بکرێ، هەموو هەلێك بۆ پتەو کردنی ئەم دۆستایەتییە بقۆزمەوە.

پاش چەند قسەیەکی تر مۆڵەتم خواستو بەجێم هێشت.

ئێچ. دۆبس،

کۆمیساری باڵا لەعیراق، ئەنگۆرە، ٢٢ی نۆڤمبەری ١٩٢٦

وەزیری دەرەوە، ٤٢٤/٢٦٥، ل:٥٠-٥٢، ژ ١/٤٦

**ژ: ٣٣**

**لەسێرجی کلارکەوە بۆسێر ئۆستن چامبرلەین - (١٧ی کانونی دووەم گەیشتووە)**

**(ژمارە: ٢١)**

**ئەنگۆرە، ٤ی کانوونی دووەمی ١٩٢٧**

**گەورەم،**

لەراپۆرتی ژمارە (٦٢١)ی (٢٤)ی نۆڤەمبەردا، لە راگەیاندنی ئەو سیاسەتە توندەی. دژ بە کوردان کەوەزیری کاروباری دەرەوە لە گفتوگۆیەکدا لەگەڵ کۆمیساری باڵای عیراقدا باسی کردبوو، ئاگادارم کردنەوە.

٢ـ دوێ شەو لە دیداری تۆفیق روشدیدا ئەمەمان خستە بەرباس، وەك ئەوکاتەی کە قسەی لەگەڵ سێر هنری دۆبسدا کردبوو، هەرئامادە نەبوو. تەنازول بکات. ئەو ئاماژەی بەتیۆریی فەلسەفە مێژووییەکەی کرد: میلی بەندۆڵە کە لە نێوان سەردەمی ئیمپراتۆریەتی یەککگرتوو (فیدرالی)و هی نەتەوەو رەگەزە سەربەخۆکاندا دێو دەچێ، تەنها ئیمپراتۆریەتی بریتانیا لە مێژوودا لە رووی سیاسییەوە ژیربووەو، لەگەڵ گەشەکردنی هێزە جیایی خوازەکاندا خۆی گونجاندووەو، بەمەیش پێکهاتەی خۆیی پاراستووە، ئێستا بەندۆڵەکە لەوپەڕی گوژمیدا بەرەو نەتەوە تاكو جیاکانو، ئەگەر ئیمپراتۆریەتەکان نەبن، تێبینی گەڕانەوەیشی بۆ لای گرووپەکان دەکرێ، پرۆسەکەیش شتێکی حەتمییە، بەڵام ئەبێ چەند یەکەیەکی بچووکی نیشتمانی لەم رێیەدا تیا بچن، یاخود بەشلۆقی رزگاریان بێ، چونکە بەکارهێنانیان لەلایەن یەکێ لە هاوسێ بەهێزەکانیانەوە واتە شەڕ لەگەڵ ئەوانی تردا. بۆیە لێرەدا سەربەخۆیی‌ی

میللەتە بچوکە یەك دوو میلۆنییەکانی وەك ئەلبانیا هەرگیز شیاو نییە. کەواتە کوردەکانیش بێ بەش دەبن، سەرەڕای ئەمەیش ئاستی رۆشنبیرییان هێندە نزمو عەقڵیان وا لە دواوەیە کە ناتوانرێ لە بنیاتی سیاسیی گشتیی تورکیادا بەشدار بکرێن، خۆ ئەمانیش، وەك بەڕێزی وتی(( هندۆسەکانی ئەمریکا) کە دیار بوو مەبەستی هندییە سوورەکان بوو، دەبڕینەوەو، لەرووی داراییەوە لە کێبەرکێی تورکە روناکبیرو پێشکەوتووەکاندا کە لە هەرێمە کوردییەکاندا جێگیر دەکرێن، شەڕی مانەوەیان پێ ناکرێ. دوای هەموو ئەمانیش ئەمڕۆ کەمتر لە (٥٠٠٠٠٠ پێنج سەد هەزار) کورد لە تورکیادان کە دەتوانرێ زۆرترین ژمارەیان لێ بنێردرێنە عیراقو ئێرانو، ئەوانی تریشیان بەپرۆسەی سڕینەوەی لایەنە نەشیاوەکانیاندا تێدەپەڕن.

٣ـ سەختە بڕوابکرێ کە ئەمە راوبۆچوونی وەزیرێکە، بەڵام من باوەڕم وایە. سەیرتر لە کەم عەقڵیی ئەمانە، ئەوەیە کە بەسووکی سەیری گرفتەکانی تورکیا ئەکەن، (٥٠٠٠٠٠) کوردەکەی تورکیا لای تۆفیق روشدی، بەهەموو پێوەرێکی بڕوا پێکراو، زۆر لە ژمارە راستیەقینەکە کەمترە، رۆژانی رابردوو فەرمانڕەوایەکی قەیسەری پێی وتم پێش شەڕ بەلای کەمەوە (٢,٥) ملیۆن کورد لە تورکیا دابوونو، ئێستاش ناشێ (١,٥) ملیۆن کەمتری تێدابێو، تورك هەرگیز ناتوانێ کۆتاییان پێبێنێ. ئێمە لەوەی وا لە کوردستاندا روو دەدا، بێ ئاگاین، بەڵام ئەزانین تورکیا سوپایەکی لەوێ مۆڵداوەو، ڕێژەیەکی زۆری داهاتی تێدا خەرج دەکاتو، هیچ نیشانەیەکی لەناوچوونی کوردیش نییە.

کۆپیی ئەم نوسراوە بۆ بەغداو تاران دەنێرم.

جۆرج ئاڕ. کلارك

*** *** ***

## ژ: ٣٤

## لە سێرجی. کلارکەوە بۆ سێرئۆستن چامبرلەین ( ١٧ی کانونی دووەم گەیشتووە )
(ژمارە : ٢٢)

**قوستەنتەنییە ، ١٢ی کانونی دووەمی ١٩٢٧**

**گەورەم ،**

پێتان ڕادەگەیەنم دادگای ئیستیقلالی ئەنگۆرە بەم دواییە ڕاپۆرتێکی کورتی سەرژمێریی کارەکانی بڵاوکردەوە کە جێی بایەخ پێدانە . ئەمە خوێندنەوەیەکی توندە و، پێدەچی وا هەست بکرێ تاوانکارانی سیاسی زۆر زیاترین لەوەی کە دانی پێدانراوە.

٢- ڕاگەیەندراوە لەسەرەتای ئازاری (١٩٢٥) ەوە کە دادگاکە کەوتووە گەڕ، زیاتر لە(١٠٠٠هەزار ) کەس بەگوناهی سیاسیو (٨٠٠) یش بەدزیو جەردەیی تاوانبارکراون ، بۆ یە ئەشێ هاولاتییەکی ئاسایی دڵخۆش بێ بەوەی کە ئەم دادگا تەمەن کورتە کارێکی بۆ کەمکردنەوەی جەردەیی ، کە برینێکی تورکیای زوویش بووە، کردووە، بەلام، بەهەمان شێوە، ترسیشی لە لێکۆڵینەوەو بەدوادا چونە سیاسیەکان هەبێ.ئەمیش چونکە ئاسایشی ڕۆژئاوای تورکیا، هەرگیز وەك ئێستا باش نەبوە بەلام هەرچەندە ئەندامانی دادگای ئیستیقلال بۆ هەرشوێنێك چووبن خەڵك بە هەموو جۆرێك مل کەچیان بوون ، بەلام خەڵك خۆشیان ناوێن .زۆربەی خەڵك ، ئەگەر وەك تورکیش (سلبی)بن، لەوانەیە تازەگەریان بەڕێگەی خۆیان پێباشبێ. دادگای ئیستقلالی ئەنگورە بۆ ئەوە هاتووەتە گۆڕێ کە بزانی ئایا تورك لەسەر شێوازەکەی غازی، ئەو پرۆسەیەی کە ئەمساڵ خنکاندنی (١٢٥)و زیندانیکردنی زیاتر لە (٥٠٠) کەسی بەپێویست زانی، خۆیان چاك دەکەن؟

٣- رای تایبەتی غازی ئەوەیە کە وڵات پێویستی بە فەرمانڕەوایەکی ستەمکاری چاكو پێداگری حکومەتێکی کۆماری هەیەو، ئەوشتانەی سەرەوەیش کە دەشێ

بەکەم بگیرێن، دەرهاویشتەیەکی ئەم بۆچوونەن. ئەمەیش ئەوە ناگەیەنێ کە شتێك نییە بۆ ئەم سیاسەتەی بوترێ. ئەگەر وڵات بەدەستێکی بەهێز بەڕێوە نەبرێ، ئەوا ڕێیتێدەچێ ململانێیەك کە هەردوولای تێدا زەرەر مەندبن، خۆ ئەگەر بێگانەیش نەهێنێتە وڵاتەوە، هەروەك دادگاکانی ئیستیقلال، ببێتە مایەی نەهامەتییە ڕاستەقینەکانی مرۆڤ.

٤- دووری وای کردووە هیچ شتێك لەبارەی کارەکانی دادگای ئیستیقلالی ئەلعەزیزی نزیك خەرپووتەوە کە بەشێوەیەکی سەرەکی کوردنشینە، نەزانین. دان بەوەدانراوە کە کاری هێورکردنەوە هێشتا زۆری ماوەو، تا کوردە نادڵسۆزەکان ریشەکێش دەکرێن، دادگاکە پێویست دەبێ. لەبەریەك هەڵوەشاندنی خێڵەکان و چەککردنی هەموان و، هەرچۆنێك بێ، ڕاگوێزانی سەرۆك تیرەکان هەر بەردەوامە. یاسای عەسکەری لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتدا بۆ (٢٣)ی تشرینی دووەمی داهاتوو درێژ کراوەتەوەو، نزیکەی نیوەی سوپا بۆئەم بەرنامەیە تەرخانکراون. مانگی ڕابردوو چاپەمەنیەکان، بۆ لێدانی خێڵی (قۆچ- ئوشاغی، K0tch- Ushaghi )ی دەرسیم کەبەئاشکرا بەرەنگاری هەوڵەکانی لێپێچانەوەی کاربەدەستە عەسکەریەکان بووبوونەوە، دەستخۆشییان لە سوپا کرد.

٥- لیستێکی تایبەت بەجێگیرکردنی خێزانە کوردە ڕاگوێزراوەکانی بایەزیدو ناوچەکانیتر، دا ئەوانەیان کە لە پرۆسەی ڕاگوێزاندا ماون، لە ئەنادۆڵی رۆژئاوا، پێشکەشی ئەنجومەن دەکرێ، بەڵام لەبەر ئەوەی کە تەنها ٢٠٠٠ کەس لە خۆدەگرێ، ئەوە دەگەیەنێ، یان سەربازەکان نەیانتوانیوە زۆرێك لە کوردە ئاژاوە گێڕەکانیان چنگ بکەون، یاخود ئەوانەی کە هەر جۆرە پەیوەندییەکیان بە یاخیەکانەوە هەبووەو رزگاریان بووە، لە گیراوان زیاترن.

٦- نیشتەجێکردنی پەنابەران بۆ پڕکردنەوەی ئەو بۆشاییەی کە ڕاماڵینی کورد لە هەرێمە کوردیەکاندا دروستی کردووە، بیری لێ کراوەتەوە، بەهیوان پەنابەری

موسڵمانیان لە یۆگۆسلاڤیاو بولگاریـاو دۆبروجـا (Dobruja) [1] و قوبـروس و قۆقـازەوە دەست بکەوێ. بەڵام ئەگەر حکومەتی ئەو وڵاتانە فشـاریان نەخەنـە سـەر، پێناچێ ئـەم هیوایـە بێتـە دی و، لەوانەیشــە خوێنێکــی زۆری تێـدا بـرژێ. تاقیکردنــەوەی نیشتەجێکردنی موسڵمانانی یۆنان لە تورکیا، هاندەرنین. پێناچێ ئـەو کشـتیارانەی کە لـە زەویی گاورەکاندا گوزەرانیـان باشـەو، رەنگـە فێسـەکانیان لەسـەر بنێـن و، بێهیچ سووکایەتی پێکردنێك نوێژەکانیان بکەن، بۆ دەست پێکردنی ژیانێکی نـوێ و لـە بـەرگێکی رۆژئـاواییدا، خوازیـارین لـە هـەرێمی سـەختی کوردستاندا نیشــتەجێ بکرێن. تورکیا ئێستا ناتوانێ، وەك دارولئیسلامەکەی زوو، خەڵك بۆخۆی رابکێشێ.

٧- کۆپییەکی ئەمە بۆ کۆمیساری باڵای خاوەنشکۆ لەبەغدا دەنێرم.

جۆرج ئار. کلارك

---

[1] ناوچەیـەکی رۆمانیـاو بۆلگاریایـە لـەنێوان دەریـای رەش و رووبـاری دانووبـدا (المنجد فـي الاعـلام، گ٩، ص٢٨٩). (س)

## ژ: ٣٥

## لە سێر ئۆستن چامبرلەینەوە بۆ سێرجی. کلارك-(قوستەنتەنییە)

(ژمارە: ٧١)

وەزارەتی دەرەوە، ٢٨ی کانوونی دووەمی ١٩٢٧

بەڕێز،

ئەمرۆ باڵوێزی تورکیا بۆ یەکەمجار دوای گەڕانەوەی لەئەنگۆرە، سەری لێدام ئەو، خۆشحاڵیی حکومەتی تورکیی بۆ دامەزراندنی بەڕێزتو ئەو پەیوەندییەی کە کردووتە پێیانەوە بەگەرمی باسکردو، کەسەرنجیدا: دەزانم چەند بەپەرۆشەوە حەز بەدەست پێکردنی دۆستایەتی ئەنگلۆ- تورکی دەکات، دەربڕی دڵی بەو نیشانانەی هەستی تورك بەرامبەر بەئێمە خۆشە کە بە وتووێژ لەگەل سەرکۆمارو سەرۆکی ئەنجومەن و وەزیری دەرەوەدا بۆی دەرکەوتبوون.

ئەمجا داوای لێکردم داواکانی تورکیا بۆ هەڵگرتنی قەرزەکان کە ڕوون بووەتەوە پەسەندکردنیان بەڕاستی لەقازانجی بەڵێندەرانی ئینگلیزدا نییە، وەرگرم. هەروەها بەگفتوگۆکانی پاریسیدا زانیبووی، ئێستا کێشەکان لە"سێر ئادەم بلۆك_ Sir Adam Block"دوەن، نەك لە فەرەنسەوە کە گەورەترین قازانجی دەست کەوتووە. ئەو تەواو دانی بەوەدانا کە سێر ئادەم بلۆك نە کارمەندی حکومەتی بریتانیاو، نە کۆنترۆڵی بەدەست ئێمەیە، بەلام جەختی لەسەر کردەوەو کە حکومەتی تورکی تا ئێستا داوای بەڵێندەرانی پەسەند نەکردووەو، زۆر جێی داخ دەبێ ئەگەر رێك نەکەون. ئەوەیشم بەبەڕێزی وت: تۆ شتێکت لەسەر ئەمە بۆ نووسیمو، منیش داوایەکم هەبوەو، بۆ ئەوەی کە لە شوێنی خۆیدا دڵنیا بکرێتەوەو بزانرێ ئاخۆ ئەتوانین بەشێوەیەکی بەسوود هیچ ئامۆژگارییەك بکەین، لەگەڵ گەنجینەدا راوێژی لەسەر کراوە.

پاشـان باڵوێزەکـە دلوای زانیـاریی لـەبارەی جیاوازییـە دەرکـەوتووەکانی نێـوان حکومەتەکانی یۆگۆسلاڤیاو ئیتاڵیاوە لەسـەر رێککـەوتی تیارنـا کـرد. ئـەمجا چـووە سەرباسـی سـەردانی مسـتەر چـەرچڵ بـۆ رۆمـاو دانوسـتانی لەگـەڵ سـینیۆر (مۆسـۆلینی)دا. گفتوگۆکانی ئـەمان، بیرو هۆشـی خـەڵکێکی زۆریـان لـە تورکیـا ورووژاندووەو، ترسێکیان هێناوەتە ئاراوە کە قسەی جارجاری سینیۆر (مۆسۆلینی) لەمەڕ پێویستی بوارێك بۆ فراوانکردنی دانیشتوانی ئیتالیاو، ئیشارەتدانی بە ((ئاسیا یـان ئـەفریقا)) بـۆ ئـەم مەبەسـتە، دروسـتیان کـردووە. ئـەم قسـانە، نائاسـایی، حکومەتی تورکیایان وریا نەکردەوە کە ناچاربوو ئامادەکارییەکی دیـاری عەسـکەری بکـاتو پارەیـەکی زۆر لـەم مەرامـەدا بەخـەرج بـدات، کـە دەشـیا بـۆ ئامـانجێکی بەسوودتر تەرخانی بکردایـە. مـن بـە باڵوێزەکـەم وت: گەشـتەکەی مسـتەر چـەرچڵ تەنها پشووەو، لەسـەر داوانامـەی هاوڕێیـەکی دێریـن بـووە کـە ئێسـتا فـەرماندەیی گەلەکەشیتی بریتانیـانی لـەدەریای ناوەڕستدا دەکـات . مسـتەر چـەرچڵ کـارێکی سیاسیی نەکردووەو ، هەرچەندە کە گەراپەوە لەم بارەیەوە قسەم بۆدەکات ، بەڵام قسەکانی ئەسیناو ڕۆمـای لـەوجۆرەنین کـە هیـچ ڕاپۆرتێکم لەسـەریان بـۆ بنێرێ . ئەوەندەی کە من لە قسەکانی ڕۆمای بزانم ، هی چاوپێکەوتنی چاپەمەنیەکان بووە کە لە ڕۆژنامەکانی ئیتاڵیادا ڕایگەیاندووە . باڵوێزەکە وتی ،بێهیچ داوایەکی ڕەسمی ، خۆشحاڵە بزانێ ئایا رازی ئـەبین کونسـڵی گشـتی تورکیـا لـە بـەغدا دەستنیشـان بکرێ ؟ پێیشی لەسەر ئەو ڕاستیە داگرت کەنایەوێ لە موسڵ داینێ ، چونکـە وتـی : کـارێکی لـەو جـۆرە ، پێدەچێگومـان دروسـت بکـات و ، ئاکـامی سیاسـی خراپـی لێبکەوێتەوە . تورکیا قازانجی ئیش و کاری لەبەغدادا هەیە . بـەردەوام دەیپرسـی : ئایا هیچ میکانیزمێکی گونجاو نییە کاری پێبکرێ ؟ هیوادارپـش بـوو پێـی بڵێم ئایا ئەگەر داوای ڕەسمی هەبێ ، پەسەند دەکرێ؟ بەڵێنم دایە لەم بارەیەوە لە ئۆفیسـی کۆڵۆنییەکان بپرسم ، کە بـێ گومـان پـەیوەندی بەحکومـەتی عێراقـەوە دەکـات و ، دواتریش وەڵامەکەی بدەمەوە.

باڵویز وتی : دوو سێ شتی تر هەن ، لەبەر ئەوە کارێکی خراپیان کردووەتە سەر مێشکی حکومەت ، دەیەوێ نارەسمیو بەگیانێکی دۆستانەوە ئاماژەیان پێبکات . ئەو کاتە داوای هیچ ڕوونکردنەوەیەکی لەسەر ئەم مەسەلەیە نەکرد ، بەڵکو تەنها ویستی سەرنجم بۆ ئەم خاڵە بچووکانە ڕابکێشێ : یەکەمیان ئەوەبوو کە کاتێك حکومەتی فەرەنسی بەیەك چاو سەیری بیانی ( رعایا) ی هێزەکانی ئەورووپاو تورکیای لە سوریا دەکرد، ئەم ڕێککەوتنە بۆ میسرو عێراق کە بریتانیا دەسەڵاتی تێیاندا هەیە ، ڕەتکرایەوە. من وتم زانیاریم لەم بارەیەوە نییە ، بەڵام لێی ئەکۆڵمەوە.

خاڵی دووەم کە بەڕێزی باسی کرد، ئەوەبووکە تورکیا دەخوازی باڵویز خانەکەمان لە ئەنکۆرە بێ. من لە وەڵامدا وتم : گرفتی ماددیمان لەڕێی ئەم گۆڕانەدا هەیە. ئەنکۆرە جێیەکی پەسەند نییەو، گوزەرانی باڵوێزیش دیاریکراوە. بەڕێزیشت وتت ئەتەوێ زیاد لەئاسایی جاران لە ئەنکۆرەبیو، منیش وام حەزدەکرد. ئەشێ ساڵانی ئاینده چەند چاکسازییەك لە گوزەرانی تۆدا بکرێ، بەڵام ئێستا باری دارایمان، بەهۆی کێشە پیشەسازییەکانی دوازدە مانگی ڕابردووەوە، زۆر خراپەو، گەنجینە هەموو ڕادەکانی بۆ کەمترین ئاست دابەزاندووە.

دیسان باڵوێزەکە پرسیی: ئایا بەم کێشە مادییانەوە، لەم بارەیەوە هیچ ڕێککەوتنێك لەنێوان ئێمەو حکومەتی فرەنسەدا نییە؟ وتم : بێگومان وایە ، بەڵام ڕێککەوتنێکی وا کە هەردوولا هەتاهەتایە پێکەوە ببەستێ، لە ئارادانییە. ئەو بەپێویستی زانی پێش ئەوەی هەر گۆڕانێك ڕووبدات، ڕاوێژ بەحکومەتی فەرەنسە بکەم. بەپێویستی نازانم لەسەر هۆکانی بەگوڕ کردنی ئەم ڕێکەوتننامەیە، وەك هەنگاوی یەکەم، بدوێم. پێم وایە باشتربێ ئێستا لەهەر گۆڕانێکدا جەخت لەسەر گرفتە ماددییەکان بکرێتەوە.

دواجار وتی: زانیویەتی چاپکراوێك بڵاوی کردووەتەوە کە کارمەندانی کونسڵخانەمان لەڕۆژئاوای ئێران، هانی بیری دژی تورکیان لە ناو کورداندا داوە. من

وتم: ئەم گومانە هیچ بنچینەیەکی نییەو، بەپێچەوانەوە، ئەزانم کارێکی لەم جۆرە پەیوەندییە دۆستانەکانمان کەلەپەیماننامەی موسڵدا دامەزراوەتەوە، دەخاتە بەر مەترسیو، لەجیاتیی کێشە نانەوە لەناو کورداندا، ئەمانەوێ بەئاشتیو بەختەوەری لەسایەی فەرمانڕەوایی تورکیادا بیانبینین، چونکە دەزانین تورکیا چەند بەم بابەتە حەساسەو، چەندیش لەسەر پێیە کە هەر تەنگو چەڵەمەیەك رووی دا لێمان بەگومانبێو، ئەم گومانەیش چەند زیان لەو پەیوەندییە باشانە دەدات کە مەبەستمانە بیانپارێزین. بەباڵوێزم وت: ئەتوانی ئەم دڵنیا کردنەوەیە، بەڕەسمی وەك سیاسەتی حکومەتی خاوەنشکۆ، بۆ حکومەتەکەی دووپات بکاتەوە.

ئۆستن چامبرلەین

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤/٢٦٦، ل: ٢٢–٢٤، ژ: ٧.

## ژ: ٣٦

### لەسێرجی. کلارکەوە بۆ سێر ئۆستن چامبرلەین( ٢٥ نیسان گەیشتووە )
(ژمارە: ١٩٢)

**قوستەنتەنییە، ٢٠ی نیسانی ١٩٢٧**

**گەوردم،**

خۆشحاڵم لە ڕاگەیاندنێکی ئەمڕۆی ڕۆژنامەی" وەقـت" ئاگادارتـان بکەمـەوە کـە دەڵێ حکومەت داوای لە حکومەتی ئێران کردووە هێرشەکانی سمکۆ لە ئێرانـەوە بـۆ سەرخاکی تورکیا ڕاگرێ.ئەگەر ئەمە ئەو ڕاپۆرتەی گوشاری تورك نەبێ کە پاشکۆی عەسکەری ئێران لەلای رائید هارێنك (بڕوانە نووسـراوی ژمـارە(١٢٢)ی (٥)ی مـانگی رابردووی رائید هارێنك) [1] گازندەی لە سەرکردبوو، وادەردەکـەوێ تورکـەکان هـەوڵ بدەن فارسەکان هانبدەن بۆ شەڕی کورد.

٢- ویلایەتـەکانی ڕۆژهـەڵات هێشتا بـەڕووی گەشـتیاراندا داخـراون، هـەواڵی سـەرکەوتنەکانی سیاسـەتو ڕێبازەکـانی تـورك بـۆ هێمنکردنـەوەی کوردسـتان، زۆرکەمن. "میللییەت" لەسـەر گوتـاری (١٧)ی ئـەم مانگـەیدا، زۆرکـەم لەسـەر ئـەم بابەتەی نووسیبوو، بەڵام لەکاتێکدا شتەکان ((لەچاو ساڵانی پێشوودا)) زیاتر پشت ڕاستکەرەوەن، نەیتوانیبوو بارو دۆخی گشتیی ویلایەتـەکانی ڕۆژهەلاتبداتـە ناسـین. ئەمـەیش ئـەو گومانـەی مـن نیشـاندەدات کـە لـە هەلومەرجەکـەم هەیـە. واتـە: ناوچەکەیەکی بەرفراوان هەیە کـە حکومـەت سـەرەڕای کۆششـەکانی، نـەیتوانیوە دەسەڵاتی خۆیی بەسەردا بسەپێنێ. دەڵێن: (١٢٠٠٠) کەسی ئەندامی ئەو بنەماڵانەی کە یـاخی بووبـوون، نێردراونـە هـەندێ شـوێنی ڕۆژئـاوای دوورتـرو، (٣٠٠) یتریـش

---

[1] ئەم نووسراوە چاپ نەکراوە.

دەنێردرێن. ئاسایییە بڕیارێك هەبێ– وەك بەئاشكرا هەبوو– بۆ ئەوەی كە هیچ فەرمانبەرێكی كورد لە ویلایەتەكانی ڕۆژهەڵات كاری پێنەكرێ. چاپەمەنیەكان بڵاوی دەكەنەوە: ئەبێ ئۆجاغ( یانە)كانی تورك كەڕۆڵی گەورەیان لە تازەگەریی كوردان خۆیاندا هەبوو، كوردیش بكەنە هاووڵاتیی باش. سێ مانگ لەمەوبەر دەنگی لێبوردنێك بۆ كوردستان لەناودابوو، بەڵام هیچ لەئەنجومەنەوە دەرنەدەچوو. بێگومان وادەست دەكەن هێشتا ئەم جۆرە كارە زووبێ.

٣– پێویستە تێبینیی ئەوەبكرێ كەسەرگوتاری لەسەرەوە باسكراوی "میللیەت" ، گلەیی لە سنوور بڕین بەگشتیی، بەتایبەتیش هی سنووری سوریا كردووە.

٤– كۆپیی ئەم ڕاپۆرتە بۆ كۆمیساری باڵای خاوەنشكۆ لەبەغداو باڵوێزی خاوەنشكۆ لەتاران دەنێرم.

جۆرج ئار. كلارك

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٦/٤٢٤، ل: ٥٥، ژ: ٣٢

## ژ: ٣٧

## لەسێرجی. کلارکەوە بۆ سێر ئۆستن چامبرلەین-( ٢٧ی حوزەیران گەیشتووە ) (ژمارە:٣٢١)

### تیرا پیا، ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٢٧

**گەورەم،**

ئەو برگەیەی(٢٠)ی حوزەیران رۆژنامەیەکی تورکیا لەسەر بڕیاری حکومەتی تورك بۆ داخستنی سنوور بەڕووی خێڵەکانی عێراقدا( وەك لە راپۆرتی ژمارە(٢١٣)ی(٤) مایسمدا ئاماژەم پێکردبوو، کە لێرەدا هاوپێچیم کردووە[1] ، شایەنی گرنگی پێدانە.

ئەم یاسایە، بەکردەوە ئەو دەسەڵاتە بەحکومەتی تورکیا دەبەخشێ کە ژمارەیەکی نەزانراو کوردو رەگەزی تری بەسەرپێچیکەری کاربەدەستانی ئەنگورە دانراو، لەویلایەتەکانی رۆژهەلات راگوێزێ، واتە حکومەت، بەپێی ئەم یاسایە، (٢٠٠٠) خێزانێکی یاخی لەناوچەکانی کوردستان بەگشتیو، بایەزید (نەك دەرسیم کە لە رۆژنامەکە بەهەڵە نووسیویە) بەتایبەتی، رادەگوێزێ. حکومەتی تورکی وەك لەراپۆرتی ژمارە(١٩٢)ی(٢٠) نیساندا هاتووە، کەوتووەتە جێبەجێکردنی ئەو سیاسەتە، دژی کوردەکان، کە ساڵی ١٩١٥ بەسەرکەوتوویی لەدەست ئەرمەنیەکان رزگاری کردو، ئەمەیش شەرکردنە دژی ئەو کوردانە. ئەمە فێڵێکی سەیری چارەنووسە کە دەبێ کوردەکانی بزوێنەرو هاندەری سەرەکیی راگوێزانی ئەرمەنیەکان، پاش دوازدە ساڵ، بەرەو رووی مەترسی هەمان چارەنووسی ئەوان

---

[1] ئەم راپۆرتە چاپ نەکراوە.

بنەوە. هیچ هۆیەك نییە کە واهەست بکەین حکوومەت هەوڵ ئەدات، بەهەمان پێوەری ساڵی (١٩١٥)، بکەوێتە راگوێزان.

٣- ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانی یاسایەکی دەرکرد کە مافی داواکردنی حسابی موڵکەکان دەداتە راگوێزراوان، بەڵام کەمیی ئەو ماوەیەی کە پێیان دراوە، بەهای ئەم ئیمتیازەی پووچەڵ کردووەتەوەو، ناشتوانم بڵێم ئایا داواکان تاچەند گوێیان لێدەگیرێ؟

٤- هیچ ئاماژەیەك نەکراوە کە بۆ چ هەرێمێك دەنێردرێنو، دەیشکرێ بپرسین: ئایا چەند لەهەژارەکان دەگەنە جێوشوێنی دیاریکراویان؟

٥- مانگی پێشوو رۆژنامەی حکومەت، جارێکیتر لە باسی ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتدا، ئەوەی رەتکردەوە کەکەمیی بودجەی دیاریکراو، جێبەجێکردنی پرۆگرامی چاکسازییەکەی راگرتبێ. هەموو ئەم شتانە، هەر لەرێکخستنی دەستەی پشکنیارانو دەست بەسەرداگرتنەوەی چەكو رێکخستنەوەی دادگا یاساییەکانەوە تاسەرژمێریو دامەزراندنی تۆمارگەی زەویەکانو هەڵوەشاندنەوەی تیرەو هۆزەکان، کە بێگومان بەئارەزووی حکومەت دەکرێ، پارەیان دەوێ. بۆیە مەحموود بەگ وتی: ئاساییە وا هەست بکرێ کە رێفۆرمەکە بە هێواشی بەرێوە دەچێ. سەرەرای ئەویش کەئاژاوە لەناوەوەو دەرەوەی تورکیا پێشو دوای دامەزراندنی رژێمی ئەنگۆرە بەرپابووە، هەستێکی نەتەوەپەروەریی جێی لێدوانی وا، ئۆفیسی دەرەوە تورکی بێ یان کوردی، لەناوچە کوردییەکاندا نییە، لەبەر ئەوە پێشوازیی خواستی وەزیری پەروەردەی کرد بۆ بەرێوەبردنی قوتابخانەکانی رۆژهەڵات بەو مامۆستایانەی کە مێشکیان بەبیری نوێی تورکی زاخ دراوە.

٦- لیستی لێبوردنی کوردان بۆ ماوەیەك بەدەست کۆمسیۆنی یاسایی پەرلەمانەوەبوو، بەڵام ئێستا وادیارە تەنها بۆ تاوانەکانی پێش یاخیبوونە. ئەمە بەگشتی ئەوە دەگەیەنێ کەحکومەت زیاتر سەرگەرمی دەست بەسەرداگرتنەوەی

چەکەکانو ریشە کێشکردنی بنەماڵە دەستڕۆکانە، نەك نواندنی هەندێ لەنەرمی وەك مەسەلەی قوتابخانەکانو دادگا یاساییەکانو تۆماری زەوییەکان.

جۆرج ئاڕ. کلارك

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤/٢٦٦، ل: ٨٥-٨٦، ژ: ٤٩

## ژ: ٣٨

## لەسێرجی. کلارکەوە بۆ سێر ئۆستن چامبرلەین( ١٥ ئاب گەیشتووە )

**(ژمارە: ٤١٧)**

**تیراپیا، ٩ی ئابی ١٩٢٧**

**گەورەم،**

وەك لەو نوسینانەم ئاگادارن کە بە ڕاپۆرتی ژمارە(٣٢١ )ی(٢٢) حوزەیران دواییان هات، دووساڵەحکومەتی تورکی پابەند کراوە، کوردو ئەو ڕەگەزانەی تر کە لە دامەزراندنی ئەم ڕژێمەوە بەردەوام سەرچاوەی کێشەبوون، لەهەرێمەکانی ڕۆژهەلاتی فوراتەوە بۆناوچەکانی تری تورکیا بگوێزێتەوە. لەگەڵ ئەوەدا کە تا دوو مانگ لەمەوبەر ئەم گواستنەوانە بەپێوەرێکی دیاریکراو ئەنجامدەدرا، بەلام ئێستا ئاشکرایە دوای پەسەند کردنی ئەو یاسایەی کە لە ڕاپۆرتی ناوبراودا زانیاریم لەبارەوەدابوو، کار بەپێوەرێك دەکەن کە تارادەیەکی زۆر لە ڕاگوێزانی بەکۆمەڵی ساڵی (١٩١٥)ی ئەرمەنیەکان دەچێ.

٢- هەموو دەڤەری کێشەکە تەواو لە جیهانی دەرەوە دابڕاوەو، چاپەمەنیەکانیش هەر لە مەسەلەکە بێدەنگن، بۆیە هیچ ڕێگەیەك نییە تادڵنیابین ئایا ئەو ڕاگوێزانە زۆرە ملێیە هیچ کارێکی کردووەتە سەر بارودۆخی ئێستا یاخود

ژمارەی خەڵکەکە؟ پێناچێ زیادە ڕۆیی بێ، گەربڵێم زیاد لە (٢٠٠٠٠) پیاو و ژن و منداڵ پێش کۆتایی‌ی ڕاگواستن بەزۆر لەخاکی خۆیان هەڵکەندراون.

٣- تەنها یەك ڕاپۆرتی کونسوڵی تەرابزوونی خاوەنشکۆم سەبارەت بە چارەنووسی ئەو خەڵکە بێبەختەو هەلومەرجی ڕاگوێزانیان پێگەیشتووە، کە بەو پێیە چەند ڕۆژی ڕابردوو (٦٠) پیاوی کوردی دەست بەستراو دوو دوو زنجیرکراو بەپێ بەناو تەرابزووندا براون و، واباوەڕدەکرێ خرابنە سەر کەشتییەکی هەڵمیی تورکی‌و بەرەو قوستەنتەنییە ڕاپێچکرابن. ئەمانە بەپێ‌و لەڕێی ئەرزرۆمەوە برابوون، بەڵام مستەر نایت نەیتوانیبوو بزانێ لەکوێوە هێنرابوون. هیچ ڕاپۆرتێك لەمەڕ گەیشتنی ئەم کوردانە لێرە بڵاونەکرایەوە، بەڵام ڕێی تێدەچێ بۆ سمیرنا یا پشت کە ناراوەکان گوێزرابنەوە . ساڵی ڕابردوویش، ژمارەیەکی بەرچاوی خێزانی دەستڕۆی کورد بۆ ئەم جێیە ڕاگوێزراون.

٤- ئەم بڕگەیەی خوارەوە کە لەسەر ئەم مەسەلەیە ڕاستەوخۆ لە ڕاپۆرتەکەی پاشکۆی عەسکەرییەوە تایبەت بە دوا گەشتی بۆ ڕۆژهەلاتی ئەنادۆڵی ناوەڕاست دەنووسمەوە، تیشکێك دەخاتە سەر شێوازی ڕاگوێزانەکە:

(( سێ‌قافڵەی جیای کوردم لە پرۆسەی ڕاگواستندا بینی،یەکیان لەنێوان ( نیغدە- Nigde) و(دەڤەلی قەرەحەسار- Develi Kara hissar)[1] دابوون، لە(٣) پیاو و نزیکەی (١٥٠ ) ژن و منداڵ پێکهاتبوو. کەلوپەلەکانیان لەسەر عەرەبانەی بە گاڕاکێشراو بوون و، زۆربەیان بەپێ‌دەڕۆیشتن و، تەنها یەك دووئافرەتی پیر لە سەر گوێدرێژو ئەسپ و عەرەبانە بوون و، (١٠ ) جەندرمە پاسیان دەکرد. دووەمیشیان، هەر بە پێ، لەنێوان قارەمان وقۆنیادا بوو، بەهۆی گەشتیارێکی ترەوەو لەسەر شەمەندەفەرەکە پێم زانی و، نزیکەی (٣٠٠) کەس دەبوون. لە(چومرە- Chumrah)[2]ی نزیك قۆنیایشدا، کامپێك هەیەو، نزیکەی (٦٠٠) کەسی تێدایە.

[1] ناحیەیەکی باشووری ڕۆژئاوای ویلایەتی قەیسەرییە لەبەشی خوارووی ناوەڕاستی تورکیا. ( س)

[2] قەزایەکی باشووری ڕۆژهەلاتی شاری قونیەیە.(س)

بەیاریدەدەری بنکەکەم وت: قەرەج لەم ناوە زۆرن. ئەو بۆی ڕاستکردمەوەو وتی: ئەوانە کوردی ڕاگوێزراون. هەرلەویَ بەتالیۆنێکی پیادەو نیو دەستەی ئەندازە هەن، بەپێی قسەی یاریدەدەرەکە، دووهەفتەیە گەیشتوون و،بۆپاسەوانیی کوردەکان نێردراون.))

(( ئەوانەی کەلەقافڵەی سەر ڕێگەکەدا بوون، وادیاربوو دڵخۆش بوون. هەرچەندە جەندرمەکان، لەکاتێکدا قسەم لەگەڵ یەکێك لەپیاوەکاندا دەکرد، دووریان خستمەوە، بەلاّم لەوە نەدەچوو بە ناهەمواری ڕاپێچکرابن یان مامەڵەی ئەرمەنیەکانیان لەتەکدا کرابیَ.))

٥- ئەگەر وەك ڕائید هاێنك وتوویەتی، شوێنی داهاتووی ئەم کوردانە دەشتیَ بەپیتی قۆنیابیَ، ئەوا دەشیَ بە تێپەڕبوونی کات خۆیان بەژیانێکی کشتیاری ئارامەوە خەریك بکەن و، واز لە بێزارکردنی دەوڵەت بێنن. ئەمانە ناوچەیەکی بەتاڵ لەدوای خۆیان جێدێڵن کەهەرگیز پڕدانیشتوان نەبوە. چەند نیشانەیەکیش هەن کەوا ئیدارەی ناوەندی بەشوێن ڕێگەیەکدا دەگەڕیَ، تائەو جێیانە پڕکاتەوە. یەکەمجار هەوڵیان دا، بەنیشتە جێکردنی هەزاران موسوڵمانی ئاڵوگۆڕکراوی یۆنانی، ئەم کارەبکەن، بەلاّم ئەمە شکستی خواردو، حکومەت ناچار دەستی لیَ هەلگرت.

٦-جێگرەوەی ئەمە، خۆی لە و(٤٠-٥٠) هەزار موسڵمانە قۆقازیەدا دەبینێتەوە کە لە ڕاپۆرتی ژمارە (٣١٠)ی(١٦) حوزەیراندا ئاماژەم پێکردبوون. ئەمەش هەر گرفتی لەڕێدایە، چونکە چەند ڕۆژی پێشوو ڕۆژنامە ناوخۆییەکان ئەم هەواڵە گرنگەیان بلاّوکردوەو: ئەو شارەزایەی پەنابەران بۆ چاوپێکەوتنی خەلکی جێی مەبەست نێردراوەتە دەوڵەتانی قۆقاز، بەوەزیری ناوخۆی ڕاگەیاندووە: هەندێکەس ئامادەن لەسایەی ڕێککەوتنامەیەکیتورکیا-ڕوسیا دا ڕەگەزنامەی تورکی هەلگرن، بەلاّم هەندێکی تریان ڕازی نین، بۆ چارەسەری ئەمانەی دوایی، بۆڕێککەوتنێکی تازە لەگەڵ ڕوسیادا گفتوگۆ بکریَ. لێرەوە دەتوانین بڵێین کاری شارەزاکەی پەنابەران،بە پێچەوانەی ئەوەوە کە ئومێد دەکرا، سەرکەوتوو نەبوە.

٧- لەکونسوڵی تەرایزوونی خاوەنشکۆوە زانیومە، حکومەتی سۆڤییەت زۆر حەز بە دوا داوای حکومەتی تورکیا بۆ ئاوەدانکردنەوەی ویلایەتە راگوێزراوەکانی رۆژهەلات ناکات. بەپێی قسەی هاوکارە رووسەکەی مستەر نایت، حکومەتی تورکیا هێشتا داواکەی نەخستووەتە بەردەم سۆڤییەتیەکان کەپێیان وایە قازانجێکی ئەوتۆی نییە. هاوڕێ( ئێتینگۆف- Etingoff ) ئەوڕایەی پێ سەیربوو کە (٤٠,٠٠٠ ) هاوڵاتیی ئازادو خۆشگوزەرانی یەکێتی سۆڤیەت، بەختو بەشی خۆیان بەئاوارەکانی خاکێکی بێپیت کەوا رێژەیەکی تری گەورەی پەنابەری موسڵمانی تێدا لەناوچوون، بگۆڕنەوە. ئەو بەگومان، بوو لەوەی کەزیاتر لە (١٠./.) ی ئەو ژمارەیە بەڕاستی لەخشتەبرابن، تائەم ئەزموونە چارەنووسازە ئەنجام بدەن.

٨- کاتیك دەستم کردە نووسینی ئەم راپۆرتە، گوتارێکی عەلی سائیب بەگی تائەم دواییە ئەندامی دادگای ئیستیقلالی رۆژهەلاتم لەرۆژنامەکاندا لەسەر بارودۆخی ویلایەتەکانی رۆژهەلات خوێندبووەوە. بەقسەی ئەم، ئەم کاربەدەستە دەسەلاتدارەی هەرێمەکە کەتازە ئەوێی جێهێشتووە، نیزامو ئاسایش دامەزراونەتەوەو، چەندین خێزانی نیشتەجێ بەهۆی یاسا نوێکەوە بۆ ئەنادۆڵی رۆژئاوا راگوێزراون. ئەو ریفۆرمەش کە حکومەت بڕیاری لەسەر دابوو، بەوریایی‌و بەردەوام جێبەجێ دەکرێ. درۆی سەرەتاکانی ئەم گوتارە، هیبەردەوامیی حوکمی عورفی‌و هێزە زەبەلاحە پرچەکەکانەو، خوێندەوار پێویستی بەهاوێنە( عدسە)ی گەورەکەر نییە تا ئەوڕاستییە بدۆزێتەوە کە دەکرێ لە دێڕەکانی دوابەشی ئەم گوتارە بێمانایەدا بخوێنرێتەوە.

٩- کۆپییەکی ئەم راپۆرتە بۆ بریکاری کۆمیساری بالآی خاوەنشکۆ لە عێراق دەنێرم.

جۆرج. ئار. کلارك

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٧/٤٢٤، ل: ٦٣-٦٤، ژ: ٢٤

## ژ:٣٩

## لەسێرجی. کلارکەوە بۆ سێر ئۆستن چامبرلەین-( ١٤ نۆڤەمبەر گەیشتووە ) (ژمارە:٥٥٥)

**قوستەنتەنییە، ٩ی تشرینی دووەمی ١٩٢٧**

**گەورەم،**

ئەمەویٚ ئاگـادارت بکەمــەوە کەسـەرۆکی ئەنجومـەن، (٥)ی تشـرینی دووەم، سیاسەتی گشتیی کابینە نوێکەی لە بەردەم ئەنجومەنی نیشتمانیدا راگەیاند. دەقی قسەکانی عیسمەت پاشا کەلە (( میللییە))دا بڵاوبووەوە، لێرەدا هاوپێچ دەکەم[1] .

٢- عیسمەت پاشا سەبارەت بەسیاسەتی گشتی، چ ناوخۆیی یا دەرەکی، تەنـها کەمێکی خستەسەر راگەیاندنی دوایی‌ی پرۆگرامی پارتی گـەل. تێبینییـەکانی لەمـەڕ بارودۆخی ویلایەتـەکانی رۆژهـەڵات جێـی سـەرنجن، ئەگـەر بۆ حوکمـی هەڵـە(mis-statement )یش بن، بۆ چاککردنی هەلومەرجەکە بەپێویستی زانـین. لەڕاسـتیدا نارەزایی‌ی زۆر دەربڕی‌و، بە پێداگرتنەوە بیٚ خەمییەکی تەواوی نیشان دا، ئەمـەش کاریگەرییـەکی پێچەوانـەی هـەبوو. برووسـکەی ئـەم دواییــەی کونسـوڵی حەڵـەبی خاوەنشکۆ دەڵیٚ: شاندی تورکی بەدوای کارناسـانیی زیـاتردا دەگـەڕیٚ، تـا سـەرباز بـەڕێی ئاسـندا بنێرێتـە کوردسـتان. ئەمـە تێبینییـەکی گرنگـە لەسـەر پـیٚ نـازینی عیسمەت پاشا بەوەی کە پۆلیس‌و پاسەوانانی نـاوخۆ تـەواو پیٚبـەپێی بارودۆخەکـە دەجووڵێنـەوە. لەباسـی سەرژمێرییەکەیشـدا، وەك کـارێکی ئاسـایی‌ی حکومـەت لـە شوێنە دوورە دەست‌و نەزانراوەکانی وڵاتدا، خۆشحاڵ نەبوو. لای هەمووان ئاشکرایە کە کاری سەرژمێریی ناوچەکانی رۆژهەڵات، مەحاڵە.

---

[1] دەقی ئەم قسانە چاپ نەکراوە.

٣- ئەم بابەتە لەراپۆرتێکی جیادا زیاتری لەسەر دەنووسمو، لێرەدا سەرنجتان بۆ راگەیاندنی ئەنجامەکان لەلایەن سەرۆك وەزیرەوەو، پێشوازیی گەرمو دەستخۆشانەی (١٤) ملیۆن کەس رادەکێشم.

٤- عیسمەت پاشا بەچەند تێبینیەك، لەبارەی دارایی و ئابوورییەوە،کۆتایی بەقسەکانی هێنا. ئەوەی شایانی باس بێ، بانکی دەوڵەتە. حکومەت بەنیازە، لە دوازدە مانگی داهاتوودا، ئەم دەزگایە دامەزرێنێ.

٥- دوایی ئەنجومەن، بەگوێ رایەڵییەوە، بەکۆی دەنگ متمانەی خۆی بە حکومەتە تازەکە بەخشی.

جۆرج ئار. کلارك

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤/٢٦٧، ل: ١٠٩-١١٠، ژ: ٥٥

## ژ: ٤٠

## لە مستەر هۆرەوە بۆ سێر نۆستن چامبرلەین-( ٥ دیسەمبەر گەیشتووە)

**(ژمارە: ٥٨٨)**

**قوستەنتەنییە، ٣٠ نۆڤەمبەری ١٩٢٧**

**گەورەم،**

ئەمەوێ پێتان ڕابگەیەنم (٢٢)ی ئەم مانگە حوكمی عورفیی ویلایەتەكانی ڕۆژهەڵات دوایی هات، چاپەمەنییە ڕەسمییەكان بڵاویان كردەوە: هەرگیز جارێكیتر بەوشێوەیەی زوو تازە ناكرێتەوە. دەڵێن فەرمانی دامەزراندنی پێشنیارێكی گشتی بۆ ویلایەتەكانی ڕۆژهەڵات كە لە دیاربەكردا دابنیشێ، خەریكە دەردەچێو، حكومەت ئیبراهیم تاڵع بەگی نوێنەری لە دامەزرێنانی پارتی گەلو ماوەیەكی كورتیش باڵوێز لەوارشۆی بۆئەم پۆستە هەڵبژاردووە. واڕادەگەیەنرێ: دەشێ حوكمی عورفی بۆ ناوچەیەكی دیاریكراو دەرچێو، ئیبراهیم تاڵع بەگو ڕاوێژكارەكانی هەلی لێكۆڵینەوەی هەلومەرجەكەیان بۆ بڕەخسێ. هاوكات ئەگەرچی حوكمی عورفی لەڕووی یاساییەوە نەماوە، گومانی تێدا نییە كە هێشتا هەركاری پێدەكرێ. تاكەكاری ناوازە كە ئێستا دەكرێ، پێی دەڵێن(( یاسای سەقامگیركردنی هێمنیی گشتی)). ئەم یاسایە، بەڕەزامەندیی غازیو بێ گەڕانەوە بۆ ئەنجومەن، بەهەموو شێوەیەك حكومەت واڵێدەكات هەموو جۆرە كاردانەوەو ئاژاوەیەك دامركێنێتەوە. ئەمە لەسەرتاسەری توركیا پێڕەو دەكرێ.

٢ـ پێشكەوتنی ڕاستەقینەی حكومەت لە هێوركردنەوەی ئەو ناوچەیەدا كەڕازی نییە پێی بڵێ كوردستان، گرانە حوكمی لەسەر بدرێ. هەر (١٠٠)كەس لە خێزانە ڕاگوێزراوەكانی كوردە یاخییەكان، لێرە بۆ شوێنی وەك سیمرنا ومەغنیسا (Manissa) كە بە پارێزراو دا دەنرێت، دەگوێزرێنەوە، بێگومان ئەمانە دەبێ لەوێ شەری نەبوونیو بێبەشی بكەن، نەخشەی كردنەوەی چەند هەزار خانوویەك

لەویلایەتەکانی رۆژهەلات بۆ پەنابەرانی قۆقازی کە هەرگیز پێناچێ بگەنە جێ، دارێژراوە. (١٥٠) مامۆستا کە ئامادەکراون، دەنێردرێنە ناوچە کوردییەکانو، یانە تورکەکان، (ئۆجاغ) بۆ دروستکردنی نەتەوەیەکی شیاو لە کوردەکان بەکار دەهێنرێن. بەلام ئەبێ وا دابنێین کە ئەم رێو شوێنانە تەنها لە قەراغەکانی کوردستان جێبەجێ دەکرێن. رەنگە پشکنیاری گشتی لەدیار بەکر تەواو سەلامەت بێ، بەلام حالەتەکە لەناوجەرگەی کوردستاندا، جیا دەبێ. ئابلۆقەی توندی سەرگەشتەکانو، هێرشی یەك لەدوای یەکی یاخییان بۆ سەر بایەزیدو، ئەوڕاستیەی کە نزیکەی نیوەی سەربازان لە کوردستاندان، ئاشکراو بەلگە نەویستن، پێدەچێ کێشەی کورد بۆ ماوەیەکی درێژتر لای ئێمە بمێنێتەوە.

٣ـ کۆپیی ئەم نووسراوە بۆ بریکاری کۆمیساری بالا لە عیراقو بالوێزی خاوەنشکۆ لەتاران دەنێرم.

ئار. ئێچ هۆر

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٧/٤٢٤، ل: ١١٨–١١٩، ژ:٦٣

## ژ: ٤١

## لەمستەر هۆرەوە بۆ سێر ئۆستن چامبرلەین ( ١٢ی کانوونی یەکەم گەیشتووە )
## (ژمارە: ٦٠٧ )

**قوستەنتەنییە، ٧ی دیسەمبەری١٩٢٧**

**گەورەم،**

ئامـاژە بەنووسـراوی ژمـارە(٥٨٨)ی (٣٠) تشـرینی دووەمـم، خۆشـحاڵم پێتـان ڕابگەیەنم کە پشکنیاری گشتی تازەی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات، دەبێتە سوپەر-والی و، جگە لە دەسەڵاتی ئاسایی بەسەر جەندرمەو پۆلیسدا، هێزە سەربازییەکانیش بەر فەرمانی دەبن. هێزە سەربازییەکانی سنووری دەسەڵاتی ئەو،بۆ بـاری ئاسـایی کـەم دەکرێنــەوە، بــەڵام جەندرمــەکان دەکرێنــە دوو ئــەوەندەو، ویلایەتــەکانی ئەلعـەزیز(خـەرپووت)، ئورفـە، بدلیـس، هـەکاری، سعرت، مـاردین، وان و دیاربـەکر، هەرێمی ئەو دەبن. ئەمەیش ئەوە دەگەیەنێ کە بەشی باکووری ناوچـەی نائـارام لـە سـایەی فـەرمانڕەوایی سـەربازیدا دەمێنێتـەوە. هاوکـات ئەنجومـەن یاسـایەکی دەرکردووە کە یەکەم:ڕێ بە ڕاگوێزراوەکان دەدات بگەڕێنەوە بـۆ خـاکی خۆیـان و، دووەم: مۆڵەتی سێ مـانگ بـەیاخییان دەدات بێنـەوە بـۆ ناوخێزانـەکانیان. مستەر ماتیۆس لەتەرابزونەوە ڕاپۆرتێکی لە بارەی ڕاگوێزانەوە ناردووەو، دەڵێ: ژمارەیـان تەنها (١٥٠٠) کەسە کە هەموویان ژن ومناڵ و بنەماڵەی ئاغا وبەگە کوژراوەکانن.

٢- ئـەم سیاسـەتە نوێیـە، بـەکردەوەی ئاشـت بوونـەوە (مصالحـە) کـەیدا وادەردەکەوێ، داننانێك بێبەوەدا کە ئـەو دڵڕەقـی و بـێ ڕەحمییـەی پێش ئێسـتا، نوشوستیان هێناوە.پێـم وایـە دەست نیشـانکردنی شـوکری قایـا بـەگ بـۆ پۆسـتی وەزیـری نـاوخۆ، کـەتا درەنگـانێك زیـاتر خـەریکی کاروبـاری دەرەوە بـووە وەك لەناوخۆ، بۆئەوە یەکە کەمێك ژیریی سیاسیانە لە بەڕێوەبردنی کاروباری کوردستاندا بخرێتە گەڕ. (٥)ی ئەم مانگە شوکری قایا بەگ ڕێو شوێنە تازەکـانی لـە ئەنجومـەن

ئاشکرا کردو، جەختی لەسەر ئەوەکردەوە کە یاخی بوون لە ناوچەی پشکنیاری نوێدا تەنها هێرش و پەلاماری ڕەشەوڵاغ بوون وهیچیتر. ڕژێمی دەرەبەگایەتی سەرکوتکراوەو، ئێستایش کاتی ئیدارەیەکی ئاساییتر هاتووە. بەردەوامیی ڕژێمی سەربازی، نیشانەی لاوازییە. ئێستا شتەکان ئاسایی بوونەتەوە، بەلام پێشبینی کێشەی تر لە بەهاردا دەکرێ. هەنگاوە تازەکان قۆناغی گواستنەوە بوون لەنێوان یاخیبوون و تەواو ئاسایی بوونەوەدا.

٣- (٥)ی ئەم مانگە، جێگری وەزیری کاروبارەکانی دەرەوە سەرنجە جێی بایەخەکانی خۆی لەسەر ئەم سیاسەتە تازەیە بۆ مستەر هێلم دەربڕی. وتی: حکومەت بڕیاری داوە حوکمی عورفی هەڵوەشێنێتەوەو، ئێستا زیاتر سەرقاڵی جێبەجێکردنی سیستمی نوێی کارگێڕییە. ناوبراو نەیدەتوانی هیچ وردەکارییەکی هێشتا بڕیاری لێنەدراوی مەسەلەکە، بدرکێنێ، بەلام بەقسەی ئەو: ئیبراهیم تالع بەگ دەبێتە فەرمانڕەوای گشتیی ویلایەتەکانی ڕۆژهەلات و، دەسەلاتێکی یەکجار فراوانی دەبێ. ئەو کەسێکی تواناو لەسەرخۆیەو، کاتی خۆی پزیشکی سەربازیو، دواتر دیپلۆمات بووە. سیاسەتی ڕاگوێزان، ئەبێ دەستکاری (تعدیل) بکرێو، گۆڕانەکانی ئایندەیش بۆ تورکیاو عیراقی هاوسێی خوارووی ڕۆژهەلاتی بەسوودبن. ئەو نەیوت ئابلۆوقەی گەشتکردن بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژهەلات خێرا هەڵدەگیرێ، بەلام درەنگو زوو کەوتووە. تورکیا گیرۆدەترین لایەنی ئەم بنەمایانەیە کە دەمێکە زاڵن. حکومەت سوورە لەسەر کۆنترۆڵی ڕێگەی تەرابزوون- بایەزید کە بایەخێکی ئابووریی بۆ تورکیا هەیە. ڕژێمی سەربازی زۆر باشە، هەرچەندە، ئەو پێیوایە، کارە باشە لەژمارە نەهاتووەکانی لەلایەکەوە، هاوتای زیانەکانین لەلایەکی ترەوە. سەربازەکان بەهۆی مەشقەکانیانەوە زۆر بیرتەسکن.

ئار. ئێچ. هۆر

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٧/٤٢٤، ل: ١٢١، ژ: ٦٧.

## ژ:٤٢

## لە مستەر هۆرەوە بۆ سێر ئۆستن چامبرلین (١٩ی دیسەمبەر گەیشتووە)

ژمارە (٦١٨)

قوستەنتەنییە، ١٤ی کانوونی یەکەمی ١٩٢٧،

گەورەم،

زۆر بەدەگمەن ئەتوانرێ زانیارییەکی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات دەستبخرێ، بۆیە گرنگە راپۆرتێک لەسەر گفتوگۆیەک کە لەسەرچاوەیەکی بڕواپێکراوەوە زانیومە، بەرزیکەمەوە. رائیدێکی جەندرمە کە پشوویەکی کورتی لە دیاربەکرەوە وەرگرتبوو، بەهاوڕێیەکی وتووە: بێز لەو کارانە دەکاتەوە کە دەبوو بیانکات، دەیەوێ بگوێزرێتەوە، ئەو، بەدرێژاییی ماوەیی هێورکردنەوە کە لەویلایەتەکانی رۆژهەلات بووەو، کوشتو بڕی پیاوو ژنو منداڵ ماندووی کردووە، وڵات ئێستا تۆقێنراوەو، ئەگەر ئەوهێزە گەورە عەسکەریەی ئەوێ لابرێ، ئەوا هەرگیز ئارام نابێ، کوردەکان (٩٠٪)ی چەکەکانیان شاردووەتەوە.

٢ـ رائیدەکە درێژەی بەقسەکانی داوەو، وتوویەتی: لێکۆڵینەوەی لەگەڵ زۆر زیندانیدا کردووەو، بەتاوانی هاندانیان لەلایەن ئینگلیزەوە حوکمی داون، بەلام ئەوان هەمیشە ئەم تۆمەتەیان رەتکردووەتەوەو، وتوویانە ئینگلیزیان خۆش دەوێ، وەك خەڵکی عیراق لێی تێگەیشتوون، بەلام ئەوان هانیان نەداون، بەڵکو، بەر لە هەموو شتێ، ئەوان چەکیان دژی حکومەتی عیلمانیی ئێستای تورکیا هەڵگرتووە.

٣ـ ئەگەر هەڵسەنگاندنی رائیدەکە بۆ عەقڵییەتی کورد لەراستییەوە نزیك بێ، ئەوا ئیحتیمالو پێشبینییەکەی شوکری قایا بەگ بۆ گێڕانەوەی باری ئاسایی بۆ ویلایەتەکانی رۆژهەلات (بڕوانە راپۆرتی ژمارە (٦٠٧)ی (٧)ی ئەم مانگەم) کزن.

ئار. ئێچ. هۆر

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٧/٤٢٤، ل:١٦٥، ژ٧٢

## ژ: ٤٣

## لە سێرجی. کلارکەوە بۆ سێر ئۆستن چامبرلەین (١٦ کانوونی دووەم گەیشتووە)

**(ژمارە: ١٧)**

**قوستەنتەنییە، ١١ی کانوونی دووەمی ١٩٢٨**

**گەورەم،**

پێتان رادەگەیەنم: حکومەتی تورکی بۆ درێژەدان بە سیاسەتە نوێیەکەی کە لە نووسراوی ژمارە(٦٠٧)ی (٧)ی مانگی رابردووی مستەر هۆردا هاتووە، ناوی (٧٨١)کوردی ڕاگوێزراوی بڵاوکردەوە کە ئێستا ئەتوانن بەماڵ و مناڵەوە بگەڕێنەوە. بۆ ماڵەکانیان لەویلایەتەکانی بایەزید، مەلاتیە، ماردین، ئورفە، سعرت، ئەرزنجان، بدلیس، ئەرزرۆم، وان و دیاربەکر. زۆرکەم لەمانە، وەك ئەفسەرو سەرۆکی شارەوانی و نوێنەری زووترو، هەندێکیشیان وەك نەوەی سەرتیرەکان، ناویان لەم لیستەیەدا هاتووە.

٢- ئەزانم ئەم سیاسەتە نوێیە، بەهۆی بزووتنەوەیەکی رەخنەگریی ناو پارتی گەلەوە، بەسەر عیسمەت پاشادا سەپێنراوەو، لەسەرنجەکانی شوکری قایا بەگەوە بۆ وەزیری دادی عێراق دەردەکەوێ: وەزیر خۆی باوەڕی بەم سیاسەتە نەبێ کە پێویستە جێبەجێی بکات. سیاسەتی پێشووی سەرکوتکاریی، بەپێی راو بۆچوونی دەرەوەی دامودەزگاکانی حکومەت، کوردی بەجۆرێك بێزار کردووە کە ئەم سیاسەتە تازەیەی ئاشتبوونەوە ئێستا سەرنەگرێ. هەندێکیش پێیان وایە سەرکوتکردن دەسەڵاتی حکومەتی، بەپێچەوانەی زووەوە، بەسەر کوردەکاندا بێهێز کردووە. دەڵێن کوردەکانی دەرسیم، لە هەر کاتێکیتر زیاتر، لە کۆنترۆل دەرچوون. هاوکات ئەنجومەن دەنگی لەسەر تەرخانکردنی (١٥٠٠٠٠٠) لیرە بۆ زیادکردنی ژمارەی جەندرمە لە ویلایەتەکانی رۆژهەلات داوەو، ئیبراهیم تاڵع بەگ کە وەك پشکنیاری گشتی موعجیزەی ئاشتبوونەوەی لە ئەستۆدایە، (٨)ی ئەم مانگە چوو بۆ دیاربەکر.

٣- کۆپییەکی ئەم راپۆرتە بۆ کۆمیساری باڵا لەبەغدا دەنێرم.

جۆرج. ئار. کلارك

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٨/٤٢٤، ل: ٣٠، ژ: ٨

ژ: ٤٤

## لە مستەر نۆکسەوە بۆ سێر ئۆستن چامبرلەین( ١٦ای نیسان گەیشتووە )

(ژمارە: ١٨٥)

ئەنگۆرە، ٩ی نیسانی ١٩٢٨

گەورەم،

خۆشحاڵم لێرەدا کۆپیی راپۆرتێکی کونسوڵی تەرابزوونی خاوەنشکۆتان بۆ بەرزبکەمەوە کە تایبەتە بەگەڕانەوەی چەند سەد کوردێك، کەوا بەهۆی رووداوەکانی پێش‌وپاش یاخیبوونی ئاداری (١٩٢٥)ی ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتەوە راگوێزرابوون.

٢- گەڕانەوەی راگوێزراوەکان یەکەم بەرهەمی ئەو گۆڕانی سیاسەتەیە کە مستەر هۆر لە نووسراوی ژمارە(٦٠٧)ی (٧) دیسەمبەری پاردا پێی راگەیاندبوون. سێ‌مانگی رابردوو رۆژنامەکانی تورکیا لیستی (٢٠٠٠) ناوێکیان بڵاوکردەوە، کە مۆڵەتیان دراوەتێ بگەڕێنەوە کوردستان، ئەوانەی کە ئەم دواییە بەتەرابزووندا تێپەڕیون، دەشێ پێشڕەوی ئەو کۆمەڵە هەڵبژاردەیەی کوردە ئەمەکدارەکان بووبن. ئەو کوردانەی کە دەگەڕێنەوە، بەپێی راپۆرتەکەی مستەر ماتیوس، واتێبینی دەکرێ تەنها خەڵکی ئاسایی‌بن. ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێ کە من لە لێکۆڵینەوەی لیستە بڵاوکراوەکاندا هەستم پێکردووە، واتە: حکوومەتی تورکیا لە کاتێکدا دەیەوێ میهرەبانییەك نیشان بدات، هێشتا ئامادەنییە رێی گەڕانەوەی بنەماڵە رێبەرەکانی کورد کە بەدەرەبەگ ناویان دەباتو، بەکۆسپی راستەقینەی رێی جێگیرکردنی رژێمی کۆمارییان لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتدا ئەزانێ، بۆ کوردستان بدات.

٣- هاوکات تەنها نیشانەیەکی کەم هەن کە بەرنامەی هێورکردنەوە تا ئێستا ئەنجامی زۆر گرنگی بووبێ. بەم دواییە پشکنیاری گشتی لەگەڵ کارمەندە گرنگەکانی ناوچەی ژێر دەسەڵاتی خۆیدا لەماردین کۆبوونەوەو، بەپێی چاپەمەنیەکان کە کۆنفرانسەکەیان بەرز نرخاند: بڕیاری بایەخدار بۆ ئیدارەو پێشخستنی هەرێمەکانی رۆژهەڵات دراون. بارودۆخە راستەقینەکە هێشتا هەر

تەمومژاوییەو، ئـەو راپۆرتانـەش کـە دەگەنـە دەسـتم، بەکـەڵك نـین. هـەروەها هیـچ ئاماژەیەکی هەڵگرتنی ئابڵووقەی هاتوچۆ، کەسێ ساڵە فوراتـی کردووەتـە سـنووری خاکی قەدەغەکراو، لەئارادا نییە.

جی. جی. نۆکس

* * *

## هاو پێچی ژ: ٤٤

## لەکونسوڵ ماتیۆسەوە بۆ مستەر نۆکس

**(ژمارە: ٢٩)**

**تەرابزوون، ٢٦ی ئاداری ١٩٢٨**

**گەورەم،**

وارادەگەیـەنن چـەندین کۆمـەڵو دەسـتـە کـورد، چـەند مـانگی رابـردوو، کـە بەرێوەبوون بۆ سەر خـاكو ئـاوی خۆیـان لەویلایەتـەکانی رۆژهـەلات، گەیشـتوونەتە ئێرە. دەڵێن یەکـەم دەسـتە دوا دواییـەکانی کـانوونی دووەمو، دوا کۆمـەڵ نزیکـەی هەفتەیـەك لەمەوبـەر، بەکەشـتیەکی هـەڵمیی کۆمپانیـای (Seir-I-Sefain) گەیـەنراون. واهەسـت دەکرێ ئەمانـە هـەموویان کەنزیکـەی (٤٠٠) کـەس بـوون، بەتەرابزووندا تێپەڕیبن. دەڵێن ئەو کوردانەی کە دەگەڕێنەوە بۆ نیشـتمانی خۆیـان، بەپێچەوانـەی ئەوانـەوە کـە سـاڵی رابـردوو بـەم شـارەدا راگوێـزراونو لــە راپۆرتـی ژمارە(٥٣)ی (٢١) نۆڤەمبەردا ئیشارەتم پێدابوون، لە خـەڵکی ئاسایین. هـەندێکیان هیچ سەرچاوەیەکی ژیانیان نییـەو نـاتوانن گەشـتەکەیان تەواوبکـەن، تـا حکومـەتی مەرکەزی مافی دابینکردنی خەرجی بەدەسەڵاتە خۆجێییەکان نەبەخشێ.

دەبلیوو. دی. دەبلیوو. ماتیۆس

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٨/٤٢٤، ل: ٦٨–٦٩، ژ:

٣٨

ژ: ٤٥

## لە سێرجی کلارکەوە بۆ سێر ئۆستن چامبرلەین-( ٢١ی مایس گەیشتووە)

(ژمارە: ٢٣٩)

### قوستەنتەنییە، ١٦ی مایسی ١٩٢٨

گەورەم،

ئاماژە بەنووسراوی ژمار(١٨٥)ی(٩) نیسانی مستەر نۆکس، پێم خۆشە پێتان رابگەیەنم (٧)ی ئەم مانگە ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانی یاسای لێبوردنی بۆ کوردە یاخییەکان دەرکرد، بەمەرجێ لەماوەی سێ مانگدا لە ویلایەتەکانی دیاریەکر، ئەلعەزیز، وان، بدلیس، هەکاری، ماردین، ئورفە، سعرت، بایەزید، مەلاتیەو سێ قەزای خنس[1] وکیغیی[2] وبەهەسنی[3] خۆیان بەدەستەوە بدەن. واتە یاساکە سەرجەم ناوچە کوردییە نائارامەکان دەگرێتەوە.

٢- ئەم هەنگاوە نەنراوە پێشبینی دەکرێ، وەك بەشێك لە بەرنامەی ئاشت بوونەوە، ئومێدی بەرچاوی لە پشتەوەن. وا راگەیەندرا کە ئیبراهیم تالع بەگی پشکنیاری گشتی گەشتێکی پشکنینی قەراغی باشووری ناوچەکە بەناو میدیاتو ماردینو جزیردا دەست. ئەمە، ئەگەر بتوانێ زیاتر بەرەو سەر بڕوات، کاریگەرتر دەبێ.

٣- کۆپییەکی ئەمە بۆ کۆمیساری باڵا لەبەغدا دەنێرم.

جۆرج ئاپ. کلارك

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٨/٤٢٤، ل: ٩١، ژ: ٦٠

---

[1] قەزایەکی باشووری رۆژهەڵاتی ویلایەتی ئەرزرۆمە.(س)

[2] قەزایەکی باشووری رۆژهەڵاتی ویلایەتی ئەرزنجانە.(س)

[3] قەزایەکی باشووری رۆژهەڵاتی ویلایەتی غازی عێنتابە.(س)

## ژ: ٤٦

## لە سێرجی کلارکەوە بۆ سێر ئۆستن چامبرلەین (٢ ی تەمووز گەیشتووە)
(ژمارە: ٣١٢)

**قوستەنتەنییە، ٢٦ی حوزەیرانی ١٩٢٨**

**گەورەم،**

خۆشحاڵم، ئاماژە بەنووسراوی ژمار(٢٣٩)ی(١٦) مایسم ، لێرەدا وەرگێڕدراوی ڕاگەیاندنێکی بڵاوکراوەی ئەم دواییەی پشکنیاری گشتیی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات، کە وەك ئاماژەیەکی تایبەت بەڕاگەیاندنی لێبوردن لەلایەن حکومەتی تورکیاوەو وەك زادەی ئەو یاسایەی کە (٩)ی مایس دەنگی لەسەردرا، بۆ بەڕێزتان بنێرم.

٢– ئەم ڕاگەیاندنە هەرکاتێك بێ، بەڵام بەتایبەتی ئێستا بایەخی هەیە، چونکە بۆ بێگانە نییە هەواڵی ڕووداوەکانی ڕۆژهەڵاتی فورات کۆبکاتەوە، لەبەرئەوەی وادیارە شتەکان وەك پێویست بەڕێوە ناچن. لێبوردنەکە زۆر سەرکەوتوو نەبوەو، تەنها کەمێك لەو کوردانەی کە بۆ ئەنادۆڵی ڕۆژهەڵات ڕاگوێزرابوون، لە شوێنە کۆنەکانی خۆیان نیشتەجێ بوونەتەوە. پێویستە ناڕازییەکان بەقسەی خۆش وایان لێبکرێ خۆیان تەسلیم بە دەسەڵاتی فەرمانڕەوا بکەن. ئەمەی دوایی، لەم بەڵگەنامەیەدا، دان نانێکی بێپەردەیە بەوەدا کە ئەگەر بەخشراوەکان لەئایندەدا جارێکیتر لەڕێ لابدەنەوە، ئەوا بەرەو ڕووی سزایەك دەبنەوە کە لەگەڵ قەوارەی تاوانی لێبوردن بۆ دەرچووی ئێستادا بگونجێ. بەم جۆرە قسانەدا دەردەکەوێ، ئاییندە جێی بڕوا نییە، بۆیە سەیر نییە کە وەزیری ناوخۆ دەیەوێ گەشتەکەی، وەك بەڵێنی دابوو، بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتی بکات، بۆ ئەوەی خۆی بارودۆخەکە هەڵسەنگێنێ.

٣–کۆپییەکی ئەم ڕاپۆرتەم بۆ کۆمیساری باڵا لەبەغدا ناردووە.

جۆرج ئاڕ.کلارك

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤/٢٦٩، ل: ٧، ژ: ٢

## هاوپێچی ژ: ٤٦ [١]

## ڕاگەیاندنێکی نوێی ئیبراهیم تالێ بەگ بۆ ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات

ئیبراهیم تالێ بەگی پشکنیاری گشتیی ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات ئەم بەیاننامەیەی بۆ دانیشتوان دەرکردووە:—

هاووڵاتیانی بەڕێز،

حکومەتی تورکیا کەئامانجی هەر ئەوەیە ببینێ دانیشتوان سەرگەرمی کاری خۆیانن، بێ ئەوەی دەستدرێژی بکاتە سەر شەرەفو ژیانو خێرو بێریانو وڵاتەکەی ببێتە مەڵبەندێکی پێشکەوتوو و دڵخۆشکەر بۆیان، لێبوردنی بۆ قوربانیانی نەفامیو ساویلکەیی دەرکردو، هەلی بۆ ڕەخساندن بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیانو بەئارامی بژین.

ئەو خەڵکانە کە لە ناوچەکانی ڕۆژهەڵات ڕاگوێزرابوون، گەڕاونەتەوە بۆ شوێنەکانی خۆیانو، هەموو مافو ئازادییەکی نیشتمانییان هەیەو، سەرجەم ئەرکەکانی هاووڵاتی جێبەجێ ئەکەن.

کۆماری تورکیا (٩)ی ئایاری(١٩٢٨) یاسای ڕاگرتنی ڕاوەدوونانی بەرپرسانی کاری توندو تیژیی ماوەی حوکمی عورفی تێدا ڕاگەیەندراوی ئەو ناوچانەی دەرکرد. گیراوەکان ئازاد کرانو، ئەو تاوانبارانەش کەمتمانەیان پێبەخشراوەتەوە، ئێستا هەموو مافو ئازادییەکی تایبەت بەگەلەکەیانیان هەیەو، لەئازادییەکی تەواودا دەژین.

جا حکومەتی کۆماری بۆ زیاتر فراوانکردنی ئەو بڕیارەی کە(٩)ی ئایاری (١٩٢٨) دەرچووبوو، بڕیارێکی تری لەپێناو ڕاگرتنی ڕاونانو دەستگیرکردنی ئەوانەی واهاندەری کاری توندو تیژی بوون، یان ئاگرەکەیان خۆشکردووە، دەرکردووە کە تا (٣٠) ئایاری (١٩٢٨) بێنەوە هۆش خۆیانو خۆبەدەستەوە بدەن. حکومەتەکەمان

[١] ئەم ڕاگەیاندنە فەرەنسییە.

ویستی لەڕێی ئەم یاسایەوە ئەوپەڕی پەرۆشیو سنگ فراوانیــی خۆی بۆ رۆڵـەکانی وڵاتەکەی بسەلمێنێ.

هاوڵاتیانی خۆشەویست،

ئەو ماوەیەی کە حکومەت بۆ ئەم لێبوردنەی کاری توندو تیژیی داناوە، سێ مانگەو، لە (١٤) ئاياری (١٩٢٨)ی رۆژی دەرچوونی ئەم بەیانەوە دەست پێدەکات. داواکارم لەو هاوڵاتییانەی کەخۆیان تەسلیم بە دەزگا تایبەتمەندەکان نەکردووە، سوود لەم دەرفەتە وەرگرن بۆ ئەوەی بگەڕێنەوە بۆ نـاو خێزانو ژنو منداڵـەکانیان کە چاوەڕێیان دەکەن. بێگومان بەهێمنی دەژیـنو، سـەرقاڵی کـارو پیشـەی خۆیـان دەبن.

پێویستە هەمووان دڵنیابن کــە کــەس، بــەهیچ شـێوەیەك، بـەگوێ رایـەڵیی فەرمانەکانی حکومەت ناگیرێو زیندانی ناکرێو سزا نادرێ. بەڵام ئـەبێ بشـزانن کـە سزای بچووکترین سەرپێچی یاسا، بەلە بەرچاوگرتنی هەڵەو کارە خراپەکانی پێشـتر بەخشراو، زیاد دەکات.

پێویستە هاووڵاتیانمـان خێرا بچنـە لای نـاوەندە بەرپرسـەکانو شـوێنی خۆیـان لـەتۆمارەکانی بـاری شارسـتانێتدا بچەسپێننو، بەمـەیش قــازانج لــەم ســەلماندنە تازەیەی میهرەبانیی حکومەتەکــەمان وەرگـرن. ئـەبێ هــەموو کـارێکی پێویسـت بـۆ رێکخستنی دۆسـیەکان، کـاتی داوای دادگاکـان یـان قازییـەکانی لێکۆڵینـەوە، تـەواو بکـەن، ئەمـەش بـۆ ئـەوەی بتوانن مافــەکانیان تــەواو وەربگرنــەوەو، ســەربەرزو شەرەفمەندانە لەتەك هاووڵاتییەکانی ترياندا بژین.

ئێمە، بـە تێکدانـی ژیـان یـان رووخـاندنی مـاڵی هیـچ هاونیشـتمانییەك، هیچمـان دەست ناکـەوێ. کـاری لـەم جـۆرەش، شایسـتەی پیـاوی مـەردو شۆڕەسوار نییـە. ئـەرکی سەرشانی هەر هاووڵاتییەکی تورکیـا، لـەوەدا خـۆی دەبینێتـەوە کـە نـاو و یـادەوەریی سـەرۆك خـێزانێکی بـەڕێزو پیاوچـاك، ئـەويش خزمــەتی ســوودبەخش لەنیشتمانەکەیدا کە تورکیایە، بەبنەماڵەو مناڵەکانی ببەخشێ.

بەم جۆرە، لەجیاتی گرتنە بەری ڕێگای پیلانگێڕیی کەسانێکی دیاریکراو، هەوڵبدەن بەخاوەندارییی کێڵگەی کشتوکاڵیو خانوو ومالّ خۆتان دەولەمەندو ماڵو منالّتان بەختیارو خۆشگوزەران بکەن. باشترین شت مرۆڤ بتوانێ لەم جیهانەدا بیکات، ئەوە نییە کە ئەوەی هەیە بیپووخێنی، بەڵکو ئەوەی نییە دروستی بکاتو بەرهەمی بێنێ.

پشکنیاری گشتی

ئیبراهیم تالّع

وەزارەتی دەرەوە،٢٦٩/٤٢٤،ل: ٨–٩، ژ: ١/٢

## ژ: ٤٧

## لەسێرجی. کلارکەوە بۆ لۆرد کوشندەن (٢٠ ی ئاب گەیشتووە)

ژمارە: ٢٨٤

قوستەنتەنییە، ١٤ ی ئابی ١٩٢٨

گەورەم،

خۆشحالّم، ئاماژە بەڕاپۆرتی ژمارە( ٣١٢)ی (٢٦) حوزەیران،م ئاگادارت بکەمەوە کە کاربەدەستانی حکومەت لە ماردین، بەپێی هەواڵێکی چاپەمەنیەکان، پێشوازیی خۆ بەدەستەوەدانی شێخ عەبدولڕەحیمو شێخ مەهدیی برایانی شێخ سەعیدی ڕێبەری سەرەکیی یاخیبوونی ١٩٢٥ یان کردووە. دەڵێن ئەم دوو سەرکردەیە بەپێی مەرجەکانی لێبوردنەکە بەخشراونو، مۆڵەتیان دراوە بگەڕێنەوە بۆ ماڵەکانیان.

٢– سەختە لێرە حوکم لەسەر بایەخی ئەم ڕووداوە بدەین، بەلّام دیارە ئەمە دەستکەوتێکی باشە بۆ بڕوای سیاسەتی ئاشتبوونەوەکە. هەروەها ئەگەر هەوالّەکە ڕاست بێ، ئەوا دەبێتە نیشانەی پێشکەوتنێکی ڕەوشتی سیاسی، چونکە سەردەمی

سوڵتانەکان ئەوانەی وا لە سایەی پەیمانی لێبوردنەکاندا خۆیان بەدەستەوە دەدا، هەمیشە لە دڵە راوکێدا بوون.

٣- ئیبراهیم تاڵع بەگی پشکنیاری گشتیی ناوچە کوردیەکان چەند رۆژێك لێرە بوو، پێدەچێ بۆ ئەوە بووبێ کەفەرمانی غازی لەم بارەیەوە وەربگرێ.

٤- ئیبراهیم تاڵع بەگ، لە وتووێژێکدا لەگەڵ کارهەڵسووڕێنی عێراق، وتی: بە سیاسەتی بەرامبەر بە کوردی عێراق تەواو دڵخۆشە. بەڵام سەبیح بەگ پێی وتم وەزیرەکان هەموویان وەك شوکری قایا بەگی وەزیری ناوخۆ نینو، بروایان بەنیاز پاکییو کردەوەی عێراقو حکومەتی خاوەنشکۆ نییە. هەرچەندە پێی وابوو غازی بروای بەئەمەكو دڵسۆزی ئێمە هەیە.

٥- وێنەیەکی ئەم نووسراوە بۆ کۆمیساری باڵای خاوەنشکۆ لەبەغدا دەنێرم.

جۆرج ئاپ. کلارك

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٩/٤٢٤، ل: ٢٠، ژ: ١٣

## ژ: ٤٨

## لە سێرجی کلارکەوە بۆ لۆرد کوشندەن( ١٢ ی تشرینی دووەم گەیشتووە)

**ژمارە: ٤٨٤**

**قوستەنتەنییە، ٨ نۆڤەمبەری ١٩٢٨**

**گەورەم،**

لە تێبینیی ناوبەناوی چاپەمەنیەکانەوە دەردەکەوێ کە بەرنامەی لەمەڕ کوردی حکومەت، وەك لەڕاپۆرتی ژمارە (٣٨٤)ی (١٤) ئابمدا باسمکردووە، هەندێك سەرکەوتنی بەخۆوە بینیوە.

٢- کاربەدەستان بەدرێژایی هاوین بەردەوام ئەو خێزانانەیان بۆ کوردستان دەگێڕایەوە کە بۆ رۆژئاوای ئەنادۆڵ راگوێزراون. دواتر، وەك بەڕێزتان لە زانیاریەکانی بەغداوە ئاگادارن، دوو کوڕی شێخ سەعیدو برایەکی سەید تەهاو چەند

سەرکردەیەکی تری کوردی پەنابەر لە عێراق هاتوونەتەوە ئەم دیو سنوورو، خۆیان تەسلیمی دەسەڵاتدارانی تورکیا کردووە. گەشتەکەی باکوور تا ( وان و بدلیس)ی ئیراهیم تاڵع بەگی پشکنیاری گشتی، کە ساڵێك لەمەوبەر زۆر جێی مەترسی بووە، نیشانەیەکی تری باشتربوونی بارودۆخەکەیە.

٣- ئێستا راگەیاندنەکانی حکومەت، لەجیاتیی هێمنیو ئاسایی بوونەوەی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات، گرفتی دەستکەوتنی مامۆستاو پزیشكو کارمەندیتر کە بۆ ئەو ناوچانە بنێردرێن، باس دەکەن. درووستکردنی رێگەوبان بەشێکە لە چاکسازیی ژێرانەی دەستپێکراو. رێگەیەك ئێستا لە خەرپووتەوە، بەناوچەی دەرسیمدا، بۆ ئەرزنجانو، یەکێکیتر لەئایندەدا لەنێوان(ئۆڤاجك Ovajik[1] وخۆزات –Hozat )[2] دروست دەکرێن. پشکنیاری گشتی روونیکردەوە کە سەرجەم سیستمی نوێی رێگەوبان، سێ چوار ساڵی تر تەواو دەبێو، وان تەنها (٥) رۆژ لە ئەنگۆرەوە دوور دەبێو، ئەوە تەنها سەختیی کوردستان بووە کە هەمیشە بووەتە کۆسپو تەگەرەی رێی کارگێرانی تورکیا. کە رێگەوبان گەیشتنە رۆژهەڵات، ئیتر کورد باشتر کۆنترۆڵ دەکرێو، کارمەندانی تورکیش راستەقینەتر لە کێشە تایبەتەکانی هەرێمی کوردان تێدەگەن. هەڵبەت مافی موڵکایەتی یەکێکە لەو گرفتانەو، حکومەت بۆ چارەسەری ئەمە، بەنیازە زۆر پارچە زەوی بەسەر خێڵەکیەکاندا دابەش بکات.

٤- وێنەیەکی ئەم راپۆرتە بۆ کۆمیساری باڵای خاوەنشکۆ لە عێراق دەنێرم.

جۆرج ئار. کلارك

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٩/٤٢٤، ل: ٤٢، ژ: ٣٦

---

[1] شارۆچکەیەکی باکووری رۆژئاوای تونجەلیە.(س)

[2] شاری (تونجەلی) ی ئێستایە لە ناوچەی دەرسیمی باکووری ویلایەتی ئەلعەزیز (ئەلازیگ). (س)

**ژ: ٤٩**

**لە مستەر ئەدمۆندزەوە بۆ لۆرد کوشندەن( ٣ی کانوونی یەکەم گەیشتووە )**

**ژمارە: ٥٠٢**

**ئەنگۆرە،٢٦ی تشرینی دووەمی ١٩٢٨**

**گەورەم،**

خۆشحاڵم کۆپییەکی نووسراوی ژمارە (٤٩)ی (٢٠)ی تشرینی دووەمتان لێرەدا بۆ هاوپێچ بکەم کە لە کونسوڵی مەرسینای خاوەنشکۆوە سەبارەت بە هەڵاتنی میر لیوا حوسەین پاشا لە قەیسەرییەوە بۆ سووریا پێم گەیشتبوو. ئەم رووداوە کرابووە بابەتی راپۆرتی ژمارە (٤٥)ی (١٧)ی ئۆکتۆبەری حەڵەب بۆ کۆمیساری باڵا لە عێراق. مستەر مۆنك مەیسن وێنەیەکی ئەم راپۆرتەی دوایی‌ی یەکسەر بۆ نووسینگەی دەرەوە ناردبوو.

٢– کەزانیاریی مستەر چافی لەبارەی هەڵاتنی حوسەین پاشاوە بێبایەخ نەبێ، حەز ئەکەم سەرنجی بەرێزتان بۆ دوا برگەی راپۆرتەکەی رابکێشم. سەرەرای سەختیی هاتوچۆ بۆ رۆژهەڵاتی تورکیا بەهۆی کاری ئەو ئابڵوقەیەی ئێستاوە، بەرێوەبەرانی ناسەرەکیی بانکی عوسمانی کە سەرچاوەی هەمە جۆری زانیارییان هەیە، زیاتر شارەزای بارودۆخی ناوخۆن. بۆیە گرنگە زانیاریی لەم جۆرە سەرچاوەیەی بۆ چوون، کە لە نووسراوی ژمارە (٤٨٤)ی (٨)ی تشرینی دووەمی سێر جی. کلارکدا ئاماژەی پێکراوە، وەربگیرێ. بەپێی ئەم سەرچاوەیە ئەم سیاسەتەی حکومەتی تورکیا بەرامبەر بە کورد تارادەیەك سەرکەوتووەو، بەتورککردنی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات وردە وردە بەرەو پێش دەچێ. یاخیبوونەکەی شێخ سەعید کەسێ ساڵ لەمەوبەر هەرەشەی لە ئارامی‌و سەقامگیری حکومەتی تورکیا دەکرد، ئەمرۆ دەبێ تەنها وەك پەندێك بیبێتە بیرۆکەی نواندنێکی شانۆیی لە تورکیا و، ئەمەش بایەخی خۆی هەیە. رای چەند سیاسەتوانێکی کورد لە عێراق: کە کوردی ئەمرۆی تورکیا شکستی ئومێدبری خواردووە، بەشێوەیەکی گشتی دژی ئەو

بۆچوونە نییەکە، بەڕای حکومەتی تورکی: ئەو سیاسەتە لەوەیە سەربگرێ. ئەمە لە ڕاپۆرتێکدا کە دڵنیام بە بەڕێزتان گەیشتووە، باسکراوە، بەڵام کۆپییەك هەر هاوپێچ دەکەم.

وێنەیەکی ئەمە بۆ کۆمیساری باڵای بریتانیا لەبەغدا دەنێرم.

دەبلیوو. ئێس. ئەدمۆندز

وەزارەتی دەرەوە، ٢٦٩/٤٢٤، ل: ٤٧، ژ: ٤١

## هاوپێچی ژ: ٤٩

## لەکونسوڵ چافییەوە بۆ مستەر ئەدمۆندز

**ژمارە: ٤٩**

**مەرسینا، ٢٠ی تشرینی دووەمی ١٩٢٨**

**گەورەم،**

ئاماژە دەدەمە ڕاپۆرتی مستەر مۆنك مەیسنی کونسوڵی حەڵەب لەسەر هەڵاتنی میر لیوا حوسەین پاشای کوردی دوورخراوە لە قەیسەرییەوە بۆ سووریا کە چەند کۆپییەکی بۆ باڵوێزخانەی قوستەنتەنییەو ئەم کونسوڵخانەیەو، بەژمارە (٤٥)ی (١٧)ی مانگی ڕابردوویش، بۆ کۆمیساری باڵای خاوەنشکۆ لەعێراق نێردراون.

٢- دوو مانگ پێش ئێستاو کاتێك لە قەیسەرییە بووم، هەواڵی هەڵاتنی پاشایەکی گرنگی دوورخراوەی کوردم بیست کە پێم وایە ئەم کابرایە بووە.وادەردەکەوێ ڕانەکردنی دابێ، بۆیە ڕێگەی درابوو بەئازادی لەشاردا پەیمانی بێتوبچێ. ئەویش بۆ ئەوەی کە گومانی لێنەکرێ، بەشێوەیەکی نموونەییهەڵسوکەوتی کردبوو و،ئەمجا کتوپڕ سەد مەترێك ڕایکردبوو و، لەگەڵ دەستە هاوەڵێکی هەڵبژێردراودا ئەمجا کتوپڕ سەد مەترێك ڕایکردبوو و،

لەگەڵ دەستە هاوەڵێكی هەڵبژێردراودا بەسەركەوتوویی دەرباز بـوو بـوو. پێیـان وتم غازی زۆر لەمە تورە بـوو بوو و، وەك ناڕەزاییـەك، سـەردانە بڕیاردراوەكـەی بۆ قەیسەرییە راگرتبوو و، سەرۆكی پۆلیسی لەكار لادابوو.

٣- دەڵێن پێشتریش چەند كوردێكی دوورخراوە لـەم شارە، مۆڵـەتی چوونـەوە مـاڵی خۆیـان پێـدراوە. بەڕێوەبـەری بـانكی عوسمـانی كـە زووتـر لـە ئۆرفـە بـوو و، كوردباش دەناسێ، رای وایە كە كێشـەی راستەقینە لەكوردستاندا نـەماوەو، خێڵـە كوردەكان كە لەناوخۆدا ناكۆكن، هەرگیز ئێسـتا نـاتوانن یەكبگرنـەوەو، بـەرەنگاری بەتوركردن ببنـەوە. بـەڵام زانیـاریی لـەبارەی گرفتـی ئـەم دواییـەی كوردستانەوە نەبوو.

٤- بەڕێوەبـەری بانكەكـە ئەوەشـی پـێ وتم كـە باڵوێزخانەكـە دەیزانـێ. واتــە: ســەرجەم ئــەو كارمەندانــەی كــە تــورك نــەبوون، بــە بەڕێوبــەرو نیمچــە بەڕێوبەرەكانیشەوە، لە لقەكانی ناوچە سنوورییەكانی توركیا (ئـەرزڕۆم، بـایبورت، ئەلعەزیز، دیاربەكر، ئورفە، عەینتاب)ی بانكی عوسمانی لە كار لابراون.

ئەمجا وتی: سەرەنجام خەریكە كاری ئەو ناوچانەی بانكەكە كز دەبێ.

٥- ئەوەی وا حكومەتی تـورك بـاوەڕی پێیـە، یان دەیـەوێ وا لـە خـەڵك بكـات باوەڕی پێ بكەن، ئەوەیە كە: یاخیبوونی كـورد ئێسـتا كۆن بـووەو بەسـەرچووەو، ئەمیشیان لە نواندنێكـی پروپاگـەندەیی یـەكجار بێمانـای پـێرێ شـەوی كۆمـەڵێك شانۆكاری گەڕۆكی قوستەنتەنییە لە مەرسینا نیشان داو، منیـش بینیـم. ئـەم كـارە هونەرییە منداڵانەیە، یاخیبوونی شێخ سەعید بەچیرۆكێكی مێژوویـی شیاوی پـەندو عیبرەت دادەنێ. ئەمانە خانوویەكیان، لەنواندنەكەدا، بـۆ خنكـاندن دانـابوو و، وەك پێویسـت گاڵتـەیان بەنەریتـە رۆژهەڵاتییـە نامۆكـانی ئــەو یاخیبوونـە كۆنـە گاڵتــە جاڕانەیـە دەكـردو، قاقایـان لێـدەداو، كـاتێك كـە یاخیبوونەكـە بەچـەند لـەرزینێكی میلۆدرامی زیانی پێكەوت، لە خۆشـیدا هاواریـانكردو، دواجـار لاشـەی شـێخ سـەعید

(کەبەشاراوەیی داهێنانێکی فێڵاویی هیت رۆبنسن[1]، لەکەمەرەوە راگیرابوو)، بە بەرچاویانەوە بە سێدارەکەیدا هەڵواسرا. کاربەدەستان دڵخۆش بوون، کاتێك دییان گوند نشین‌و جوتیاران کە ژمارەیەکیان کورد بوون، لەناخەوە خۆبەخۆ بەم کارە رێکخراوە سانایە پێدەکەنین.

ئار.ئی. دەبلیو. چافی

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤/٢٦٩، ل: ٤٧-٤٨، ژ: ١/٤١

## ژ: ٥٠

## لە سێرجی کلارکەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن (١٥ ی تەمموز گەیشتوە)

**ژمارە: ٣٠٥**

**قوستەنتەنییە، ١١ی تەمموزی ١٩٢٩**

**گەورەم،**

خۆشحاڵم لێرەدا کۆپیی راپۆرتێکی مستەر هێلم لەمەڕ گەشتەکەی بۆ رۆژهەڵاتی تورکیا کە لەنامەی (٦)ی مایسی نووسینگەی سەرکاتبدا راگەیاندراوە، پێشکەشی بەرێزتان بکەم.

٢- لەیاخیبوونی ساڵی ١٩٢٥ی کوردەوە، بۆ بێگانە نییە بچێتە رۆژهەڵاتی فورات. بۆیە راپۆرتەکەی مستەر هێلم بایەخێکی زۆری هەیەو، ئەو ڕاستییەیش کە حکومەت مۆڵەتی گەشتەکەی داوەن نیشانەی بەرێزی‌و سەنگینییەتی لە ئەنکۆڕە. هەلومەرج بواریان نەدایە مستەر هێلم، کە گەیشتە دیاربەکر، مەبەستی سەرەکیی خۆی بۆچوونە رۆژهەڵاتی دوورتر جێبەجێ بکات. بەڵام منیش لەوەدا لە گەڵیدا

---

[1] هیت رۆبنسن– Heath Robinson نووسەرێکی کۆمیدیی بریتانی بووەو، ساڵی ١٨٧٢ لە لەندەن لەدایك بووە، لە خێزانێکی هونەرمەند بووە. رۆبنسن خاوەنی رێبازێکی تایبەتی نووسین‌و نواندن بووەو، کارەکانی هاوتای ئەوانی Rube Goldbergی ئەمریکین. ساڵی ١٩٤٤ کۆچی دوایی کردووە.
(http: //www. wikipedia . com / wiki / heath+ robinson)

یەکدەگرمەوە کەئەو ڕێگەیەی (دیاربەکر– مەلاتیە– سیواس– گیرەسون[1]) وائەو گرتیەبەر هەرچەندە دەکەوێتە ناوچەیەکی زۆر نزیکترەوە، ئەنجامی بەدەستهاتووی بەنرختری لەچاو هی ئەوپەڕی ڕۆژهەڵاتی تورکیادا هەبووە.

٣– مستەر هێلم دەڵێ جوڵانەوەی کورد، وەك حکومەت هەمیشە جەختی لەسەر دەکاتەوە، چیتر نەماوە. سەرانی کورد بەڕاستی بێهێزو کەم تین کراون. دەستکەوت هەرچەندە سلبییە، بەڵام شتێکە سوڵتانەکان هەرگیز پێی نەگەیشتوون، چونکە مەسەلەی کورد هەمیشە لەگەڵ ئەواندا بووە. بەڵام ئێستا کە حکومەتی تورکیا پێویستی بەکاری بنیاتنان و دامەزراندن هەیە، وەك پێشبینی دەکرا، وادیارە باش بەڕێوە ناچێ. مستەر هێلم پێی وایە گوشاری ئابووری و کشتوکاڵیی، ڕۆژهەڵاتی تورکیا هێندە زۆرە، بووەتە هەڕەشە بۆسەر بەردەوامی ڕژێمی ئەنگۆرە. ئەوە گەشتیارانی سەرلێداوی ئەو هەرێمە سەرسام دەکات کە حکومەتی تورکیا کەمتەرخەمە کەوا نایەوێ هەوڵی بەدەست هێنانی هاوکاری و ڕاوێژی بیانی بدات بۆ چاککردنی بەرووبوومی بێکەڵکی ئەو دانیشتوانە دوور لەیەك نیشتەجێیە.

جۆرج ئاڕ. کلارك

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧١/٤٢٤، ل: ٢٨، ژ: ١٠

---

[1] ویلایەتێکی باکووری تورکیایە لەسەر دەریای ڕەش، لە ڕۆژئاوای ویلایەتی تەرابزوونە.(س)

## هاوپێچی ژ: ٥٠

### سەرنج لەسەر گەشتێکی ٩-١٩٢٩/٦/٢٩ لە ئەنگۆرەوە بۆ حەڵەب، دیاربەکر، مەلاتیە، سیواس، کەناری دەریای ڕەش.

ئەو گەشتەی کە ئەمڕۆ تەواوم کردو، سەرجەم ناوەڕاستو ڕۆژهەلاتی تورکیای گرتەوە، کارێکی زۆری، لەچەند ڕوویەکەوە یەکجار ناکۆکی، کردە سەرم. هەوڵدەدەم یەکەمجار لەم تێبینیانەوە هەستو تاقیکردنەوەکانی ڕۆژانەی خۆم باس بکەمو، ئەمجا بەلەبەر چاوگرتنی هەموو شتێکو، پاش لێکۆڵینەوەی خێراو سەرپێی ئەو بارودۆخەی وا ئەمڕۆ باڵی بەسەر ویلایەتەکانی تورکیادا کێشاوە، دوا ئاکامەکان پوختە دەکەم.

٢- گەشتەکەم بە ئاگاداریو ڕەزامەندیی حکومەتی تورکیابوو و، بۆیە هیچ ڕێگرییەکم لەسەردانی ئەو ناوچانەدا، کە چەندین ساڵ بۆ بیانی قەدەغەن، نەهاتەڕێ. گەشتەکەم زۆر فراوان نەبوو، چونکە ڕێگەکانی تورکیا سەختو، هەندێکیان تەواو نالەباربوون، لەلایەکیترەوە، هەمان ئەم هۆیە، ڕووی ئەم وڵاتەی زیاتر خستە بەرچاو. ئەمە جگەلەوەی مانگی مایس باران لەسەرتاسەری تورکیادا، بەبڕێکی زۆرو نائاسایی، دەباری. جا لەبەر ئەمە، کێڵگەو لەوەڕگاکان لە باشترینو ڕێگەکانیش لە خراپترین باردابوون. دەسەڵاتدارانی تورک لە هەموو شوێنێك پێشوازیی گەرمیان لێکردمو هاوکارم بوون.

٣- لەئەنگۆرەوە بۆ حەڵەبو لەوێشەوە تا ماردین، بەشەمەندەفەر چووم. لە ئەنگۆرەوە بۆ حەڵەب، ئەوی شایەنی باس بێ، کەمی بەرڕوبوومە. ئەمە ئەو ناوچەیەبوو کە بەدەست وشکەساڵی ١٩٢٨ەوە زیاتر دەیناڵاندو، دەرەنجامەکانیشی تەواو ئاشکرابوون. کاربەدەستانی تورك خۆیان دانیان بەوەدانا کە ئەمساڵ تەنها (٢٥٪)ی ڕووبەری ئاسایی‌ی ناوچەکانی سەروو ئاستی ئاوەکان (دێم) چێنراون. ئەو

ناوچە داچێنراوانە بەرهەمیان باشە. قۆنیاو قارەمان[1] کە هەرێمێکی دەوڵەمەندی دانەوێڵەیەو دووساڵ لەمەوبەر بینیبووم، کشتوکاڵی باشی تێداکرابوو، ئێستا کێڵگەکان ئەبینرێن زۆر کەم بەرهەمن. بەچاوی خۆم قسەی نوێنەرێکم بۆ دەرکەوت: گوند نشینەکان، پاش ئەوەی سەرجەم ئاژەڵو ماڵاتەکانیان لەدەست دابوو و، دەرکیان بەوەکردبوو کە ئەبێ، بۆ خۆپاراستن لەبرسێتی، خۆشیان بۆ قۆنیاو شارۆچکەکانیتر کۆچ بکەن، گوندەکانیان هەموو چۆڵ کردبوو. کشتوکاڵو بەروبوومی باش تەنها لە ئەرەگلی[2] بەدیدەکرێن‌و، پێم وایە ئەمەیش بەسۆنگەی سیستمی پێشکەوتووی ئاودێرییەوەیە. خۆ ئەگەر ئەم سیستمە لە شوێنەکانی تر بخرایە گەڕ، بێگومان ئەمەش دەشێ، دەکرا لە کاریگەریی چوار وەرزی وشکی یەک لەدوای یەک زیاتر بەدوور بوونایە.

٤- تاریکی نەیهێشت دەشتی سیلسیا ببینم، بەڵام بۆ بەیانی کە چووینە سوریا، بەپیتیی خاکەکەو کشتوکاڵی چڕوپڕو ئەو ژمارە گەورەیەی خەڵک کە لە کێڵگەکاندا کاریان دەکرد، زۆر سەرسامیان کردم. فڕۆکەخانەیەکی فەرەنسی نزیک موسلیمییەیەو[3]، هەردوو جارەکەش سێ فڕۆکەم لەکاتی فڕیندا بینی.

٥- زۆر نیشانەی پێشکەوتن لەحەلەبدا هەن. شەقامەکان ، بەتایبەتی سەرەکییەکانیان، چاککراون‌و، دووکانەکان پڕ لەکەلوپەلن‌و، بژێوی ئاسانە. فەرەنسە لە دروستکردنی رێگاوباندا زۆر چالاکەو، ئەمەش وەک کارێکی خێرا بووەتە مایەی گەشەی وڵات. کونسوڵی خاوەنشکۆ، بە پێچەوانەی خەڵکەوە، پێی وانیە حەڵەب لەبەر نزیکیی لە سنووری تورکیاوە بێ ئومێد بووبێ. ئەو دەڵێ: بازرگانی وردە وردە گەشە دەکات. بەم دواییە، هێڵی ترانزێتیش، بەهۆی تێپەڕبوونی کەلوپەلی بێ باج هێنراوی ئەسکەندەرونە بۆ رۆژهەڵاتی تورکیا بەرادەیەکی بەرچاو

---

[1] قەزایەکی باشووری رۆژهەڵاتی ویلایەتی قۆنیەی رۆژئاوای تورکیایە. (س)

[2] قەزایەکی ئەوسەری باشووری رۆژهەڵاتی ویلایەتی قۆنیەیە.(س)

[3] شارۆچکەیەکی نزیکی باکووری شاری حەڵەبە.(س)

بووژاوەتەوە، هەرچەندە رەنگە ئەم بازرگانییە تەنها کاتی بێ‌و، لەگەڵ دانانی هێڵی ئاسنی دیار بەرکر- قەلەر (Keller)دا نەمێنێ، سەرەڕای ئەمە، مەرسینا موونافیسێکی بەهێزی ئەسکەندەروونەیەو، حکومەتی تورکیاش هانی ئالووێر لە بەندەرەکانی تورکیا دەدات، ئەمە، لەم حاڵەتەی ئێستادا، واتە گواستنەوەی درێژو گرانبەهای تری هێڵی ئاسن‌و، بەپێی سەرچاوە تورکییەکانیش، دواخستنی زیاتر، چونکە کاربەدەستانی فەرەنسی یان سوری بەهانەیان بۆ راگرتنی ئەو کەلوپەلانەی وا بەشەمەندەفەر لەمەرسیناوە بەناو حەڵەبدا بۆیان دەهێنرێن یان دەبرێن، دۆزیوەتەوە، لە ڕاستیدا بازرگانیی تورکیا لەڕێی حەڵەبەوە تاڕادەیەك وەك یەك لەنێوان ئەسکەندەرونەو مەرسینا دابەشکراوەو، ئەوی پێشوویان کەلوپەلی نێردراو ئەمیان هی هێنراوی زۆرە.

٦- بەپێی قسەی کونسوڵی خاوەنشکۆ لە حەڵەب، ئەلف‌و بێی نوێی تورکیا سنجەقی ئەسکەندەروونە بەرەو پێشتر دەبات، پڕوپاگەندەی تورکیایش، بە دڵنیاییەوە، بەم شێوەیە دەردەکەوێ، مستەر مۆنك مەیسن پێی وایە هیچ جۆرە پڕوپاگەندەیەکی ئیتاڵی لە دەڤەرەکەدا نییە.

سنووری سووریا

٧- هێڵی ئاسنی ڕۆژهەلاتی یەنیجە کەلە "چۆبان بەگ"[1]یەوە تا دەرباسییە[2] (نزیك ماردین) سنووری تورکیاو سووریا پێکدێنێ، لەدەست فەرەنسیەکاندایەو، هەرچەندە هێواشەو، ٤١١ کیلۆمەتری حەڵەب بۆ ماردین هەژدە سەعاتی دەوێ، باش بەڕێوەدەبرێت، وارگۆنی شەمەندەفەر پاك‌و خاوێنەو، جێی رەزامەندییە. لەلایەکی ترەوە، تورکان گلەیی ئەوەیان دەکرد کە فەرەنسیەکان هێڵە ئاسنەکەیان پشتگوێ خستووەو، چییان دەست دەکەوێ دەیبەن‌و، هیچ خەرج ناکەن، چونکە دەزانن ئەبێ، بەتێپەڕبوونی کات، بۆ حکومەتی تورکیای بەجێ بێڵن. ئەگەر پایز

[1] ناحیەیەکی باشووری ڕۆژهەلاتی ویلایەتی غازی عێنتابە لەسەر سنووری سووریا. (س)

[2] شارۆچکەیەکی سووریایە لەسەر سنووری تورکیا لە ئاستی ویلایەتی ماردین. (س)

خزمەتگوزاریی ئەو ئۆتۆمبیلانەی کەجێی نووستنیان هەیە، بگاتە نسێبین، لەوانەیە گەشتیاران ببزوێنێ، بەڵام سەفەر مایەی ماندوویی‌و بێزارییەو، گەرمەو، ناکرێ خەڵکی بۆهان بدرێ.

٨ـ خاکەکە لە موسلیمییەوە تا جەرابلوس سوورەو، بەدیمەن بەپیتە، کرێکاران (کە زۆربەیان ئافرەتن) زۆرن، بەڵام بەروبووم کز دیارە. هێڵە ئاسنەکە جارێکی‌تر لە "غۆبانی بەگ"دا دێتەوە ناو تورکیا، ئەفسەری گومرگەکە بەئەدەب بوو، بەڵام هاوکارەکەی کە تایبەت بوو بە پاسپۆرت، سەری لە ڤیزەکەم سوڕماو، دۆش داما، پاش ئەوەی چەند دەقیقەیەك پاسپۆرتەکەمی ئەم دیو و ئەو دیو کردو، ویستی (سەرەوژێر) چەند لاپەڕەیەکی، کە جگە لەڤیزەی تورکی هەموو شتێکیان تێدابوو، بخوێنێتەوە. داوای کرد شوێنەکەی بۆ بدۆزمەوەو، ئەوی نووسراوە بۆی بخوێنمەوە.ئەمجا لەوەیش زیاتر، نووسینی ناوەکەم لەلیستەکەیدا، بە هەزار بێنەو بەرە، نزیکەی دە دەقیقەیەکی تری خایاند.

٩ـ کاتێك لەجەرابلوس بەڕێی پردێکی بەهێزی ئاسندا لە فورات دەپەڕیتەوە، ئیتر ناوچە بەپیتەکە دوایی دێ،تا عەرەب پینار (Arappinar)[1]ی نزیك ئۆرفە، کەوا هەستدەکەم مەڵبەندی ناوچەیەکی گرنگی بەرهەمی دانەوێڵە بێ، جگە لە چەند رەشماڵێکی کوردان، شتێکی تر لەو زەوییە رووتەدا نابینرێ، ئەمە ئەگەر چی دەشتێکی بەپیت بەدرێژایی١٠ میل لێرەوە دەست پێدەکات.

هێڵەکە بە جێییەکدا تێدەپەڕێ کە لە بەراوی سەوزە دەچێ‌و، ئاوێکی زۆری هەیەو، رووەکی زۆری تەماتەیشم تێدا بەدیکرد، هەر لێرە، چەندین دێی لە قوڕ دروستکراو هەن‌و، خانوەکان لە شێوەی گومەزدان‌و، لە دوورەوە تەنها لە لۆدە دەچن.

١٠ـ هەر لەو کاتەدا واقم وڕما، کە لەبەری سووریای هێڵە ئاسنەکەدا، کە لەخەیاڵ دەچێ، کشتوکاڵی باشتر کرابوون‌و، ئاژەڵ‌و مەڕ، ماڵات‌و بەتایبەتی رەشەوڵاغ

[1] شارۆچکەیەکی باشووری رۆژاوای شاری ئورفەو لەسەر سنووری سووریایە. (س)

هەبوون، هاوکات تەنها مەڕم لەدیوی تورکیا بینی، دوای گوڵتەپە کە نە گرد هەیەو نە گوڵێك رووارە، هەرچەندە دەتوانرێ ئاوێکی باش لەبیرەکانی دەربهێنرێ، جگە لە وێرانە هیچی تر نییە، کەس تێیدا نە نیشتەجێ بووەو نە کشتوکاڵی کردووەو، بەدەگمەن زیندەوەرێکی تێدا دەبینرێ، تەنها سێچوار مەتر لە خوارووی هێڵەکەوە بێ کۆتا، بەردی سنووری دانراون کە تا لە شوێنێکی رۆژئاوای "رەئسولعەین"دا تاریك داهات، نۆسەدو سیو چواریانم ژمارد.

١١ـ گەشتی ناخۆشی ئەو چەند رۆژە، تەنها خۆراکێکی بەمێشکم دا: پاسەوانانی تورك لەسەرجەم بنکەکانو، جارجاریش لەنێوانیاندا دەبینران، گاردە فەرەنسیەکان لە پۆستێکی بەهێزی ئاقچەقەلعە بەدەر، لەجێیەکی تر بەدی نەدەکران، هەرچەندە ئەمیش ئەوە ناگەیەنێ کەلەوێ نەبوون. لەهەردوولای هێڵەکەدا تێبینی رێگە دەکرێو، ئەفسەرێکی تورکیش دانی بەوەدانا کەئەوەی بەری سووریا رۆژانە لە لایەن دوو لۆرییەوە بۆ ئامادەکردنی پۆستە فەرەنسییەکان بەکاردێت، بەلام هی دیوی تورکیا تەنها جارجار ئۆتۆمبیلێکی بەرەو ماردین پێدا تێدەپەڕێ. راستە تورکیا یەمەنی لەدەست داوە، بەلام سوپا هێشتا یەمەنی خۆی لەسنووری سوریا دا هەیە، زۆر کات خۆراكو پێداویستی بەناڕێکوپێکی دەگەنو سەربازانی تورکیش بەوەدڵیان ئاو دەخواتەوە باڵندە تەریوەکانی تاکە نیشانەی ژیانی جگە لەخۆیان، دەدەنە بەر گولله. گوێم لە ئەفسەرێك بوو، بە هاوولاتییەکی دەوت: نوێنەرەکان کە لە ئەنگۆرە خۆش بژینو، هەر مووچەیەکیان بوێ بە خۆیانی ببەخشن، کەی دەتوانن لەبرسێتیی ئەم سنوورە چۆڵەدا بژین!!!

١٢ـ سنوورەکە عەقڵ نایبڕێ. پێناچێ کێشەی ئەوتۆ لە رۆژهەلاتی ئاقچەقەلعەدا هەبێ، چونکە بەڵگەیەکی نیشتەجێ بوونی تێدا نییە، بەلام سنووری رۆژئاوای ئەم جێیە تەواو ناسروشتییە. گوندەکان کە تەنها ١٠٠ سەد یار لەیەکەوە دوورنو، دەکەونە هەردوو دیوی هێڵە ئاسنەکەوەو، دانیشتوانەکانیان یەك زمانو دابو

نەریتییان هەیە، لە دوو دەوڵەتی جیاوازدان. لەمەیش زیاتر، زەویەکە بەدرێژایی سنوور تەواو تەختە، ئەمەیش وا دەکات کاتی کێشەو ئاژاوە بەرگریی تێدا نەکرێ.

١٣. بەداخەوە بۆم دەرکەوت کە گێروگرفت لەماردین‌و دیاربەکر ماون. ڕۆژانە ڕووداوی بچووك سەرهەڵدەدەن. قاچاخچێتی بڵاوە. لە قاوەخانەیەکی دیاربەکر بتڵێك شەمپانیایان بەپێنج شلنگ دامێ. هەوڵەکانی تورکیایش بۆ کۆنترۆڵکردنی ئەمە، زۆر سەرکەوتوو نەبوون. دانیشتوانی هەردوو دیوەکە چەکدارن‌و، خێڵەکان زوو زوو پەلامار دەدەن‌و، کێشەی خوێن لە زۆر شوێندا لەناودایە. هەموو ئەو تورکانەی کە باسی سنوورم لاکردوون، ئەگەرچی دەڵێن ڕەنگە هەردوولا هەڵەیان هەبێ، زۆر بەڕەقی دواون. بێگومان پێدەچێ جۆرە ئاگربەستێك بۆ تاوو توێکردنی بارودۆخی ئێستای سنووری سوریا بێتەکایەوە.

ماردین‌و سنووری عێراق

١٤. ڕێگەکە لەبنکەی ماردینەوە، بەدرێژایی شەش میل، بۆ شارۆچکەیەکی تابلۆ ئاسای ژێر لوتکەی گردێکی قووچەکیی لەبەردی کلسی ساف پێکهاتووە، کە ماڵەکانی چین چین لەسەر یەك هەڵچنراون، ١٢٠٠ پێ بەرزدەبێتەوە. قەڵایەکی دێرین لە لوتکەی ئەم گردەدایەو، پێی دەڵێن: Shubha . باوەڕوایە ئەم قەڵایە بەمێژوو هی سەردەمی ڕۆم بێ‌و، عەرەبەکانیش بەزەبری هێز نەیانتوانیبێ بیگرن. کوردێکی بەتەمەن چاوساغی کردم بۆ قەڵاکەو، بەخۆشییەوە دەیگێڕایەوە چۆن کاتێ ئیمانداران گرتوویانە، شازادە مەسیحیەکە لە جێی بەرگریی سەر قەڵاکەو فڕێدراوەتە خوارەوەو، پاشان براوە بۆ شاخێکی چەند میل دوورتر. شوێنەکەوتووانی ئەم شازادەیە هەموویان یا بەشمشێر لە ناوچوون، یاخود بەسەر دیوارەکاندا خراونەتە خوارەوەو مردوون. ئەمجا دەمێکی تەقاندو، وتی: چارەنووسێکی شیاوبوو بۆ هەموو گاورەکان. کەتەنیابووم پشوویەکم دا، بەڵام هەرزوو خزمەتکارە تورکەکەم هاتەلام‌و، لێی تێکدام.

١٥- دانیشتوانی ماردین نزیکەی ٣٠ هەزار کەسن و، هەشت هەزاریان یەعقووبیی سوورین کە پاتریارکەکەیان لە ماردینە، (٢٠٠) نەستۆری و (١٢٠) پرۆتستانت و، (١٠٠٠) یشیان کاتۆلیکی ئەرمەنین. هەروەها والی پێی وتم دانیشتوویەکی زۆری مەسیحی لەمیدیات دەژین و، زۆرینەی دانیشتوان کوردنین، بەڵام زمانەکانی کوردی و عەرەبی لەهی تورکی زیاتر قسەیان پێدەکرێ. شارۆچکە کە پاک و خاوێنەو، خانوەکانی لەبەردن و، میوانخانەکەیشی لەسەروو ئاستی ناوەندیی ئەوانی تورکیاوەیە. شوێنەکە بەگشتی کۆنترۆڵ دەکرێ، چونکە ئەم شارۆچکەیە دەشتەکەی بەرەو باشوور گرتووەتەوە. چۆل " Chul " ی زوو کە ناوچەیەکی گرنگی بەرهەمهێنانی لۆکەو دانەوێڵە بوو، ئێستا بەروبوومەکەی تەنها بەشی ناوخۆ دەکات و، بووەتە لەوەڕگا. شەوانە، رووناکی پۆستێکی فەرەنسی، لەدووریی چەند میلێك لەمیوانخانەکەوە، دەبینرێ. پێیان وتم: نسێبین دوور ترو لەباشووری رۆژهەڵاتدا گیان ئەدات و، شارۆچکەیەکی تازەی سوری لەودیو سنوورەوە جێیگرتووەتەوە. ئەمڕۆ ماردین بۆی لواوە، چونکە قافڵەکانی بازرگانیی خوارووی رۆژهەڵاتی تورکیا، بۆ ئەوەی بگەنە هێڵی ئاسن، پێویستە بەوێدا بڕۆن. بەڵام بەدڵنیاییەوە، هەرکە هێڵی ئاسنی دیاربەکر تەواو بوو، ئەوا چارەنووسی ئەمیش وەك هی نسێبین دەبێ.

١٦. ماردین، دوا چارەنووسی هەرچییەك بێ، ئێستا بایەخێکی گەورەی سیاسیی هەیە، چونکە جیا لە بازرگانیەکەی، ناوەندێکی پێشکەوتوویشە کە تورکیا کۆنترۆڵی سنوورەکانی رۆژهەڵات، سوریا و عێراقی خۆیی لێوە دەکات. جێی سەرسوڕمان نییە کەتۆفیق هادی بەگی والی تورکێکی قوتابخانە نوێیەکەیەو، گەنج و توانایەو، تەواو قەناعەتی پێکراوە کە تورکیای تازە شتی باش دەکات. ئەوی تایبەتبێ بەویلایەتەکەی، ئەوەیە کە چەند نیشانەیەکی رواڵەتیی گەشبینیم هەست پێکرد. نیزام و رێکوپێکی زۆر باشن و، دانیشتوان بەگشتی خاوێنن. خوێندەواری بەرەوپێش دەچێ و، شەقام دروست دەکرێ و، یەکێك لە شتە سەیرەکانی تورکیا، لە هەموو

لادانێکی ڕێگە سەرەکیەکاندا، هەرچەندە کەمن، تابلۆی ناوی شوێن‌و دوورییەکانیان دانراون. بەڵام هەرکەس بێتە شارەکە، یان لێی دەربچێ، لەجێیەکی تری خۆرهەڵاتی فورات رادەگیرێ‌و داوای ناسنامەی لێدەکرێ‌و، کۆنترۆڵی سەربازیش ئاسان دەرکی پێدەکرێ. لەگەڵ ئەمەیشدا، تێبینیی ئەوەم کرد کە ئەفسەرەکان، تەنانەت لەو پارچە دوورانەدا، دیمەنێکی زۆر تایبەتیان هەیە. هەموو بەیانییەك ریش ئەتاشن‌و پووت‌و پشتێنەکانیان پاك دەکەنەوە. وام هەست دەکرد ئەمانە پەرۆشن تا بنەمایەك دابنێن. خۆ ئەگەر یەکێك لەمیش سەرسام نەبێ، لەو بەڵگەیەی پێشکەوتن رادەمێنێ کە فۆتۆگراف[1] لەهەموو جێیەکدا هەیەو، ماردین بووەتە ڤالنسیا [2]. فۆتۆگراف لەئەنادۆڵ زۆرەو، سەرەڕای بەهاکەیان، ئەوانە نەبن کە لە میدڵسێکس دروستکراون، هەرگیز شتی وام لە سەرتاسەری تورکیا بەدی نەکردووە.

١٧. تۆفیق هادی بەگ، وەك هەرکەسێکی تر، بەهەستێکی زۆر، بەڵام بەگیانێکی ملکەچانەوە، باسی سنووری سوریای کردو، دانی بەوەدانا کە ئەمە لەم بارەی ئێستادا شتێکی حەتمییەو، بەچارەیەکی هەمیشەیی دانەنا. والی توانیی قسە لەسەر سنووری عێراق بکاتو، وتی ئێستا هەموو شتێك جێی رەزامەندییە (بڕوانە پاشکۆی أ)[3]. ئەو عێراقییانەی کە پەساپۆرتەکانیان رێکوپێکن، ئێستا دەتوانن بێ ئەوەی بچنە جەرابلوس، لەهەر خاڵێکی رەسمیی سنوورییەوە بپەڕنەوە. کۆچی خێڵەکانی ئەو دیو سنووریش کە لەگەڵ سوریادا گرفتی زۆری دێتە رێ، بەرێکوپێکیو بێ هیچ رووداوێك بەڕێوە دەچێ. ئەو خۆشحاڵبوو کە هەردوولا زیاتر متمانەیان بەیەك کردووەو، هیواشیی خواست هەرزوو بازرگانیی عێراق‌و تورکیا پەرەبسێنێ.

---

[1] گرامەفۆن.

[2] شارێکی گەورەی رۆژهەڵاتی ئیسپانیایە لەسەر کەنداوی ڤالنسیای سەر دەریای سپیی ناوەڕاست. (س)

[3] ئەم پاشکۆیە چاپ نەکراوە.

دیاربەکرو کوردستان

١٨. ڕێگەی ماردین بۆ دیاربەکر (پاشکۆی ب[١])، سەرەتا بەجێیەکی رووتەن و چۆڵدا دەڕوات، بەڵام ئەم ناوچەیە سەخت نییە. هەندێ دارو درەختی کورت لەسەر گردەکانن و، دۆڵێکیش کە ڕێگەکەی پێدا تێدەپەڕێ، داری تێدایەو کشتوکاڵیشی تێدا کراوە. جەندرمە جارجار دەبینرێ و، نیشانەی هاتوچۆی ماتۆڕیش بەدی دەکرێ. دەڤەرەکە لە نیوەی ڕێدا فراوان دەبێ و، کشتوکاڵیشی سەرکەوتووترە، بەڵام تەنها بەشێکی کەمی ئاسانە. پێناچێ قازانج لە دیجلە بکرێ، چونکە لێرەدا جێی هیوا نییەو، مرۆڤ دەتوانێ لێی بپەڕێتەوە. دواتریش ئاگادارکرام کە ناوچەیەکی فراوان کشتوکاڵی تێدا نەکراوە، چونکە کەسی تێدا نیشتەجێ نەبوە. پێیان وتم ئەوەی کە ئینگلتەرە پێی وایە بەرهەمێکی باشی گیا هەیە، نەچێنراوەو، دیارە ناشیدوورێتەوەو، ئەمەیش سەرسامی کردم. ساڵی رابردوو دەبوو بایی نزیکەی چوار ملیۆن لیرەی تورکی دانەوێڵە بهێنرێتە هەرێمی دیاربەکر کە ڕۆژانی پێش جەنگ ناوچەی ناردنە دەرەوەی دانەوێڵە بووە، کەچی ئەمساڵ سەرەڕای بارانی زۆر، ڕەنگە بەهۆی کەمی چاندنەوە بەروبوومی زیادەیان نەبێ. بەرهەمی سەرەکی جگە لەدانەوێڵە، بریتییە لەمەڕو بزن و خوری و پێستەو برنج.

١٩. دیاربەکر لە دووریی بیست کیلۆ مەترەوە دەبینرێ و، گەشتیار کە دەیگاتێ سەری لەدیمەنی دەسوڕمێ. پردێکی کۆنی ڕۆمەکانی دوو کیلۆمەتری باشووری شارۆچکەکە، سەرنجی مرۆڤ رادەکێشێ. ئەم پردە یەکێکە لەوانەی کە ئەمڕۆ لە ڕۆژهەلاتی تورکیا ماون و، ڕێگەی بدلیس بەسەر ڕووباری دیجلەدا دەبات. شارۆچکەکە کەوتووەتە بەرزایی ٤٠٠چوار سەد پێی سەرووی دیجلەوەو، باخچەی لێژاییی خوار دیوارەکانی جێی سەرنجە. کاتێك دەگەیتە دیوارە لەبازڵتی ڕەش دروستکراوەکان، ئیتر شارۆچکەکە نابینرێ. بەڕاستی، سیفاتی زۆرن. ئەگەرچی حەزم نەدەکرد تێیدا بمێنمەوە، بەڵام پاش دوو ڕۆژ مانەوە یەکجار سەرنجی

ڕاکێشام. ئەم لەسەرجەمی ئەو شارۆچکانەی تری تورکیا کەبینیومن، تەواو جیاوازەو، پێناچێ شێوەی بۆ چەند سەدەیەك گۆڕابێ. بەپێی قسەی والی، هەرچەندە بەدێی کوردان دەورەدراوە، بەڵام کورد لەناوەوەی دیوارەکاندا نییە، پێدەچی ئەمەش زیادە ڕۆیی بێ. ئەم شارە، بەپێچەوانەی ڕاپۆرتەکانی پێشووەوە، کێشەو تەنگو چەڵەمەکانی سالانی ڕابردوو زیانیان لێ نەداوەو، جگە لە دەروازەی باکوور، یان (ئەلعەزین)، دیوارەکان وەك خۆیان ماون. بەداخەوە کاولکارییو دەروازەی سەروو سەرەتای کۆتاییە، چونکە پێیان وتم دیوارەکان بۆ دروست کردنی خانوو ورێگە بەکار دەهێنرێن. ئەم وێرانکردنەی شوێنەوارەکان تاوانە. بەلام وادیارە نارەزایی قازانجی نییە. شەوانە دەرگاکان داناخرێن، بەڵکو بەوردی پاس دەکرێن.

٢٠. ئەم شارە لە ناوچەیەکی بچووکتردایەو، لە ژمارەی دانیشتوانیشدا لەدوای ماردینەوەیە، کەچی پیسو چەپەڵ دیارە. شەقامەکان خراپ قیرتاو کراون. دووکانەکان، ئەگەرچی شتی زۆرو باشیان تێدایە، بەلام بچووكو پیسن. خانوەکان لەسەر شەقامی تەسکنو، دیوارەکانیان بێ دەرگاو پەنجەرەنو، ناخۆشن. بەلام ناوەوە زۆر جیاوازە. ئەوانەی کە بینیمن، حەوشەی خۆشو پڕگوڵو گوڵزارو نافوورەیان هەیەو، دیوارو ناوفەرشی ژوورەکانیان بەردنو پاكو خاوێنن. وادیارە بژێویو خۆراکی خەڵکەکە باشنو، تەنها چەند سواڵکەرێك لەو ناوەدان.

٢١. سەرباز کۆنترۆڵی هەموو شارەکەی کردووە، چونکە دیاربەکر مەڵبەندی کارگێڕی سەرجەم ڕۆژهەلاتی فوراتی تورکیایە، بۆیە لە چەند روویەکەوە، دوای ئەنگۆرەو قوستەنتەنییە، بە گرنگترین شار دادەنرێ. تەنانەت هێزی سەربازی لەدەست پشکنیاری گشتیدایە. شەقامەکان پڕ لە ئەفسەرو سەربازنو، بەهۆی کارمەندێکی زۆری مەدەنیو خێزانەکانیانو خانەوادەی ئەفسەرانەوە کە لە قوستەنتەنییەوە هاتوون، خەڵك ڕەنگە بۆچوونێکی خراپی بۆ شوێنەکە لا دروست بێ. ئەمەیش لەوانەیە لەئەنجامی ئەوەوە بێ کە مانگی ڕابردوو کارەبای بۆ ڕاکێشراوەو، کارگەی سەهۆڵی تێدا دامەزراوە. بەم جۆرە، هێما ڕاستەقینەکانی

پێشکەوتن، بەدی دەکرێن. جا ئەگەر بۆچوونەکەم تەنها لەسەر دیاریەکر بنیات بنێم، ئەوا گەشبینیەك لەدەرەوە هەیەو، پێویستە بێ دوو دڵی بڵێم تورکیای نوێ کاری باش دەکات.

٢٢ـ زۆر رێی تێدەچێ شارەکە، بەدرێژایی زەویە بەرزەکە، بەرەو باکوور بکشێ. بەمەش بەسەر دیمەنی جوانیو بەپیتیو پڕ کشتوکاڵیی دۆڵی تەسکی دیجلەدا دەڕوانێ. دوو قوتابخانە لە لێژاییی دەرەوەی دیوارەکەدا دروستکراونو، دوو کیلۆمەتر دوورتریش فرۆکەخانەیەكو سێ دەستەی عەسکەرین. ئەو بەیانییە کە جێم هێشت، حەوت فرۆکەم لەئاسماندا بینی. هەروەها نەخۆشخانەیەکی تێدایەکە هێڵی ئاسنی قەلەر– دیاریەکری لەنزیکەوەیە، ئەمە جگە لە پارکێك کەنزیکەی ٢٠٠ دوو سەد یاردی چوارگۆشەیەو، بەتەلی دڕکاوی دەور دراوەو، سەکۆیەکی نواندنو مۆسیقا لەناوەڕاستیدایە. شەوی هەینی، تیپێکی عەسکەری ئاهەنگێکی رۆژهەڵاتیی لێرە پێشکەشکرد کە هەموو خەڵکی خۆشحاڵ کرد. مۆسیقاکە هێندە باش لێدەدرا، منیش، وەك ئەو ژمارە گەورەیەی ئەفسەرانی ئامادە، واقم ورما. زۆربەی ئافرەتان رووبەندیان پێوە نەبوو. دەشتێکی فراوان لەدەرەوەی دیواری رۆژهەڵات، بەرەو باشوورو رۆژهەڵاتیش، باخو باخاتو ئاوی زۆر هەن. دیسان هەر لێرە، ئاشی ئاردو برنج هەن، بەڵام هەموویان کۆنن؛ سەرەڕای ئەمە، ژمارەیان پێداویستیی ئامێرو کەرەستەیانیان قەرەبوو کردووەتەوە. زیاد لەپازدە ئاش ئەو ئاوە بەکاردێنن کە لە شارەکەوە بۆ دیجلە دێتە خوارێ. دووکارگەی ئاوریشمیی لە شاردان، بەڵام بایەخیان نییە.

٢٣ـ هەموو ئەو خەڵکە کارمەندو ناکارمەندانەی وا قسەم لە تەکدا کردن، کۆکبوون لەسەر ئەوەی کە باری ئابووری مەترسیدارە.ساڵی رابردوو هەموو شوێنێك کارەساتبار بووەو، پێشبینی لەوە خراپتریشیان دەکرد. سنووری سوریاو نەبوونی پەیوەندی، هەلومەرجەکەیان ئاڵۆزتر کردووە، خۆشبەختانە بارودۆخەکە ئەوەندە بەخراپی نەماوەو، ئەگەر، بۆ نموونە، بازرگانیی لەگەڵ عیراقدا پەرەی

پێبدرێ، ئەوا شتەکان باش دەبن، ئەمڕۆ بازرگانی لە دیجلەوە ناکرێ، کەچی بەرلەجەنگ هەمیشە بەلەم هاتوچۆی پێدا دەکرد.

ساڵانی داهاتوو، رێگەی نوێی ئاسن قازانجی بۆ ئەم مەسەلەیە دەبێ، بەڵام هێشتا زۆری ماوە یەکەم شەمەندەفەر بگاتە دیاریەکر.

٢٣ . دەمویست لەدیاریەکرەوە بۆ بدلیس و لەوێوە بە دەریاچەی وان و قەرەکۆسە[١]دا بچمە ئەرزرۆم، بۆ ئەمەیش مۆڵەتی پێویستم لە ئەنکورە وەرگرتبوو رێگەکە راستەوخۆ بەوناوچانەدا دەیبردم کە ساڵانی رابردوو جێی کێشە بوون. ئەم رێگەیەش گرفتی زۆربوو، بەڵام گرنگییەکی یەکجار زۆری دەبوو. تەنانەت لە ماردین گومانم لە جێبەجێبوونی ئەمە دەکرد، والی ساردی کردمەوەو، هەروەك ئەو ئەفسەرو شۆفێرانەی کە لێم پرسیبوون، پێی وتم: بارانی خوڕ رێگەی ئەو دیو دەریاچەی وانی تەواو تێکداوە، بەداخەوە کە لە دیار بەکرەووم پشکنیاری گشتی لەوێ نەبوو، بەڵام مومتاز بەگی جێگیریم بینی. ئەمیش هەر دووپاتی کردەوە کە رێگەکە تەواو سەختە. ئەمتوانی تا بدلیس، یان تەنانەت ئەرجیش بەئۆتومبیل و، پاشان بەئەسپ بڕۆم، جالەبەرئەوەی ئەو هەرێمانە بەگشتی هێمن بوون، ئەو بەچوونم ناڕازی نەبوو. لەگەڵ ئەمەیشدا رێیتێدەچوو، ئەگەر پاسەوانیشم لەتەکدا بوایە، تووشی هەندێ مەترسی بهاتمایە، چونکە بەداخەوە ، پێشبینی رووداوی بچوك دەکرا، بۆیە ئامۆژگاریی کردم رێگەیەکی تر بگرم، منیش زۆر بەمە ناڕازی نەبووم، هەروەها لەبەر ئەوەی زانیاریی تاڕادەیەك باشم هەبوو، بڕیارم دا شوێن قسەکانی مومتاز بەگ بکەوم، بە ئەلعەزیزو مەلاتیەو سیواسدا، بچمە دەریای رەش و، ئەرزرۆم کە ساڵی پار کونسوڵی خاوەنشکۆ لە تەرابزوون سەری لێدابوون، واز لێ بێنم. بەم جۆرە توانیم چەند شتێك لە ناوەڕاستی تورکیا ببینم و، پێشدەچێ لەوەی کە لە دەستم چووە، زیاترم دەستکەوتبێ.

---

[١] قەزایەکی رۆژاوای ویلایەتی بایەزیدی رۆژهەلاتی تورکیایە. (س)

٢٤ـ بێگومان ئارامی باڵی بەسەر ڕۆژهەڵاتی فوراتــدا کێشـاوەو، ئاشکرایشـە ئـەم هێمنییە پشت ئەستوورە بەهێز. بەشی گەورەی سوپای تـورك لـەو هەرێمانەدایەو، سروشتی شاخاویی ناوچەکەو دووریی نێوان شارو گوند، وا لـەمرۆڤ دەکـەن ئاسـان دەرك بـەو تەنگوچەڵەمانـە بکـات کــە تورکـەکان بـۆ دامرکاندنــەوەی یـاخیبوونو چارەکردنی ئـاڵۆزیو نائـارامی هاتووتـە ڕێیان، یــەك لـەو چەکـە گرنگانــەی کـە بەکارهاتوون، ڕاگوێزانی بنەماڵە بەهێزو دەوڵەمەندەکانی کورد بووە. هەندێك لەمانە لەسایەی لێبوردنـدا گەڕاونـەوە، بــەڵام ســەرجەم موڵــكو ماڵیـان لـەم پرۆسـەیەدا لەدەستداوە.

پێشییان وتم: ئەمڕۆ تاکە کوردێکی دەوڵەمەندو بەهێز. لە کوردستانی تورکیـادا نییە.

٢٥ـ یەکەم هەنگاو چەککردنی گوندنشینەکان بووە. ئـەم بەرنامەیـە چـوار سـاڵە لەئارادایـە، بـەڵام هێشـتا چـەك زۆرەو، بـۆ ئەمـەیش گلـەیی لــە سـنووری سـووریا دەکرێو، چەتـەیش جارجـار ڕوو دەدات، هێشـتا ناوچـەکانی مـووشو بایـەزید هێـور نەبوونەتـەوە. گرنگـە بیسـتنی هـەندێ لەئەفسـەرەکان بـەزەییان بـــەو گوندنشـینە چارەڕەشـانەدا، کـە دەڵێـن بەکولەمـــەرگی دەژیـــن، دێتـــەوە. ســاڵانی شــەڕو بــێ سەروبەرەیی وڵاتیان وێران کردووەو، ئیتر ئەمانیش دەبێ یا چەتەیی بکـەن، یـاخود لەبرسـاندا بمـرن. بۆیــە ئەمانــە زۆرجــار، لـەبێ هیواییـدا، ناچـار دەبـن تەقەلـە جەندرمەیەك بکەنو کاروانێك تاڵان بکەن، هەرچەندە دەشێ دواییش تووشـی سـزای توونـد ببن. دڵنیایان کردمەوە کە ئەمە ئاکامی گشتیی بـێ سـەرەو بـەرەیی ئێسـتای ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتەو، منیش پێم وایە ڕاست بێ.

٢٦ـ ئەوی مایەی. خۆشحاڵییە، لێرە بەرنامەیەکی بنیاتنەر هەر کە ئەگەر پـێڕەو بکرێ، دەشـێ سـەرکەوتووبێ، بنـەمای ئـەم بەرنامەیـە دروسـتکردنی ڕێگـەو بانــە، ڕێگەیەکی تازە لە دیاربەکرەوە بـۆ سعرت ڕاکێشـراوەو، ئـەم سـاڵیش تـا بدلیـسو، لەوێوە بۆ باکوور تەواو دەکرێ، دەڵێن بدلیس تەواو کاول بووەو، وانیش کەمێك لـەو

باشترە، کە لە دیاریەکربووم، ئیبراهیم تاڵع لە وان بوو. ئەویش، لەبەر ڕێگەکە، زۆر بەگران گەیشتبووە ئەوێ، ئاگاداریش کرامەوە کە گشت دەستەو دایەرەکەی، جگە لە جەندرمە، ورد پاسی ڕێگە سەرەکییەکانی ڕۆژهەڵاتی فوراتیان کردووە.

٢٧ـ جۆرێك ئاسایش لەئارادایە، بەڵام پێویستە کاری زیاتر بکرێ تا جێگەکە پەسەندبێ. هەروەها دەبێ ڕێبازە چاککراوەکانی پەیوەندی یارمەتیدەربن‌و، یەك دوو بەروبوومی باش قازانجییان هەبێ، بنیاتنانی هێواش‌و لەسەرخۆ سەردەکەوێ، نەك ستەمکاری، چونکە کوردستان دەڤەرێکی جیاوازە.

زمانی کوردی، تا فورات، لەتورکی زیاتر بەکاردێ‌و، سەیرە کە مامەڵە تا سیواس تەنها بە دراوە زیوە کۆنەکان دەکرێ‌و، سواڵکەرێکی مەڵاتییە دراوێکی کانزایی نوێی وەرنەگرت. بەڕێوەبەری بانکی عوسمانی پێی وتم هەر خێرا پارەی کاغەز دەگۆڕنەوە بەئاڵتوون کە زووتر هاوشانی دراوی زیوی تورکیی تاکە دراوی سوریا بووە، هێشتا تا ئاستێکی دیار لە ڕۆژهەڵاتی تورکیا مامەڵەی پێدەکرێ.

٢٨ـ بۆ تورکیا جێی خۆشحاڵییە کە، وەك ئەفسەرانی سوپا ئاماژەیان پێکرد، مومتاز بەگ سۆزێکی بەرچاوی بۆ دانیشتوانی ناوخۆ هەیە، ئەو وتی: هێورکردنەوەو پێشخستنی کوردستان، کاری سەرەکیی ژیانی ئەوە. پارەنییەو کەرەستەیش کەمە، بەڵام سەرکەوتن هەر بەدەست هاتووە. خوێندن خێرا گەشە دەکات‌و، هێڵی ئاسن‌و ڕێگەوبان گۆڕانی گەورە دێننەکایەوەو، ئومێدی زیاتر بە سەرنج‌و ئامۆژگارییەکانی شارەزای کشتوکاڵیی هەنگاری بەدی دەکرێ، کە ئەم دواییە دەست نیشانکرا بۆ ئەوەی سەر لێرە بدات‌و، ڕاپۆرت لەسەر ئەو شتانە بدات کە ئەکرێ لە ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵات بکرێن. بەکورتی لە دیاریەکر، نەك هەر لەودیو دیوارەکانەوە، بەڵکو لەفەرماندەیی سوپاو فەرمانگەکانیشەوە، هەستم بەهەمان ئەو گیانی کارو پێشکەوتنە کرد کەئەمڕۆ ئەنگۆرە دەبووژێنێتەوە.

## دیاربەكر تا فورات

٢٩ـ ڕێگەكە لە دیاربەكرەوە تا ٤٠ كیلۆمەتر بەدەشتێكی بەپیتی چێنراودا تێدەپەڕێ كە بەتایبەتی گەنمەشامیی وەك رووەكی سەرەكی خۆراك تێدایە. ئەمەیش بەڵگەی باشیی بەروبوومی ئەم ساڵە. لەوەدوا ڕێگەكە، كە وەك زۆرینەی جادەكانی تری توركیا باش دانراوە، بەڵام ریكخستنی لاوازە، دەچێتە ناوچەی شاخاوییەوەو، نزیك ئەرغەنیو مەعدەن زۆر باش دەبێ، كانە مسەكە ئێستا كاری تێدا ناكرێ، بەڵام ئەندازیارێكی ئەڵمانی ماوەیەكە لەوێیەو، ئامادەكاری بۆ ئەوە دەكرێ كەهێڵی ئاسنی قەلەر–دیاربەكر گەیشتە ئەرغەنی[1]، كانەكە بخرێتەوە گەڕ، لەم بارودۆخەی ئێستادا، ناكرێ هیچ هەلێك بەسەركەوتوویی بقۆزرێتەوە، چونكە گواستنەوە ئاسان نییە. بەڕێكەوت خەڵك دەرك دەكەن كە دامەزراندنی هێڵی ئاسن وەزیری دەرەوە لێهاتووییەكی گەورەی ئەندازەییە. نیشانەكانی سەر رووی شاخەكان دەریدەخەن كە نەخشەی هێڵە ئاسنەكە كێشراوە، بەڵام لەبەرئەوەی هەرێمەكە تەنها لە چیاو دەربەند پێكدێ، دەربەندەكان، بەهۆی كووڕیو لێژیی دیوەكانی دیجلەوە، بەهەزار حاڵ بواری ڕێگەیەكی تەسك دەدەن، ئەم پرۆژەیە زۆرترین خەرجیی تێدەچێ. دەزانم هێڵە ئاسنەكە لەمەلاتییەوە بۆ (١٧) كیلۆمەتری باشووری ئەلعەزیز دەڕوات، لقێكی بەموورادسۆدا درێژ دەبێتەوە بۆ مووشو وان. ئەمجا لەوێیشەوە، بەبەری دەریاچەی قەشەنگی "گولجك"[2]دا بۆ ئەرغەنیو مەعدەن[3] و شارۆچكەی بچووكی "عوسمانییە"ی چوار پێنج كیلۆمەتری سەر ڕێگەی سەرەكیی باشووری ئەرغەنی كە ئێستا شوێنەوارێكی نەماوە، بۆ دیاربەكر دەكشێ. ئەم ڕێگە ئاسنە بەهرەیەكی خوایە بۆ دیاربەكرو ئەرغەنیو مەعدەن، بەڵام پێویستە مەبەستەكەی زۆر ستراتیجی بێ.

---

[1] قەزایەكی باكووری رۆژاوای ویلایەتی دیاربەكرە. (س)

[2] دەریاچەیەكی بچووكی نزیكی باشووری رۆژهەلاتی شاری ئەلعەزیزە.(س)

[3] قەزایەكی باشووری رۆژهەلاتی ئەلعەزیزە.(س)

٣٠ـ رێگەكە لەناو كێوەكاندا ترسناكە. ماوەیەك لەمەو پێش جەردەی زۆر بوو، بەڵام ئێستا باشە. جارێكی تر جەندرمە لەو بەشانەدا زیاد كراونەوە، لەكاتێكدا دەركم بەوە دەكرد كەپێدەچێ هەموو جموجووڵكانم لەو بەشەنەدا چاودێری بكرێ، چاودێری ئەگەر هەبووبێ، زۆر هەستی پێنەدەكراو، منیش پێی نیگەران نەبووم، هەستم بەوە نەدەكرد كەبەلای كەمەوە چەند جەندرمەیەك، بۆ سەلامەتیی من، لەوێ بن، بەڵام كە لەلای جۆگەیەكی بچووك بۆ خواردنی نیوەڕۆ وەستاین، دووان بێ ئەوە كە بزانم لەكوێوە پەیدابوون و، ماوەیەك دواتریش دووانی تر ئۆتۆمبێلەكەیان ڕاگرت و، پرسییان: چی لەسەر باڵوێزەكەی ئینگلیز كە ئەو بەیانییە ئاگادار كرابوونەوە چاودێریی بكەن، دەزانن؟ ئەمەش زۆر سەرسامی كردم.

٣١ـ پاش ماوەیەكی زۆر شاخەكانمان جێ هێشت و، ڕوومان كردە دەشتی بەپیتی مورادسۆو، دوای بڕینی چەند میلێك باخ و باخات و گوندێكی زۆری لەقوڕ دروستكراوی دڵفڕێن، گەیشتینە ئەلعەزیز. كە دانیشتوانی سیازدە هەزار كەسە، مەڵبەندی فەرمانڕەوایی ی قەرەباڵغترین و یەكێك لە گەورەترین ویلایەتەكانی توركیایە، ئەم تاڕادەیەك تازەیەو، وەك دیاربەكریش ناخۆشە، چونكە سادەو بێ ڕەنگ و ڕووەو، هەمووی لەدارو تەختە دروست كراوە. تادرەنگانێك ئەم شارە بچووك بووە، بەڵام ئەو دانیشتوانەی خەرپووتی سەرگردێكی لێژی باكووری كە لەتەنگ و چەڵەمەكان ڕزگاریان بوو، ئێستا هاتوونەتە خوارەوە، بۆشارە نوێیەكەی سەر دەشتەكە.

٣٢ـ ڕۆژانی زوو خەرپووت شارێكی ئاوەدان بووەو، دانیشتوانی بەزۆری ئەرمەنی بوون، هەروەها كۆلێجێكی ئەمریكیی تێدا بووە كە بەباخ و بێستان دەورە درابوو. بەڵام ئەمڕۆ نە ئەرمەنی و نەباغ و بێستان ماون و، سەربازان كە زۆر شڕو شێواون، لە بینای كۆلیجە ئەمریكییەكەدا جێگیركراون و، شارەكەیش كەم و زۆر بەهەمان چارەنووسی گوندە ئەرمەن نشینەكانی توركیا چووە. بەدەگمەن ئەبینرێ بەردێك بەسەر یەكێكی ترەو مابێ.

٣٣ـ لەگەڵ ئەمانەدا، گرنگە ئەو راستییە بزانین کە ئەو قسانەی وا ئەرمەنییەکانی خەرپووت کردوویانە، ئێستا تورکەکانی ئەلعەزیزیش دەیانکەنەوە. زۆرێك لە ئەرمەنیەکان چوونەتە ئەمریکاو، جارجار لەوێوە پارە بۆ خزمو کەسوکاری ئێرەیان دەنێرنەوە. ئەمڕۆ کاری سەرەکیی بانکی عوسمانیی ئەلعەزیز، گەیاندنی حەواڵەی تورکە پەنابەرەکانی وەك ئەرمەنیەکانی نیشتەجێی ئەمریکایە بە کەسوکاریان. خۆ ئەگەر ئەمە نەبێ، ئەوا پارە کەمە. کشتوکاڵو چاندن بەهۆی نەبوونی پەیوەندییو دووریی ماردینەوە ٢٦٠ کم- کە دەروازەی ئێستایە،تەنها بەشی ناوخۆ دەکەن. پار ئەمە نەبوو. دەبوو دانەوێڵە لەدەرەوە بهێنرایەو، ئەمڕۆیش باری ئابووری هەر خراپە. هەرچەندە ئاو زۆرەو خاکەکە بەپیتە، بەلام پارەو کەمێ کۆششی پێویستن. سەرەڕای ئەمەیش، دووکانەکانی ئەلعەزیز کەلوپەلی باشیان تێدایە. بەرهەمی ناوخۆ، وەك هی هەرشوێنێکی تری ئەم بەشە، زۆر هەرزانبەهایەو، سێچوار هێلکە بە پێنییەك دەکڕدرێن.[1]

٣٤. گرنگترین خاسیەتی رێگەی ئەلعەزیز- {مەلاتیە پاشکۆی د }[2]، ئەوەیە کە بەسەر فوراتدا تێپەڕ دەبێ. لەئەلعەزیزەوە تا فورات، شتێکی وانەبوو جێی سەرنج بێ، ئەوە نەبێ کە (٣٠) کیلۆ مەتری سەرەتا دەشتێکی بەپیت بوو. لەخانکۆڤ (Hankov)[3] کە (٢٠) کیلۆمەتر لە ئەلعەزیزەوە دوورە، باشترین بەروبوومی دانەوێڵە هەیەو، تائێستا شتیوام لەسەرتاسەری تورکیا نەبینیوەو، ئەمەیش دیارە بەهۆی پەینەوەبووە. هەروەها تێبینی بەروبوومێکی کزوکەم دەکرا، هۆیەکەیشی ئاشکرایە، چونکە هیچ ناوچەیەك کە من پێیدا تێپەڕیبم، بی ئاو نەبوە.

٣٥. دواتر هەستم کرد رێگەکانی رۆژهەلاتی فورات، سەرەڕای باری خراپیانو نەبوونی پرد، لەچاو ئەوانی تردا باشتربوون. ئەمەیش زادەی ئیدارەی دیاربەکر بوو.

---

[1]و[2] چاپ نەکراون.

[3] مادام لەسەر رێی ئەلعەزیز- مەلاتیەیە، ڕەنگە (خان کەندی) بێ. (س)

بەداخەوە(٢٠) کیلۆمەتری دوایی‌ی ڕێگەکە، بەر لە گەیشتن بە ڕووبارەکە، هێندە خراپە بڕوا ناکرێ! ئەمەیش زیاتر بەهۆی بارانی خوڕەوەکە سەرەنجام فورات سەرڕێژی کردووەو، ڕێگە زۆر نزیکەکانی ڕامالیوە. دوایی گەیشتینە ئەو شوێنەی کە پێش لافاوەکە گوندی ئیسۆغلۆو بوو و، سەیرمانکرد نە گوندەکەو نە پردەکەیش ماون. تەنها (١١) خانوو لەکۆی (٢٠٠) رزگاریان بووبوو. خۆشبەختانە، لەشەش هەفتەی دوای لافاوەکە، قەیاغ( بەلەمی بچووك)ی بەهێز دروست کرابوون‌و، ئەم کارەیش وەك خاوەنەکانیان دەیانوت: مانگێکی خایاندبوو. ئەو ماوەیە، گواستنەوەی نێوان ڕۆژهەڵات‌و ڕۆژئاوا وەستابوو و، لۆریەکان بۆ پەڕینەوە، دەبوو سێ ڕۆژ بمانایەوە. بەڵام بەهۆی نامەکەی والیی ئەلعەزیزەوە، من چاوەڕێم نەکرد. دوای سەعاتێك نارەحەتی، خۆم‌و ئۆتومبێلەکەم بەسەلامەتی گەیشتینە بەری ڕۆژئاوای ڕووبارەکە کە بەخێرایی دەڕژا. بەم جۆرە ماڵئاواییم لەو هەرێمە قەدەغەکراوە کرد کە زۆر لام خۆشبوو و، ئەو پرسیارە هەمیشەییەی لادرووستکردم کەبۆچی ئەبوو ناوچەیەکی قەدەغەکراو بێ.

فورات تا کەنارەکانی دەریای ڕەش

٣٦. ڕێگەیەکی باش لەفوراتەوە دەچێتە مەلاتیە، ئەمە ئەگەرچی باران وایکردووە کە چەند جارێك ناچار دەبێ بەفراوانی لە ڕێگەکە لابدەی. مەلاتیە نۆزدە هەزار کەسی تێدا نیشتەجێن‌و، بەمیوەکەی‌و، دۆستایەتی عیسمەت پاشا ناسراوە. ناوبراو ساڵانە سەری لێدەدات‌و، ڕەنگە ئەمەیش لەبەر بینسا گرنگ‌و بەکارنەهاتوەکانی دەرەوەی بێ. ئەم شارە پارکێکی تێدایەو، کارەباشی هەیە، بەڵام کە من لەوێ بووم، کارەباکەی ڕێك‌و پێك نەبوو. بازاڕەکانی گەورەن‌و، دووکانەکانی شتی باشیان تێدایە. باخ‌و بێستان لە هەر چواردەوری شاردا هەن‌و، جگە لە میوە، خواردەمەنی‌و ئەفیونی تێدا چێنراون.

٣٧. زۆرم پێ سەیر بوو کە بینیم مەلاتیە سەختترین شاری تورکیایە. مرۆڤ ئەتوانێ لە باکورو کێوەکانەوە، یان وەك من لەڕۆژهەڵاتەوە، بچێتە ئەم شارە.

ڕێگەکە بەرەو باشوور زۆر خراپە. پێیان وتم نامەی قوستەنتەنییە بەشەش مانگ دەگات. مەلاتیە لە وەرزی میوەدا ماوەیەکی کەم دەژێتەوەو، پایزان دەگەڕێتەوە سووڕی درێژی متبوونی. ئەکرێ دانەوێڵەو .......هتد بۆ ناردنە دەرەوە بەرهەم بهێنرێ، بەڵام گواستنەوە بەسەر ڕێگە خراپەکاندا، ئەگەر شتێکی ڕێتێنەچوویش نەبێ، هیچ نەبێ لێرە وەك شوێنەکانیتر ڕێگرە. هەمان ئەو قسەیەم بیست کە نەهاتیی بەرو بوومی پار، بووەتە مایەی کە مو کورپیی ناوخۆ وپێویستی کاڵای لە دەرەوە هێنراوو قەیرانی توندی ئابووری. هەروەها گازندە لەدەست دەسەڵاتداران کرا کە ڕێگەی باشتریان دروست نەکردووە. بەهۆی کرانەوەی هێڵی ئاسنەوە، هیوای هاتنی ڕۆژانێکی گەشتر دەخوازرا. هاوکات خەرجیی گواستەوە بۆ ئەم جۆرە پێداویستیانە کەدەتوانرێ لەناوخۆ بەرهەم بهێنرێ، نرخی هەموو شتێکی گران کردووە، بۆ نموونە پاوەندێك شەکر، لەچاو قوستەنتەنییەدا، ٥٠٪ گرانترە.

٣٨. لە مەلاتیە، بۆ یەکەمجار، تێبینی نیشانە ڕاستەقینەکانی ناسکیی بارودۆخەکەم کرد. جەردەییو چەتەیی لەشوێنەکانی تر کەمو زۆر خۆبەختییەو، تووشی پێکدادان دەبنو، مەسەلەیەکی زۆر ترسناکیش لە نزیك مەلاتیەدایە. دزیو جەردەیی سەر ڕێی قەلەر (Keller) ماوەیەك بوو ڕۆژانە ڕوویاندەدا، بەلام ئێستا هەندێ کەس دەستگیرکراون. کارێکی چەتەیی، چەند ڕۆژێك بەر لە گەیشتنم، لەسەر ڕێگەی سیواس کرابوو و، تەقەو چەند کوژراوێکیشی لێ کەوتبووەوە. تێکچوونی پردەکان، بەهۆی بارانەوە، هەلی زیاتری بۆ ئەم چەتانە ڕەخساندووە. بەڕێوەبەری بانکی عوسمانی وتی: بەگشتی بەبردنی پارەکە قەناعەت دەکەن، بەلام جێی بێزارییە کە دەبینی کاتێك دەزانن تالانییەکە بەس نییە، بەڕێگەیەکیتر قەرەبووی دەکەنەوە. من بەپارەیەکی زۆر کەمەوە سەفەرم کرد.

٣٩. پێشبینی دەکرا ڕۆژی دواتر وەزیری ناوخۆ لەسیواسەوە بگاتە مەلاتیە، ئەمەش لە زانیاریەکانی هێزێکی گەورەی جەندرمەوە زانرا کە بۆ پارێزگاریی بەڕێزی دەرچووبوون. منیش بۆ ئەوەی لە ڕێگە پێی بگەم، بەرەبەیان بەرەو باکوور سەفەرم

کرد. لەڕاستیدا، وەك دەرکەوت، شوکری قایا بەگ دواسات پلانەکانی گۆڕیبوو. چونکە ڕێگەیەك (پاشکۆی ه[1])ی بینیبوو وئەبڵەقی کردبوو. سەرباری ئەمە، جەندرمەکان هەر لەو ناوەدابوون. هیچ لەوە سەیرتر نەبوو کە (١٤) سەعات بەردەوام بەخراپترین ڕێگە لەژیانمدا دیبێتم، ڕۆیشتم و، ڕێگەی سەرەکی(باکوور-باشوور)ی ناوەڕاستی تورکیام گرت. تەنها یەك پردی بەهێزی ڕەنگ تازەی بەردین لە هەرێمی شاخاویی ناوەڕاست بەسەلامەتی دەرچووە. بەڵام ڕێگە لەدیوەکەی ترەوە نییەو، ئەبی شۆڕبیبێتەوەو، بەهەمان شێوە جۆگەکان ببڕی.

٤٠. لێرەبوو، چەند کاروانێکی گەورەی حوشتری لەخوری بارکراوم بینی: ناوبەناو پەڵە جۆ دەبیران، بەڵام بەگشتی گوندەکان ئاژەڵداران، چونکە هەرچەندە ناوچەکە شاخاوییە، کەچی هێندەی هەرێمە بەرزەکان رووتەن و سەخت نییەو، زۆر رانی مەڕو بزن لەوناوچانە بەخێو دەکرێن. قەنغال- Kangal[1] مەڵبەندی سەرەکیی ئەمانەیەو، نزیکەی (٢٣) کیلۆمەتری ڕێگەکەیش لەوێوە زۆر جێی ڕەزامەندی بوو و، ئەمجا بۆ سیواس( ٦٠کم) لەوپەڕی خراپیدابوو. زۆر ناخۆشە لە لاوە سەیری ئەو ڕێگە تێکچووە دەکەی. پیادەو گوێدرێژ بەملاو ئەولایدا دەڕۆن و، گەشتیاری کەم بەختیش لەقوڕو چاڵی تایەکاندا نوقم دەبێ. دوایی دڵنیابووم لەوەی وا والیی ئێستای تەرابزوون کە زووتر لە سیواس بووبوو، دەستی کردبووە دروستکردنەوەی بەشی سیواسی ڕێگەی مەڵاتیە. ئەم، لە پاش (٢٣کم) ەوە، لەکار لادرابوو و، والییەك کە لە قوستەنتەنییە بەوپلەیە نەگەیشتبوو، جێی گرتبووەوە. بێگومان ئەم لە سیواس ئەوە ناکات و، ئەبێ تورکیا بەنەفامی و لە دەستدانی ئابووری، بەهۆی نەبوونی پەیوەندییەوە، باجەکەی بدات. سەیرە! ئەمڕۆ لە جادەیەکی سەرەکیی ئەم جیهانەدا دوو پیاو، لەکاتی نزیك بوونەوەی ئۆتومبیلدا، جڵەوو چاوی گوێدرێژەکەیان بگرن و بیترسێنن، چونکە سێ گوێدرێژ کەم و زۆر

---

[1] ئەم پاشکۆیە چاپ نەکراوە.

[1] قەزایەکی باشووری ڕۆژهەڵاتی ویلایەتی سیواسە.(س)

ڕووداوێکیان خوڵقاندبوو. بەڵێ بەڕاستی ئەمە لە ڕێگەیەکی نزیک سیواس ڕوویدا. دیمەنێکیتر هی ئەو جێیەبوو کەزوو گوندی گەورەی (ئۆلاش–Ulash )[2] بوو. ئەم گوندە لەبارێکدا بوو، هەروەك شۆفێرو خزمەتکارە تورکەکانم، وام هەست دەکرد بوومەلەرزە لێیدابێ. ئەوان لەڕێبوارێکیان پرسیو، ئەویش لەوەلامێکی کورتو پڕ واتادا وتی:" ئەمە گوندێکی ئەرمەنی بوو." لێرە بەدواوە، چەندین دیمەنی وام بینی.

٤١. سیواس (٢٩٠٠٠) دانیشتووی تێدایەو، شارێکی بچووکی دلگیرەو، ئەگەرچی کارەبای نییە،بەشێوەیەکی ناوازە (ایستثنائي)، بارودۆخی باش بوو.شارۆچکەیە وشکە ساڵی پاری نەچێشتبوو و، دەیتوانی لەهەموو لایەکەوە دانەوێڵە بەنرخێکی باش بفرۆشێ. هەروەها ئەمساڵ چاندنێکی باش بووەو، قەناعەت وایە بەرووبوومیشی زۆربێ. بەهۆی نزیکیشی لەسامسوونەوەو لەبەر ئەوەی ڕێگەی باش بەم و قەیسەریشییەوە دەبەستێ، هەمووکات بەرهەمەکانی ساغ دەکاتەوەو، لەمیش زیاتر، لەئایندەدا، پەیوەندییەکان زیاتر پێش دەکەون، چونکە پێیان وتم هێڵی ئاسنی قەیسەری، حوزەیرانی ١٩٣٠ و، هی سامسون ساڵی دواتر دەکرێنەوە. ئێستا پرۆژەی هێڵی ئاسنی ئەرزنجان و یەنیکەوی‌و، گرێدانی بەهێڵی تەسکی ئەرزرۆم‌و سنووری ڕووسیاوە، مەسح دەکرێ.

٤٢. ڕێگەی سیواس بەرەو دەریای ڕەش، بەقەرەحەساری ڕۆژهەلاتدا چوومە گیرەسوون، لەڕاپۆرتەکانی پێشووی پاشکۆی عەسکەری‌و کونسوڵی خاوەنشکۆدا لەتەرابزوون، تەواو باسکراوەو، ئیتر پێویست ناکات زیاتری لەسەر بڕۆم. بەسە بڵێم ڕێگەکە، بەپانتایی‌ی ویلایەتی سیواس، یەکجار خراپە. لە سیواس بیستم وەزیری ناوخۆ بڕیاری داوە بەرەو سووشەهر (Enderos)[1] لە ڕۆژهەلات، کە ئەم دواییە

[2] ناحیەیەکی نزیك بە باشووری شاری سیواسە. (س)

[1] قەزایەکی باشووری ویلایەتی (شەرقی قەرە حیسار) بووەو، ئێستا سەر بە ویلایەتی سیواسەو لە باکووری ڕۆژهەلاتیدایە. (س)

بوومەلەرزە لێیدابوو و، لەوێشەوە بۆ ئەرزرۆم، بڕوات. دەبوو ئەو ڕۆژە کەمن لەسیواس دەرچووم، ئەویش بڕۆیشتایە، بەڵام بیست و چوار سەعاتی دواخست و، جەندرمەکانیش زۆر درەنگ لەمە ئاگادارکرانەوە. بۆیە باش پارێزرام و، بێ ئەژمار سڵاوم وەرگرت کە بەدڵنیاییەوە بۆ ئەو بوون و، شتێکی خۆشتریش ئەوەبوو کە والی خۆی ئامادەکردبوو تەماشایەکی ڕێگەکە بکات، بۆیە هەر کە لە سیواس دەرچووم کەوتبوونە چالاکییەکی بەرفراوان. ئەو بەردانەی کە چەند مانگێک بوو ئامادەکرابوون، خێرا خرابوونە سەر ڕێگەکەو- ئەگەر سەرەتا هەروا نەبووبێ، چونکە تاکە مەکینەیەکی ڕۆڵەم لە (٨٠٠کم)ی نێوان قەرەحەسارو دیاریەکر نەدی، لەدوا قۆناغدابوون. هەندێ جاریش تورک تەواو بێئومێد دەبێ. ئەو بەیانییە ڕێگەکە لە شوێنێکدا بەدرێژیی میلێک، بەوانەی سەرگەرمی دروستکردنی جادەکەبوون، داخرابوو، بۆیە دەبوو ئوتۆمبێلەکەم، هەروەك ئەوی شوکری قایا، ئەگەر لەوێ بوایە، بەکێڵگە کێڵراوەکاندا بڕوات.

بێگومان کە شوکری قایا گەڕایەوە ئەنگۆرە، ڕاگەیاندنێك لەسەر بەرەو پێشچوونی دروستکردنی جادەکانی تورکیا دەداتە چاپەمەنییەکان.

٤٣. کاتێك بەناوچەی پڕئاو و بەپیتی زارادا [1] کەچەندین جەڵەبی گەورەی ڕەشەوڵاغ و ئەسپ و ڕانەمەڕی تێدابوون، تێپەڕیم، ڕێگەکە زۆرخراپ بوو و، هێندە لێژبوو، جێی مەترسیبوو. ئەمەیش وایکرد، پێش ئەوەی بگەمە سووشەهر، شەوداببێت. خان، بەپێچەوانەی ئەوەی کە پێشبینیم کرد، خراپ بوو. ناچار چوومەلای قایمقام و، ئەویش بەڕێزەوە چادرێکی لەوانە دامێ کە لەبێستانێکدا بۆ وەزیری ناوخۆ و تاقمەکەی دابینکرابوون و، ئاوی زۆرو مانگەشەوی پڕو شاخی بەرزی باشوور کردبوویانە جێیەکی قەشەنگ و دڵفڕێن.

٤٤. سووشەهر لە کەناری دەریای ڕەشدایەو دارستانی سنەوبەری هەن. پێش جەنگ ئێرە شارێکی کشتوکاڵی ئاوەدان بووەو، زۆربەی دانیشتوانی ئەرمەنیبوون.

---

[1] قۆچگیری، قەزایەکی ڕۆژهەڵاتی ویلایەتی سیواسە. (س)

ئەمیش بوومەلەرزە لێیدابوو و، خانووەکانی تەواو وێران کردبوو. نزیکەی دوو هەزار ماڵی قوڕ رووخابوون، بەڵام لەبەر ئەوەی ئەم رووداوە رۆژی رووناك قەومابوو، تەنها چوارکەسی کوشتبوو. ئەو کاتە کە من لەوێ بووم، خەڵك هەموو لە دەرەوەی ماڵەکانیان دەژیان.

کەناری دەریای رەش

ئەوەی گەشتێکی درێژ بەئوتومبیل بەسەر رێگاکانی ئێستای تورکیادا بکات، هەمان خۆشییەکانی دەهەزار شەرکەرەکەی زەینەفوونی تەواو بەنسیب دەبێ. شتێکیتر، هێندەی دیمەنی دەریاکە لە گیرەسوون، سەرنجی رانەکێشاوم. گەشتی رۆژانی دوایی لەسووشەهرەوە خۆش بوو، چونکە لەجیاتیی وشکیو بێپیتی، دارستانی سنەوبەرو، نزیك دەریاکەیش دارگوێز هەبوون، ئێرە لەقەرەحەسارەوە زۆر دڵگیربوو، بەڵام زۆر کاولیش بوو، چونکە رێژەیەکی بەرچاو ئەرمەنیی تێدا نیشتەجێ بوویوونو جێو شوێنێکی سەختیان دروستکردبوو. ئەگەرچی رێگەکە تەسكو هەورازو ترسناك بوو و، (٦٥٠٠) پێ بەرز دەبووەوە، پێچاوپێچو تیژاییی دەرپەڕیوی زۆربوون، ئەوەندە نەبێ کە پردێکی گرنگی سەر رووبارێك نەماوە، ئیتر بەگشتی باش بوو. خانووەکانی گوندێکی ناخۆشیان دروست نەکردبوو، بەڵکو بەجۆرێك بەسەر گردەکەدا بڵاوبووبوونەوە کە مرۆڤ وای هەستدەکرد لەسویسرا بێت نەك تورکیا. بەڕای من ئەم هێمایەی ئاسایشو سەقامگیریو سەوزایی، خاسیەتە سەرەکییەکانی کەناری دەریای رەش بوون. هەروەها سیفەتێکی تری ئەو ناوچەیە، ئەو رێبازەیە کە هەر گرێیەکی بەری گردەکەی بەچڕوپڕی پێچێنراوە. ئەمە ئەگەرچی ئەو هەرێمە کەندەڵانی زۆرە، بەڵام دۆڵ نییە.

٤٦. گیرەسوونی ٨٠٠٠ کەسیی پێگەی چالاکیەکانی کاتی ئاگربەستی عوسمان ئاغای بەدناو، جوانترینو گۆشەگیرترین شاری بەندەرەکانی دەریای رەش بوو. هەرچەندە بەرهەمی میوەی هەبوو، بەڵام پشتی بە بەرووبوومی گوێز بەستبوو. گوێز،

لەساڵێکی هاتدا، پێنج ملیۆن لیرەی تورکی بۆ شارەکە پەیدا دەکات. بەرهەمی ساڵی رابردوو تەواو خراپ بوو و، ئەمساڵ ئومێد زیاتربوو، بەڵام سەرماو سۆڵەی دوایی زیانی گەورەی داوەو دیسان بەرهەم کەم دەبێ. ئەم شارە هەرچەندە تەنها گۆشتی مەڕو مانگاو ئاردی لە دەرەوە دەهێنا، کەچی باری ئابووری باش نەبوو. لەوێ تاکە ئینگلیزێك کە ئەندازیاربوو و، دەبووە وەکیلی ئۆتومبیل کارەکەی وەستابوو، لەگەڵ ئەمەیشدا هێشتا سووربوو لەسەر ئەوە کە:

ئەتوانرێ لەرێی دەرهێنانی کانزاوە پارە لەتورکیا پەیدابکرێ.

٤٧. باری ئابووریی تەرابزوون وەك هی گیرەسوون خراپە، ئەمەیش چەند هۆیەکی هەن، لەوانە: رۆیشتنی کارگەی میوەی یۆنان‌و نیشتەجێبوونی بازرگانانی موسڵمان لە ئەنجامی ئاڵوگۆڕی دانیشتوان‌و بوونیان بەخاوەنی دارگوێزەکان‌و، دابەزینی بەرهەم بەهۆی وەرزی نەهاتییەوەو، کەمبوونەوەی بازرگانیی ترانزێتی ئێران کە ئێستا تەنها پێنج یەکی هی ساڵی ١٩٢٤ دەبێ. ئەگەر رێگەکە لە باتووم‌و هەمەدان درێژتریش بێ، بازرگانەکان وایان پێباشترە، ئەگەر ژیرانە رەفتاریان لەتەك بکرێ، کەلوپەلەکانیان بەتەرابزووندا ببەن، بەڵام تورکەکان هەموو کۆسپ‌و تەگەرەیەك دەخەنە رێگەکەو، هەموو بالەکان لە تەرابزوون‌و جارێکی تریش لە سنووری ئێران دەکرێنەوە. ئەم رێگەیە، بەقسەی کونسوڵی ئێران، زۆرکات نائارامە. تەنها چەند رۆژێك پێش گەیشتنی من، کاروانێك تالان کرابوو.

٤٨. هەروەها ئەو بازرگانە تورکانەی کە قسەم لەگەڵ کردبوون، رەخنەی زۆریان لەئیدارەکە هەبوو. نموونەیەك لەبەرهەمی گوێز وەرگیرابوو. خۆشبەختانە بەروبومی گوێزی دەریای رەش، وەك بازرگانێك دەریخست، ساڵانە ١٤ ملیۆن لیرەی تورکی پەیدا دەکات. هەڵمەتێکی حکومەت دژی مێروو ومشەخۆر دەبووە هۆی زیادبوونی داهاتی ساڵانی ئایندە بەرامبەر بە خەرجییەکی کەم، بەڵام بەداخەوە حکومەت هیچ بۆ ئەمە ناکات. والیرەداو لە تاقیکردنەوەی خۆمەوە، نموونەیەکی رێگری‌و گرفت نانەوەی تورك دەنووسم. بەکەشتییەکی بچووك لەقیرەسوونەوە گەیشتمە

تەرابزوون. کەشتیتر لەبەندەرەکە نەبوو، کەلوپەلی گەشتیارانی تر بێجیاوازی دەپشکنران.

٤٩. جادەکانی دەوری تەرابزوون باش بوون. حەفتا کیلۆمەترێك بەدرێژیی ئەرزرۆم رۆیشتم، بینیم رێگەکە فراوان بوو، لە بارێکی باشدابوو، هاتوچۆی باشی لە سەر بوو. بەڵام کاروانێکی حوشتریشم بینی. ئەو دیمەنانەی کە زۆر دووبارە دەبوونەوە، هی گوندو کڵێسەو خەڵوەتگە وێرانەکانی زووی یۆنانیەکان بوون.

٥٠. لەو سەردانە کورتەدا کەهەر بەسەر کەشتییەکەوەو لە بەندەرەکەدا بۆ سامسۆنم کرد، پێچەوانەی قسە ناخۆشەکانی زووم بۆ دەرکەوت کەلەبارەی ئەم شارۆچکەیەوە کرابوون. ئەمەیش بۆمن سەیربوو. لێرە خەڵك بەهۆی تووتنەوە ژیانی خۆش بوو. هێڵە ئاسنە نوێیەکە ناوچەی پشت کەناراوەکانی دەبووژاندەوەو، پارە زۆر بوو، گوندی نوێ لەجێی گوندە رووخاوە یۆنانیەکاندا خێرا دروستکرابوون. والی بەدەسەڵاتو تواناو، خەڵکیش کامەران بوون. ئەم گەشەکردنەی تورکیا زۆر خێرایەو، بەڕێوەبەری بانکی عوسمانی ئاگاداریکردمەوە کە شەپۆلێکی گەورەی بازرگانی لە ئارادایەو، بانکە تازەکانی تورکیا بێ بەڵێنو گەرەنتی ئامادەن پارەبدەنو هاوکاریی بکەن. پرۆژەی دابینکردنی ئاویش وەکو ئەوەی دەزگایەکی ڤینسیایی کە ماوەیەك بەر لەتەوابوونی چاوەڕێی پارەکەی لە شارەوانی کردبوو، جێبەجێبووبوو. نوێنەری دەزگاکە پێی وتم چەند پرۆژەیەکی هاوشێوە لە تورکیا بەدەستەوەن، بەڵام بەهۆی ئیجرائاتی یاساییەوە راگیراون. بەڕاستی جێی گوڵەکانی باخچەیەکی دەرەوەی گۆڕستانێك کە دەشێ هی مەسیحیەکان بوویێ، زۆر جوان بوونو، سامسۆنیان رازاندبووەوە.

چەند سەرنجێکی گشتی:

٥١. لەهەندێ تێبینی گەشتێکی دووساڵ پێش ئێستامدا بۆ هەرێمە بەرزەکانی ناوەڕاستی تورکیا، نووسیبووم: ئاسایشو هێمنیی تەواو مۆرکی ئەوکاتەبووە، بەڵام ئەم تێبینیانەی ئێستام، شتێکی جیا لەم گەشتە فراوانەمدا پێشاندەدەن. هەڵبەت

ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە ئاسایش نییە، بەڵکو هەیە، بەڵام خەڵك واهەست دەکات، بێئەوە کە وریابکرێتەوە، تیادەچێ و لەناو دەبرێ. سنووری سوریا، ئەگەر هەندێ رووداوی بچووك نەبن، ئارامە، کەچی رێتێدەچێ پریشکێك ببێتە هۆی هەڵگیرسانی ئاگرێك. ویلایەتەکانی رۆژهەڵات کۆنترۆڵکراون، بەلام پێم وایە پێویستە ئێستاو داهاتوویش بەوردی مامەڵەو رەفتاریان لەگەڵدا بکرێ. ناوەڕاستی تورکیا بەقەیرانێکی زۆر توندی ئابووریدا تێدەپەڕێ، چەتەییش لەزۆر ناوچەدا کەم روو دەدات.

٥٢. تەنگژەی ئابووری و جەردەیی، تەنها پشت بەیەك دەبەستن. چونکە حکومەت کۆنترۆڵی باشی وڵاتی کردووە،دەنگی هیچ بەرهەڵستییەك لە ئارادا نییەو، غازی لەو دەڤەرەیشدا، وەك هەموو شوێنەکانیتر، ناسراوە. بەڵام سکی خاڵی مایەی ناڕەزاییەو، دەرمانی ئەم دەردەی تورکیایش زنجیرەیەك بەروبوومی باش و گەشە کردنە. بۆچوونی ئاشکرای من وایە: ئەگەر بەرهەمێکی خراپ یاخود خراپتری بەدوادابێ، رەنگە بارودۆخەکە ترسناك بێ. هەمان ئەم قسەیە لەهەموو جێیەك دەبیسترێ کە: سوڵتانەکان رۆژهەڵاتی تورکیایان پشتگوێ خستبوو، بۆیە ئەمیش گوێ پێنەداو. ئەمڕۆ گلەیی ئاشکرا لەم رووەوە نییەو، زوو دەرهاویشتەو قازانجی ئەمیش دەردەکەون. رژێمی ئێستا لەم بەشانەدا کەسەرەتای جووڵانەوەی ناسیونالیستییان بەخۆوە بینیوەو، هەمیشە لە بیری نیشتمانپەروەریدا ژیاون، لە تاقیکردنەوەدایەو. خۆشبەختانە جوتیاری تورك بۆ ژیان کەمی دەوێ، بەڵام خۆنەگەر ئەم کەمەیش ماوەیەکی زیاتر، وەك ئەوی پار، هەرنەبێ، ئەوا تورکیا بەرەو رووی کێشەو گرفت دەبێتەوە.

٥٣ـ راستە هەلومەرج یارمەتیی حکوومەتیان نەداوە. پارە کەمەو وشکە ساڵی پاریش کارەسات بووە. بەڵام بەداخەوە نیشانەیەك نییە دەریبخات هەنگاویان بۆ ئەوە نابێ کە لە ئایندەدا چاوەڕوانی کارەساتێکی هاوشێوە نەکەن. رێگەکانی ئاسن بەخەرجییەکی بەرچاو دروست دەکرێن و، هەرچەندە درەنگ بەهای ئابوورییان

دەبێ، زۆر ستراتیجین. جادەکان زیاتر پێویستن، بەڵام مەخابن لە ڕۆژهەڵاتی فوراتدا نەبێ، بایەخیان پشتگوێ خراوە. مۆتۆرسوارێك کە لە ڕێگەی سەنگافوورە- لەندەندا بەئەنگۆرەدا تێپەڕیبوو، پێی وتم: ئەگەرچی ئەفغانستان و ئێرانی بڕیبوو، بەڵام ڕێگەکانی تورکیا خراپترینی ئەوانە بوون کە بینیبوونی. دەزانم ڕێگەی سیواس- مەلاتیەیش کە جادەیەکی سەرەکیی گرنگە، لەوانەی وا ئەو بینیبوونی، زۆر خراپترە. ئەگەر ئەمڕۆ بڕی باجی کۆکراوەی ڕێگاکانی تورکیا ژیرانە لە قۆنتەراتی دروستکردن نەك چاککردنەوەی جادەکان خۆیاندا، کەبەش ناکات، خەرج بکرێ، ئەوا کاریگەریی باشی دەبێ. گوندو شارۆچکە دوورە دەستەکان پێش دەکەون و، کشتوکاڵ و بازرگانی خێرا گەشە دەکەن و، بنەما گشتییەکانی وڵات هەڵدەچنرێن.

٥٤- چاکسازییەکانی تورکیا، لەو بەشە دوورانەدا، تەنها کەمێك بەرەو پێش چووە. مەلایەکم نەدیوە، مزگەوتەکان وادەردەکەوتن فەرامۆش کرابن. تەنها جارجار کەسێکم ئەبینی نوێژ بکات. هەمیشە ئاماژەم بەو ڕاستییە کردووە کەدراوە ئاڵتوون و زیوەکان پەسەندن و، کوردییش زمانی ڕۆژهەڵاتی فوراتە. زۆربەی ئافرەتانی دیاربەکر بێ پەچەن، بەڵام وەك هەموو جارێك وتوومە، دیاربەکر شارێکی جیایە. ئافرەتی شوێنانی‌ترو، بەتایبەتی کەناری دەریای ڕەش، بەدەگمەن بێ ڕووبەند دەبینران. هەرکە ئوتومبێل یان پیاوێك دەبینن، خێرا ڕوخساریان دادەپۆشن. هەموو ئەمانە هێمای بنەما بێ هێزەکانی ژیانن. خانووی لادێکان لەقوڕن و، ئەوەی لەوانەوە دێتەدەر، زۆر پیس و پۆخڵ دیارە. خۆ ئەگەر هەندێ شوێن لەمە دەربکرێن، ئەوا گوندەکانی کەناری دەریای ڕەش و ویلایەتەکانی ڕۆژهەڵاتن، چونکە بەڕای من خەڵکی ڕۆژهەڵاتی فورات خاوێنترن و، بنەماکانی ژیان هێندەی ئەوانی ڕۆژئاوای ڕووبارەکە نزم نین. نەخۆشخانەیەکی پاك لە گشت شارێکدایە، بەڵام وەزارەتی تەندروستی، بەهۆی کێشەی بنەبڕکردنی نەخۆشی و

زیادبوونی لە ڕادەبەدەری دانیشتوانەوە، ڕێگەیەکی سەختی بۆ کۆنترۆڵکردنی بارو دۆخەکە لەبەردایە.

٥٥ـ قوتابخانەی تازە لەهەموو جێیەك دروستدەکرێ‌و، خوێندن بەردەوام گەشە دەکات، بەڵام ئەمانیش زۆر هێواشن. بێگومان کاتێك ئەلف‌و بێی نوێ تەواو دەچەسپێ، کە ئەم نەوەیەی ئێستای قوتابخانەکان پێدەگات. خەڵك هەموو حەزدەکەن پیتە کۆنەکان بەکاربێنن‌و، کارمەندانی وەزارەتی دەرەوەیش لەو خەڵکە جیانین‌و، ئەمەش سەیر نییە. بەڵام کەمێك جێی سەرنجە کە لە لیستی خواردنەکانی باشترین چێشتخانەی سامسۆندا، وەك هەر شوێنێکی‌تر، جگە لە کیرەسوون کە مرۆڤ ئازادە کام ڕێنووس هەڵدەبژێرێ، دەبوو بەڕێنووسی کۆن بنووسرێ. کارمەندێکم نەبینی بتوانێ ڕێنووسە تازەکە ئاسان بخوێنێتەوە. بەڵگەی تێکچوونی سیستمەکە کە زادەی بەکارهێنانی زۆرە ملێی‌یە، لە یەکی ئایارەوەی ئەو ڕاستییەیە کە ئێستا بروسکەکان لەشارێکەوە بۆ یەکێکی تر سێ‌چوار ڕۆژ دەخایەنن. بەڕێوەبەری بانکی عوسمانی لەمەلاتیە پێی وتم: بروسکەیەکی لقی ئورفە لە ڕێگە دە ڕۆژی پێچووەو، چەند ڕۆژێك دوای ناردنی پشتگیرییەکە بەپۆستەدا، گەیشتووە. بەڵام پێویستە ئەوەیش بڵێم کەبروسکەیەکم لەگیرەسوونەوە بۆ تەرابزوون بەپێنج سەعات ناردووە. خۆ ئیش‌و کاری بەشە ئیدارییەکان، ئەگەر بەهۆی کۆبوونەوەی نووسەرانی بروسکەکانیشەوەبێ، بێ‌سەرەوە بەرەن.

٥٦ـ بەڵام ڕەنگە شتەکان، وەك دیارن، زۆر خراپ نەبن، چونکە بەلای کەمەوە نیشانەیەکی پەسەندییان هەیە.سەربازی نوێ تەنها لەم وەرزەدا بۆ خزمەتی سەربازی داوا دەکرێن. کۆمەڵی (٢٠–٣٠) کەسیی ئەم سەربازانەم لە هەرێمە زۆر دوورەکان بینی. ئەمانە نیگەران دەرنەدەکەوتن‌و، بەفەرمانی تاکە سەربازێك بوون. دەزانم کە دیمەنێکی وا هەرگیز پێش شەڕ نەدەبینرا، چونکە یەکە سەربازیەکان بۆ دەرکێشانی سەربازی تازە دەنێردرانە لادێکان، پاسەوانی بەهێز بۆ بەرگرتن لە هەڵاتنی ئەو گوندنشینانە کۆدەکرانەوە.

٥٧- ئەوەی لەم گەشتەدا زۆر سەرنجی راکێشام، لێک دووریی دانیشتوان بوو. لەماوەی سێ ساڵی رابردوودا، کەم‌و زۆر سەردانی گشت پارچەکانی تورکیام کردووە. پێم سەیرە! لەکوێ زیاتر لە چواردە ملیۆن کەس توانیویانە خۆیان بشارنەوە!! بەڵام وەك مستەر جاکۆرت (Jacquart) وتی، هەر لەوێبوون. بەپێی قسەکانی ئەو، ویلایەتی ئەلعەزیز چڕترین دانیشتوانی هەیە. خۆ ئەگەر بڕوانینە نەخشەی رێگەکانیش، ئەوا دەردەکەوێ لادێیەکانی ئەوێ‌و جێیەکانیتریش چەند کەمن، هەرچەندە ئەمە راست بێ‌یان نا، بایەخێکی ئەوتۆی نییە. ئەو ڕاستیەی کە ماوەتەوە ئەوەیە: کەم بوونەوەی بەرچاوی ناوچەی چێنراو، سەرەڕای وشکە ساڵی ١٩٢٨، دەدرێتە پاڵ کەمیی دانیشتوانیش. لەهەلومەرجێکی وەهادا، پێدەچێ بیروڕا وابووبێ کەتوانایی‌ی مرۆڤ تا ئەوپەڕی بەگەڕ بخرێ. ئەمەیش لەڕاستییەوە دوورە، چونکە توانایی‌ی مرۆڤ جگەلە کەمی، بێ‌هێزیشەو، دووسێ پیاو لە تورکیا بۆکردنی کارێك بانگ دەکرێن کە لە شوێنەکانی تر بەکەسێك دەکرێ. هەروەها نابینرێ پیاو لە کێڵگەکانی کەناری دەریای رەش کار بکات. ئەم ئیشە ئافرەت دەیکات‌و، پیاوانیش لە قاوەخانەی گونددا، بەلەش گرانی، رۆژ بەسەر دەبەن. کشتوکاڵ کەسیستمی گومرکیی تورکیا تائەم ئاستەو چەند سەدەیەکە وای لێکردووە، زیاد لە پێویستی، بەرهەمی نەبێ، خودی جوتیارانیش بەهۆی چارەڕەشیی ئێستایانەوە، لێی بەرپرسن.

٥٨- حکومەتیش بەشی خۆی بەرپرسە. ناتوانم بڵێم دەکرێ سامانی کانزایی‌ی تورکیا قازانجی ئابووریی لێ‌بکرێ یان نا، بەڵام بەپێی تاقیکردنەوەکانی ئەم گەشتەم، بێ دوودڵی دەڵێم: تورکیا دەیتوانی ببێتە وڵاتێکی ئاوەدانی کشتوکاڵی. هەڵبەت مەبەستیشم لەمە ئەوە نییە کە ببوایەتە باخێکی هاوشێوەی ئەوانەی بەشە بەپیتەکانی کەنار دەریای رەش. ئەمە مەحاڵە، چونکە ناوچەیەکی فراوانی بێ پیتی شاخاویی هەیە، کە بە چاندنی دارستان نەبێ، کەڵکی نابێ. کەم‌و زۆر سەرجەم ئەو جێیانە کە من بۆیان چووم، دۆڵ‌و دەشتی پان‌و بەرین‌و بەپیت‌و ئاوی زۆریان هەبوو.

بیستم دەیانوت: شتێك نییە لەسەر زەمین هێندەی خاك پیرۆزبێ. دەشێ ئەمە راست بێ، بەلام پێویستیشە هاوکاریی ئەم دیارییەی خوا بکرێ. ئەگەر تورکیا بیەوێ پێش بکەوێو بەختیاربێ، ئەبێ رێگە کۆنەکانی کشتیاری وازلێبێنێو، جووتیاران دەست لەتەمەڵی هەڵگرنو، حکومەت ئەرکی خۆی جێبەجێ بکات.

٥٩- غازی لای خۆیەوە هەموو هەوڵێکی خستوەتەگەڕ بۆ خستنەرووی رێبازە هاوچەرخەکانی کشتوکاڵی. خۆ ئەگەر ئەمە لەجێیتریش بکرێ، بەلام بوار نەدرێتە جوتیار بەرهەمەکانی بەکرێیەکی گونجاو بێنێتە بازاڕ، ئەوا ئەم رێبازە قازانجێکی ئەوتۆی نابێ. هەربۆیە مەسەلەی رێگەکان، لای من، بایەخی گەورەیان هەیەو، دڵنیاشم زۆرکەسی ناو حکومەتو هەندێ فەرمانڕەوای ویلایەتەکانیش دەرکیان بەم راستییە کردووە. هەندێ لە فەرمانڕەوا نیشتمانپەروەرە راستەقینەکان زۆر کاردەکەنو ئاکامی ئیشەکانیان دیارە، بەلام جێی داخە هەندێکیتریان ناتوانن یاخود خۆیان لەقەرەی بنیاتنانو بووژانەوە نادەن. ئەمان سەر بەقوتابخانە کۆنەکانن‌و، تاڕادەیەك لە ئەنگورە دەترسن، بەلام هزرو تینو توانیان نییەو، گەرەکیانە کشتیاری بدەنە دەست خواو، ئەگەر پارەیەکیان لەڕێگەو قۆنتەراتەکانی ترەوە دەست کەوت، ئەوا کارێکی وەك چاککردنی(١٠)میل رێگەی دەرەوەی سنووری دەسەلاتیان بکەنو، بەرتیل وەرگرن. بەکورتی بەرژەوەندیی تاك، لای ئەمان، لە پێش بەرژەوەندیی نیشتمانییەوەیە.

٦٠- راستییەکە ئەوەیە: حکوومەتی تورکی، هەرچەندە جەخت دەکاتەوە، پارەو مرۆڤی کاراو دەستی کارگەری نین. کەمی ئەم مرۆڤانە تاڕادەیەك باشتربووە، چونکە وەرەیەکی نوێ لەناو رۆشنبیرانی ئەمڕۆی تورکدایەو، هەر کە بەرتیلو گەندەڵی لەبەین بران، ئەوا رێیتێدەچێ پێشکەوتنی راستەقینە سەربگرێ. تەنگوچەڵەمەی ترانزێتی تەرابزوون، بریتییە لە وەرگرتنی بەخشیشی زۆر. کارمەندانی حکومەت کاتێ ئەتوانن بەدڵسۆزیو بێ بەرژەوەندیی خۆیان خزمەت بکەن کە پارەیان

بدرێتیو، ئەمەیش ئەو کاتە دێتە دی کە حکومەتی تورك پارەی هەبێ. هەروەها سووری گەندەڵییەکە بەوجۆرە تەواو دەبێ کە: تا بەرەو پێش نەچن، پارەنابێ.

٦١- بەپێی ئەو راستییەی کەحوکمی تاك سەپاندن بەسەرگشتدا لە تورکیا، لەچاو شوێنەکانیتردا، ترسناکترە، بەهێزترینو دواسەرنجم لەسەر ئەم گەشتە گەڵاڵە کرد: ئەگەر سەرەڕای هەموو نیازە باشەکانی جیهان، هاوکاریی تورکیا نەکرێ، ئەوا ناتوانێ شێلگیرانەو لەهیچ چەرخێکی نالەبارو ناخۆشدا خۆی بەرەو پێش بەرێ. بەڕای من، پێویستە یاریدەدەرانی زانستیو رێگای نوێی کشتوکاڵی بەکار بێنێ. ئەبێ ئامۆژگاریی شارەزا وەرگرێو، کاری پێبکاتو، لەسەروو هەمووو شتێکیشەوە پارە پەیدا بکات. پسپۆرە داراییەکان پێنج ساڵی رابردوو دەستیان بە ئاگردا چزاوەو، مارانگازن. ئێستایش شەرم ئەیانگرێو، ئەگەر تورکیایش مەبەستیەتی، ئەبێ لە کەلی شەیتان بێتە خوارەوەو، بەرەو رووی ڕاستییەکان بێتەوەو، ژیرانە سەرمایەی دەستکەوێو، مامەڵەی شیاوی پێوە بکات، ئەمجا دەشێ دەزگاو دامەزراوە ناودارەکانی بازرگانی، وەك ئەم دەیەوێ، هاوکاریی بکەن. بەمە، هەرکاتێ ئەو گیانە نوێیەی هێنایە ناوەوە کە لە دەرەوەی وڵات لەبرەودایە، لەوانەیە بتوانێ خێرا سامانە شاراوەکەی گەشەپێبداتو، ببێتە وڵاتێکی شارستانیی خۆشگوزەران. بەپێچەوانەوە، ناشێ گەشبین بین. تورکیای کۆن هاوژیانێکی تایبەت بووەو، دەیتوانی کەم یا زۆر بمێنێتەوە. تورکیای نوێیش زووتر شکاوە. ئێستا پڕوپاگەندەی ئەوە دەکات کەدەوڵەتێکی مۆدێرنە، بۆ سەلماندنی ئەم قسەیەیشی، پێویستە هەنگاو بەرەو پێش بنێ، چونکە وەستان بۆ ئەم، واتە شکستە. ئەم وڵاتە هەوڵی داوە بەتەنها بەرەو پێش بچێ، بەڵام خۆ هەوڵەکانی، ئەگەر لەسەریشیان سووربێ، شتێکی ئەوتۆی بۆناکەن. ماوە ببینن ئایا دەرك بەبەرژەوەندیە راستەقینەکانی وڵات، پێش بەسەرچوونی کات، دەکرێ؟ یان ئایا کۆششە جێی مەبەستەکانی فەرمانڕەوایانی تورکیا کە وڵاتەکەیان تاوانبارکراوە بەوەی وا هەرچی

دەیکەن دەیخۆن و، زۆرکات بەهەمان شێوە هەڕەشەیە بۆسەر خۆی و جیهانیش، نوشوست دێنن؟

ئالێکس کەی. هێلم

قوستەنتەنییە ،۲۹ ی حوزەیرانی ۱۹۲۹

وەزارەتی دەرەوە ،٤٢٤،٢٧١، ل: ٢٣–٤٠، ژ: ١/١٠

## ژ: ٥١

## لە مستەر ئەدمۆندزەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن_( ٢٤ی ئادار گەیشتووە )

**ژمارە: ٨٩**

**ئەنگۆرە، ١٧ی ئاداری ١٩٣٠**

**گەورەم،**

خۆشحاڵم کۆپیی دوو برووسکەتان لەگەڵ کۆمیساری باڵای بریتانیادا لە عێراق بۆ بنێرم کە تایبەتن بەڕاپۆرتی رۆژنامەیەکی قاهیرە لەمەڕ داواکانی شۆڕشگێڕانی کوردی تورکیا لە حکومەت و، بۆ رەچاوکردنیان لەلایەن ئەم حکومەتەوە نووسراون.

٢. تەنها کەمێك سەبارەت بەو برووسکەیە هەیە کەبۆ (سێر ئێف هەمرین)م ناردووە. رێکخراوە کوردییەکان هەرچەندە لە دەرەوەی تورکیا چالاك بن، بەڵگەیش هەیە کە چالاك نین، زۆر بە گومانم ئەو کوردانە کە لە تورکیادا ماونەوە، یەکێتی و سەرۆکایەتی یاخود دەسەڵاتێکی وایان هەبێ تا ئەمڕۆ ئەم جۆرە داوایانە لە حکومەتی تورك بکەن. پێم وایە ویلایەتەکانی رۆژهەڵات کە مستەر هێلم کۆتایی ی مانگی حوزەیرانی ساڵی رابردوو سەری لێدابوون (راپۆرتی ژمارە ٣٠٥ی ١١ تەمموزی ١٩٢٩ ی مستەر جی. کلارك) وەك خۆیان ماون.

٣. ماوەیەك هەندێ هەواڵی ئەوناوچانە دزەیان دەکرد. حوزەیرانی رابردوو شەڕی نێوان سەربازو کوردی هەرێمی قەرەکۆسە– بایەزید بە کونسوڵی خاوەنشکۆ

لە تەرابزوون راگەیاندراوە. هەر ئەو مانگە، ئیبراهیم تاڵع بەگ لەغەرزانی نزیك سعرت هەواڵی خۆبەدەستەوەدانی کوڕانی لە قەیسەرییەوە هەڵاتووی حەسەن پاشای پێگەیشت. چاپەمەنیەکان سەرەتای تشرینی یەکەم بڵاویانکردەوە کە دەستەیەك کوردی بەفەرمانی زادۆ( یادۆ؟)[1] لە ناوچەی دیاربەکر– ئەلعەزیز سەرکوتکراون. کۆتایی ساڵی ١٩٢٩ ئیبراهیم تاڵع بەگ سەردانی ساڵانەی خۆی بۆ ئەنگۆرە کرد. حکومەتی تورك متمانەی پێبەخشیوەو، لەجێبەجێکردنی دەسەڵاتە فراوانەکەیشیدا، ئەتوانێ ناوبەناو ئەو جۆرە سەرکەوتنانەی وەك: دابەشکردنی زەوی بەسەر جوتیارانی گوندەکانی نزیك ئەلعەزیزو کردنەوەی ئۆجاغێك لە پالووی نێوان ئەلعەزیزو مووش یان پرۆژەیەك بۆ گواستنەوەی سەرمایە لە ویلایەتی بدلیسەوە بۆ مووش، رابگەیەنێ. لەبەر نەبوونی هەواڵی پێچەوانە، واهەست دەکەم دەکرێ وای دابنێین کە پرۆسەی مەحکەم‌و توندو تۆڵ، بەڵام نەك بێسۆزو عاتیفەی بەتورككردنی رەگەزی کورد لە تورکیادا، بەرێکوپێکی سەردەکەوێ.

٤. کۆپیی ئەم نووسراوەم بۆ نوێنەری باڵای بریتانیا لەبەغدا ناردووە.

دەبلیوو. ئێس. ئەدمۆندز

*　　*　　*

## هاوپێچی (١)ی ژ: ٥١

## بروسکەی کۆمیساری باڵای بریتانیا لە بەغدا، بۆ نوێنەری خاوەنشکۆ لە قوستەنتەنییە.

**١٣ ی ئاداری ١٩٣٠**

راپۆرتێك گەیشتە ئێرە کە لە رۆژنامەی ((مساوات))ی قاهیرەدا بڵاوکرابووەوەو، دەیوت: شۆڕشگێڕانی کورد لە تورکیا چەند داوایەکی تایبەتیان لە حکومەت کردووەو، ئەمیش رەچاویان دەکات.

---

[1] یادۆ، پێشتر بەشداری شۆڕشی شێخ سەعیدی پیرانیش بووە (د. نوری دەرسیمی، دەرسیم لە مێژووی کوردستاندا، وەرگێرانی د. ئەحمەد فەتاح دزەیی، چ١، دەزگای چاپو بڵاوکردنەوەی موکریانی– هەولێر، ٢٠٠١، ل ٢١١) .(س)

حەزئەکەم بزانم ئایا ئێوە هیچ زانیارییەکتان هەیە لەو بارەیەوە کە حکومەتی تورك، بە لە بەرچاوگرتنی ڕێتێچوونی کاردانەوەی کوردانی عێراق، بەنیازێ سیاسەتی خۆی بەرامبەر بەکورد بگۆڕێ؟

* * *

## هاوپێچی (٢)ی ژ: (٥١)

## لە نوێنەری خاوەنشکۆوە، ئەنگۆرە، بۆ کۆمیساری باڵا لەبەغدا

**١٣ی ئاداری ١٩٣٠**

ئاماژە بەبروسکەی ڕۆژی ١٣ی ئادارتان.

ئەو هەواڵەم نەبیستووەو، پێم وایە شتی وانییە، سیاسەتی گشتیی حکومەتی تورکیا بەرامبەر بە کورد هەر بەئاشتیخوازانەی ناوەندگر (معتدل) دەمێنێتەوە.

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٢/٤٢٤، ل:٨٧، ژ: ٤٢

## ژ: ٥٢

## لە سێر ئار. کلایڤەوە بۆ مستەر هندرسن- (٢٩ ی نیسان گەیشتوە)

**ژمارە: ١٥٧**

نوێنەری خاوەنشکۆ تەواوکەری ڕاپۆرتەکانی پێشکەشی وەزیری دەرەوەی خاوەنشکۆ دەکات. لێرەدا وێنەی ڕاپۆرتی ژمارە ٥٧ی ١٦ ی نیسانی ١٩٣٠یتان بۆ دەنێرم کە لە مەڕ دڵە ڕاوکێی حکومەتی ئێران لە (جووڵانەوەی کورد) بۆ کۆمیساری باڵای خاوەنشکۆی لە عیراق ناردووە.

تاران، ١٦ی نیسانی ١٩٣٠

* * *

## هاوپێچی ژ: ٥٢
## لە سێر ئاڕ. کلایڤەوە بۆ سێر ئێف هەمفریز

**ژمارە:٥٧**

**تاران، ١٦ی نیسانی ١٩٣٠**

**گەورەم،**

وەزیری داد لە چاوپێکەوتنێکدا کە دوێنێ لە گەڵمدا کرد، نائارامیی خوێی لەو مەسەلەیەی کە بە (جووڵاندنەوەی کورد)ی ناوبرد، دەربڕی، ئەو وتی: بیرۆکەی کوردستانێکی یەکگرتوو ئەرمینیای سەربەخۆ، دیسان قسەیان لەسەرکراوەتەوە، ئەو باوەڕی وا بوو کوردانی ئێران، تائێستا، تەواو لە دەرەوەی ئەم بزووتنەوەیەدا بوو، بەڵام سیاسەتی تورك بەرامبەر بەدانیشتوانی کورد هەمیشە سەرچاوەی نیگەرانیی حکومەتی ئێران بووە، ئا لەم کاتانەدا وتراوە حکومەتێکی کوردی کەتەنانەت خاوەنی وەزیری دەرەوەیشە، لە نزیك شاخی ئاراراتدا هەیە.

٢ـ هاوکات بیستبووی کارمەندانی بریتانی لە عیراق لەگەڵ جووڵانەوەکەدان کە بۆ کوردستانێکی سەربەخۆیەو، سەرکردەکانی بزووتنەوەکە، بۆ ئەم مەبەستە، داوایان لە شێخ مەحموود کردووە. چاپەمەنییەکانی تورکیا بەم دواییە رایانگەیاند: کۆلۆنێل لۆرەنس لە کوردستان بووە. هەروەها وەزیر نەیزانی ئەم هەواڵە لە چاپەمەنیەکانی عیراقدا بڵاوبووەتەوە. پاشان وتی: سوپاسگوزار دەبێ ئەگەر من بتوانم هەر هەواڵێك لەسەر ئەم بابەتە لەبەغداوە وەربگرم. پێم وت: من لە بیستنی ئەو حیکایەتانە تەواو ماندوو بووم کە ئەڵێن گوایە کۆلۆنێل لۆرەنس لە بەشە جیاجیاکانی رۆژهەڵاتو ناوەڕاستی ئاسیادایە. لەو بارەیەیشەوە کە گوایە کارمەندانی بریتانی لە عیراق سۆزیان بۆ جووڵانەوەی کورد بەگشتی هەیە، بەراشکاوی، بڕوام بەمە نییە، ئەگەر کۆمیساری باڵا لە بەغدا بیەوێ سەرنجی قسەکەی ئەو بدات، بۆی ئەنووسم.

٣ـ (تەیموور تاچ – Teymour tache)یش لەوتووێژەکەیدا ئامـاژەی بـۆ {پـارتی موسـاوات (Mussouat) بـۆ قۆقـازێکی سـەربەخۆ} کـرد کـە ئێسـتا سەرکردەکانی لەقۆستەنتەنییەن، بەرنامەی ئەم گرووپە دژی ئێرانە، چونکە ئامانجی ئازربایجانی (یەکگرتوو)ە کە هەموو ئەو بەشـەی ئـێران تـا زنجان دەگرێتـەوە، ئـەو وتی: پێویست ناکات ئەم پارتە زۆر بەجددی تێ بخوێنرێتەوە، بەڵام گرنگە بزانرێ چ پەیوەندییەکی، ئەگەر هەبێ، بە بزووتنەوەکانی ئەرمینیای سەربەخۆو، کوردستانی یەکگرتووە وە هەیە.

٤ـ وێنەیەکی ئەم راپۆرتە بۆ وەزیری کاروباری دەرەوەی خاوەنشکۆو سـکرتێری دەرەوە بۆ حکومەتی هندستان نێردراوە.

ئارِ. ئێچ. هەمفریز

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٢/٤٢٤، ل:١١٠-١١١، ژ:٦٢

ژ:٥٣

**لە سێر ئێف. هەمفریزەوە بۆ سێر ئـاڕ. کلایـڤ- (لـە ئۆفیسی کۆلۆنیەکانـەوە ١٧ی مایس ئاڵوگۆڕکراوە).**

**بەغدا، ٢٩ی نیسانی ١٩٣٠**

**بەڕێز،**

حەز ئەکەم ئاماژە بە نووسراوی (ژمارە ٥٧ی ١٦ نیسانی ١٩٣٠)ت بکەم کە تێدا هـەم لـەو گفتوگۆیـەی کـە لەسـەر چـالاکیی نەتـەوە پەرستانی کـورد لەگـەڵ بـەڕێز وەزیری داد دا سازت دابوو، هەم لە گومانی بەڕێزی کە گوایە کارمەندانی بریتانیا لـە عـیراق سـۆزیان بـۆ جووڵاندنـەوەی کوردسـتانێکی سـەربەخۆ هەیـە، ئاگـادارت کردبوومەوە.

٢ـ پێشنیار دەکەم، ئەگەر بەڕێزی جارێکیتر باسی ئەم مەسـەلەیەی کـرد، پێـی بڵـێ: حکومـەتی خاوەنشـکۆ، لـە ئـەنجامی ڕێنوێنیـەکانی ئەنجومـەنی کۆمەڵـەی نەتەوەکانەوە، کاتێك بڕیار لەسەر ناکۆکیی سنووری مووسڵ لەگـەڵ تورکیـادا درا، مەرجێکی هەبوو کە بەو پێیـە چـەند ئیمتیـازێکی تایبـەتی وەك بـەکارهێنانی زمـانی زگمـاك بـەرەسمی، بدرێنـە کوردانـی عـیراق. کەواتـە شـتێکی ئاسـاییە کارمـەندانی بریتـانی لـە عـیراق چـاودێریی جێبـەجێکردنی ئـەم مەرجـە بکـەن‌و، بزانـن ئایـا بەشێوەیەکی شیاو بەڕێوە دەچێ یان نا.

٣ـ لەگەڵ ئەمەیشدا، دوور لەهاندانی بیرۆکەی ئۆتۆنۆمیی کوردستان کە لە لایەن چەند ناسیۆنالیستێکی توندڕەوەی کوردەوە، بەدی دەکرێ، کامەرندانی بریتانیا لـە عـیراق بەهـەردوو کۆمیسـاری پێش خۆشمـەوە، وەك ئاگـاداریت، زۆر وریـا بـوون، نەیانهێشت عیراق ببێتە ناوەندی نەتەوەپەرستانی پیلانگێڕی کـورد کـە دەیانـەوێ ئـاڵۆزی‌و نائـارامی لـەناو کوردانـدا بـەرپا بکـەن. درێـژەی ئـەو ڕێوشـوێنانەی سـاڵی ١٩٢٨، کە بۆ ئەم مەسـەلەیە گیراونەبـەر، لـە هـاوپێچی ڕاپۆرتـە نهێنیـەکانی ژمـارە

١٦٣٣ی ١٤ی تەممووزو ١٨٢٥ی ١٢ ئابی ١٩٢٨ی سێر هێنری دۆبسدا بۆت نێردراون، دەکرا بەتایبەتی ئەو رووداوەی کە لە برگەکانی ١١و ١٢ی نووسراوی ژمارە ١٦٦٣ی ئاماژەپێکراودا باسکراوە، بیری وەزیری داد بهێنرایەوە، لەویش زیاتر، ئەوە دەرەنجامی راستەوخۆی نوێنەرایەتیی کۆمسیۆنی باڵا بوو کە حکومەتی خاوەنشکۆ مانگی شوباتی ساڵی ١٩٢٩ لیستێکی تایبەتی ئەو ناسیۆنالیستە کورد- ئەرمەنییانەی بۆ ئەفسەرانی پەساپۆرت نارد بۆ ئەوەی ڤیزەکانیان بۆ عیراق بدرێنە دواوە.

٤ـ وا هەست دەکەم ئەگەر بەرێز وەزیری داد ئەو راستییانەی بهێنرێتەوە یاد، بیانوو و پاساوی لەباری نامێنێ بەرامبەر بەو گومانانەی کە لە بۆچوونی دەسەڵاتدارانی بریتانیادا لە عیراق بۆ بزووتنەوەی کوردستانێکی سەربەخۆ دەربڕیبوون.

٥ـ کۆپییەکی ئەم راپۆرتە بۆ وەزیری کاروباری وڵاتە کۆلۆنیالکراوەکان دەنێرم.

ئێف. ئێچ. هەمفریز

کۆمیساری باڵا لەعیراق

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٢/٤٢٤، ل:١١٤، ژ:٦٦

*** *** ***

ژ:٥٤

**لە مستەر ئەدمۆندزەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن_ (٢٦یمایس گەیشتووە)**

**ژمارە: ١٥٨**

**قوستەنتەنییە، ٢١ی مایسی ١٩٣٠**

**گەورەم،**

خۆشحاڵم وێنەی دوو راپۆرتی کونسوڵی تەرابزوونی خاوەنشکۆتان لەسەر یاخیبوونی کورد لە هەرێمی چیای ئاراراتدا بۆ بنێرم. بەکورتی، پێنج هەزار کوردێکی سەر سنوورەکانی روسیا- ئێران کۆتایی مانگی شوبات راپەڕیبوون،

زۆربەیان لەلایەن سەربازانی تورکەوە کوژرابوون، نزیکەی ٥٠٠ کورد هەڵاتبوونە کێوەکان، بەڵام تورکەکان چالاکانە شوێنیان کەوتبوون. ئەم تورکانە لەوە دەترسان ئەمەرنییەکانی روسیاو کوردەکانی ئێران هاوکارییان بکەن.

٢ـ مستەر ماتیوس نووسیویە: ئاسایشی گشتیی ویلایەتەکانی ئەرزڕۆم و ئەرزنجان و گوموشخانە[1]، جێ رەزامەندییە، بەڵام لە قارس و بایەزیدو بدلیس و وان بەپێچەوانەوەیە. نیزام، وەك لەراپۆرتی ژمارە ١٥٩ی ئەمڕۆمدا دەبینرێ، باڵی بەسەر گەورەترین بەشی ویلایەتە کوردییەکانی باشووردا، بە بەدلیس و وانیشەوە، کێشاوە. بۆیە دەشێ وا دابنرێ کە کاربەدەستان باروذۆخی باکوورو باشووری کوردستانیان کۆنترۆڵکردووە. راپۆرتەکانی مستەر ماتیۆس پیشانی دەدەن کە تورك بەچ خێرایی و توانایییەکەوە رەفتار لەتەك هەر هەوڵێکی ئاژاوەو یاخیبووندا دەکات.

دەبیلو. ئێس. ئەدمۆندز

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤/٢٧٢، ل:١١٥، ژ:٦٧

* * *

**هاوپێچی (١) ژ: ٥٤**

**لە کونسوڵ ماتیۆسەوە بۆ سێر جی. کلارك**

**ژمارە:٤٨**

**تەرابزوون، ٢٩ی نیسانی ١٩٣٠**

**گەورەم،**

ئاماژە بەنووسراوی نهێنی ژمارە ٤٧ی ٢٨ی ئەم مانگەم لەسەر یاخیبوونی پڕۆپاگەندە بۆ کراوی کورد لەناوچەی وان و بایەزیدو بدلیس، ئەم زانیارییانەتان لەیەکەمی ئەو دوو سەرچاوەیە کە لەو راپۆرتەدا نووسیومن، پێ رادەگەیەنم.

---

[1] ویلایەتێکی باکووری رۆژهەڵاتی تورکیایە، لەخوار ویلایەتی تەرابزوونی سەر دەریای رەش. (س)

٢ـ یاخیبوونەکە دوو مانگە لە ویلایەتە سنووریەکانی نزیك کۆماری ئەرمینیای روسیاو ئێران بەرپابووە. چەند شەڕو شۆڕێك لەنێوان سەربازانی تورك و ٣٠٠٠-٥٠٠٠ چەکداری کورددا هەڵایساون و، کوردان شکستییان تێدا هێناوەو، زۆریان کوژراون و، دەستگیرکران و، بە بەندکراوی بروانە ویلایەتەکانی تر. پێنج سەد کەسیش کە رزگاریان بووە، ناچار کراون هەڵبێنە چیاکان و، لەوێوە پەلاماری گوندەکان بدەن و، دزی بکەن و، هەندێ جاریش هاووڵاتییان بکوژن. جەندرمە بۆ لەناوبردنی رزگاربووان و سەربازیش بۆ یارمەتیدانی جەندرمە، لەکاتی پێویستدا، تەرخانکرابوون. ئاسایشی گشتی لە ویلایەتەکانی ئەرزرۆم و ئەرزنجان و گوموشخانەدا، بالادەستە. بەڵام گەشتی ویلایەتەکانی وان و قارس و بایەزیدو بدلیس مەترسیدارە.

٣ـ ئەم زانیاریانەی خوارەوەیش لەسەرچاوەی دووەمی ئەو دووانەوە کە لە برگەی یەکەمی سەرەوەدا ئاماژەم بۆ کردوون، وەرگیراون. کوردێکی خالیس ناوی کوڕی شێخ عەبدولمەجیدی ناوداری کورد، کەسێ ساڵێك پێش ئێستا لە هەرێمی بایەزیدەوە بۆ برووسە راگوێزرابوو، یاخیبوونەکەی لەناو ئەندامانی تیرەکەی و خێڵە دۆستەکانی نیشتەجێی دەورووبەری شاخی ئاراڕات رێکخستبوو. خالیس، دوای چەند شەڕێك کە دوو مانگی رابردوو روویان دا، دەستگیرکرا. بەڵام کاتێك دەیانویست لە ئەرزرۆمەوە بیبەنە تەرابزوون، هەڵات. ئەمجا چووە خاکی ئێرانەوەو، ئەڵێن ئێستا لەوێ کوردان بۆ ئەوە هاندەدات، کەدژی حکومەتی تورکی درێژە بەبەرگری بدەن. عاسم پاشای ئەفسەری فەرماندەی سەربازانی ناوچەی بایەزید،پاش گەیشتنی بروسکەی فەرمانی ئەنکورە بۆ لەناوبردنی کوردانی رزگاربوو، بەهەرنرخێك بێ، رایگەیاند: بەهۆی سروشتی هەرێمەکەوە، ئەم جۆرە فەرمانانە، تەنانەت بە دوو سێ فەیلەق سەربازیشەوە، ناتوانرێ جێبەجێ بکرێن. دەسەڵات دارانی تورك، چونکە رێیتێدەچوو ئەو کوردانەی وا ئاسایی لەخاکی ئێران جێگیربوون، پەیوەندی بەکوردانی تورکیاوە بکەن و، لەبەر ئەو بۆچوونە بڵاوەش کە گوایە کوردەکان

یارمەتیی ئەرمەنیەکانی روسیایان پێگەیشتووە، بەدوو دڵنییەوە لە بارودۆخەکەیان دەڕوانی. کۆمەكو یارمەتی لە فەیلەقی هەشتەوە نێردراونە ناوچەی سنوور، سەربازگەی سنوورەکانی ئێران و ئەرمەنستان توندو قایم کراون.

٤- لێرە تێبینیی هیچ جموجۆڵێکی فەیلەقی هەشتم نەکردووەو ئەو سەربازانەیش کە لەو فەیلەقەوە نێردراون و فەرماندەییەکەیان لە تۆقاتە، لەرێی ئەرزنجانەوە بروان. بەپێی راپۆرتێك کە بۆ یەکەمجار لە هاوکارە ئەڵمانییەکەمەوە بیستم و بڵاوبووبووەوە، سوداد پاشا بەهۆی هەلومەرجی هەرێمەکەیەوە بانگکراوەتەوە بۆ فەرماندەیی فەیلەقی نۆ. بەڵام پشت راستکردنەوەی ئەم هەواڵەم پێنەگەیشتووە. تێپەڕبوونی سەرەتای ئەم مانگەی فەسیلەکانی جەندرمە بەناو تەرابزووندا،وەك لە نووسراوی ژمارە ٣٨ی ٢ی ئەم مانگەمدا هاتبوو، وا دەردەکەوێ بووبێتە کەرەستەی راپۆرتەکانی تایبەت بە ئاڵۆزیو نائارامی تەرابزوون کە بوونە بابەتی بەدرۆخستنەوەیەکی رەسمیی ١٥ی نیسان. پێم راگەیاندرا: ئەم راپۆرتە، پاش ئەو بروسکانە، لەناوەوە بڵاوکرایەوە کە بۆ ریسواکردنی ئەمەك و پشتیوانیی دانیشتوانی تەرابزوون بۆ کۆماری تورکیا، نێردرابوونە ئەنگۆرە.

٥- ئاژاوەی ئەرمەنییەکان، بەپێی سەرچاوەیەکی دەرەکی کە رەنگە باش ئاگاداری رووداوەکانی قۆقاز بێ، لەوێ لە ئارادایە، بەڵام هیچیتر لەو بارەیەوە نەزانراوە.

دەبلیو.دی. دەبلیو، ماتیۆس

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٢/٤٢٤، ل١١٥–١١٦، ژ: ١/٦٧

*    *    *

## هاوپێچی (٢)ی ژ: (٥٤)
## لە کۆنسوڵ ماتیۆسەوە بۆ سێرجی. کلارک
## تەرابزوون، ٧ی مایسی ١٩٣٠

گەورەم،

ئاماژە بە نووسراوی ژمارە ٤٨ی ٢٩ی مانگی پێشووم، ئەزانم عاسم پاشای ئەفسەری فەرماندەی سەربازانی لە ناوچەی بایەزیدەوە گواستراوەتەوە قۆنیەو، زەکی پاشای سەرۆکی پێشووی جەندرمە کە لە راپۆرتی ژمارە ٢١ی ١٠ شوباتی رابردوومدا ئاماژەم بەدەستنیشانکردنی بۆ فەرماندەی فیرقەی ١٥ کردبوو، لە بایەزید جێی گرتوەتەوە. ساڵح پاشای ئەفسەری فەرماندەی فەیلەقی ٩ کە هاورێی خودی غازییەو، پێشتر لەسەرەوەی ئەرکاندا بووە، چالاکییە سەربازییەکانی ئیغدیر بەرێوە دەبات، پێیان راگەیاندم: دوا ئامادەکاری کراوەو، ئۆپەراسیۆنەکانی دەستپێکراون، یان چەند رۆژی داهاتوو ئەنجام دەدرێن.

٢ـ نزیکەی ١٥٠٠٠ سەرباز کە لە هەرێمەکانی ئەرزنجان‌و ئەرزرۆم‌و بایبورتەوە هێنراون، لە ناوچە سنووریەکان کۆکراونەوە. ئەمەیش پێدەچێ هێزێکی زۆر گەورە بێ بۆ کۆنترۆڵکردنی چەند سەد کوردێك.

٣ـ زانیاری دوو سەرچاوەی سەربەخۆم پێگەیشت کە ژمارەیەکی زۆری ئەرمەنی ویستوویانە سۆڤیەت جێبێهڵن، مۆڵەتیان نەدراوە بێنە ئەم وڵاتە، بۆیە دەچنە ناو خاکی ئێران. ئەم کۆچە زادەی برسێتیی ناوچەی قۆقازەو دەست بەسەراگرتنی کەلوپەلەکانیانە لە لایەن روسیاوە، وەك بەرێزت ئاگاداری، ماوەیەك موسڵمانانی جۆرجی‌و ئاجار (Ajar)[1] لەقۆقازەوە بەردەوام پەنایان بۆ ئێرە دەهێنا.

---

[1] ئاجار ئەو رەوەندە جۆرجیانەن کە سەدەی ١٧ موسڵمان بوون‌و، هەژارەکانیان خاوەنی زیاتر لە ٥٠٠ سەر مەرو بزن‌و، تۆتۆتۆمییان پێدراوە. ئەمانە بەشێکیان لە تورکیا دەژین.
(-http: // www. ourworld. compuserve. com/ home pages/ usazerb/ 4B. htm

٤ـ پێشبینی دەکرێ حەسەن خان ئەختەری کونسوڵی گشتیی ئێران لە تەرابزوون، چەند رۆژێکی‌تر لە ئەرزڕۆمەوە بگاتە ئێرە.

دەبلیوو.دی. دەبلیو. ماتیۆس

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٢/٤٢٤، ل:١١٦،ژ ٢/٦٧

*** *** ***

## ژ:٥٥

## لە مستەر ئەدمۆندزەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن

**ژمارە: ١٥٩**

**قوستەنتەنییە، ٢١ی مایسی ١٩٣٠**

**گەورەم،**

خۆشحاڵم تێبینییەکانم لەسەر گەشتێکی سەرەتای ئەم مانگەم بۆ دیاربەکر، بدلیس‌و مووش هاوپێچ بکەم.

٢ـ وێنەیەکی ئەم نووسراوە بۆ کۆمیساری باڵای خاوەنشکۆ لەبەغدا دەنێرم.

دەبلیوو. ئێس. ئەدمۆندز

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٢/٤٢٤، ل:١١٦، ژ: ٦٨.

*** *** ***

---

- http: // www. swat valley. com/swat/cs/swat5.shtml
- http:// www. osgf.ge/all/ika/people-of- georgia. htm)

## هاوپێچی ژ: ٥٥
## تێبینی لەسەر گەشتێکی دیاربەکر، بدلیس مووش

**مەرعەش،**

مەرعەش شارێکی ئاوەدانە. شوێنەکەی کەوتووەتە سەر شاخێك و بەسەر دەشتێکدا دەڕوانێ کە تا ٣٠میل بەرەو باشوورو(فەوزی پاشا) درێژ دەبێتەوە، بەڵام ئەم دەشتە تاڕادەیەك وەك زەلکاوی مەلاریا هەڵهێنان وایە. هەرچەندە لێژاییەکانی دەوروبەری کشتوکاڵی تەواویان تێدا کراوە، دەشتی فراوانی ئەلبیستان (Elbistan)[1] یش بەرەو ژوور زۆر دەوڵەمەندە، کەچی بازرگانی لەم شارەدا وەستاوە. تەنها لەبەر شتێك گرفتی دراو هەیە. مامەڵە تەنها بەدراوە زیوو زێڕە کۆنەکان دەکرێ و، پڕۆپاگەندەی ڕۆژانەیش دژی ئەم دراوانە، لەسەر سنووری سوریا، ئەم جۆرە پارانەی لەکار خستووە. دووەمیش بە دەگمەن کەسێك ئەبینرێ پارەی هەبێ و، کەسیش متمانەی نییە قەرز بداتە کەسێکی تر. وەکیل نەماوەو، وەکیلەکانی زوو ئەرمەنی بوون. بەروبووم باشن، بەڵام ترسی ئێرە، وەك هی هەر شوێنێکی تر، بریتییە لەوەی کە جووتیاران نەتوانن بیانفرۆشن. دیسان وەکیل بۆ ئەمەیش نەماوە. جگە لەمانەیش کشتیارە باشەکان ئەرمەنی بوون و، ئەم بۆشاییەی کە دروست بووە، کاری نەك هەر لە چەندایەتی بەڵکو لەچۆنایەتیی بەروبوومیش کردووە.

مەرعەش لە کەللەرەقیدا هاوشانی قەیسەرییە. قەیسەریە کە هێڵی ئاسنی ئەنگۆرەی لەسەرە، تاڕادەیەك بووژاوەتەوە. مەرعەش هێشتا بەبیرە کۆنەکانەوە نووساوە. هێڵە ئاسنەکە ئەبێ ئەمساڵ بگاتە مەلاتیەو، نزیکەی ١٥ میل دوور لە مەرعەش تێدەپەڕێ و، ئەگەرچی ئەو پاس و ئوتومبیلانەی کە بەسەر ڕێگەیەکی

---

[1] قەزایەکی باکووری ڕۆژهەڵاتی ویلایەتی مەرعەشە.(س)

سەرەکیی زۆر باشدا دەڕۆن، لەگەڵ شەمەندەفەرێکدا کە هەفتـەی سێجار دەڕوات، پەیوەندییەکی باشیان درووست کردووە، هێشتا ئەم شارە لەخولیای نوێ بوونەوەدا سستو خاوو دابڕاوە. خاوەن زەویـەکانی نـاوخۆ زۆر دەسـەڵاتدارنو، جووتیـاران وەکو "رەعییەت" وان. لەوە دەچوو شتێکی کەم بـۆ هەڵوەشاندنەوەی موڵکایـەتی کرابێ. وادیاربوو والی کەوتبووە بەر دەسەڵاتی بنەماڵەکانی ناوخۆ. ئۆجاغێکی تـورك لەشارەکەدایە، بەڵام هەستم کـرد پێشـکەوتنی ئـەوتۆی دژی دابو نەریتـە کۆنـەکان بەدەست نەهێناوە. زۆرجار والی ئۆجاغ هانی سەما دەدەن، بەڵام مەرعەش زۆر کـەم پەسەندی دەکات. مامۆستایەکی قوتابخانە دەستی لـەکار کێشـابووەوە بـۆ ئـەوەی ژنەکەی، وەك داواکرابوو، نەبات بۆ سەماکردن. ئەڵێن مەرعەش، ئەگەر بوێرێ، ئـەوا وەك مـەرد رائەپـەڕێ. بـەڵام ئـێرە سـەربازگەیەکی لێیـەو، لـە راپۆرتـی مامەڵـەی توندوتیژی کوردانەوە، دەردەکەوێ کە ئەم دوو هۆکارە شارەکەیان سەرکوتکردووە.

لەبەر ئەوەی بەر لەڕاگواستنی ساڵی ١٩١٥ سێیەكو بـەڵکو زیـاتری دانیشـتوانی ئەم جێیە ئەرمەنی بوون، ناوچەیـەکی فراوانـی ئـەم شـارە وێـران بـووە. گـەندەڵیی یاسـایی، بەتایبـەتی سـەبارەت بـە موڵکــە جێماوەکـان، یــەکجار زۆرە. پەنابــەران لەبۆسـنەو جێیترەوە هێـنراون بۆ پڕکردنــەوەی ئــەو بۆشــاییەو، هــەمان دەردی بەشخوراوییان چێشـتووە. رۆژانـی هـەینی مـانگو ئەستێرەیەك لەسـەر کڵێسـەی "فڕانسیسـکان- Franciscan"[1] کە ئێسـتا قوتابخانەیـەکی تورکییـە، دادەنرێـن. پێدەچێ حکومەتی فەڕەنسە نەیـەوێ، بـەلابردنی قەتماغـەی برینـە کۆنـەکان، یـادە تاڵەکان ببزوێنێ. جا ئەگەر فرانسیسکیەکان وەریشیان بگرتایـەوە، بەهۆی نـەمانی مەسـیحییەکانەوە پێویسـتییان پێـی نـەدەما. دوو مامۆسـتای ئـەمریکیی دینــی

---

[1] رەهبانییەکە قەشە فەرەنسیس ئەسیزی دایمەزراندو، هـەژاریی کردە بنچینەیـەکی ژیانی خۆی. لەسـەر سواڵ ئەژی. راهیبەکانی رووبانکردە فـێرکردنو مژدەدان لـە شـارەکانداو، ژیـانی گیـانیی عەلمانیـەکانیان بووژانـدەوە. لـە رۆژهەڵاتـیش (پاسـەوانی خاکە پیرۆزەکانن)، لـە قـودسو دمیـاتو قاهـیرەو بـەیرووتو حەڵەبو تەرابولسو ناسیرەو سەیدا دابەزین (المنجد فی للاعلام، حکومەتی ٥٢٦).(س)

مەسیحی، هێشتا هەر لەقوتابخانەیەکی چۆڵدا ماون. چەندین ئافرەتی تری مەسیحییش تا ئێستا خۆیان بۆ ئەو کەمینەیەی کەماوەتەوە، تەرخانکردووە.

## عەینتاب

دیمەنی عەینتاب، یاخود وەك لەبەرنەخشی لە دوژمنایەتی ساڵانی ١٩١٩و ١٩٢٠ی تورك- فەرەنسیدا پێی دەڵێن‌و بەرەسمیش ناونراوە (غازی عەینتاب)، زۆر تێکچووە، بەڵام لەچاو مەرعەش کە دژیەتی، گوزەرانی خۆشترە. ئەم شارە هەشت مانگ لە دوژمنایەتیی فەرەنسەوە گلابوو و، نزیکەی سی مانگیش گەمارۆیان دابوو، بۆیە ئەمەکی خاکی رزگارکراوی هەیە. دوو کۆمەڵی سیاسیی لێن؛ یەکێکیان شوێنکەوتووی قلیچ عەلی بەگو، ئەویتریان هی عەلی جەنیانی بەگەو، هەردوو نوێنەری شارەکەن. لەوکاتەوە کە عەلی جەنیانی وەك وەزیرێکی بازرگانی نەیتوانیوە جیاوازی لە نێوان پارەی دەوڵەت‌و هی خۆیدا بکات، تاقمەکەی گەلێ بێ هێزبووە، بەڵام هەردوولا دڵسۆزی کۆمارو رێبازەکانین. ئۆجاغێکی تورکی چالاکی تێدایە کەمانی خوێندن‌و یاری‌و سەماو هتد دەدات‌و، روویەند وردە وردە خەریکە نامێنێ. ئەو کچانەی کە واز لە خوێندن دێنن، جگە لەشەپقە لەسەرکردن، بیر لەشتێکیتر ناکەنەوە، بەڵام ئافرەتە پیرەکان، ئەگەر رووبەندیش نەپۆشن، سەریان هەر دادەپۆشن. ئەو ئافرەتانەی کە لە کاروبارە کۆمەڵایەتییەکاندا دەردەکەون، ژنی ئەفسەرو کارمەندەکانی خەڵکی ئەنگۆرەو قوستەنتەنییەو ناوچە پێشکەوتووەکانی ترن. دانیشتوان خۆیان بەتورك ناودەبەن، بەڵام زیاتر عەرەبن. گومانی تێدا نییە، خوێندنی چڕوپڕو داخستنی سنوور بەرووی هاتوچۆ و پەیوەندیی باشووردا، وا لە قسەو تێڕوانینی ئەم ناوە تازەیە دەکات کەزیاتر تورکی بن. شتێکی سەیرە کە عەلەوی (شیعە) کانی ناوخۆ ئەم رژێمە نوێیەیان بەدڵەو، بەهۆی زیادبوونی دەستڕۆیی( نفوز)ی پیاوانی دینییەوە، هەست ناکەن ئیتر کەمینەیەکی بێزراوبن.

عەینتاب لەرووی بازرگانییەوە باش دەردەکەوێ. سنوورە تازەکە کۆتایی بەو بازرگانییە ترانزیتە هێناوەکە عەینتابی پێش دەخست. بەڵام عەینتاب سەروەت‌و

سامان لە هەرێمێکی دەوڵەمەندی نێوان خۆیو سنووری سورریاوە دێنێ. فستقو زەیتوونو سابوون، لە ڕێگەی ئەدەنەو مەرسینەوە بەرەو ڕۆژئاوای تورکیا، یان دەرەوەی وڵات، دەنێردرێن. خەڵك دەڵێن: زۆر حەزیان لە سەروەتو سامانە، هەڵبەت ئەمەیش دەرهاویشتەی راگوێزانی ساڵی ١٩١٥ی ئەرمەنییەکانە کە ژمارەیان سی هەزار بەرامبەر بە پەنجاهەزار موسڵمان بووە. کەچی کۆی گشتیی ئەمڕۆی دانیشتوان لە (١٥-٢٠) هەزار تێناپەڕێ، بەڵام ئەم شارە کە بێ سەروبەر فراوان دەبێ، دەرفەتێکی باشی بۆ رەخساوە. بینای خانوەکان باشنو، ناوچە وێرانەکانی راگوێزرانو شەڕو شۆڕش بنیات دەنرێنەوە، یاخود پاك دەکرێنەوە. پرۆژەیەکی کەمی شارەوانی، وەك باخچەو قاوەخانەو سینەماو.....هتد هەن. میوانخانەیەکی زۆر ساکار، بەڵام خاوێنیشی لێیە. کڵێسەی فرانسیسەکان کەوەك ئەوی مەرعەش دەستی بەسەردا گیراوە، کراوەتە قوتابخانەی ((غازی مستەفا کەمال)). مامۆستایانی ئەمریکی نەخۆشخانەیەکی بەناوبانگ بەڕێوەدەبەنو، چاوەڕێی ڕۆژێك دەکەن جارێکیتر قوتابخانە بەبۆمبی فەرەنسی رووخاوەکەیان دروست بکەنەوە.

**ئورفە**

مرۆڤ بە بەلەمێکی کۆن دەپەڕێتەوە بۆ" بیرەجیك"ی بەری ڕۆژهەڵاتی فوراتو، دەچێتە ویلایەتی ئورفەوە کەوا یەکێکە لەنۆ ویلایەتی پێکهێنی هەرێمی پشکنیاری گشتیی مەدەنی دیاربەکر، یان باشتر بڵێین نۆ ویلایەتەکەی نیوەی باشووری کوردستانی تورکیا. کەمێك گیاو کوردی گوند نشینو رانە مەڕەکانیان، ئەو دەمەی ساڵ لەشاری ئورفە بەدی دەکرێن. لێرەو لەوێ چەند زەوییەکی نزمی چێنراو درێژ دەبنەوەو، لادێیش هەن کە خانووەکانیان لە قوڕ دروست کراون. ئورفە خۆی دەکەوێتە هەورازەکانی شاخێکەوەو، بازاڕی ساغکردنەوەی بەروبوومی دەشتێکی کشتوکاڵیی فراوانە کە دەگاتە باکوورو (٥) میلی باشوور بۆ پشتی حەڕان. ئەم دەشتە بیست هەزار دانیشتووی ئەم شارەی لەگوزەرانێکی مام ناوەندا راگرتووە. دەڵێن لێرە بەپێچەوانەی شوێنەکانی تری تورکیاوە، کەموکوڕیو نەبوونی پارەو

متمانەو پشتیوان (اعتماد) لەئارادانییە. ئەم شارە، لەچاو ئەوەی وا لە دەرەوە دەیهێنێ، زیاترو بەشێوەیەکی بەرچاو دانەوێڵەو مەڕ لەمەرسیناو ئەدەنەو قوستەنتەنییەوە دەنێرنە دەرەوە. هەڵوەشاندنەوەی دەیەك، کشتوکاڵ چاندنی زیادکردووە. جوتیارێکی زۆر، هەروەك بەگەکان، بوونەتە خاوەنی زەوی. زۆر کشتیار زەوی لەسایەو بەپێی یاسای نەهێشتنی موڵکە گەورەکان، وەردەگرن. بەگشتی گوزەرانی ناوچەکە باش دیارە. ئەم شارە، لەجەنگەکانی دەرەوەو یاخیبوونەکانی ناوخۆ دوور بووە. دین لێرە، لەچاو ئەنگۆرەو قوستەنتەنییە، زیاتر پێڕەو دەکرێ. شوێنەکەیش، وەکو چۆن پێم وانییە بێوەفابێ بۆ کۆمار، بەهێواشی ڕێبازەکانی ڕۆژئاوا دەگرێ. ئافرەتان بەگشتی رووبەند دەپۆشن. بەڵام ئەم نەوەیەی کەتازە پێدەگات، پاش تەواوکردنی قوتابخانە کڵاو لەسەر دەکات. سەما، بەتایبەتی لە قوتابخانەکاندا، دەستی پێکراوە، بەڵام زانیم والی زۆر لە ئافرەتانی ناوخۆ بۆ ئاهەنگەکانی نابات. تۆپی پێو یارییتر لەناودانو، ئۆجاغی تورك زۆر هانی خەڵکیان بۆ دەدات. هەروەها دوو سینەمای سادە ویانەیەك هەنو، زۆرکات ئەفسەرانی فەوجی سوارەی جێگری ئێرە، هاتوچۆیان دەکەن. خەڵك لێرەیش، وەك عەینتاب، بەخۆیان دەڵێن تورك، بەڵام ڕێژەیەکی زۆریان کورد یاخود عەرەبن.

ئەتەم بەگی والی کە تورکی قوستەنتەنییەو میوانداریيەکی باشی کردم، پیاوێکی چکۆلەی توانایەو، وادەردەکەوێ باش شارەزای هەرێمەکەی بێ. کارمەندە سەرەکییەکانی ویلایەتەکەیش کە لەسەر شەرەفی من بۆ نانخواردن داوەتی کردبوون، هەموو پیاوی چاك بوون.

**سیوەرەك**

سیوەرەك دێیەکی گەورەیەو، لەسەر گردێکی پڕ کەندولەندی نزمی ناوەڕاستی ڕێی دیاربەکرو ئورفەدایە. قایمقامەکە پێی وتم گوزەرانی شارەکەی باشە، لەسەر ئەو میوەو سەوزەیە دەژی کە لە دەشتێکی بچووکی تەنیشتی بەرهەم دێن. جگە لەم گوندە، ئیتر هەر (٩٠) میلەکەی نێوان دیاربەکرو ئورفە، وێرانەیە. زۆر بەدەگمەن

لادێو، تەنانەت زەویی بچووکی کشتوکاڵی، دەبینرێن. گردەکان جگە لەکەمیی گژوگیا کەئالیکی رەشەولاخو ئەسپو بزنی چەند کوردێکی نیشتەجێی ئەم وەرزەی ئەو دەوروبەرە دابین دەکەن، هیچی تریان لەسەر نەرواوە. زەویی نێوان سیوەرەكو دیاربەکر بەردەڵانە وەك بڵێی(( خوا تەنها بەردی باراندووە)).

**دیاربەکر**

ئێستا پێنج ساڵ بەسەر یاخیبوونی شێخ سەعیدا تێپەڕیوەو، دروشمی دیاربەکر ((کاری ئاسایی))یە، هەرچەندە بەداخەوە ئەوکارە لەچاو رۆژانی زوودا کەمە. ئێرە شوێنی پشکنیاری گشتییە کە وەك جۆرێك لە جێگری پاشا خوارووی رۆژهەڵاتی تورکیا بەڕێوە دەبات، نۆ ویلایەتو هێزی سەربازیو جەندرمە بە فرمانین. هەروەها ئەم شارە سەرکر دایەتیی فەیلەقی سەربازی دەکات، بۆیە، وەك مەبەستمانە، بووەتە نموونەیەکی ئەنگۆرە، ئومێد وایە نەك هەر لەڕووی کارگێڕییەوە، بەڵکوو لە ئەزموونو پەیوەندییشدا کار لەناوچەکە بکات. ئەفسەرو سەربازو کارمەندو ژنەکانیان کە هەموویان لە تورکە چاکەکانی خۆرئاوای تورکیان، لە شەقامە تەسكو قەرەباڵغەکانی شاردا کێبەرکێی گوندنشینو دانیشتوانی شار دەکەن. ئەمانی دواییش، ئەگەرچی خۆیان ناڵێن، بەڵام بەزۆری کوردن. ئەمڕۆ(( مەدەنییەت))، وەك(( مەشرووتییەت))ی ساڵانی ١٩٠٨–١٩٠٩، بووەتە ویردی سەر زمانی دانیشتوانی رۆژهەڵاتی تورکیا. مەبەست لەمەیش بریتییە لە کڵاو بۆ هەردوو رەگەزو، خواردنەوەی ئەلکهوولو سەماو بۆینباخو پاژنەی بەرزو، جلوبەرگی شەو بۆ خاوەن سامانەکانو، کەم چوونە مزگەوتو کەم بەرۆژووبوونو، پیتاککردن بۆ کۆمەڵەی فڕۆکەوانی لەبریی خێرکردنو، تۆپیپێو پیتە تازەکانو، هەموو ئەو شتانەی کەتایبەتی گاورە رەزا گرانەکان بوون. ئەوە جێی سەرسوڕمان نییە کە شارستانی بوون، (( وەك بەتورکی لێکدراوەتەوە)) بەشێوەیەکی دیار لە دیاربەکر بەرەو پێش دەچێ، بەڵکو هێشتا لەجموجووڵدایەو، ئەفسەرو کارمەندو خێزانەکانیان کە لە رۆژئاوای تورکیاوە هاتوون، سەرکردایەتیی دەکەن. بنەماڵەکانی ناوخۆ زۆر

خـاو دەڕۆن. منـاڵان، ئاسـانتر كاریـان تێدەكریێ، چونكـە هـەموویان لـە قوتابخانــە حكومییەكان دەردەچن، بەڵام ئەم كارە بۆ ئافرەتـان زۆر سـەختە. خانمـانی نـاوخۆ جارجارو، تەنانەت بێسەرداپۆشین، لە ئاهەنگەكاندا دەردەكەون. ئافرەتـانی چینـی هەژاریش كەشەوانە بۆ هـەوا گۆڕینێك دەچنـە دەرەوەی دیوارەكـانی شـار، روویـان داناپۆشـن. یانەیـەك لـەم شـــارەدایە، بـەڵام بەشـێوەیەكی سـەرەكی سـەربازییە. (ئۆجـاغی تـورك) چالاكـەو، سـەدان ئـەندامی هەیـەو، كارەكـانیش، زیـاتر، هـەر ئاسـاییەكانن. كارەكانیـان خـولی زمـانو سـازدانی ئاهــەنگو هۆڵــی خوێندنــەوەو كتێبخانەو هاندان بۆ یاری دەگرنەوە. یـاریی تۆپـی پـێ بڵاوەو، پاڵـەوانێتیی جامی ویلایەتەكانی كـە پشـكنیاری گشـتی پێشكەشـی دەكـات، لـەم شـارە سـاز دەكریێ. هەردوو رەگەز دەستیان بەیاریی تێنس كردووەو، بۆكسێنیش بیری لێكراوەتەوە.

خەڵكێكی زۆر لەمزگـەوتی سـەرەكیدا دەبینـرێنو، زۆریـەی مزگەوتـەكانی تـر بـۆ ئامانجو گەنجینەی سەربازی بەكار دەهێنرێن. كڵێسەكە لێرەیش، وەك جێیەكانیتر، دەستی بەسەردا گیراوە. بێگومان دەسەڵاتی حكومەت لە دیاربەكر هێنـدە بـەهێزە، دەتوانیێ هەنگاوەكان خێرابكات، بەڵام وادیارە سیاسەتەكە دەیەویێ واز لـە شـتەكان بێنیێ تا خۆیان وردە وردە گەشە دەكەن.

شار باش بەڕێوە دەبریێ.لێرە سیستمی ئاوەڕۆ هەر كۆنە.ئاو زۆرەو هەمووماڵێك حەوشـەو حـــەوزی ئـاوی خـۆی هەیـە. شـــارەوانی ســـەرگەرمی راكێشــانی ئـاوی خواردنەوەیە لـەدووری دەمیلـەوەو، هـەروەها دەسـتی كـردووە بـەپرۆژەی كارەبـاو سەهۆڵ. ئەو شوێنانەی كەبینا دەكرێنەوە، بانە تـەختـە خۆڵـەكانیان دەكرێنـە بـانی ئاسنی رووكەشكراوی شێوە هـەرەمیو، چـەتری كۆنـی دارینــی دووكانــەكانیش بەچـەتری ئاسـنی رووكـەش كـراو. جادەكـان، سـەرەڕای ئاڵۆزییـان، بـاش پـاك دەكرێنەوە. كاولكارییەكی شـوێنەوارە كۆنـەكان كـە جێـی نیگەرانییـە، ئەوەیـە كـە سەرۆكی شارەوانی داوای لە سوپا كردووە دیواری كۆنی دەروازەكانی نزیك بـاكوورو باشـوور بتەقێننـەوە. بێگومـان هـەواگۆڕكێی شـارەكە لـە هـاویندا زۆر خراپـەو، جـا

چونکە سەرۆکی شارەوانی زۆر بە هەر رەخنەیەکی لەم بابەتە ناڕەحەتەو، دەڵێ تەنها ئەو بەشانە وێران دەکات کە(( بایەخی مێژووییان نییە))، ئومێد دەکرێ ئەم کاولکارییەی شوێنەوارەکان زیاتر پەرە نەسێنێ. باخچەیەك لە دەرەوەی دیوارەکە دروست دەکرێ، بەڵام تا ئێستا ئەو شارۆچکە تازەیەی کە بڕیاربوو لە دەرەوەی دیوارە کۆنەکە دروست بکرێ، هیچ بەرەو پێش چوونێکی بەخۆوە نەدیوە. میوانخانەکەیش شوێنێکی ناخۆشە.

(( نەخۆشخانەی نموونەیی))ی خۆشەویستی وەزیری تەندروستی، دەزگایەکی زۆر جێی شانازییە. تەنها سێ نەخۆشخانەی تری نموونەیی لە تورکیا، سیواس‌و ئەرزرۆم‌و ئەنگۆرە، هەن. ئەم نەخۆشخانەیەی دیاریەکر جێی حەفتا نەخۆشەو، پاك‌و خاوێنەو، چەند پزیشکێکی لێهاتوو باش بەڕێوەی دەبەن. نەخۆش لەهەر نۆ ویلایەتەکەوە دەنێردرێنە ئەم نەخۆشخانەیە، بەڵام کەسانی تووشی حاڵەتە ترسناکەکان، بەهۆی هەڵبەزین‌و دابەزینی ئەو رێگە دوورو خراپانەوە رزگاریان نابێ. ئەم نەخۆشخانەیە کەلوپەلی باشی تێدان‌و، ئامێرێکی تەواوی تیشکی ئێکسی (X-Ray)ی هەیەو پزیشکی نەشتەرگەر(جراح) بەکاریش هاتووە. مەلاریا بڵاوترین نەخۆشییە، بەڵام هەرزوو بە دابەشکردنی دەرمانی مەلاریا، وەك هەنگاوی یەکەم، لەم شارە کۆنترۆڵ کراوە بۆ قۆناغی دووەمیش، بەنیازن زەلکاوی هاوشانی رووباری دیجلە وشك بکەن.

قوتابخانەی سەرەتایی‌و ناوەندی لەم شارەدا زۆرن، بەڵام نزیکترین دواناوەندی (سانەوی) تەنها ئەوەی قەیسەرییەیە، قوتابخانە ناوەندییەکە، وەك زۆرینەی قوتابخانەکانی ئەمڕۆی تورکیا، زۆر رێك‌وپێکە. کێشەی کەمیی مامۆستا کە باڵی بەسەر هەموو وڵاتدا کێشاوە، وایکردووە سێ مامۆستاو جارجاریش یاریدەدەر وانەی (٢٥٠) قوتابیی کورو کچ بڵێنەوە، قوتابخانە سەرەتایی‌و ناوەندییەکان ئێستا تێکەڵن. بەڕێوەبەرەکە مووچەی باشی پێ دەدرێ، بەڵام وا دەردەکەوێ ئەرکی زۆربێ. هەروەها وا دیاربوو بەسەیری پەیکەرێکی غازی کە لەسەر مێزی ژووری

خوێندنەوەکەیدا بوو، هەموو ماندوویەتیی لەبیردەچووە. لێدان و گوێ ڕاکێشان نەماون و، ڕێیان پێ نادرێ. ئەگەر کوڕێك یان کچێك نەبێ بتوانێ داوای هاوکاریی نوێنەری شار بۆ تۆڵە سەندنەوە لە مامۆستایەك بکات، ئەوا مەشق و پەروەردە باش بەڕێوەدەچن.

قوتابخانەیەکیش بۆ ڕاهێنانی مامۆستایانی سەرەتایی لە دیاربەکردایە. ئەمیش نیشانەی جووڵانەوەیەکی سوودمەندە. نزیکەی بیست قوتابخانەی وەها لەسەرتاسەری وڵاتدا یەکێکیش لە ڕۆژهەڵاتی فورات (وان) هەیە. ئامانجی ئەم قوتابخانانە زیادکردنی ژمارەی مامۆستایانی سەرەتاییە، کە پێویستییەکی سەرەکیی پەروەردەیی وڵاتن. خولەکە خۆڕاییە و خواردن و جێونوێن، تەنانەت بەپێی ئاستی ناوخۆیش، باش نین و، قوتابیانیش لەو چینانەی شار و لادێکانەوە دەهێنرێن کە گوزەرانیان زۆر باش نییە. جا ئەمانە کاتێك ئامادەکران، دەبێ هەشت ساڵ لە قۆناغی سەرەتاییدا ببنە مامۆستا. پاشان، ئازادن، ئەگەر توانییان، خۆیان بۆ کاری مامۆستایەتیی قوتابخانە بەرزترەکان، ئامادە بکەن، یاخود واز لە پیشەکە بێنن. دەڵێن سیستمی پێگەیاندنی مامۆستای لێهاتوو بۆ قوتابخانە سەرەتاییەکان، سەرکەوتووە. ئەو بیانیانەی کە لە دیار بەکر بینیمن، یاخود شتێکم لەبارەیانەوە بیست، تەنها دوو شارەزای بواریکشتوکاڵیی هەنگاریبوون لەبینایەکی دەورەدراو بە کێڵگەو بێستانی زۆر ناشیرین کە پێیان دەوت (کێڵگەی نموونەیی). بێگومان ئەمانە گرفتی یەکجار زۆریان سەبارەت بە هاوکاریو گەنم هەیە. وەك خۆیان ڕایانگەیاند: بەلای کەمەوە بەرهەمێکی زۆر باشی گەنم، لەسایەی چاندنێکی بەهرەمەندانەدا، بەپیتیی خاکەکەی نیشانداوە. کاربەدەستان لەهەوڵی ئەوەدان وردە وردە کاربکەنە سەر کشتیاران تا هەوجارە سادە دارینەکانیان بگۆڕن بەهی پۆڵا. هەندێ لەجوتیارانی کورد، لەم کێڵگە نموونەییەدا، فێری بەکارهێنانی گاسنی پۆڵاین بوون. هەروەها دەسەڵاتداران دەیانەوێ پەروەردەی ئەسپ بۆ یارمەتی کێڵان باش و زیاد بکەن، بۆیە تەویلەیەکی ئەسپ لە هەمان کێڵگەدا دروست دەکرێ.

وتیان دیاربەکر بەرهەمی بۆ دەرەوە نێردراوی زۆرە، بەلام من تەنها چەند کێڵگەیەکی کەمی بەرهەمهێنان و ناردنە دەرەوەم بەچاوی خۆم بینی. پێویستە بڵێم ویلایەتی دیاربەکر تەنها کەمێك زیاد لەپێویستی خۆی بەرهەمی کشتوکاڵی (دانەوێڵەو میوەو ئاژەڵ) بەرهەم دێنێ‌و، پیشەسازییش مردووە. ئەمە بۆ هەرێمەکەیش، تا بدلیس و وان، کە دیاربەکر بازاڕی ساغ کردنەوەیەتی، هەر ڕاستە.
بەپێی نووسراوی ژمارە ۳۰۵ی ۱۱ تەمموزی ساڵی ۱۹۲۹ی سێرجی. کلارك، مستەر هێلم لە ڕاپۆرتی پاریدا پێی لەسەر خراپیی باری ئابووری هەرێمی دیاربەکر، مەلاتیە، سیواس داگرتووە. دیاربەکر شەڕی رووس و راگوێزانی مەسیحی و جیاکردنەوەی خاکی عێراق و سوریاو، دواجاریش یاخیبوونی شێخ سەعیدی بەخۆوە دیوەو، تازە خەریکە دێتەوە سەر خۆی. جا بۆ ئەوەی بیرۆکەیەکمان لەسەر لەناوچوونی ئابووری هەبێ، پێویستە بۆ ڕاپۆرتەکانی پێش جەنگی کونسوڵ بگەڕێینەوە. بازرگانیی ویلایەتی دیاربەکر لەگەڵ ولاتانی دەرەوەو پارچەکانی تری تورکیادا، ساڵانە خۆی لەشەش سەد هەزار ئیستەرلینی[1] دەدات. کەلوپەلی بۆ دەرەوە نێردراو بریتی‌بوون لە ئاژەڵ و پێستەو خوری و مس و جەوت و دانەوێڵەو کەرەو برنج و بەنی ڕستراوو جل‌وبەرگ. ئێستا، لەهەموو ئەمانە تەنها ئاژەڵ دەنێردرێتە دەرەوە. شاری دیاربەکر گوزەرانی خراپ نییە، چونکە جگە لەوەی کە پێداویستی خۆی دابین دەکات، ژمارەیەکی زۆر کارمەندو ئەفسەرو سەربازیشی لێ‌و، چەند شلینگێکیان[2] پێیەو، مووچەکەی ئەنگورەیشیان لێرە خەرج دەکەن. بەلام ئەمە یارمەتی باری کۆمارەکە نادات. بازرگانێکی بەتەمەنم بینی کەزۆر پەرۆشی ڕۆژانی پێش تۆکەندی سوێس بوو: کاتێك دیاربەکر کەم و زۆر لەسەر کاروانە ڕێی حەلەب- بەغدا دا بوو. هیوای خواست کەهێڵی ئاسن گەیشتە مەلاتیە، گوزەرانی زووی دیاربەکر بگەڕێتەوە. بەداخەوە تەنها یەك شت هەیە کەڕاپۆرتەکانی

---

[1] دراوی بریتانییە. (س)

[2] بیست یەکی جونەیهی ئیستەرلینییە.(س)

کونسوڵی زوویش، وەك هۆکاری پەککەوتنی بازرگانی ئاماژەیان پێکردووە، ئەویش نائارامیی وڵاتەکەیە. کۆمار لەپێناوی دوایی هێناندا بەمە، دەتوانێ پشتیوانییەك بۆخۆی مسۆگەر بکات. ئێستا نیزام باڵی بەسەر وڵاتدا کێشاوە، تەنها چەند ناوچەیەکی کەم نەبێ کە یاخییان جارجار، دەیانشێوێنن. جوتیاران گوێدرێژو حوشتر بەدانەوێڵە بارکراوەکانیان رادەکێشن. ژنە کەشتیارەکانیش، بێ پارێزگاریی پیاوو کەسوکاریان و بەلیرەی ئاڵتوونی گەردن و ملیانەوە، بەوناوەدا دێن و دەچن. پاسی شڕۆڵە بە گەشتی سەدان کیلۆمەتری دەردەچێ و، لەو دەشت و دەرە هێمنەدا دەشکێ. چەند ناوچەیەکی کەم نەبێ کە هێشتا باندو جەندرمەیان بەهێزی گەڕۆك و تەلەفۆنەکانیانەوە لێن، ئیتر سەرتاسەری باشووری رۆژهەڵاتی تورکیا تەواو کۆنترۆڵ کراوە.

زۆربەی مەسیحیەکانی دیاربەکر (یەعقووبی Jacobites)ن و، کڵێسەیان هەیە، بەڵام نەئەمان و نەکەمینەکانی تریش قوتابخانەی خۆیان نییە. سەرباری ئەمە، سیاسەتی تورك بەرامبەر بە مەسیحیەکان، ئەم دواییە، تاڕادەیەك نەرم بووە. کڵێسەیەك دراوەتەوە بەپرۆتستانت و گریگۆرییە ئەرمەنییەکان و، یەکێکی تریش بەکاتۆلیکە سووری و ئەرمەنیەکان. هۆی کوژرانی قەشەیەکی کاتۆلیکی ئەرمەنی، نیسانی ١٩٢٩، تایبەت بووە، بەڵام گومانی ئەوە هەیە کە دەسەڵاتدارانی حکوومەت بە تیرۆرکارییەکی وەها نیگەران نەبووبن، هەڵبەت ئەمەیش زیاتر خواستی کۆچکردنی ئەرمەنیەکان هان دەدات. وەك ئەرمەنیەکان دەڵێن، رەنگە تاوانباران تورك بووبن، بۆیە جگە لە شایەتێکی ئەرمەنی کە، تا ئەوکاتەی دان بەزانیاریی خۆیدا دەنێ، زیندانی کراوە، کەسێکی تر لەسەر ئەم تاوانە سزا نەدراوە. چیرۆکی هاوشێوەی کوژرانی قەشەیەکی ئەرتۆدۆکسی لە ماردین (نووسراوی ژمارە ٤٦١ی ٢١ نۆڤەمبەری ١٩٢٩ی سێر جی. کلارك)، هێندەی من بزانم، لەوی پێشوو جیاوازە، بەڵام زۆر لەمە دڵنیایش نیم.

## سیلوان

تابلۆیەکی سەر ڕێگەکە هێما بۆ ((بدلیس)) دەکات، ڕووی لەپردی سەر دیجلەی دیاربەکرو ئەو ڕێگە سەرەکییە (٩٠) کیلۆمەترییەیە کە زۆریەی یەکجار خراپەو، بەروبوومی کشتوکاڵی هەتا سیلوان یا (فارقین Farkin) دەڕوات. ئێرە جێی قایمقامەو، گوندێکی گەورەیە. زۆریی ژمارەی خانووە رووخاوەکانی، نەمانی دانیشتووە ئەرمەنیو مەسیحیەکانیتر ئەسەلمێنێ. کوردانی دەشتەکەی دەوروبەری زۆر کاردەکەن. دەڵێن کشتوکاڵی سالانی رابردوو دوو هێندە بووەو، گوزەرانی گوندەکەیش وادەردەکەوێ زۆر باش بێ. قوتابخانەی سەرەتاییو (نیشتمانی)ی ((بۆ فێربوونی پیتە تازەکان– بۆ گەنجان))ی لێن. سیٚساڵە ئۆجاغێکی تورکی زیندووی هەیەو، بەتورککردن خێرا بەڕێوەدەچێ. ئەگەرچی ئەم شارە لە بەرزاییی چیاکاندایە، کەچی تووشی مەلاریا هاتووە.

## غەرزان

کاتێك مرۆڤ دەگاتە ئەم شارەی جێی قایمقامێکیتر، کشتوکاڵو ئاوەدانی روو لە کەم بوون دەکەن. خانووەکانی ئەم گوندە کاولو وێرانن، بەڵام قوتابخانەو ئۆجاغێکی تێدان. دەڵێن سەمایشی تێدا دەکرێ کە ئەفسەرانی بەتالیۆنە جێگیرەکەی ئێرەو خێزانەکانیان ئامادەی دەبن. کەسێك خوێندەوارییەکی هەبێ، سەختە لە جێیەکی وادا بمێنێتەوە، بەڵام قایمقام کەسێکی چالاكو هەستیار دیاربوو. ئەرمەنی لێرەیش نیشتەجێ بووبوو، بەڵام قایمقام پێی وتم دانیشتوانی دووگوندی یەعقووبی، تەنها ساڵێك دەبێ( سەرەڕای نارەزاییی ناوەندە ناوخۆییەکانی دەسەڵات)، بەسەر سنووری سووریادا کۆچیان کردووە.

## بدلیس

هێماکانی ژیان، کاتێك بەرەو بدلیسو ناو شاخ دەڕۆی، کەمو کەمتر دەبنەوە. دارتوو وەی تر هی گوندە ئەرمەنیەکانن لەهەورازی گردەکاندا ڕواونو، ئێستایش

پشتگوێ خراون. ڕێگەکە بەرەو جۆگەی( بدلیس سۆ) بەڕێڕەوێکی زۆر کووڕدا دەڕوات و، لێرەیش تاچەند میلێك درەختی میوەی فەرامۆشکراو لەخاکە کەمتر لێژەکاندا دەبینرێن، بەڵام تاکە شت کە بجوڵێتەوە زیاتر لە دەهەزار سیسرك و چەند لۆرییەکی کەمی سەربازییە، کە لەڕێگەیاندا بەرەو وان، بەبدلیسدا تێپەڕن. بدلیس خۆی دیمەنێکی تراژیدیی هەیە. گشت خانووەکانی و ئەوانەی هەردوو بەری جۆگەکە بەسەر یەکدا ڕماون. خانووی ئاوەدان، بەدرێژاییی جادەی سەرەکی و لێرەو لەوێ، هەن. ئەوە کە زوو شارێکی چل هەزار ماڵەبووە، ئێستا بووەتە گوندێکی پێنج هەزار ماڵ. لیرەیش دوورخستنەوەو دەرکردنی ئەرمەنیەکان گورزێکی کوشندەیان لە ژیانی ناوچەکەداوەو، ئەوی ئەم پرۆسەیەیش تێکی نەدابوو، داگیرکاریی ڕووسەکان لەناوی بردووە. ئەگەرچی بدلیس پێش شەڕ ژیانێکی ساکاری شك بردووە، بەڵام کەمێك بەرهەمی بۆ دەرەوە نێردراوی هەبوە و، بازرگانیشی لەگەڵ جیهانی دەرەوەدا کردووە. ئەمڕۆ ئاسان نییە بڵێین لەسەر چی دەژی، چونکە لەناوخۆیدا داڕماوەو، دانیشتوانی ناوچەکانی دەوروبەریشی یەکجار کەم بوونەتەوە، یان هەر نەشماون.

بڕێك کاری دیاریکراوی بنیاتنان ئەنجامدراون. کازم پاشای والیی سمیرنا، کە هێشتا مەڵبەندەکەی شاری بدلیسە، ناوێکی باشی هەیەو، مزگەوت و قوتابخانەیەکی نوێ کردووەتەوە. خانوو بەشی ئەو کەمە هاوڵاتیانە وردە وردە چاك کراونەوەو، چالاکییەکانی حکومەت هەر ئاساییەکانن.

قوتابخانەی نیشتمانی(بۆ لاوان)و سەرەتایی و ناوەندیی تێدان و، شارەوانییشی هەیە. هەروەها ئۆجاغێك هەیە کە هانی تۆپی‌پێ دەدات و هەنگاوی شارستانانەی سەما، هەرچەندە کەم کەم و بۆ ئەفسەرو خێزانەکانیان ساز دەکرێ، نراوە. ئۆرهان سامی بەگی قایمقام کە بەڕێزەوە ڕێوشوێن و خواردنی دووشەوی بۆ دابینکردم، پیاوێکی ڕۆشنبیرو کارمەندێکی بەتوانایە. ئەم زۆر، لەسەر ڕێبازو چەکی تورکیای نوێ پێ دادەگرێ. ئەمەیش بۆ ئەوەی گوشاری دەوروبەری بۆی نەبنە مەترسی. ناوبراو، هیچ کێشەیەکی ئاشکرای لەگەڵ ویستی سیاسی دانیشتواندا نییە.

ڕووداوەکانی پێشتر نەریتەکانی ناوخۆیان بەجۆرێك وردوخاش کردووە کە ناتوانن بەرەنگاری کۆمارەکە ببنەوە. بدلیسیش وەك مووش و وان ساڵی ١٩٢٥ ڕانەپەڕی، بەڵکوو لە ڕاستیدا خەڵکانی خۆبەخشی لەدژی شێخ سەعید ناردە بەرەکانی جەنگ.

**مووش**

ئەگەر یەکێك لە بدلیسەوە بچێتە مووش، ئەوا بە قەراغی نیوەی دەشتی بەرزی مووشدا دەڕوات کە بە پیت و بەرهەم هێن ناوی دەرکردووەو، ئەمڕۆ کەمێك لە گوند نشینانی کورد بەجێ ماون. لەوانەیە گوزەران و ژیانی ئەمان لە هی کوێرە لادێ قوڕینە دڵتەنگەکان باشتربن، بەڵام دەستیان تەنها بەزەوییەکی بچووکی کشتوکاڵی دەگات. ئەمە لەکاتێکدایە کە گردەکانی دەوروبەری، شوێنەواری ڕەزوباخ و بێستانە خۆشەکانی ئەرمەنیەکانیان پێوە دیارە.

دیمەنی مووش زۆر لە هی بدلیس دڵتەزێنترە. مووش لە شارێکی سی هەزارییەوە، بووەتە گوندێکی وێرانەی سێ هەزار کەسی. هۆکانی ئەم کاول بوونەیش، دەدرێنە پاڵ داگیرکاریی یەك ساڵەی ڕووسەکان و هاتنەوەی ئەرمەنیەکان لەگەڵیاندا بۆ تۆڵە سەندنەوە. دانیشتوانی موسوڵمان، کە ڕووسەکان هاتن، هەموو هەڵاتن و، ئێستا زۆریان ناتوانن، یاخود نایەنەوێ بگەڕێنەوە. مووش، بەهۆی پێگەی ناوەندی (مرکزی)یەوە، بەم دواییە لەجێی بدلیس بووە پایتەختی ویلایەت. عابدین بەگی والی کەداوەتی کردم بۆ خوانی نیوەڕۆ، پیاوێکی چاك و بەتواناو هەستیارەو، بەشێوەیەکی کاتی لە بینایەکی ناخۆشدا نیشتەجێ بووە. دەزگا ئاساییەکانی وەك قوتابخانەو شارەوانی و ئۆجاغ، زۆر باش نین. سەرەڕای ئەمانەیش، بەسەرکەوتوویی ویلایەتەکەی بەڕێوە دەبات، چونکە لەو شوێنانە سەرباز دەگیرێ و باج دەسەنرێ کە بەر لەشەڕ مەحاڵ بوو مل بۆ شتی وابدەن. کوردەکان، ئەگەر لەترسەوە نەبێ، باش کۆنترۆڵ کراون، ئیشکەریشن. میوەو دانەوێڵە بەرهەم دەهێنرێن، بەڵام خەڵکێکی زۆر کەم بەکشتوکاڵەوە کە سەرچاوەی سامانی شارەکەیە، سەرقاڵن. ئەم جۆرە بازرگانییە، وەك جێیەکانی‌تر، لە ئەرزڕۆمەوە یەك دوو ڕۆژ بەئۆتومبیل و لە کەش و

هەوایەکی لەباردا، نەك لەڕێی دیاربەکرو بدلیسەوە، دەکرێن. خەڵکی مووش لەڕابردوودا چەرمەسەریی زۆریان دیوە، ئێستا نایانەوێ لەگەڵ حکومەتدا تووشی کێشە ببن. دەشێ دەرك بەوەبکەن کەدەوڵەت هەندێ خزمەتی دیاریکراوی وەك دروستکردنی ڕێگەوبان و خوێندن و هاوکارییان لەبواری کشتوکاڵ و... هتد دا پێشکەش دەکات.

## وان

ئیبراهیم تاڵع بەگ حەزی نەدەکرد بچمە وان، بەڵام پێویست بوو من کات بەفیڕۆ نەدەم. دەڵێن وان زۆر لە مووش و بدلیس وێرانترە. بۆیە دەکرێ تەنها کەمێکی لێ بەدی بکرێ، بەڵام تا ئێستا هەر پایتەختی ویلایەتی وانەو، بەئاشکرا، ناوەندێکی گرنگی سەربازیشە. لەڕاستیدا سێ ویلایەتەکی مووش و بدلیس و وان، هەرچەندە تەواو ملکەچی یاساکانی کۆمارن، لەڕووی ئابورییەوە مردوون، بەڵام ئەوەندە هەیە: دانیشتوانێکی کەم لەو هەرێمانەدا دەژین.

## ماردین

ماردین کەوتووەتە سەر بەردو، ۳۰۰۰ پێ لەئاستی ڕووی دەریاوە بەرزەو، بەسەر دەشتێکی فراوانی کشتوکاڵیدا دەڕوانێ کە تۆفیق هادی بەگی والی بە(( دەریایەکی بێ شەپۆل)) ناوی دەبات و، تا ئەودیو سنووری سوریا درێژ دەبێتەوە. دەشت و خەڵکی شارەکەیش دڵخۆش دیارن. دەڵێن ناوچەکە میوەو پێستەو خوری، لە شتی بۆ ناوەوە هێنراو زیاتر، دەنێرێتە دەرەوە. سەرباری ئەمە، بازرگانی لەچاو ساڵانی پێش شەڕدا زۆر کەمەو، ئەمەیش دەرەنجامی ڕەوی مەسیحیەکانە کە کاتی خۆی باشترین کشتیارو وەکیل بوون.

ماردین وەك سعرت هەرگیز مۆرکی توندڕەویی نەبوە. موسڵمان و مەسیحی بەگشتی، هەمیشەو ئێستایش، پێکەوە دەژین، بەڵام مەسیحیەکان کە بەشێوەیەکی سەرەکی یەعقووبین و تائەمڕۆ ماونەوە، بەختەوەر نین، چونکە واهەست دەکەن باروذۆخ لە قازانجیاندا نییەو، گوشاری بەردەوام، ئەگەرچی کەمیشە، ناچار

بەکۆچیان دەکات. مافەکانیان بەسەر زەویەکانیانەوە پرس و نکۆڵییان لیٚ دەکریٚ. پاتریارکە یەعقووبیەکەیان بەشێوەیەکی کاتی چووەتە موسڵ و، ساویلکەیی و کەمتەرخەمیی ئەو ئەرمەنیانەیش کە چوونەتە ئەودیو سنووری تورکیا-سوریا، کارێکی خراپیان کردووەتە سەر ئەوانەی وا ماونەوە.

موسوڵمانەکانیش هەر دڵخۆش نین. بنەماڵە گەورەو دێرینەکان موڵکەکانیان هەڵوەشاوەتەوەو، خانوە دڵگیرەکانیان دەفرۆشن و، خۆیان دەدەنە دەست چارەنووسێکی دیارو زانراو. ماردین، بەکاری فشار، هەوڵ دەدات زمان و رێبازە عەرەبیەکان لە یاد بکات و، ببێتە تورک و، ئەلف و بێی نویٚ بخوێنێتەوەو بنووسیٚ. ئۆجاغ و قوتابخانەکان بۆ ئەم مەبەستە دەخرێتەگەڕ. والی کە وەك شاندی سەرەکیی لیژنەی سنوری تورکیا- عێراق دەیناسین، پیاوێکی توانایەو، وادیارە سیاسەتە رەسمییەکەی بەبیٚ توندو تیژییەکی زۆر بەرامبەر بەمەسیحی و موسڵمانەکان پێڕەو دەکات.

جگە لە دوو خانمی مامۆستای مەسیحیی ئەمریکی، بینایەکی تر لە ماردیندا نییە.

## بەگشتی

بیٚ گومان سیاسەتی ئێستای پێکهاتنەوە( مصالحە) کە ئەرکی ئیبراهیم تالع بەگە، وەك پشکنیاری گشتی لە بەشی باشووری خۆرهەڵاتی تورکیادا جێبەجیٚ بکات، سەرکەوتووە. ساڵێکە نۆیەم ویلایەت پێش( بایەزید) خراوەتە سەر ئەو هەشتەی کە دوو ساڵ لەمەوبەر کرانە قەڵەمڕەوی دەسەڵاتی ناوبراو. ئەو پێی وتم پێشبینی ناکات هیچ ناوچەیەکی تر بۆ سنوورەکەی زیاد بکریٚ، چونکە ئاسایش و ئارامی لە هەرێمی ئەرزڕۆم بەرقەرار بوونەتەوەو، پێشی وابوو مەبەست لەمە دامەزراندنی پشکنیارێکی گشتیی ترە لەویٚ. سەرکوتکردنی سەرهەڵدانی ساڵی ١٩٢٥، بەدڵنیاییەوە، بەهەمان ئەو دڕندەییە بووە کە لە کوشتاری ئەرمەنیەکاندا پێڕەو کراوە. گوندەکان هەموویان سووتێنراون و، تەخت کراون و، پیاو ژن و منداڵ

کوژراون. ئەفسەرانی تورك دانیان پێدانـاوە کەبەم کردەوانـە رازی نـەبوون، بـەڵام ناچاربوون ئەرکـەکانیان جێبـەجی بکـەن. هـەروەها گومـان لـەوەدا نییـە کـە هـەر هەوڵێکی یاخی بوون، لـە هـەر کـاتێکدا بێتـە ئـاراوە، گـورزی کاریگـەری لێ دەدرێ. بەڵام وادیارە ئیبراهیم تاڵع بەگ ناوچەکەی بێ هیچ تەنگوچەڵەمەیەك بەرێوە دەبات. هێزی سەربازییش دەسەڵاتی ناوبراوی بەتەواوی سەپاندووە. (پرسـیم ئایـا فرۆکـەی زۆری بۆ هێورکردنەوەی ناوچـە سـەختەکان بـەکارهێناوە؟ ئـەویش لـەوەڵامدا وتـی: وڵاتەکە یەکجار شاخاوییە). سەربازی تازەو باج، هەرچەندە کەمن،کۆدەکرێنـەوەو، سەربازەکان لەنسێبین دەخرێنە شەمەندەفەرەوەو، بەرەو رۆژئاوای ئەنادۆڵ رەوانـە دەکرێن. گەشتیاران بـەبێ پاسـەوانیی گەشـتەکانیان دەکـەن. هێنـدەی مـن بینیـم، جەندرمە، نەك سـەرباز، دوو دوو پاسـەوانی جادەکانیـان دەکـرد. ئوتۆمبیـلو پـاس بەئازادی بە هەموو لایەکدا( دیاریەکر– سعرت، مەلازگرد، بدلیس و دیاربەکر بەرێگەی ئەرجیشی باکووری کـەناری دەریاچـەی وانـداو، بایـەزید– قەرەکۆسـە) هـاتوچۆ دەکەن. من پاسـەوانم نـەبوو. گـاردی سـەربازیم( ٢٠کـەس لەهـەر خـاڵێکدا) تەنهالـە هەردوو سەری ئەو جۆگەیەدا کە بدلیسی کەوتبووە سەر، بینی. ئیبراهیم تاڵع بـەگ، لەگەڵ داوای لێبوردندا، ئامـاژەی پێدا کە کاتێك چوومـە وان دەبـوو پاسـەوانێکی بـۆ دابین بکردمایە، چونکە باندێك لەوناوەدایـە. لەبـەر ئـەوەی نەمدەویسـت پرسـیاری مایەی بێزاری بکەم، نەمزانی ئەو باندە لە باکوور یان خوارووی دەریاچـەی وانـدایـە، بەڵام واهەست دەکەم لە باشووری دەریاچەکەدا بووبێ. ئەگەر ئەمە وابێ، ئـەوا پێـم وایـە لەگـەڵ ئـەو زانیارییـەی عێراقدا یـەك دەگرێتـەوە کـە لـەبارەی برینداربوونـی سەربازێکی تورکەوە بووە. سـەربازەکە، بـەپێی ئـەو هەواڵـە، لـە نسێبین خرابووە شەمەندەفەرەوە.

وادەردەکەوێ ئیبراهیم تـاڵع بـەگ بـۆ جێبـە جێکردنـی سیاسـەتی پێکهاتنـەوەو بنیاتنان، پشت بەسێ شت ببەستێ. یەکـەم خـاڵ بریتییـە لەکشـتیاریو، گرنگـترین کاریش بۆ ئەمە هەڵوەشاندنەوەی موڵکی گەورەی بەگەکانو، دابەشکردنیانە بەسـەر

جوتیاراندا،بۆ ئەم مەبەستەیش یاسای (٨)ی حوزەیرانی ١٩٢٩ پێڕەو دەکرێت. خاوەن موڵك ئەگەر بە فرۆشتنی زەویەکەی رازی نەبێ، ئەوا لێیدەسەنرێ. خاوەن زەوی دەتوانێ تەنها (٥٠٠) دۆنمی هەبێ. کشتیار بەدوازدە پشك (قیست) ی ساڵانە پارەکە دەداتو، دەڵێن خۆشحاڵە زەویی خۆی هەبێو بەتەکنیکی پێشکەوتووی پیشەسازی کار بکات. ئیبراهیم تالع بەگ هەولیش دەدات پشتیوان (اعتماد) بۆ شارەزایانی کشتوکاڵی دابین بکات. ناوبراو راوێژکارێکی دارایی‌ی راهێنراوی فەرەنسەی تایبەتمەندی ئەم بوارەی هەیە. جالەبەر دواکەوتوویی‌ی دانیشتوان، ئەو کۆمەڵانەی هاوکاریی کشتوکاڵی کە حکومەت گەرەکیە لە سەرتاسەری وڵاتدا دروستیان بکات، لێرە لەچاو جێیەکانی تردا، کەمتر جێبەجێ دەبن. بەڵام لە یەك دوو شوێنی وەك مووش، بیستم، بانکی کشتوکاڵی سوودی هەبوە. دەسەڵاتدارانی ویلایەتە جیاجیاکان، هەمیشە لە هەوڵی ئەوەدان کشتیاران واز لە هەوجارە دارینەکۆنەکانو گاسنە قورسە رووسیەکانی دەوری مووش بێننو، گاسنی سووکی ئاسن بەکار بێنن بەقووڵییەکی شیاو زەوی دەکێڵێو، بەروبوومی باشتری دەبێ. ئەم گاسنە سووکانە، بەهەرزانو پێنج پشکی ساڵانە، بە جووتیار دەفرۆشرێن. جووتیاران بایەخی پەینکردن نازانن. بەهای ئەم کۆششە رەسمیانە هەرچییەك بێ، کشتیاری کورد بەروبوومی باش بەرهەم دێنیو خۆی، وەك ئیبراهیم تالع بەگ پێی‌وابوو، لەبارێکی باشدا دەژێنێ. پێدەچێ بتوانێ کەمێك لە پێویستیی ناوخۆ بەرهەم بێنێ، بەڵام لەبەرنەبوونی پەیوەندیو وەکیل، رووبەرووی گرفتی خستنە بازاڕ دەبێتەوە.

دووەم، ئیبراهیم تالع بەگ پشت بەدروستکردنی رێگەوبان دەبەستێو، مافی خۆشیەتی وابکات. نیوەی تەنگو چەڵەمەکانی زوو، زادەی سەختیی کوردستان بوون. نەك تەنها کوردان لەگەڵ پێشکەوتنی سیستمی رێگەوباندا باشتر هەست دەکەن لەیاساوە نزیکن، بەڵکوو کارمەندە تورکەکانیش دەرفەتی زیاتریان بۆ دەرەخسێ تا لە کوردەکان نزیك ببنەوەو، لێیان تێبگەنو، لە چاری

گیروگرفتەکانیاندا یارمەتییان بدەن. ئیبراهیم تالّع بەگ چەند مانگێك لە گەشتی هاوینەی پشکنیارییەکەیدا بەسەر دەبات. والی وقایمقامەکان، بە پێچەوانەی ئەوانی پێش خۆیانەوە، سەر لە هەرێمەکانی سنووری دەسەلاتی خۆیان دەدەن. هەرکە کێشەیەك لە شوێنێ دوورە دەستدا رووبدات، ئەمان، وەك ئەرکی هەر بەرێوەبەرێکی پەرۆش، دەچن‌و لێی دەکۆڵنەوە.

پێم سەیرە، لەگەڵ ئەو هەموو پێداگرتنەدا لەسەر دروستکردنی رێگەوبان، رێگەی باشترو زیاتر دروست نەکراون. بەلاّم عەلی فوئاد پاشای ئەفسەری گشتی فەیلەقی (٧)ی دیاربەکر، ئاماژەی پێدا کە دووری (مسافە)ی زۆر ئەم کارەی گەلیّ سەخت‌و بەخەرجی کردووە. ئەم کێشەیە ئاسان نییە. چونکە گوند نزیکی ئەو رێگایانە نییە تاکرێکاران لێوە بهێنرێ‌و، هاوکات ئاوو هێزی کارو مەکینەی رۆڵەی هەڵمی‌و.....هتد دەست ناکەون. بۆیە وردە وردە سیستمی رێگەوبان تەواو دەکرێ. بەهەرحالّ، جۆرێك جادەی تازە روو بە رۆژهەلاّت: لە دیاربەکرەوە بۆ ئورفەو سعرت‌و هەکاری‌و بدلیس‌و وان‌و مووش هەن‌و، رێگەی باکوور، باشوور: ئورفە، دیاربەکر، ئەلعەزیزن ئەمساڵ‌و بەم زووانە دەگاتە ئەرزرۆم‌و، دەیبووژێنێتەوە. بارودۆخی چەند رێگایەك دواتر باسی دەکەم.

سێیەم خاڵی سیاسەتەکەی ئیبراهیم تالّع بەگ هەموو جۆرەکانی خوێندنە، کە بەواتایەکی تر مەبەست بەتورککردنە. ئەم خاڵە بایەخێکی زۆری پێدراوە. دەزگاکانی خوێندن لە هەموو ویلایەتەکانی تردا، جگەلە هەکاری، تەواون. قوتابخانەی ناوەندی لە پایتەختی ویلایەت‌و، هی سەرەتایی‌و نەوجەوانان لەسەرجەم شارۆچکەو گوندە گەورەکانداو، یەکێکی راهێنانی مامۆستایانی سەرەتاییش لە دیاربەکردان‌و، خەریکن یەکێکی تریش لە وان دروست بکەن. پرۆسەی خوێندن تەنها لە گوندە بچووکەکاندا کە ژمارەیەکی زۆر کوردیان تێدا دەژی، کۆسپی هاتووەتە رێ. چارەیەکی گونجاو ئەوەبوو قوتابخانە لە شوێنێکی نزیکی چەند گوندێك دروست بکرێ، بەلاّم ئەم پرۆژەیە لەوجێیانەدا کە بەفری

زستانیان زۆرەو، منداڵ ناتوانێ پێیاندا تێپەڕێ، کەڵکی نەبوو. کارێکی شیاوی تر ئەوەبوو کە منداڵان بەخۆڕایی بخرێنە بەشە ناوخۆییەکانەوەو، ئەمەیش نیشانی دەدات کە کاربەدەستان سوورن لەسەر بایەخ پێدانیان، بەڵام دایكو باوکیان مۆڵەتیان نادەن، چونکە ئیش و کاریان لە کیس دەچێ. ئیبراهیم تالع بەگ، وەك هەل ڕەخساند بۆ کاروچالاکیی گەنجان، سوورە لەسەر ماندانی خەڵك بۆ یاریو، ئەم کارەیش لە ڕێگەی ئۆجاغەکانەوە دەکات. تۆپی پێ بڵاوترین یارییە، بەڵام کەس ناتوانێ بڵی گەیشتووەتە گوندەکان. بۆکسێن و تێنسیش بەکەمی دەستیان پێکراوە. ئۆجاغ لە شارۆچکەو گوندە گەورەکاندا هەیەو، ئەرکیشیان، وەك هی هەموو پارچەکانی تری تورکیا، بڵاوکردنەوەی ((شارستانێتی))یە. هەرچەندە زۆربەی ئەندامانی ئەم ئۆجاغانە پیاون، بەڵام مەبەستیانە ئافرەتانیش بێنە کۆمەڵەکەوە. ئەمانە لە هەرکوێ بن دابونەریتی میللییان چەسپاندووەو، بێگومان زۆر کاریگەریشن.

سوپا ئەمڕۆ قوتابخانەیەکی گەورەیە، سەربازی کورد بۆ ئەوەی ببنە تورکی چاك، دەنێردرێنە ڕۆژئاوای ئەنادۆڵ. ئەمانەش، وەك سەربازانی تری سوپای تورك، مامەڵەی باشیان لەتەکدا دەکرێو، فێری خوێندنەوەو نووسینی تورکی دەکرێن. کاتێکیش دەگەڕێنەوە باشترینیان، وەك پاداشتێك، لەپۆستی وەك موختاری گەڕەکدا دادەنرێن. جا لەبەرئەوەی هەموو پیاوێك، وەك چۆن گشت منالان بەقوتابخانەدا تێدەپەڕن، ئەبێ خزمەتی سەربازی بکات، ئاشکرایە تەنها دەساڵی ئەم پرۆسەیە جیاوازییەکی یەکجار زۆر و دیار لە تێڕوانینی ئەو خەڵکانەدا دەکات کە هیچ ئامۆژگارێکی دینیو ئەدەبو سەرکردەیەکیان نییە تا لەسەر ڕێبازەکانی خۆیان بیانهێڵنەوە.

فەرمانبەرێك لای مـن ڕەخنەی ئەوەی گرت کە پشکنیاری گشتی، بێئەوەی پێویست بێ، وەك والییەکی بالا (سووپەر والی) بەسەر والییەکاندا کە دەتوانن کارەکانیان ڕاپەڕێنن، سەپێنراوە. بەڵام پێم وانییە ئەم ڕەخنەیە لە جێی خۆیدابێو،

هیچ پاساوێکی هەبێ، بەڕای من سیستمی پشکنیاریی گشتی سەرکەوتووە. کاتێك سەربازان کاری بۆ گەنی سەرکوتکردنیان دەکرد، پشکنیاری گشتی بە بەرنامەی ئاشتبوونەوەو کۆنترۆلکردنی سوپاوە هاتە مەیدان، بەڵام هێندە بەس بوو کە دڵنیا بێ ڕێزی تەواوی فەرمانڕەواییەکەی دەگیرێ. ناوبراو بڕوای بەخۆیو پشتیوانیی ئەنگۆرەی هەبوونو، ئەیتوانی متمانەو پشتیوانییەکی وا بەکارمەندانی هەرێمی بەرفرمانی خۆی ببەخشێ کە ئەگەر ڕاستەوخۆ پشتیان بە پایتەختی دوور ببەستایە، هەرگیز نە یاندەبوون، لەلایەکی ترەوە، ئەیتوانی خواستو داوای ناوخۆ بگەیەنێتە ئەنگۆرەو، بەهۆی دەستڕۆییشیەوە مامەڵەی ژیرانەو بەسۆزیان بۆ دەستەبەر بکات . پشکنیارێکی گشتی ئەوە دەگەیەنێ کە یەك سیاسەتی سەرتاسەری بۆ کوردەکانی باکوور، بڵێین ئێوەی کوردان لە تورکیا، کە ئێستا کێشەی سەرەکیی ناوخۆی ئەم وڵاتەن، پێڕەو دەکرێ. سوڵتانەکان چەندین سەدە، هەروەك دەساڵی کۆمیتەی ئیتیحادو تەرەقی، نەیانتوانی کێشەی کورد هێوریکەنەوە، چونکە لە قوستەنتەنییە لێی دووربوون، ئەم تورکە تازانە سەرکەوتوون، چونکە پیاوی خۆیان ناردووە بۆ ئەوەی لەکاتو شوێنی شیاودا خێرا کۆنترۆڵی بکەن. ئیتر فەرمانبەران بۆ دوورخستنەوە نانێردرێنە کوردستانو، هەڵوێستیان وەك هی ئەو کاتانە نییە کە دەگەڕێنەوە. هەست دەکەن کارکردن لەکوردستان ئەگەر چی ئاسانییە، بەڵام کارێکی جددییە بۆ دەوڵەت، دەشێ ئەگەر باش جێبەجێ بکرێ، ئومێدی پێ ببەخشرێ.

دەسەڵاتدارانی تورك باش دەزانن، ئەگەر واز لە کورد بێنن، ئەوا گەلێکی لەسەرخۆو پیشەکارە. هەروەها دەزانن پێویستیان پێیەتی بۆ پڕکردنەوەی ئەو زەوییە فراوانو چۆڵانەی کە تیایاندا دەژی. جا چونکە ترساندوویانە، دەکرێ متمانەیان پێبکرێو، بەئومێدیشن لەبری ئەوەی کە بە کۆچەری بژی، بیکەنە تورکێکی چاكو کشتیارێکی جێگیر. ڕێی تێناچێ جارێکی تر کورد یاخی ببێتەوە.

رەنگە جارجار وەك ئێستا گێروگرفت روویدەن، بەڵام گەر کوردستانی باکوور (ئەرزیرۆم و ئەرزنجان و ..هتد) لەمە دەربکەین، ئەوا دەکرێ بڵێین تورکەکان وڵاتیان تەواو پاککردووتەوەو، بۆ نەهێشتنی سەرهەڵدان کۆنترۆڵی تەواویان کردووە. چەند بەگێکی کورد، پاش دەربڕینی ئەمەکداریو زیان نەدانی لەوە بەدوای دەستەو دایەرەکانیان، رێیان دراوە لە مەنفا (رۆژئاوای ئەنادۆڵ) بگەڕێنەوە سەر ماڵو حاڵی خۆیان. بەگێکی کوردی راگوێزراوی نزیك سیوەرەك چەند فڕۆکەیەکی پێشکەش کردبوو بۆ ئەوەی مۆڵەتی گەڕانەوەی لە ئەدەنە بدرێ، بەڵام دووساڵ زیندانی کراو، گوندەکانیشی بەسەلامەتی هێڵرانەوە. ئیبراهیم تاڵع بەگ بەخۆشحاڵییەوە، باسی چەند بەگێکی بۆ کردم کە لە مەنفا گەڕابوونەوەو، ئەمیش تا فێری خوێندنەوەو نووسینی پیتە نوێیەکان بووبوون، لە میوانخانەیەکی دیار بەکر دانابوون. پاش نۆزدە رۆژ کارەکەیان ئەنجام داو، رێیان درا بگەڕێنەوە سەر شوێنو رێی خۆیان.

ئیبراهیم تاڵع بەگ دەستەیەك راوێژکاری هەنو، گشتییان پیاوی چاکن. ئەمانە بریتین لە: راوێژکارێکی سەرەکی (مومتاز بەگی والیی پێشوو شارەزای ئەودەفەرانە)، کە کاتی گەشتی پشکنیاری گشتی جێی دەگرێتەوەو، راوێژکارێکی سەربازیی (جەنەراڵ کاکری روستو پاشا راهێنراوی ئەڵمانیاو شارەزا) کە پەیوەندیی بەقوماندانی فەیلەقی سەربازییەوە دەکاتو، راوێژکارێکی یاسایی (تەڵعەت بەگ)و، هەروەها یەکێکی لاوی داراییی راهێنراوی فەرەنسە.

ئیبراهیم تاڵع بەگ زوو پزیشکی سەربازی بووەو، غازی کاتێك ساڵانی ١٩١٦و ١٩١٧ فەرماندەی دیاربەکر بووە، ناسیویەتی. ئەو سیاسەتی رەسمیی داناوە، ئەگەرچی خۆی هێڵە سەرەکییەکانیشی دانەڕشتبێ. ئیبراهیم تاڵع بەگ کرێکارەو، خۆی دەچێت شتەکان ببینێ، ناوبراو کەسێکی لێهاتوو و نەرمو نیانو بەخشندەو بیرفراوانو نۆرزانەو خەریکی خوێندن (دراسە)ی کارگێڕیی ئەنگلۆ هندییەو، پێویستیش بوو بچێتە بۆمبای. کاری کارمەندانیشی سەعات حەوتو نیوی بەیانی دەست پێدەکاتو یەکی پاش نیوەڕۆ کۆتایی دێ. ئەو کەسێکی رۆشنبیرەو،

فەڕەنسیی و کەمێکیش ئینگلیزی دەزانێ و، لە باتووم کونسوڵ و لە وارشۆ نوێنەر بووە. ئەگەر پێویست بکات بیگۆڕن، ئەوا دەبێتە باڵوێزێکی باش.

دواجار ئەکرێ تەنها پێ لەسەر ئەو راگوێزانە دابگرم کە پار کارێکی زۆری لە مستەر هێلم کردبوو. تەنانەت بەدرێژایی ئەو رێگایانەی وا بە ئاوەدان لە قەڵەم دەدرێن، کەس بە دووریی چەندین میل زیندەوەرو نیشانەیەکی کشتوکاڵ نابینێ. سەرجەم شارەکان، بێ جیاوازی، گوندن و، گوندەکانیش تەنها چەند کۆختەیەکن.

تێبینیم لەسەر دین و ئاودێری و رێگەوبان نووسیوە

دەبلیوو. ئێس. ئەدمۆندر

## دین

زۆرجار دین بووەتە بابەتی لێدوان. ئەو سیاسەتە نوێیەی کە لە تورکیا پێڕەو دەکرێ زۆر بیروبۆچوونی لەمەڕ دین هێناوەتەگۆڕێ. هەندێ تورکی رووناکبیر بڕیاری ئازادن و، خۆیان دینیان وەلا ناوەو، هێندەی بەستە بەبەرژەوەندیی وڵاتەکەیانەوە، ئیسلام لە گۆڕدەنێن.

هەندێ بەڕاستی دەڵێن: دەشیا تورکیا ئامێزی بۆ مەسیحییەت بکردایەتەوە. هەروەها ئیسلام بەرێگر دەزانن و، راست بن یان هەڵە، دواکەوتوویی تورکیای پێوە دەبەستنەوە. بەڵگەیەکی بچووکیشیان بۆ ئەمە کارەساتی رۆژوو سەپاندنە بەسەر دایك و کۆرپەدا پێش و پاش منداڵبوون. ئەمان رێزی داب و نەریتی دینی مەسیحی دەگرن، بەڵام بێگومان، لە پەسەندکردنی پێغەمبەرێتیی مەسیحیدا، دوو دڵن. پێناچێ ئارەزووی کاتولێکی بکەن، چونکە بینویانە پەیوەندیی بەفەڕەنسەوە هەیە. پێیان وایە پرۆپاگەندەی سیاسیی ئیتاڵی و نەمسایی، کلێرکێتیی[1] دەگەیەنێ. وا

[1] دینداریی مەسیحی، پابەندبوون بە بنەماکانی دەسەڵاتی کلێرکی لەسیاسەتدا. (س)

دەردەکەوێ زیاتر مەیلی پرۆتستانتیزمی ئەمریکی بکەن، بەلام وا دیارە هێندەی ئارەزووی چاکەت لەبەرکردن دەکەن، هی دین ناکەن. دەرەنجانی ئەم بۆچوونانە، بەدڵنیاییەوە، رۆژێك دێ ببێتە شتێکی زیادە بۆ یەکتاپەرستی.

هەڵبەت هەندێ کەسیش هەن، ئاهەنگو بۆنە ئیسلامیەکان تێکەڵ بە ژیانی نوێ دەکەنو، لەوانەیشە زۆربەیان تێدا هەبێ کە لە ئەنگۆرەو ناو تورکە خوێندەوارەکانی شوێنەکانی تر جێی متمانەبن. رۆژوو وچوونە مزگەوتو پێنج نوێژو دەستنوێژی رۆژانەو وازهێنانو دوورکەوتنەوە لەخواردنەوە، ئەو شتانەن کە تورکی نوێ بەکاری نەکردە یان نەشیاویان دەزانێ، بەلام هێشتا هەمان بیروباوەڕی باوانی هەیە، بۆیە حەز دەکات یادو ئاهەنگە دینییەکان بەشێوەیەکی هاوچەرخ ساز بدرێن.

بێگومان ئافرەتان بۆ ئەمە موحافیزکارن. زۆر سەیرە، دەبیستم ئافرەتانی چینە هەژارەکان، لە چاو ئەوانەدا کە لە بارێکی باشتردان، زۆر کەمتر موحافیزکارن. ئافرەتانی هەژار کەمتر بە ژیانی گۆشەگیریو دوورە پەرێزی راهاتوون.

### ئاودێری

بیرۆکەیەك لەناو دەزگاو ناوەندەکانی حکومەتدا هەیە کە: ئەگەر پارە پەیدا بکرایە، زۆرباش دەبوو گەر بەشێکی لە ئاودێریدا خەرج بکرایە. کەس ناتوانێ گەشت بەناو تورکیادا بکاتو، ئەو پرسیارەی لا دروست نەبێ کە، کەئایا ئەم بیۆرکەیە راستە؟ لەکاتێکدا مەودایەکی فراوانی زەویی کشتوکاڵی، چۆڵو کەم دانیشتوانە، کێشەکە نەبوونی زەوی نییە، بەڵکو کەمیی دانیشتوانە. تورکیا تەواو پێچەوانەی یۆنانە. ئەو جێیانەی کە پاساوی خەرجیی ئاودێرییان بۆ دەهێنرێتەوە، ئەوانەن کە بەرێكو پێکی ئاودابینکردن کاری چاندنو بەرهەمهێنانی هەندێ بەرووبومی بەنرخیان بۆ ئاسان دەکات، بەلام پێش ئاودێری، لێکۆڵینەوەی زۆر وردی پسپۆرانی کشتیاری کارێکی پێویستە. ئەوەندەی من بزانم: هیچ توێژینەوەیەکی شارەزای کشتوکاڵی لەم جۆرە نەکراوە.

هەروەها پێدەچێ ئەمە بەبیانوو بۆ ئـەو گوندو شارانە بهێنرێتـەوە کـە گۆمـاوە بۆگەنەکانی سەرچاوەی مەلاریا ژیانیان لێ تاڵکردوون. ئەمـە دیاردەیـەکی بـەرچاوە، بەڵام ئەوی وا لێرە پێویستە، وشککردنە، نەك ئاودێری.

دیسان ئەبێ پارە بۆ پاراستنی هەندێ ناوچـەی دیاریکراوی بـەپیتی وەك دۆڵـی (Meander)، لە داخوران بەو ئاوە خـوڕەی کـە لـە جۆگـەکان سـەر ڕێـژ دەبـێو، کیلگـەکان بەبـەردولم دائەپۆشـێ، خـەرج بکـرێ. بـەڵام دانیشـتوانی زۆرینـــەی ئـــەو شوێنانە، چونکە مەسیحیەکان چۆڵیان کردوون، بۆ نیوەی جارانیان کەم بوونەتەوە. بۆیـە گومـان لـەوە هەیە کـە ئـەو زەوییانـە، پـاش تـەواو چـاككردن، سـوودیان لێ وەربگیرێ؟

لەکاتێکدا ئەنگۆرە بەخۆشحاڵییەوە باسی ئاودێری ئەکاتو، پێویستی بە پارەیە بۆی، کارێکی ژیرانەیە بزانرێ قازانجە ڕاستەقینەکانی چی ئەبن.

## ڕێگەوبان

ڕێگەکان بەگشتی خراپنو، لەتەڕو توشیدا گەشتیان پێداکرێ. شۆستەکان، وەك شوێنەکانی تری تورکیاش، تەنها (١٠) میل دەچێتە دەرو، پینەیەکی زۆری ئەوانــەی دواتری کراونو، دواجار ئەمەیش نامێنێ، تا نزیك دەبێتەوە لە شارێکی ترو، ئــەمجا حاڵەتە کە پێچەوانە دەبێتەوە. جادە سەرەکیەکان، زۆر کـەم، لەڕێگـە خۆڵینـەکانی تەنیشتیان باشترن.

| | |
|---|---|
| * ڕێگەی ئولوو قشڵە– ئەدەنە | پشـتگوێ خـراوە، بـەڵام هێشـتا بەکەڵکی بەکارهێنان دێ. |
| * ئەدەنە– جەیهان | جادەیـــەکی ســـەرەکیی فەرامۆشـکراوەو، جێـی تایـەی قووڵـی زۆرن. |

| *جەیهان- عوسمانییە | خۆڵەو، پردی نییەو، چەمەکە لەوەرزێکی خۆشدا بە کەڵکی پەڕینەوە دێ |
|---|---|
| عوسمانییە- دامێنی گاورداغ | خۆڵەو، لەسەر جادەیەکی پشتگوێ خراوە. پردەکانی بەزۆری رووخاون. |
| *مەورازی رۆژئاوای گاورداغ | رێگەیەکی ئەندازەیی‌ی فەرامۆشکراوی خراپە. |
| * لوتکەی گاورداغ- فەوزی پاشا | رووکاری دەرەوەی باشە. پردەکەی لە بنەوە تێکچووە. |
| * فەوزی پاشا- لقی عەینتاب | باشە. |
| * لقی عەینتاب- باکووری ئەل- ئۆغلوو | مرۆڤ سەری لێ سوڕدەمێنێ. |
| * باکووری ئەل ئۆغلوو- مەرعەش | زۆر باشەو، لقێکی وێستگەی هێڵی ئاسنیشی هەیە. |
| * سەعات٦:١٥ لەئەدەنەوە بە فۆردێکی نوێ دەرچوومو، ٢:٣٠ گەیشتمە مەرعەشو، لەرێگەش سەعاتێك پشووم دا. | |
| * مەرعەش- دووڕییانی جادەی فەوزی پاشا | جادەیەکی سەرەکیی بەردرێژە. رووکاری دەرەوەی، جگە لە چەند ماوەیەکی پچڕ پچڕ، زۆر خراپە. ماوەی دارینی پردی، بلێین، (پێنج) میلی دەرەوەی مەرعەش رووخاوەو، هەروەها ئەوی بیست میلی دەرەوەیشی بەرەو نەمان دەچێ. |
| * فەوزی پاشا- عەینتاب | بۆ هاتوچۆی ناوخۆ باشە. |

| * دووریپیانی ڕێگەی فەوزی پاشا- عەینتاب | زۆر باشترەو، چەند کیلۆمەترێکی تەواو چاککراوە. مەرعەش- عەینتاب سێ سەعاتە ڕێیە. |
|---|---|
| * عەینتاب- نزیب (Nizib) | دروستکراوەو، ڕووەکەی نارێکە. پرد نییە،بەڵام لە وەرزی وشکیدا، چەمەکان بوارن. |
| *نزیب- جەرابلووس | ڕێگەیەکی خۆڵینە. |
| * جەرابلووس- بیرەجیکی بەرامبەر | خۆڵینە. |
| *عەینتاب- بیرەجیکی بەرامبەر | دەڵێن دروستکراوە، بەرزونزمی زۆرن. |
| *بیرەجیك | بەلەمی ساکاری پەرینەوە. |
| * بیرەجیك- ئورفە | سەرەکییەو، زۆریەی چاڵو چۆڵەو، لێرەولەوێ هەر نامێنێ. پردەکان، بەزۆری، روو لە چاککردنەوەن، نزیکەی سێ سەعاتە ڕێیە. |
| * ئورفە- سیوەرەك | دروستکراوە. هەندێ جار تەواو نامێنێ. زۆرجار نارێکەو، چەند میلێکی کەمی باشن. بینای پردی سەر ڕووبارەکە (بڵێن پازدە میل خوارووی سیوەرەك) باشە. سەرجەم کەڵەپردەکانی پردی (دوو میلە باشووری سیوەرەك) قورپ بەردن، سەرەکەیشی دراینە. |
| * سیوەرەك- دیاربەکر | دروستکراوەو، زۆریەی چاڵو چۆڵە، |

| | |
|---|---|
| | بەلام دە میلی دوایی‌ی باشن. |
| * ئۆرفە– دیاربەکر | شەش سەعاتە رێیەکە. |
| * دیاربەکر– حاسلۆ | دروستکراوەو، بەردرێژە. لە دوای شەش کیلۆمەترو بەلای راستدا دەچێتەوە بۆ سعرتو، لە پەنجاو هەشت کیلۆمەترو لای چەپدا دەچێتە حەزۆ. |
| * حاسلۆ –سیلوان( هەشتاو پێنج کیلۆمەتر)– باتمان سۆ | بەرد رێژو باشە. |
| * باتمان سۆ | پردێکی لەقورو بەرد دروستکراوی یەك کەوانیی هەیە. |
| باتمان سۆ– حەزۆسۆ | بەکەڵك نەماوە. |
| * حەزۆسۆ | پردێکی لە بەردو قورکراوی هەیە. |
| رێگەیەکی تر کە لە وەرزی خۆشیدا پەسند بێ، رێگەی خۆڵی شەش کیلۆمەتری دەرەوەی دیاربەکرە بەرەو غۆبان. لێرە رێگەیەك دەچێتەسعرتو حەزۆسۆ. | |
| * حەزۆسۆ– غەرزان | رێگەیەکی خۆڵینی باشە. |
| * غەرزان– بدلیس سۆ | رێگەیەکی ئەندازەیی‌ی سەرگردەکانەو، رووەکەی بەرزو نزمە. |
| بدلیس سۆ– بدلیس | رێگەکە لە بەری جۆگەکەدا بڕاوەو، نارێکوپێك بۆ لۆرییە عەسکەریەکان چاککراوەتەوە. جێی دوو لۆری لە زۆربەی شوێنەکاندا دەبێتەوە. |
| * دیاربەکر– بدلیس بەفۆردی | سەعات۰۰:٦ی بەیانی دەرچووم، |

| | |
|---|---|
| نوێ | ٦:٣٠ی ئێوارە، گەیشتمە جێ. سەعاتو نیوێك بۆ پشوو لامدابوو. بە هەمان ئۆتۆمبیل سەعات ٧:٣٠ی بەیانی لە بدلیس دەرچووم، بەغۆباندا، ٤:٣٠ ئێوارە گەیشتمەوە دیاربەکر، بەلام سەعاتێك پشووم دا. |
| * بدلیس– مووش | نەوەد کیلۆمەترە. سی کیلۆمەتری یەکەم دروستکراوەو، چاڵوچۆڵی زۆرن. سی کیلۆمەتری ناوەڕاست بەقەراغی دەشتی مووشدا دەڕوات، چەمێکی گەورەی بێ پردیشی لەڕێیە، کە لە وەرزی وشکانیدا ناوەڕاستەکەیشی بواری پەڕینەوە دەدات. دوا سی کیلۆمەتر دروستکراوەو، ڕووەکەی بەرزو نزمە. کاتی پێویست بۆ بڕینی، بە فۆردێکی تازە، سێ سەعاتە. |
| * بدلیس –وان | ١٠ میل لەدەرەوەی بدلیس دەبێتە ڕێی لاوەکی (فرعی). ئەڵێن ڕێگەی دەوری باکووری دەریاچەکە، لەکەش و هەوای نالەباردا نەبێ، لۆریی بەسەردا دەڕوات، بەلام هی باشووری، تا دەوربەری. کۆتایی‌ی مانگی مایسی ئەمساڵ بەکەڵك نایەت. |

<table>
<tr><td colspan="2">* مووش پرۆژەی تەواوکردنی سێ ڕێگەی بەرەو دیاریەکرو بدلیس‌و بایەزید هەیە.</td></tr>
<tr><td>* دیاریەکر- ماردین</td><td>ڕێگەیەکی دروستکراوی نەوەد کیلۆمەترییە. بەشێکی زۆر باشەو، ئەوانی تری کەڕێگەی لاوەکییان نییە، یەکجار خراپن. سێ سەعاتە ڕێیە.</td></tr>
</table>

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٢/٤٢٤، ل١١٧-١٢٧،ژ:١/٦٨

## ژ:٥٦

## لە مستەر ئەدمۆندزەوە بۆ مستەر هندرسن.

**ژمارە:١٦٦**

**قوستەنتەنییە، ٢٣ی مایسی ١٩٣٠**

**گەورەم،**

ئاماژە بە نووسراوی ژمارە (١٥٨)ی (٢١) ئەم مانگەم، خۆشحاڵم لێرەدا کۆپیی نووسراوێکی تری کونسوڵی تەرابزوونی خاوەنشکۆتان تایبەت بە بارودۆخی کورد بۆ بنێرم. ئەم نووسراوە بریتییە لە زانیاریی وەرگیراو لە کونسوڵی ئێرانەوە لە ئەرزرۆم سەبارەت بە پیلانێك کە لە ئەرزرۆم هەڵوەشێنراوەتەوەو، شەڕێکی نزیك بایەزید لەگەڵ یاخییاندا، کە لە ڕاستیدا بەشێك بووە لەو یاخیبوونەی کەوا مستەر ماتیۆس باسی کردووە( بڕوانە نوسراوی ئاماژە پێکراوی سەرەوە)و، کۆبوونەوەی سەرباز نزیك سنوورەکانی رووسیاو ئێران کە ڕەنگە ئامانجیان گەمارۆدانی ژمارەیەکی زۆر یاخیی پەنابردوو بۆ چیاکان بێ.

٢ـ گومانی تێدا نییە، زانیارییەکانی کونسوڵی گشتیی ئێران لەسەر کۆلۆنێل لۆرەنس. تەنها قسەو قسەلۆکی بەردەوامی ئەرزڕۆمەوە، پێدەچێ لە هاوکارە سۆڤەتییەکەیەوە وەریگرتبێ. هەست ناکەم حکومەتی تورک باوەڕ بەو پڕۆپاگەندە بێ مانایانە بکات.

دەبلیوو ئێس. ئەدمۆندز

وەزارەتی دەرەوە ٢٧٢/٤٢٤،ل:١٣٠ژ:٧٣

*    *    *

## هاوپێچی ژ: ٥٦

## لە کۆنسوڵ ماتیۆسەوە بۆ سێرجی. کلارک

## تەرابزوون، ١٢ی مایسی ١٩٣٠

**ژمارە:٥٧**

**گەورەم،**

خۆشحاڵم ئەم زانیارییانەی خوارەوەتان بۆ بنێرم کە(١٠)ی ئەم مانگە لە کەسی ئاماژە پێکراوی برگەی (٤)ی راپۆرتی ژمارە (٥٤)ی (٧)ی ئەم مانگەم وەرمگرتوون.

٢ـ دوومانگە، دەسەڵاتدارانی تورک نەوەد کوردیان لە ئەرزروم دەستگیرکردووە، کوڕێکی شێخ سەعیدو مۆرهەڵکەنێکیان لە ناودایە. ئەو گیراوانە. کۆپیی بەرنامەی (کۆمیتەی کوردستان) بۆ راپەڕین‌و لیستی ناوی کەسانێکیان، کە کۆمیتەکە فەرمانی کوشتنی داون، پێگەیشتووە. جا دەبوو سەرهەڵدانەکە، بەپێی بەرنامەی ئەو کۆمیتەیە، هاوکات لەچەندین شوێنی جیاجیای ویلایەتەکانی رۆژهەڵات‌و باشووری رۆژهەڵات بەرپابیوایە. ئیبراهیم بەگی سەرۆکی دادگای تاوان (Agir Ceza

(Raisi) کە سێ ساڵ لەمەوبەر شەست کوردی بەتاوانی جێبەجێ نەکردنی یاسای کڵاوشەپقە بەمردن حوکم دابوو، یەکەم ناوی لیستەکە بووە. خالیسی کوڕی شێخ عەبدولمەجید[1]، وەك لە راپۆرتی ژمارە (٦٨)ی (٤) ئەیلوولی (١٩٢٨)مدا ئاماژەم پێکردبوو، بەشداریی هێرشی پایزی ساڵی ١٩٢٨ی بۆ سەر کاروانێك کە فەرشی لە تەورێزەوە بۆ تەرابزوون گواستبووەوە، کردبوو و، پێشدەچێ یەکێك لەو سەرکردە وکوردانە بووبێ کە ئەم دواییە دەستگیرکراون. زانیاری لەبارەی ناوی کوڕی شێخ سەعید یاخود مۆرهەڵگەنەکە (حکاك Hakak)وە نییە کە گیرابن و، لەبەر وردەکاریش هیچ پرسیارو لێکۆڵینەوەیەك نەکراون، مۆر هەڵگەنەکە بە تاوانی دروستکردنی مۆر بۆ (کۆمیتەی کوردی) تاوانبارکراوە. دوازدە لەو کووردە دەستگیرکراوانە ناوەڕاستی مانگی نیسانی رابردوو نێردراونە ئەنکۆرە بۆ دادگایی. دوا شەڕو پێکدادانی کوردو سەربازانی تورك، کە خاوەنی ئەم زانیارییانە بیستبوونی، چەند هەفتەیەك لەمەوبەرو لەسەر رێگەی بایەزیدی- قەرەکۆسە روویان دابوو، قوربانییەکی زۆریان لێکەوتەبووەوەو، کوردەکان پێنج ئەفسەری تورکیان بەدیل گرتبوو، دواتر پارچەی لەشیان بڕیبوون و، کوشتبوونیان. تورکەکان باوەڕیان وابوو، کە کوردەکان نەخشەی راپەڕینێکی سەرتاسەرییان بەڕێنوێنی کۆڵۆنێل

---

[1] خالیس بەگ (١٨٨٩-١٩٧٧) بە ئۆیزتورك ناسراوەو لە هۆزی سپیکییە. باوکی قوماندانێکی سوارەی حەمیدی بووەو، شەڕی رووسی کردووەو، ١٩٣٠کۆچی دوایی کردووە. خۆی پێشتر خەریکی کشتوکاڵ بووە. ١٩٢٨ ئەندامێکی وەفدی شۆڕشی ئاگری بووە بۆ گفتوگۆ لەگەڵ نوێنەرانی حکومەتدا. دوای شۆڕشەکە، چووەتەوە ناو ئێران. دواتر بەلێبوردنی گشتی گەڕاوەتەوە بۆ تورکیا. سێ جار بە نوێنەر لەسەر پارتی دیموکرات هەڵبژێردراوە. لەهەرای ١٩٦٠دا دووخراوەتەوە بۆ (یاسسی ئەدە)و مەحکەمەکراوەو، ماوەیەك گیراوە. پاشان لەئەرزرۆمەوە براوە بۆ تەرابزوون و، هەڵاتووە (ئیحسان نوری بیتلیسی، شۆڕشی نەتەوەیی کورد لە تورکیا، وەرگێڕانی م. جەمیل رۆژبەیانی، بغداد، ١٩٩٣، ل١٩؛ رۆمات ئالاکۆم، خۆیبوون و شۆڕشی ئاگری، وەرگێڕانی شوکور مستەفا، هەولێر، ٢٠٠٠، ل٥٥، ٦٣، ٧٥-٧٦) . (س)

لۆرەنس[11] کێشابوو. هەواڵ لە ئەرزرۆم هەیە کە ناوبراو مانگێك پێش ئێستا لە قەرەکۆسە بینراوەو، دواتر پۆلیس فەرمانی چاودێریی پێدراوە. هەوڵدەرەکەیش هاودەنگم بوو کە ئەم قسەیەی سەبارەت بە کۆلۆنێل لۆرەنس، سەیرە. سەرباری ئەمە، تورکان باوەڕیان وابوو کە کۆلۆنێل لۆرەنس لە ڕاستیدا لەناو وڵاتی کورداندا نەبوە، بەڵکو زیاتر لە سنوورەوە نزیك بووە. فەوزی بەگ والیی ئێستای ئەرزڕۆم و ئیبراهیم بەگی سەرۆکی دادگای تاوان، ناکۆکن. ئیبراهیم بەگ، بەئامادەبوونی هەواڵدەرەکە، وتبووی والی، چونکە بەرەچەڵەك کوردە، ناتوانێ مەترسی بارودۆخەکە هەڵسەنگێنێ.

٣ـ هەواڵدەرەکە پشت ڕاستی کردەوە کە سەربازی فەیلەقەکانی (٧)ی دیاربەکرو (٨)ی تۆقات[1]– بەپێی قسەی ئەو سیواس و (٩)ی ئەرزڕۆم بەدرێژایی سنوورەکانی ئێران و ئەرمەنستان لە ئیغدیری باکوورەوە بۆ کەفەر یان گەوەری هەکاریی دووسەعات لەدزە (Diza)[2] وە دوورەو ورمێ یاخود رومییە (Rumye)ی سەرسنووری ئێران لەباشوور بەرەو ڕۆژئاوا کۆکرانەوە. ئەو پێی وابوو ژمارەی سەربازە کۆکراوەکانی سەر سنوور لە (١٥٠٠٠)چەکدار زۆر زیاتر بووە و، زۆربەیان هی هەرێمی بایەزید بوون. تورکەکان وتوویانە گوایە ئەو سەربازانە بۆ مانۆڕ کۆکراونەوە. مۆڵدانەکە دەوروبەری (٢٤)ی مانگی مارس دەستی پێکردووە کەچوار فەوجی سوارەو ٢٠٠ حوشتری بارکراو، لە تەقەمەنی لەدیاربەرکرەوە

---

[1]مەبەست تۆما لۆرەنس (١٨٨٨–١٩٣٥)ە کەئەفسەرو نووسەرێکی ئینگلیزییە، متمانە پێکراوی زۆر بەژێری وڵاتەکەیبووە لەلای سەرانی عەرەبو، بەتایبەت شەریف حسێن لەیەکەم جەنگی جیهانی، ولەوەودوادا. ساڵانی ١٩١٦–١٩١٨ هانی عەرەبیدا بۆ شۆڕش دژی تورکو لایەنگیریی کرد. ڕۆژنامەوانی ناسناوی( مەلیکی تاج لەسەر نەتراوی عەرەب)ی لێناوە( المنجد فی الاعلام، حکومەتی ٦١٥)(س)

[1] ویلایەتێکی بەشی باکووری ناوەڕاستی تورکیایە.(س)

[2] قەزایەکی نزیك بە سنووری ئێران و لە ڕۆژهەڵاتی ویلایەتی حەکارییە.(س)

گەیشتبوونە قەرەکۆسەو، هەر لەوماوەیەدا، چوار فەوجی تری سوارە بە ئەرجیشدا بەرەو وان پەڕیبوونەوە. جگە لە سەرباز، هەزاران جەندرمەیش گەیشتبوونە سنوورەکان. زەکی پاشای سەرۆکی پێشووی جەندرمە فەرماندەیی‌ی فیرقەی جێگیری قەرەکۆسە کردبوو، دواتریش ساڵح پاشا هی فەیلەقی نۆی سەربازیی لە سوداد پاشا وەرگرت.

٤- زانیاریدەرەکە نەیتوانی باسی کۆبوونەوەکە بکات. قسەکانی ئەرزڕۆم هی کوردەکانن، بەڵام کاربەدەستانی تورکیش دەیانەوێ رێ لە هاتنە ناوەوەی کەسانی وەك ئەرمەنی‌و سەربازانی ئاژاوەگێڕی سۆڤیەتی لەسەرتاسەری قۆقازەوە بۆ ناو وڵاتەکەیان بگرن. ناوبراو بیستبووی پێنج فیرقەی رووسی چووبوونە ناو خاکی ئێرانەوە. تورکیایش پەنابەرانی ئەرمەنیی دزە کردووی بۆ ناو خاکەکەی دەستگیرکردووەو، دوانیەوە دەست رووسەکان، ئیتر ئەمەرنیەکان ملی رێگەیان گرتوو بۆ ناو خاکی ئێران.

٥- لەنووسراوەکانی ژمارە (٥٦)ی (١٤)ئابی (١٩٢٨)و (١٦)ی (١١)ی تەممووزی (١٩٢٩)مدا ئاماژەم بەو هەواڵدەرە داوە کە (٩)ی ئەم مانگە لەگەڵ ژنە ناساغەکەیدا، هاتنە ئێرەو، (١٥)ی مانگ بە تەنیا گەڕایەوەبۆ ئەرزڕۆم.

٦- زانیم کەشتیی هەڵمیی هێڵی سدیق زادە، کۆتایی‌ی نیسانی رابردوو، بە باری (٥٠٠ پێنج سەد) تەن بەنزینەوە لە باتوومەوە گەیشتووەتە ئێرە. دەسەڵاتدارە سەربازییەکان دەستیان بەسەر بەنزینەکەدا گرتووەو ، بە لۆری‌و حوشتر رووبە ئەرزڕۆم دەیگوێزنەوە. تفەگ‌و تەقەمەنیش بە برێکی زۆرو بەرچاو، لە چەند هەفتەی رابردوودا، نێردراون.

دەبلیو.دی. دەبلیو. ماتیۆس

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٢/٤٢٤، ل: ١٣٠-١٣١، ژ:١/٧٢

## ژ:٥٧

## لە مستەر ئەدمۆندزەوە بۆ مستەر نێی، هندرسن (١٠ی حوزەیران گەیشتووە)

ژمارە: ١٩٤

ئەنگۆرە، ٣ی حوزەیرانی ١٩٣٠

گەورەم،

پێم خۆشە ئاگادارتان بکەمەوە کە گەنجێکی کوردی سەلاحەدین[1] ناوی کوڕی شێخ سەعیدی رێبەری سەرهەڵدانی ١٩٢٥ی کوردستان لێرەیەو، بە تاوانی پیلانگێڕان لە ئەرزڕۆم، کە کونسوڵی خاوەنشکۆ لە تەرابزوون ئاماژەی پێکردووە (نووسراوی ژمارە ١٦٦ی ٢٣ مایسم)، چاوەڕێی دادگایی دەکات.

٢ـ رۆژنامەی (مللییەت)ی نیمچە رەسمی، ٢٦ی مانگی رابردوو، نووسیبووی چۆن کاتێك سەلاحەدین لە بەغدا پەنابەر بووە، نێردراوەتە قوتابخانەی سەربازی ئەوێ، دانی پێداناوە کە خەرجیی، خوێندنەکەی، بەڵام نەك دژی تورکیا، لە سێر هاملتۆن[2] (سێر ئی. ئێلینگتۆن؟) وەرگرتووە. ئەم زانیارییە هەڵەو بێ زیانە لەژێر سەردێری "کۆمەڵێ ناپاك"دا نوسراوەو، دەڵێ: "پرۆژەی ئایندە دژی کەسانی سەر بەو رێکرو

---

[1] دوای تێك شکاندنی شۆڕشی شێخ سەعید هەڵاتە دیوی عیراق. نووری سەعیدی سەرۆك وەزیری ئەو کاتەی حکومەتی پاشایەتی، پاراستیو خستییە کۆلیجی عەسکەریی بەغدا. ساڵی ١٩٣٠ گەڕایەوە بۆ تورکیا (روبرت اولسون، البیرانیون نسبا، مناصب، سیاسات، مقاتل، مناف الخ،" کوردنامە" (مجلە دوریە)، دمشق، العددان ٢-٣، تموز ایلول ١٩٩٥) . (س)

[2] مەبەستی (ئەی. ئێم. هاملتۆن)ی خاوەنی کتێبی طریق فی کردستان، ترجمە جرجیس فتح اللە، بغداد، ١٩٧٣)ە کە ئەوکاتە سەرپەرشتیی کردنەوەی رێگای نێوان رەواندز- حاجی ئۆمەرانی کردووە بۆ سەر سنووری ئێران.(س)

چەتانە دەبێ کە یارمەتیو پارەی مستەر هاملتۆنیان لە بەغداوە پێ دەگاتو، کێشەو ئاژاوە لە هەرێمەکانی ڕۆژهەلات دەنێنەوە"[٣]

ڕۆژنامەیەکی تەنزئامێز کە خوێندەوارێکی زۆری هەیەو، بەقازانجی حکومەت دەردەچێ، یەکەم پەڕەی بۆ وێنەی کوردێکی یاخی تەرخانکردبوو کە حکومەت گرتبوویو، پاوەنی ئینگلیزیی لێ داکەوتبوو.

٣ـ من پاش ئەوەی راوێژم بە نوێنەری عێراق کرد، نەشیاوی مەبەستی ئەم جۆرە بۆچوونە بێ مانایانەم بۆ ئەو بەشەی کە تایبەتە بە وەزارەتی کاروباری دەرەوە، روونکردوە. ئەو ویستی بیانوو بۆ هەڵوێستی نابەرپرسانەی ڕۆژنامەنووسانی ناوخۆ بێنێتەوەو، ئەمە ناچاری کردم، بیری بێنمەوە کە هەردوو ڕۆژنامەکە پەیوەندیی تایبەتییان بە حکومەتەوە هەیە. هەرچۆنێك بوو، ڕێنوێنی (تعلیمات)ی بۆ راگرتنی ئەو پێشبینییە زیانبەخشانەی لەمەڕ ئاکامی دادگاییەکە دەرکرد.

٤ـ دوێنێ دەرفەتم بۆ رەخساو، سەبارەت بەمەسەلەکە قسەم لەگەڵ وەزیری دەرەوەدا کرد. ئەو، بەخۆشحاڵییەوە، رازی بوو بەتەواوی واز لەو تێبینیانە بهێنرێ، چونکە بێ بناغەو. زیانبەخشن، ناوبراو پەیمانی دا ئیتر شتی لەو بابەتە بڵاو نەبێتەوەو، خۆبەخۆ وتی ئەو سیاسەتەی پێ پەسەندە کە حکومەتی خاوەنشکۆ لە عیراق پێڕەوی دەکات.

٥ـ وێنەی ئەم نووسراوە بۆ کۆمیساری باڵای خاوەنشکۆ لەبەغدا دەنێرم.

دەبلیوو. ئێس. ئەدمۆندز

وەزیری دەرەوە،٤٢٤/٢٧٢، ل:١٣٢-١٣٣، ژ: ٧٧

[٣] ئەمە فەرەنسییە.

ژ:٥٨

**لە سێر جی. کلارکەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن –(٣٠ حوزەیران گەیشتووە)**

**ژمارە: ٤٣و٤٤**

**برووسکە**

**قوستەنتەنییە، ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٣٠**

**وەڵامی نووسراوی ژمارە (١٦٦)ی مستەر ئەدمۆندز.**

بەم دواییە هەواڵی هێرشێکی سازدراوی تورك بۆسەر کوردەکانی هەرێمی ئاراڕات بڵاو بووتەوە.

چاپەمەنییەکان رایانگەیاندووە:١٠ی حوزیران و رۆژانی دواتر لەئارارات هێرشێك کراوەتە سەر چەتەو رێگری لە ئێرانەوە هاتوو. ئەو چەتانە تا ناوخاکی ئێرانی، شوێنی ئامادەکردنیان، راونراون، هێرشی دووەم (١٩)ی حوزەیران نزیك بە خانك Hanik روویداوەو، بیر لەکردەوەی سزادان بەئاشکرا بۆ رۆژئاوای دەریاچەی ورمێ و باشووری خانك کراوەتەوە. (کۆتایی وەڵام.)

بێگومان چەتەکان کوردن، بەڵام رەنگە دەسەڵاتداران ئامادەنەبن دان بەسیاسەتی لێك تێگەیشتنی ئاشتیانەدا دابنێن.

(بۆ تاران دووبارە کراوەتەوە.)

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل:١، ژ:٢

ژ: ٥٩

## لە سێر. ئار. کلایڤەوە بۆ مستەر ئێی هندرسن-( ١٠تەمووز گەیشتووە)
## ژمارە: ٢٩٨، نهێنی و تایبەتی

گولحەق، ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٣٠

گەورەم،

خۆشحاڵم نووسراوی پاشکۆی سەربازیی هاوپێچ بکەم کەتایبەتە بەلێدوان لەسەر کێشەی ئێستای کوردستانی تورکیا لەگەڵ رۆبن پاشا ناوێکی ئەرمەنیداو، دەیشڵێ گوایە ساڵی ١٩١٤ لە ئەرمینیا وەزیری جەنگ بووە. هەروەها نووسراوی کونسوڵی خاوەنشکۆ لە تەورێز، سەبارەت بەهەمان بابەت، هاوپێچ دەکەم.

٢. ئامانجی راگەیەنراوی سەردانی رۆبن پاشا بۆ تاران دەست خستنی چەکە بۆ کوردانی تورکیا. لەکاتێکدا، بەمەزندەی ئەو، ژمارەی سەربازانی سوپای تورك (٦٥٠٠) چەکدار دەبێ، جەنەراڵی ئێرانی لە تەورێز مستەر پاڵمەری ئاگادار کردووەتەوە کە سوپای تورك (١٥٠٠٠) سەربازی هەیەو، فرۆکەو تۆپی قورسیش پشتیوانییاندەکەن.

٣. لەبارەی برگەی (٨)ی راپۆرتی مستەر پاڵمەرەوە کەتێیدا هاتووە: بەپێی رای ئەمیر عەللام، سیاسەتی ئێران هاوکاریکردنی یاخییانی کوردە بە خۆراك و تەقەمەنی، بێگومان زیادە رۆییە. راستەکە تەیموور تاج دەڵی کوردان هەموویان داردەستی ئێرانن. ناوبراو بەڵگەی ئەوە دێنێتەوە کە پەیوەندیی مێژوویی و دینییان بەئێرانەوەیە، نەك تورکیا، بۆیە هەمیشە سیاسەتی ئێران بەرامبەر بەکورد لەسەر بنەمای دۆستایەتی و لێککەیشتن بووە. هاوکات بیرۆکەی کوردستانی یەکگرتوو لای حکومەتی ئێرانیش قەدەغەیە، لەبەر ئەوە" مافی چارەنووسی و مافی تایبەت بۆ کەمینەکان" ی ویلسن کە حکومەتی خاوەنشکۆ بێ ئاگایانە پێیوابوو بەکەڵك دێت، گومانی زۆری لەسەرە.

٤. هەفتەی پێشوو لە وەزیری دەرەوەم پرسی: ئایا نائارامی ئێستای کوردستانی تورکیا هیچ دڵە راوکێیەك بۆ حکومەتی ئێران دروست دەکات؟ بەڕێزی کە تا چەند مانگی رابردوو باڵوێزی ئێران بووە لە ئەنگۆرە، مەسەلەکەی روونکردەوەو، وتی بڕیارە کۆمسیۆنی سنووری تورکیا- ئێران رۆژی (١٠)ی تەمموز، بۆ دیاریکردنەوەی سنوور دەست بەکاربێ و، پێشبینیکرد بەر لەکۆتایی وەرزی هاوین، دۆخەکە سەقامگیر ببێ.

٥. وێنەی ئەم راپۆرت و هاوپێچە بۆ کۆمیساری باڵای خاوەنشکۆ لە بەغداو کونسوڵی خاوەنشکۆ لە تەورێز نێردرا.

ئار. ئێچ. کلایف

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣،٤٢٤، ل: ٧، ژ: ١١.

* * *

## هاوپێچی (١)ی ژ(٥٩)

## لە نەقیب کۆلۆنێل دۆدەوە بۆ سێر ئار. کلایف

**گولحەق، ٢٨ی حوزەیرانی ١٩٣٠**

**گەورەم،**

خۆشحاڵم کۆپی راپۆرتێکتان لەبارەی چاوپێکەوتنێکی رۆژی (٢٦)ی حوزەیرانی ١٩٣٠ مەوە لەگەڵ رۆبن پاشا ناوێکدا بۆ بەرزبکەمەوە. وێنەی ئەم نووسراوە راستەوخۆ بۆ فەرماندەی هەواڵگری و کارە سەربازییەکان وەزارەتی جەنگ و سەرۆکی ئەرکانی گشتیی فەرماندەییەکانی سوپا لە هندستان دەنێرم.

پی. سی. ئار. دۆد

پاشکۆی سەربازی

" راپۆرتی چاوپێکەوتنی رۆژی (٢٦)ی حوزەیران لەگەڵ رۆبن پاشا ناوێکدا."

(٢٦)ی حوزەیران، بەپێی وادەیەك، لەگەل رۆبن پاشا ناوێکدا کۆبوومەوەو، ناوبراو پێی راگەیاندم کەساڵی ١٩١٤ لەئەرمینیا وەزیری جەنگ بووەو، ئێستاش بەکارێکی نهێنی هاتووەتە تاران. ئەو، بەنیازبوو هاوکاریی حکومەتەکانی بریتانیاو ئێران بۆ کوردانی تورکیا لەئاراڕات بەدەست بێنێ.

زانیم ئەمانە سێچوار ساڵە لەهەوڵی ئەوەدان کە لەژێر دەستەیی‌ی تورك رزگاریان بێو، لەڕاستیشدا ئێستا، سەرەڕای کۆششەکانی تورك بۆ ئەوەی بیانخەنەوە ژێر رکێفی خۆیان، تاڕادەیەك سەربەخۆن.

تورکەکان دەورووبەری (١٠)ی حوزەیران دەست پێشخەری تاوانێکی نەخشە بۆکێشراو بوون دژی کوردانی ئاراڕات. رۆبن پاشا پێی وابوو سوپای تورك (١٥٠٠) نیزامی‌و نزیکەی (٥٠٠٠) نانیزامی دەبێو، ئەمەیش زۆر لەژمارەی راگەیەندراوی سەرچاوەکانی‌تر کەمترە. کوردەکان دوو ناوچە، یەکیان بەرەو باکووری ئەرجیش‌و، ئەوی‌تر هەرێمی چیای ئاراڕات‌و بەرەو رۆژئاوایان کۆنترۆڵ کردووە. دەیانەوێ پانتایی‌ی نێوان هەردوو دەڤەرەکە بگرن‌و، بیکەنە هەرێمێکی شۆڕشگێڕ. سوپای تورك کراوە بەدوو بەشەوە: گروپێکیان لە باشووری ئەرزرۆمەوە بەرەو ئاراڕات‌و، ئەوی دی باکووری رۆژئاوای گۆلی وان بەرەو ئەرجیش‌و بایەزیدی پێ سپێردراوە. شوێنی ئەم کردەوە سەربازییە بۆ سەربازانی نیزامی زۆر سەختەو، تورکەکان بەهێشتنەوەی هێزەکانیان لەو هەرێمانەدا گرفتیان زۆرە.

سۆڤیەت رێ بەتورکیا دەدات بۆ پێویستیەکانی سوپاکەی بەڕێگە ئاسنەکانی سۆڤیەت‌و بەناو کۆماری یەکێتی سۆسیالیستیی سۆڤیەتیدا دابین بکات.

کوردانی تورکیا بەدەست کەمو کوڕیی ئاسایی‌ی تەقەمەنییەوە کە تاکە داوایانە بۆ درێژە پێدانی بەرگری دژی تورك، دەناڵێنن. تەنها داوای رۆبن پاشایش دابینکردنی نارەسمیی تەقەمەنی‌بوو بۆ کوردەکانی ئاراڕات.

ناوبراو پێشنیاری ئەوەی لاکردم کەئەگەر حکومەتی بریتانیا رازی بێ، ئەوا ئەم دەتوانێ تەقەمەنی زۆر بەنهێنیو لەڕێی عێراقەوە بۆ کورد بگوێزێتەوە. بۆیە پێویست بوو پێی رابگەیەنم کە ئەم داوایەی بێمانایەو، ناتوانم ئەم مەسەلەیە بەجددی بگەیەنمە وەزیری خاوەنشکۆ. ئەو، بەهیوابوو لەگەڵ حکومەتی ئێراندا سەرکەتووتربێ.

قسەکانی رۆبن پاشا ئەوەیان دەگەیاند کە سۆڤیەت تورك وەك داردەست بەکاردێنیو، ناڕەسمی یارمەتی تورك دەدات بۆ کۆنتۆڕلکردنی کوردەکان، تاپاشتر خۆیان بەشێوەیەکی ئاشتیانە دەست بەسەر ناوچەکەدا بگرن. بەمەیش گەرەکیانە دەسەڵاتی خۆیان بەرەو خۆرهەلات تا خوارووی کەناراوەکانی دەریای قەزوینو بەرەو باشوورو عێراق فراوان بکەن. ئەمە ترسی رۆبن پاشایە، بۆیە هیوادارە ئامانجی ئەم کارەی ئێستای لەتاران دەستەبەر بکات.

" نەقیب کۆلۆنێل پێرسی سی. ئار. دۆد"

پاشکۆی سەربازی

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ٨، ژ: ١/١١

*** ******

## هاوپێچی (٢)ی ژ: (٥٩)

## لەکونسوڵ پاڵمەرەوە بۆ سێر. ئار. کلایڤ.

**ژمارە: ١٠٨ نهێنی**

**تەورێز، ١٨ی حوزەیرانی ١٩٣٠**

**گەورەم،**

خۆشحاڵم پێتان رابگەیەنم کە جەنەڕاڵ ئاگاداری کردمەوە: (١٢)ی حوزەیران‌و دوای بۆمبارانکردنێکی سی رۆژەی مەترێزەکانی پێشەوەی یاخییان، سوپای تورک کە وامەزەندە دەکرێ(١٥-١٦) هەزار چەکداربووبن، بەتۆپی قورس‌و پێنج فرۆکەوە شالاویان بردە سەر کوردەکان لە شاخی ئاراڕات.

هێرشەکە لە ئیغدیرەوە دەستی پێکردو، بەرەو دیواری پارێزگاریی نیمچە ڕووخاوی (سەردار بولاق- Sardar Bulak)ی باشووری رۆژهەلات کە دەکەوێتە نێوان هەردوو ئاراڕاتی گەورەو بچووك، پێشڕەویی کرد.

٢. رەنگە ئەو خاڵە کۆنترۆل کرابێ، کەچی جەنراڵەکە پێی‌وابوو کۆششی تورکەکان شکست دێنێ، چونکە ئەو دیواری پارێزگارییە لەزستاندا گەلێ سەخت‌و لەبڕین نەهاتووە.

٣. هەڵبەت دەتوانرا گوندو کۆختەکانی بناری ئاراڕات بسووتێنرانایە، بەلام دەڵێن یاخیەکان هێندەیان خۆراك پێیە کەدەتوانن تاماوەیەکی درێژ بمێننەوە. دەشێ یاخییان خێزانەکانیان ناردبی یان بنێرنە لای کوردانی ئێران.

٤. جەنەڕال رایگەیاند: هەموو هەوڵێکی دەخاتەگەڕ بۆ چەککردنی هەرپەنابەرێك، بۆیە داوای لە تورکەکان کردووە چوار مانگ پێش دەست پێکردنی هەر هێرشێکی نەخشە بۆکێشراو، ئاگاداری بکەنەوە. جالەبەر ئەوەی چەند رۆژێکی کەمیان داوەتێ‌و (پەلاماری رووسەکانیش لەئارادایە)، نەیتوانیوە هەنگاوی پێویست بنێ‌و، مادام ئاگادار نەبووە، رازی نییە بەرپرس بێ.

٥. ئەو پێی‌وابوو دەشی باشتر بێ تورکان هێزەکانیان بکەنە چەند ستوونێکی تێکەلی چوارهەزار کەسی. ئەمجا لەچەندین قۆڵی جیاجیاوە هێرش بکەنەسەر چیای ئاراڕات‌و، لەڕێگەی بێتەلیشەوە پەیوەندیی بەردەوامیان پێکەوە هەبێ.

**تێبینی:**

هەربەم شێوەیەبوو ئیتاڵیەکان ساڵانی ١٩٢٧و ١٩٢٨ لەشاخی بەرقە (Cyrenaican Jebel)[1] سەرکەوتن،بەڵام ئەم چیایە لەگەڵ ئاراراتدا بەراورد ناکرێ.

٦. ئاسان نییە ژمارەی یاخییانی کورد دیاری بکرێن. ساڵی رابردوو دەیانوت دوو هەزار چەکدار دەبن، بەڵام ئێستا باوەڕوایە، بەهۆی پەنابەرە موسڵمانەکانی رووسیاوە، ژمارەیان (١٥٠٠)یتر زیادی کردبێ.

٧. (١٥)ی مانگ بەڕێوەبەری بانکی میللی (Bank Milli) بۆ نانی ئێوارە داوەتی کردم، تا ئەمیر عەللام ببینم کە (١٧) ی مانگ دەچووە تاران.

سەردار ئینتیسار (Sardar Intisar)ی هەشت ساڵ لەمەوپێش رەئیس نیزام (Rais Nizam)و پارێزگاری گشتیی تەورێزو ئێستا پارێزگاری گشتیی باشووری ئێران، وەك سەرۆکی وەفدی ئێران بۆ مەسەلەی سنوور دەست نیشانکراوەو، بەم نزیکانە لەرێگەیدا بەرەو ماکۆ دێتە ئێرە.

٨. ئەمیر عەللام لای خاتوو ماك گرات کە (١٦)ی مانگ چاوی پێی کەوتبوو، دانی پێداناوە کە بەرنامەو سیاسەتی ئێران بریتییە لەهاندان یاخود یارمەتیدانی یاخییانی کورد بەخۆراكو تەقەمەنی دژی تورك.

٩. ئەمەیش لەگەڵ بۆچوونی بەرچاوخراوی خۆمدا کەلەگەڵ خاتوو ماك گراتدا لێی دوامو، لەسەرچاوەی تریشەوە بۆم دەرکەوتبوو، یەکدەگرێتەوە.

١٠. وێنەی ئەم نووسراوە بۆ باڵوێزخانەی ئەنکۆرەی خاوەنشکۆ نێردراوە.

ستانهەوپ پاڵمەر

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ٨-٩، ژ: ٢/١١

---

[1] شاخێکە لە ناوچەی بەرقەی باکووری رۆژهەڵاتی وڵاتی لیبیا (المنجد في الأعلام، حکومەتی ١٢٦). (س)

## ژ: ٦٠

## لە سێر جی کلارکەوە بۆ مستەر نێی. هندرسن (٧ی تەمووز گەیشتووە)

ژمارە: ٢٥٤

قوستەنتەنییە، ٣ی تەمووزی ١٩٢٠

گەورەم،

خۆشحاڵبووم، لەبرووسکەی ژمارە (٤٣)ی (٣٠)ی مانگی رابردوومدا، لەچەند راپۆرتێکی ئاژانسی ئەنادۆڵ لەمەڕ کردەوەی سەربازیی نزیك سنووری تورکیا- ئێران دژی چەتەکانی کورد، ئاگادارتان بکەمەوە.

٢ـ ئەم راپۆرتانە بۆ چەند رۆژێك و دوای بڵاوبونەوەی رۆژنامە ئەورووپییەکان کە زانیارییان لەسەر کارە سەربازییەکانی سنور تێدابوو، دواکەوتن و، کە دەرپشچوون، ئاشکرابوو مەبەستیان بچووککردنەوەی قەوارەی شەڕەکەیە.

راستە، ئامازە بەبۆمبابارانی ئاراپات لەلایەن فڕۆکەکانی تورکیاوە کراوە، بەڵام بەپێی راگەیاندنی رەسمی، ژمارەیەکی کەم سەرباز بۆ بەرەنگاریی پەلامارێکی بێ بایەخی سەرسنوور بەکارهێنراوە. دوا برووسکەی وان کە تێیدا هاتبوو: ژمارەیەکی زۆر پەلاماردەری کۆبووەوە لە (یەکمالان Yakmalan)ی ئێران لە(گەوەری سامیان Gevirisamyan)ەوە سنووریان بڕیوەو، پەیوەندییان بەهۆزی حەیدەرانلییەوە کردووەو، هێرشیان کردووتەسەر چەند رەبییەیەکی جەندرمەو، هەوڵی یاخیبوونیان داوە لەنزیك زیلان[١]، ئەوەی نیشاندا کە دۆخێکی ترسناکتر بەڕێوەیە، برووسکەکە بەکورتی ئامازەی پێکردبووکە کارکراوە بۆ بەرگرتن لە گەڕانەوەی هێرشکەران بۆ ئێران.

٣ـ سێ رۆژە راگەیاندنی رەسمی دەرنەچووە، بەڵام باری سەرسنوور تارادەیەکی زۆر بابەتی لێدوانی چاپەمەنییەکان بووەو، ئێستایش ئاشکرایە کەکاری سەربازی

---

[١] ناحیەیەکی نزیکی باکووری شاری ئەرجیشە لە ویلایەتی وان. (س)

بەشێوەیەکی بەرچاو لە ڕۆژئاوای گۆلی ورمێو نزیك ئاراراتی شوێنی ڕاپەڕینی خێڵی بەهێزی کوردی جەلالین دژی حکومەت، دەستی پێکردووەو، بەپێی نووسینەکانی ئەمڕۆی (میللیەت)ی نیمچە ڕەسمی، یاخییان گەمارۆدراونو، تەواو دامرکاندنەوەیان تەنها مەسەلەی چەند ڕۆژێکی کەمە.

٤ـ وەك چاوەڕوان دەکرا، چاپەمەنییە هاوکاریکراوەکانی حکومەت هاودەنگی حکومەتن بۆ چارەسەری (مەسەلەی سنووری ڕۆژهەڵات) چونکە ئیتر هێزی گەورەی تورك لە هەرێمی ئارارات بەدی ناکرێ. هێورکردنەوەی بەزەبری هێزی ئەو بەشانە، لەئانو ساتدایەو، گوندەکانیش کە زۆر بەفراوانی بڵاوبوونەتەوە، لەگەڵ زەویدا تەخت دەکرێنو، ئەمجا دوای وێرانکردن، دەسەڵاتە مەدەنییەکان بەرەو رووی بنیاتنان دەبنەوە.

٥ـ دوورنییە حکومەتی ئێران بەرپرسی ئەم ڕووداوانە بێ، چونکە یەکجار لەسنوورییەوە نزیکن، دەڵێن سەرکردەکانی یاخیبوون، ئەگەر بکرێ بەوە ناوببرێن، بەژمارەیەکی کەمەوە لەخاکی ئێرانەوە هاتوونو، لەوێ چەكو تەقەمەنیی بەشی خۆیانیان هێناوە. دەسەڵاتدارانی ئێران هیچ هەوڵێك نادەن بۆ ڕاگرتنی هێرشەکانو، چاپەمەنییەکانیش دەپرسن: ئایا ئەمە هەڵوێستێکی ڕاستە بۆ دەوڵەتێکی دراوسێ کە تورکیا ڕێککەتننامەی دۆستانەی لەگەڵدا هەیە؟ کونسوڵی ئێران وەڵامی ئەم پڕوپاگەندەیەی دایەوە کە گوایە ئێرانیش هاوشێوەی تورکیا بەدەست پەلاماردەرانەوە دەناڵێنێ، بەڵام دەنگ ناکاتو، حکومەتی تورکیایش ناڕازی نییە چاپەمەنییەکان دەوارێك لەئێران هەڵدەن، چونکە ناتوانن هیچ زیانێك بدەن، بێگومان ئومێدیان وایە، ئەمە بەدواداچوونی ئامانجی سەرەکیی کردەوە سەربازەکان کە دوایی هێنانە بە گێچەڵی یاخیبوونی ساڵی ١٩٢٥ی کوردان، نەهێڵێ.

وێنەی ئەم نووسراوەم بۆ نوێنەری خاوەنشکۆ لە تاران ناردووە.

جۆرج. ئار. کلارك

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل٤-٥، ژ:٧

ژ:٦١

لەسێر جی کلارکەوە بۆ مستەر ئێی هندرسن (٧ی تەمووز گەیشتووە)

ژمارە:٤٥

برووسکە،

قوستەنتەنییە، (٧)ی تەمووزی ١٩٣٠

ئاماژە بەنووسراوی ژمارە (٢٥٤)م، هەواڵی ئەوە هەیە کە شاڵاوێکی نوێی هێرشکارانی نزیك چیغلی کەوی (Chiglikeuy)[1] کە ژمارەیان (١٠٠)کەس دەبێ، دەستی پێکراوە. دیسانەوە گازندەو گلەیی لە حکومەتی ئێران دەکرێ، دەڵێن نوێنەر بۆ ئێران نێردراوە.

پاشکۆی سەربازی زانیویەکە دەهەزار سەربازی تورك لەشەڕدان‌و، سەد قوربانییان هەیەو، سێ فرۆکەیشیان لەدەستداوە.ناوبراو زیانەکانی بەکەم دەزانی.

ئەم نووسراوە بۆ تارانیش نێدراوە.

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل:٧، ژ:٩

[1] رەنگە هەر (چیغلی)ی شارۆچکەیەکی باکووری رۆژهەلاتی ویلایەتی وان بێ نزیك بە سنوور. (س)

ژ:٦٢

لەسێرجی کلارکەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن ( ٧ی تەمووز گەیشتووە )

ژمارە:٤٦

قوستەنتەنییە، ٧ی تەمووزی ١٩٣٠

برووسکە

ئاماژە بەبرووسکەی خێرای پێشووم، چاپەمەنییەکانی تورکیا کەوتوونە ئیشارەتدان بەوەی کەرێتێدەچێ بریتانیای مەزنی خوازیاری هەمیشەیی دروستکردنی دەوڵەتێکی کوردیی سەربەخۆ لە باکووری عیراق، پەیوەندیی بەم جووڵانەوەیەی نزیك چیای ئاراراتەوە هەبێ.

هەروەك وەزیری کاروباری دەرەوە، بەم دواییە، هەمان بۆچوونی بۆ وەزیری عیراق دەربڕیوە، من بەڕێزی لەهەڵوێستی راستەقینەی خۆمانو، وەك لەهاوپێچی راپۆرتی ژمارە (٣٦٧)تاندا هاتبوو، ئاگاداردەکەمەوە.

ئەم نووسراوە بۆ بەغدایش نێردراوە.

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل:٧، ژ:١٠

## ژ:٦٢

## لەسێرجی کلارکەوە بۆ مستەر ئیی. هندرسن (١٤ی تەمووز گەیشتووە)

**ژمارە: ٢٦٢**

**قوستەنتەنییە، ١٠ی تەموزی ١٩٣٠ قوستەنتەنییە**

**گەورەم،**

ئاماژە بەنووسراوی ژمارە(٢٥٤)ی سێی ئەم مانگەم، وێنەی راپۆرتێکی پاشکۆی سەربازیی باڵوێزخانەی خاوەنشکۆ هاوپێچ دەکەم کەتایبەتە بەکردەوە سەربازییە تازەکانی تورک دژی یاخییانی کوردی دەوروبەری شاخی ئاراڕات.

٢. هەفتەی رابردوو مۆڵەت درایە چاپەمەنیەکانی ناوخۆ تا بەدرێژی لەسەر رووداوەکانی کوردستانی باکوور کە ئێستا زۆر گرنگترو فراوانتر دەبینرێ، وەك لەوەی سەرەتا بەگشتی دەرکی پێدەکرا، بدوێن. هێزێکی بەرچاوی سەرباز لە شەرگەکاندان و، دەڵێن باندەکانیش کە زووتر بە (١٠٠) کورد دانرابوون، سەدان کەسیان لێکوژراوە. پۆستە سەربازییە تورکەکانی سەر سنووریش، وەك ئەوی بولاقباش(Bulak Bazi)[1]، کەوتوونە بەر هێرشی هێزی پێشکەوتوو و، هەواڵی بۆمبارانی فرۆکەیش رۆژانە لەئارادایە. سەرەڕای ئەمە، ئاشکرایەیاخییان لەسنووری (١٥٠) کیلۆمەترێکدا چالاکن. کەسانێك کە کێشەکەیان جووڵاندووە، لە ئاراڕاتەوە تا خۆشاب (Khoshab)[2] ی رۆژهەڵاتی وان کە ئێستا بەئاشکرا دەنگی یاخیبوون و سەرهەڵدان و بزووتنەوەیەکی بەرفراوانی تێدایە، بەدرێژایی ئەرزرۆم و مووش و ئەلعەزیز دەستگیر کراون و، بڵاوکراوەکانیش کوژرانی ژمارەیەك سەرکردەی کورد لەپێکدادانێکی نزیك ئەرجیشی سەر کەناری سەرووی رۆژئاوای گۆلی وان

---

[1] ناوچەیەکی سەر سنووری تورکیا– ئێرانە نزیکی رۆژهەڵاتی شاری بایەزیدە.(س)

[2] ناحیەیەکی نزیکی باشووری رۆژهەڵاتی شاری وانە.(س)

رادەگەیەنن. ڕۆژانە خەڵك دڵنیا دەکرێنەوە کە حکومەت باش کۆنترۆڵی بارودۆخەکەی کردووەو، یاخییان تەواو گەمارۆ دراون و، تەفروتوونا کردنیان کە تاکە خەیاڵی تورکیایە، تەنها مەسەلەی پێنج و دوو ڕۆژێکە.

٣. بابەتی گرنگی هەفتەی رابردووی بڵاوکراوەکان، جگە لە چەند زانیارییەکی کەم لەسەر کارە سەربازییەکان، پەرەسەندنی بەردەوامی هێرشی دوژمنکارانەو جنێودانیان بە ئێران بوو. چاپەمەنیەکان بەوەندە نەوەستاون کە حکومەتی ئێران بەڕێگەدان بە پەڕینەوەی یاخییان لە سنوور تاوانبار بکەن، بەڵکوو بەئاشکراو بێپەردە ئەڵێن: ئێران چەك و خۆراك بۆ یاخییان دابین دەکات و، بەهێزیان دەکاتەوەو، لەپشت جووڵانەوەکەوەیە. جا هەروەك بەڕێوەبەری

چاپەمەنییەکان دوێنێ پێی ڕاگەیاندم، توندو تیژیی ئەم تاوانبارکردنانە، تەنانەت لەباری ئێستای پەیوەندیی تورکیا– ئێراندا، جێگەی سەرسوڕمانە، چونکە دیارە هەموو هەواڵەکانی لەمەڕ یاخیبوونەکە کۆنترۆڵ دەکرێن. دەڵێن تاران نارەزاییی زۆری لەمە پێشانداوەو، خودی وەزیری دەرەوە بە پەیامنێری چاپەمەنیەکانی ڕاگەیاندووە: هەردوو حکومەت، لە هەڵگیرسانی یاخیبوونەکەوە، لە پەیوەندیی توندو تۆڵدان. بەڵام ئاماژەی بەوەیش کرد کە هیچ گفتوگۆیەکی "گرنگ" ئەنجام نەدراوە. ئێران پاش لێدوانێکی کارمەڵسووڕێنی وڵاتەکەی کەتێیدا وتی: هیچ هەواڵێکی تارانی نییە، تا ئێستا شتێکیتری بڵاونەکردووەتەوە.

٤. گومان نییە حکومەتی تورکیا سوورە لەسەر تێکشکاندنی مەسەلەی کوردو، هاندەرێکی دوورتریش لەپشت شاڵاوی توندی دژی ئێرانەوە هەیە. بەردەوام ئەوە رەت دەکرێتەوە کەحکومەتی تورك نیازی لێدانی یاخییانی لەناو خاکی ئێراندا هەبێ، ئەگەرچی کونسوڵی خاوەنشکۆ لەتەرابزوون دەزانێ هەنگاوێکی لەم جۆرە، بەوپێیەکە سنوور شکاندنێك شتێکی وا لەمەسەلەکە ناگۆڕێ، بیری لێکراوەتەوە. ڕۆژنامەی (وەقت) زیاتر دەچێتە پێش و دەڵێ: ئەگەر ئێران نەتوانێ لەسنووری خۆیەوە چاری یاخییان بکات، ئەوا حکومەتەکەی پێویستە یان ڕێگە بداتە

سەربازانی تورك لەناو ئێراندا شوێن پێیان هەڵگرن، یاخود رازی بێ بە دیاریکردنێکی وەهای سنوور کە دوایی بە پەلامارەکان بێنێ. ئەگەر ئەم دوو چارە یەیش شکستیان هێنا، پێویستە تورکیا بەئازادییەکی تەواوەوە هەر رێو شوێنێك پێڕەو بکات کەئاسایشی خۆی پێویستی بن. ئەمە پێدەچێ ئەوە بگەیەنێ کە تورکیا دەیەوێ هەلومەرجی ئێستا بۆ قازانجی خۆی بقۆزێتەوەو، دیفاکتۆی سنوور بەجۆرێکی سوود بەخشتر لەوەی وا سالانی دوایی هۆکاری زۆر ناکۆکی بوون، بسەپێنێ.

٥. پێویستە پێی لەسەر دابگرمەوە کە پێشڕەوییکردن خەیاڵە، چونکە تورك بەدناوو جێی گومانەو، سەرچاوەی بڕوا پێکردنی نییە. کارەکانی حکومەتی ئەنگۆرە شاراوەنو، دەشێ چەند هەواڵێکی کەم لەئەنگۆرە دەست بکەون. سەرباری ئەمە، کۆتاییی ئەم هەفتەیە دەچمە پایتەختو، پێدەچێ بتوانم وتووێژ لەگەڵ وەزیری دەرەوەدا بکەم.

جۆرج. ئار. کلارك

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ١٠، ژ: ١٣

## هاوپێچی ژ: ٦٣
## لەڕائید ئۆلێرییەوە بۆ سێرجی. کلارك

ژمارە: ٥

قوستەنتەنییە، ٤ی تەمووزی ١٩٣٠

گەورەم،

خۆشحاڵم ئەم روونکردنەوانەی لای خوارەوەتان پێشکەش بکەم کە هاوکارێکم لێیان ئاگادار کردوومەوە. سەرچاوەی ئەم زانیارییانە یۆنانییە.

ا. حکوومەتی تورکیا مانگی نیسانی رابردوو خۆی بۆ هێرشێکی سەر یاخییانی کوردی نزیك بایەزید ئامادەکرد.

ب. دوو فەیلەقی تایبەتی سەربازی، یەکیان لە یەکەکانی فەیلەقی نۆ لە باکوورو، ئەویتر لە یەکەکانی فەیلەقەکانی شەش‌و حەوت، دروست کراون. هەریەك لەم دوو فەیلەقە لە (٤٠٠–٥٠٠) سەرباز پێکهاتووە.

ج. فەیلەقێکی یەدەگ لە ویلایەتەکانی رۆژئاوا پێکهێنراوە[1].

د. فیرقەیەکی سوارەو هەندی تۆپی شاخ‌و چوار پۆل فرۆکە لەگەڵ دوو فەیلەقی ئاماژە پێکراودا، خراونەگەڕ.

ه. ئۆپەراسیۆنەکان مانگی مایس‌و حوزەیران دەست پێکراون‌و، تاڕادەیەك سەرکەوتووبوون.( ١٠٠سەد) قوربانی هەبوون‌و، یاخییان سی فرۆکەیشیان خستە خوارەوە.

و. لەبەر ئەوەی فەیلەقی باکوور، بەر لەئامادەبوونی فەیلەقی باشوور، کەوتە پەلامار، ژمارەیەك لە دوژمنان توانیان بەرەو باشوورو گۆلی وان هەڵبێن‌و، لەوێ چەند گوندێکیان وێرانکرد.

---

[1] ئەم خاڵە لێی پەڕیوە.

ز. گوشاری باشتری سەربازی تورك، ناچاریکردن بە گۆلی سنووردا بەرەو گۆلی ورمێ بپەڕنەوە.

ح. واهەست دەکری جەندرمە بتوانی چاری ئەم پاشماوەیەیش بکات.

٢. دەکری ئەم خالانەی سەرەوە لەگەڵ زانیاریەکانی لەمەڕ ئەم بابەت کە زووتر گەیشتبوون، یەك بگرنەوە. ئەمانە بەشداریی (١٠٠٠٠) دەهەزار سەرباز لە هێزە حکومییەکان و هۆی گواستنەوەی ئاژاوە بۆ باشووری هەرێمی چیای ئاراڕات دەخەنە روو.

٣. ئەرکانی گشتی گەرەکی نییە فەیلەقەکانی هەشت و نۆ، وەك بەشێوەیەکی ئاسایی دامەزراون، بێنێتە گۆڕەپانەکەوە، بەڵکو پێکهاتەی تێکەڵ لە ناوچەیەکی فراواندا دروست دەکات. ئەم راستییە کارێکی گرنگی ئەم کردەوە سەربازییانەیە.

٤. پێم وایە ژمارەی قوربانیان لەوەزیاترە کەپێشاندراوە. کوردەکان کە لە هەرێمێکی باشی شیاو بۆ پارتیزانیدا دەجەنگن، سەختە توانرابێ بە قوربانییەکی هێندە کەم وەدەر نرابن. راپۆرتێکیش بەم دواییە گەیشتووە کە شەمەندەفەرێك (٣٠٠) برینداری هەڵگرتووە، بەناو جەرابلوسدا بەرەو رۆژئاوا رۆیشتووە.

ئۆلێری

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ١١، ژ: ١/١٣

ژ: ٦٤

لەسێرئار. کلایڤەوە بۆ مستەر نێی. هندرسن( ٢٢ی تەمووز گەیشتووە)

ژمارە: ٣٢٨

گوڵحەق، ١٤ی تەمموزی ١٩٣٠

گەورەم،

ئاماژە بەنووسراوی ژمارە(٢٩٨)ی (٣٠) حوزەیرانم، وەرگێڕراوی بابەتێکی(١٠)ی تەمموزی رۆژنامەی "ئێران"تان بۆ دەنێرم کە هەواڵی ئاژانسی دەنگوباسی تورکیا دەسەلمێنی سەبارەت بە هاوکاریو هاندانی کوردانی تورکیا لەلایەن حکومەتی ئێران بۆ تێکۆشان دژی حکومەتی تورك.

٢. کاتێك دەزگاکانی ئێران بیانەوی بۆچوونێك بەجیدی بخەنەڕوو، رۆژنامەی "ئێران" لەهەر رۆژنامەیەکی تری ئەم وڵاتە زیاتر بەکار دێنێ. ئەم رۆژنامەیە دەکرێ وەك نیمچە رەسمی سەیر بکرێو، بابەتەکەیش بە جیدی نووسراوە.

من دڵنیام تێڕوانینی رەسمیی حکومەتی ئێران بۆ کێشەی کوردی تورکیا تەواو بەوجۆرەیە کە "ئێران" باسی دەکات، بەڵام نازانم ئایا کاربەدەستانی سنوور کار بەم تێڕوانینە رەسمییە دەکەن؟ ئێرانو تورکیا هێندە جیاواز مامەڵەی کوردی لای خۆیان دەکەن کەئاسان نییە باوەڕبکرێ رای تایبەتی ئێران تەواو لەگەڵ راگەیاندنە رەسمییەکەدا یەکبگرێتەوە. دەشێ تێبینییەکانی ئەمیر عەللام( کەلەبڕگەی (٣)ی نووسراوی لەسەرەوە ئاماژە پێکراومدا ئیشارەتی پێکراوە) وەك نمونەیەك بۆ بۆچوونی تایبەتی ئێران لەئاستی کێشەی خێڵە کوردەکاندا وەربگیرێ.

٤. سەرنجی دواتری چاپەمەنیی تاران، تاوانبارکردنی سۆڤیەتیەکانە بە بڵاوکردنەوەی هەواڵی ناڕاست لەبارەی ئەم مەسەلەیەوە، پێشاندانی ئێران وەك دراوسێیەکی خراپو، پاساو هێنانەوە بۆ هێرشە سەربازییەکانی ئەم دوایییەیان لەنزیك خوداقەرین_ Khudafarin. ئەم بەیانییە پرسیارم لەسەر ئەم بابەتە

لەوەزیری دەرەوە کـردو، بۆم دەرکـەوت بـەڕێزی پێـی وایـە: حکومـەتی سۆڤیەت، بەتاوانبارکردنی ناڕاستی حکومەتی ئێران بەهاوکاریکردن‌و هاندانی یاخییـانی کـورد، هـەوڵدەدات کێشـەو گرفـت لـەنێوان هـەردوو حکومـەتی ئـێران‌و تورکیـادا بنێتـەوە. بـەڕێزی لەسـەری ڕۆیشـت‌و، بەتووڕەییـەوە لەسـەر نەشیاویی مامەڵەکردن لەگــەڵ حکومـەتی رووسدا، جـا قەیسـەری بـێ یـان کۆمۆنیسـت، دووا. بەقسـەی ئـەو، هەردوکیان شایانی متمانە پێکردن نەبوون.

٥. هاوکـات بـۆ کۆمسـیۆنی سـنووری ئـێران کـە بڕیـاربوو (١٠)ی تـەمموز بـۆ دەستپێکردنەوەی دیاریکردنی سنووری ئێران– تورکیا لەگەڵ تورکـاندا کۆببێتـەوە، هێشـتا هــەر لەتارانــەو، هــۆی دواخستنیشــی شــەڕو شــۆڕی بەردەوامــە لەگــەڵ کوردەکاندا. ئەمە هەرچەندە دەڵێن تورکەکان دەستیان بەکار کردووە.

ئـەندامانی شـاندەکە لەسـەرگرتنی کارەکـەیان بـێ‌ئومێدن، چونکـە راوبۆچوونـی هەردوو لیژنەکە لەسەر دیاریکردنی سـنوور، بـەپێی ئـەنجامی بەدەستهێنراو، سـاڵی رابـردوو هێنــدە لەیــەك دووربــوون کــەدەبوو ســەرەتا مەســەلەکە بەشــێوەیەکی دیپلۆماسییانە لەتاران یـان ئـەنگورە گفتوگۆی لەسـەر بکرایـە. دەسـەڵاتە باڵاکـانی ئێران‌و تورکیا ئەم هەستەیان نەبوو، بەڵکو لـەڕێی ئـەندامێکی لیژنەکـەوە زانیـم کـە ڕاسـتە. وادەردەکـەوێ( فـەرووغی_ Feroughi)ی بـاڵوێز لـە ئـەنگورە، تـەرکیزی کردبێتە سەر گوندەکانی ناوچەی ناکۆکی لەسـەرو، مەسـەلەی بڕیـاردان لـەڕێگاکانی پەیوەندیکردن‌و رووبارەکانی بۆ کاتێکی‌تر هێشـتبێتەوە. یەکلاییکردنـەوەی رووبـارو ڕێگەوبانەکان، گەورەترین کێشەی ئەندامانی کۆمسیۆنەکەیە.

٦. وێنەی ئەم نووسراوەو هاوپێچەکەی بۆ باڵوێزی خاوەنشکۆ لە قوستەنتەنییەو جێگری کۆمیساری باڵای خاوەنشکۆ لەعێراق دەنێرم.

ئار. ئێچ. کلایف

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٢/٤٢٤، ل: ١٨، ژ: ٢١

***   ******

## هاوپێچی ژمارە:٦٤

## هەڵبژاردەیەك لە ژمارەی رۆژی"١٦"ی تەمووزی (١٩٣٠)ی رۆژنامەی "ئێران"
## "کێشەی کوردو سیاسەتی حکوومەتمان"

رۆژنامەکە لەسەر گوتارداو بەم ناونیشانە دەڵێ:

تورکیای دراوسێمان، دەمێکە تووشی کێشەی کورد بووە. ئێمە پێشترو ئێستایش لەبەر پەیوەندیی دۆستانەی ئێران– تورکیا بەمە دڵگرانینو، بەجیددی هیوادارین ئەم گرفتەیش، وەك هەموو ئەو تەنگوچەڵەمانەی تر کەحکومەتی تورکیا بەسەرکەوتوویی بەسەریاندا زاڵ بووە، تەواو چارەسەر بکرێ.

وابۆ هەفتەیەك دەچێ هەواڵێکی کورتی وەرگێڕدراوی رۆژنامەیەکی بیانیمان لەسەر ئاژاوەکانی کوردانی تورکیا بۆ زانیاریی خوێنەرانی بەڕێزمان بڵاوکردەوەو، ئیتر پێویست ناکات جارێکیتر لێرەدا دووبارە بکەینەوە. بەڵام ئاژانسی ئەنادۆڵ بەم دواییە راپۆرتێکی لەم بارەیەوە بڵاوکردووەتەوە کە لە رۆژنامە ناوخۆییەکانی تارانەوە وەریگرتبوو. ئەمەیش ناچاری کردین ئەم گوتارەی لەسەر بنووسین.

راپۆرتەکە دەڵێ:

(( خالید ئاغاو (١٠٠) کەس چوونە ئێرانو، چەکیان وەرگرتو، ئەمجا پەلاماری خاکی تورکیایان دا. یاخییان، بەپێی چەند هەواڵێکی بڕواپێکراوی گەیشتوو، لە ئێران بەئاشکرا کاریان بۆ ئاسان کراوەو، لە (ماکۆ)یشەوە خواردنیان بۆ دابین دەکرێ)).

بڵاوکردنەوەی ئەم راپۆرتەی ئاژانسی ئەنادۆڵ، زۆر جێی نیگەرانییە، چونکە رای گشتیی تورکی دەشێوێنێو، تورکانی پشتیوانی بەهێزکردنی پەیوەندیی سیاسیی تورکیا– ئێران پاشگەز دەکاتەوە. لەبەر ئەوەی ئێمە حەز ناکەین کەمترین بەهەڵە لێکگەیشتن لەنێوان حکومەتی ئێرانو تورکیادا هەبێ، بەپێویستی دەزانین ئەم هەواڵەی سەرەوە رەتبکەینەوەو، گلەیی لە ئاژانسەکە بکەین کە ئەم راپۆرتەی بێ

لێکۆڵینەوەی شیاو، چ بۆ متمانەی خۆی یان هەرشتێکیتر، بڵاو کردووەتەوە، چونکە لەکاتێکدا هەردوولا پەرۆشی پەیوەندیی دۆستانەی هاوبەشین، بەهەڵە لێکحاڵیبوونمان لەنێواندا پەیدا دەبێ.

ئێمە لە زۆر سەرچاوەی بڕواپێکراوی ناوخۆوە، کەهەواڵەکانیان جێگەی سەرسوڕمان و نیگەرانی بوون، لێکۆڵینەوەی تایبەتمان لەسەر ئەم مەسەلەیە کردووە چونکە حکومەتی ئێران نەك هەر پشتیوانیی یاخییانی کوردی نەکردووە، بەڵکو چەندین ڕێوشوێنی بەقازانجی حکومەتی تورکیا گرتووەتەبەر. ئەو ڕێوشوێنانەیش بەم جۆرە بوون:—

١. حکوومەتی ئێران بۆ هاوکاریی حکومەتی تورکیا، ئەوکاتەی کێشەی یاخییانی کورد لەتورکیا کۆتایی‌ی دێ، پێشنیاری پێڕەو جێبەجێکردنی سیاسەتێکی کردووە.

٢. حکوومەتی ئێران پەیوەندیدارانی ئاگادار کردووەتەوە کەسنووری کوردستانی ئێران دابخەن، بۆ ئەوەی نەکوردانی ئێران بتوانن یارمەتیی کوردانی تورکیا بدەن و، نەکوردانی تورکیایش کراوەیی سنوور بەهەل بزانن و، پێیدا لەدەست هێزە تورکەکان هەڵبێن.

٣. حکوومەتی ئێران بۆ جێبەجێکردنی ئەم ڕێوشوینانە، ، فەرمانی بەخێڵە کوردە ئێرانیەکان داوە لەسنوور دووربکەونەوە بەرەو ناوەوە، ئەمەیش بۆ ئەوەی نەتوانن پەیوەندی بەکوردانی تورکیاوە بکەن.

٤.کاتێك چەند کوردێك کەپێشتر لەخاکی تورکیاوە هاتبوونە ناوخاکی ئێران و سەرپێچیی ئەم فەرمانەیان کردبوو، حکومەتی ئێران...... وپاشان ڕایگواستن.[1]

٥.سەبارەت بەو بایەخەیش کەحکومەتی ئێران بە کوردان وڵاتەکەیی دەدات و، بەڕەعیەتی ئاسایی‌ی خۆییان دەزانێ، کوردانی ئێران ڕێیان پێ نادرێ هاوکاریی کوردانی تورکیا بکەن و، هان یاخود پەنایان بدەن.

[1] ئەم ڕستەیە ناتەواوە.

٦. حكوومـەتمان ڕێنوێنیـی (توجیـە) ی بـۆ بەرپرسـانی سـنوور نـاردووە، تـا هاریكاریی دامو دەزگای سنووریی توركیا بكەنو، متمانەی تەواو لەنێوان هەردوولادا بێننـە ئـاراوەو، دەزگاكـانی هـەردوو حكومـەت بـەگوڕ بكـەن، تابـەوریایی و زانیـاری تەواوەوە لەسەر هەلومەرجەكە بكەونەگەڕ.

بەكورتی، حكوومەتی ئێران دڵسۆزانەو، وەك برایـەك لـەم مەسـەلەیەدا مامەڵـەی لەتەك توركیادا كردووە. جا بۆیە پێمان وایە ئاژانسی ئەنادۆڵ، بێ چوونەوەی پێـش وەختی بۆ سەرچاوە بڕوا پێكراوەكانی ناوخۆ، ڕاپۆرتەكەی بڵاوكردووەتەوە.

ئێمـە كەپشـتیوانی نـاوەندخوازیینو، چـەند سـاڵێكە لـەوڵاتماندا پـێڕەوی ئـەم سیاسەتە دەكەین، ئێمە كەهەمیشە دژی هەرجۆرە هاندانو ووروژاندنێكی ناوخۆیینو، بوار نادەین كەس ئەم كارانە دژی بـەرژەوەندی دەوڵـەت بكـات، ئێمـە كـەدەزانیـن باوەڕمان بەو ڕاستییە هەیە، كەوا هەر وڵاتێك دەبێ یەكەم هەنگاو ئاسایشی نـاوخۆ سەقامگیربكات تابتوانێت چاكسـازییتر بـەجێ بهێنێو، چـەند سـاڵی دوایـی هـەموو كۆششێكمان كردووەو تا بەهـەوڵی مـاندوویی نەناسـانەی خاوەنشـكۆ، بـەئامانجمان گەیشتووینو، ئێران بووەتە وڵاتی ئاسایشو ئـارامی. ئێمـە كـەباوەڕمان بەپرنسـیپی پاراستنی دۆستانە هەیە لەگەڵ برا توركمانەكانمانداو بۆ ئەمەیش چەندین بەڵگەمان هەیە، ئێستا چۆن دەبـێ خـەڵك باوەڕبكـات كەئێمـە پـەنا یـان یارمـەتیی ژمارەیـەك كوردی یاخیمان دابێ؟!!

ئەم كارانە لەبناغەدا، جگە لەمەسەلەی پەیوەندیی دۆستانە، دژی ئەو سیاسەتو بۆچوونانەیشن كەحكوومەتمان هەیبوون. سیاسـەتی حكومـەتی ئـێران سیاسـەتێكی ڕوونی شەرەفمەندانە بووەو، هەرگیز بـەم جـۆرە كردەوانـە بەدناو نابێ. بۆیـە ئـەو بابەتەی كە ئاژانسی ئەنادۆڵ بڵاوی كردووەتەوە، بـێ بناغەیـەو، هیوامانـە ئاژانسـی نـاوبراو هەواڵەكـەی لـە چاپەمەنییـە توركیـەكاندا ڕاسـت بكاتـەوەو، دەسـت لـە دروستكردنی ناحاڵیبوونی بێ هۆ هەڵبگرێ.

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٢/٤٢٤، ل: ١٩—٢٠، ژ: ١/٢١

## ژ: ٦٥

### لە سێرجی. کلارکەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن(٢١ی تەمووز گەیشتووە)
### ژمارە: ٢٧٣ "نهێنی"

قوستەنتەنییە، ١٥ی تەممووزی ١٩٣٠

گەورەم،

ئامـاژە بەنووسـراوی ژمــارە (٢٦٢)ی (١٠) تــەممووزم، ئاگادارتــان دەکــەم کــە ڕۆژنامەکانی تورکیا (١٣)ی ئەم مانگە بـەڕەسمیی دامرکانـەوەی ڕاپـەڕینی کوردیـان ڕاگەیاند.

٢. شەوی (١٢)ی مانگ کە وەزیری دەرەوەم لەئەنگۆرە بینی، بەڕێزی پێـی وتم: هـەواڵ لەساڵح پاشـای فـەماندەی گشـتیی کـردەوە سـەربازیەکەوە گەیشـتووەو، بڵاوکراوەتـەوە. ئـەو نـەك هـەر بەسـەرکوتکردنی سـەرکەوتووانەی ئـەو تێکدەرانـەی ئارامیی تورکیـا، بـەڵکوو بەپاککردنـەوەی (٢٥) میلـی سنووری تورکیـایش دڵخۆش بوو. بەقسـەی ئـەو، باندەکـان بـێ هـیچ هـەوڵێکی ڕێکخستنیان لەلایـەن حکومـەتی ئێرانەوە، یان ئاگاداریی دەزگاکانی ئێران و حکومەت خۆیشی، لەو ناوچانەدا دزەیان کردبووە نـاوەوە. گلەییـەکان لـەئێران بێسـوود بـوون و، بـێ وەڵام مانــەوە، بۆیـە جەنـەڕاڵی تـورك فـەرمانی پێدرا، بەهـەر نرخێــك بـێ، تەنانــەت ئەگــەر پێویسـت بەتێکشـکاندنی خێڵـەکانی سـەر سنووریش بکـات، سـەرهەڵدانەکە دابمرکێنێتــەوە. هـەروەها تۆفیـق ڕۆسـتوو، بـەر لـە دوا نـاڕەزاییی ئـێران دژی داگـیرکردنی سـنوور، نامەیەکی بۆ مۆسکۆو واشنتۆن ئامادە کردبوو و، داوای پەیماننامەکانی (لیتڤینۆڤ و کێلۆگ)[1] ی تێدا کردبـوون، لەبـەر ئـەوەی بـەڕای ئــەو، لـێرە حاڵـەتێکی دەسـت

[1] ڕێکەوتننامەی ئاشتی (Kellogg-Briand) ١٩٢٨/٨/٢٧ لە پاریس لەنێوان ئەڵمانیاو ئەمریکاو بەلجیکاو فەرەنسەو بریتانیاو هندستان و ئیتاڵیاو یابان و پۆڵـەندەو چیکۆسلۆڤاکیادا ئیمزا کراو، ٢٤ی تـەممووزی-

درێژکردن روویدابوو، ئەویش چونکە پێی وابوو ئەو کوردانەی کە تورکیایان داگیرکردبوو، بەشێك بوون لەسوپای ئێران. هەربۆیە بەڕێزی سوپاسی خودای کرد کە ئێستا پێویست ناکات تێبینییەکانی بنێرێ، لەبەر ئەوەی بەقسەی ئەو، چەتەکان گەمارۆ دراون‌و (٢٥) میلی ناو خاکی تورکیایشیان لێ پاك کردوونەوە. بەڵام بەڕێزی هێشتا کێشەی ئارامبوونەوەی بارودۆخەکەی لەگەڵ حکومەتی ئێراندا هەبوو. هەرکە دیدارەکەمان کۆتایی هات، بەڕێزی چووە ئەنجومەنی وەزیران، هاوڕێکانی لەوێ داوایان دەکرد بۆ ئەوەی پرسیاری لەمەڕ بەرنامەی ئایندەیەوە لێ بکەن. ئەویش دانی پێدانا کەهیچ بیرۆکەیەکی لەسەر چۆنییەتی وەڵامدانەوەیان نییە.

رای وابوو کە لە پرۆتستۆ رەسمی‌و بێ سوودەکان بێزار نەبن‌و، بەئێران بڵێن یا بەجیددی پاسی سنووری خۆی بکات، کە مەبەست لە جێگیرکردنی سەربازە بەدرێژایی سنوورەکەو، ئەمەیش لەگەڵ باری دارایی ئەو وڵاتەدا ناگونجێ، یا ئەوەتا رازی بێ سنووری هەرێمی ئاراڕات بەقازانجی تورکیا دیاری بکرێ‌و، لەبەرامبەردا قەرەبوویەك لە تورکیا وەرگرێ. بەڕێزی بەهەڵی زانی‌و دووپاتی کردەوە کە حکومەتی کۆمار هەرگیزو ئێستاش رێککەوتننامەی ساڵی ١٩١٣ی سنوور کە پەرلەمانی تورکی بڕیاری لێ نەداوە، پەسەند ناکات‌و، دان بەرەواییدا نانێ.

بەڕای ئەو، ئەگەر چی مەسەلەی سەرهەڵدانەکە لەپێناوی دەرفەتی دیاریکردنی سنووردا نەورووژێنراوە، بەڵام هەلێکی باشی بۆ جەختکردن لەو دیاریکردنە هێناوەتە گۆڕێ.

٣ـ کاتێك وەزیری دەرەوە بەتوندی پێی لەسەر پشتیوانیی حکومەتی ئێران بۆ کورد داگرت، لە بەڕێزیم پرسی: ئەگەر بتوانێ ئەو سیاسەتەم بۆ روون بکاتەوە کەمن بەبێ سوودم دەزانی‌و، نەك هەر پێم وانەبوو ئێران قازانجێك لە تووڕەکردنی تورکیادا بکات، بەڵکو ئەو وڵاتە خۆیشی گرفتی بەرچاوی لەگەڵ حکومەتی سۆڤیێتدا

---

-١٩٢٩ جێبەجێکرا. پەیمانی (Litvinov)یش ١٩٢٩/٢/٩ لەنێوان رووسیاو پۆڵەندەو رۆمانیاو لاتڤیاو ئیستۆنیادا لە مۆسکۆ ئیمزا کراو، شەرعیەتی رێککەوتنی کێلۆگی لەو پێنج دەوڵەتەدا سەلماند.

هەیەو، هیچ دەستکەوتێکی لەزیادکردنی تەنگوچەڵەمەکانی خۆیدا نابێ. تۆفیق ڕۆستوو ئەو هەواڵەی بەتوندی ڕەتکردەوە کە کێشە لە سنووری ڕووسیادا هەبێ. ئەو لەمۆسکۆی بیستبوو کەجگە لەهەندێ ڕووداوی تەواو بێ بەهای سەر سنوور، شتێکی ئەوتۆ لەئارادانییە. بەڵام بەڕای ئەو، ئێران ویستوویەتی بێ هێزیی خۆی بەرانبەر بەهەرسێ دراوسێکەی (عیراق و ڕووسیاو تورکیا) بەهەل بزانێو، ئەوان بەگژیەکدا بکات. ئەم شیکردنەوەیە هەندێ زانیاریی پێ بەخشیم، بەتایبەتی دوای ئەوەی دوو ڕاپۆرتی کونسوڵی تەوریزی خاوەنشکۆم خوێندەوە کەبە ڕوونی دەریان دەخست: أ- ئێرانییەکان بەهانەی خۆیان هەیە کەبەرامبەر بە دوژمنکاریی ڕووسەکان لەباشووری ڕۆژئاوادا هەستیار بن (ئەمەیش قەسەکانی تۆفیق ڕۆستوو دەسەلمێنێ). ب- ئێرانییەکان تارادەیەك پشتگیریی کوردیان کردووە (ئەمەیش پاساوی تاوانبار کردنەکانی تۆفیق ڕۆستوو بەدەستەوە دەدات). ڕەنگە ڕاستی ئەوە بێ کە ئێرانییەکان بەهیوابن سەرهەڵدانێکی کورد وا لە تورك بکات نەتوانێ بەئاسانی پێ لەسەر داواکانی بۆ دیاریکردنەوەی سنووری هەرێمی ئاراڕات دابگرێ.

٤- هەر کە بەڕێزی باسی عێراقیشی کرد، بە دەرفەتم زانیو، لەسەر مەسەلەی زمانی کوردی لە عیراق، وەك لە برووسکەی ژمارە (٤٦)ی (٧)ی ئەم مانگەمدا ئاماژەم بۆ کردووە، گفتوگۆم لەگەڵدا کرد. بەڕێزی خێراو لەوەڵامدا دانی پێدانا کەئێمە لەو مەسەلەیەدا دڵسۆزین، ئەمە هەر چەندە تورکیا بەشێوەیەکی ڕەسمی دان بەدەسەڵاتی عیراق، نەك بریتانیادا، دەنێ لەو وڵاتەدا.

٥- کۆپیی ئەم ڕاپۆرتە بۆ نوێنەری خاوەنشکۆ لەتاران و بریکاری کۆمیساری باڵا لەبەغدا دەنێرم.

جۆرج ئاڕ. کلارك

وەزارەتی دەرەوە،٢٧٣/٤٢٤، ل:١٣-١٤،ژ:١٧

ژ: ٦٦

لە سێرجی کلارکەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن (٢١ی تەمووز گەیشتووە)

ژمارە:٢٧٤

قوستەنتەنییە، ١٦ی تەمموزی ١٩٣٠

گەورەم.

ئاماژە بەنووسراوی ژمارە (٢٧٣)ی دوێنێم، وێنەی راپۆرتێکی رائید بی. جی. ئۆلێریی پاشکۆی سەربازییتان بۆ دەنێرم کەبۆ باڵوێزەکەیی ناردووەو، هەواڵی دوا ئۆپەراسیۆنی سەربازیی دژی کوردی تێدایە.

٢ـ چاپەمەنییە تورکیەکان بەردەوام سەرکەوتنی یەکجاریی لەشکری تورک دەڵێنەوە، بەڵام ئاشکرایە شەڕوشۆڕ، بەتایبەتی لە هەرێمی کێوی ئاراپات، درێژەیان هەیە، هەرچەندە گومانی تێدا نییە کە تورک بارودۆخی کوردستان هێوردەکاتەوە، بەڵام هێشتا زۆرکاری تریش ماون، جێبەجێییان بکات.

٣ـ وێنەی ئەم نووسراوەم بۆ نوێنەری خاوەنشکۆ لەتاران و بریکاری کۆمیساری باڵا لە بەغدا ناردووە.

جۆرج ئار. کلارک

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل:١٤–١٥، ژ: ١٨

*** *** ***

## هاوپێچی ژمارە (٦٦)

## لەرائید ئۆلێرییەوە بۆ سێرجی. کلارك

ژمارە:٦

## قوستەنتەنییە، ١٦ی تەمموزی ١٩٣٠

گەورەم،

لە درێژەی راپۆرتی ژمارە (٥)ی (٤)ی تەممووزی (١٩٣٠)مدا، خۆشحاڵم ئەم هەواڵەی ئۆپەراسیۆنەکانی دووهەفتەی رابردووی گۆل(وان)تان بۆ بەرزبکەمەوە.

٢ـ ئەم هەواڵانە بەشێوەیەکی سەرەکی، لە راپۆرتی چاپەمەنییەکانەوە وەرگیراون کە ڕاستن‌و لەقازنجی هێزی تورکییەکاندان، بەلاّم زانیارییە وەرگیراوەکانی سەرچاوەکانی‌تر، نیشانیدەدەن کە لە خاڵە سەرەکییەکاندا لەگەڵ راستییەکاندا یەکدەگرنەوە.

٣ـ وا دەردەکەوێ کۆشش‌و ئامانجەکانی ئەم دواییەی یاخییان، لەچاو ئەوانەی شەڕەکانی پێشووتری ئاگری داغ دا، زیاتر بووبن. بەکورتی ئەمە زەوتکارییەکی خێڵەکی بوو لەسەر سنووری ئێران‌و، تاقمە رق ئەستوورەکانی خەڵکیش بە مەبەستی راماڵینی ئەو سەربازانەی وا لە هەرێمی ئاگری داغ جەنگابوون، بەرەو دیاربەکر بزوابوون‌و، یارمەتیی یاخییانیان دابوو.

٤ـ ئاشکرایە، وا پێشبینی دەکرێ یاخییان هاوکاریی دانیشتوانی ناوخۆ، بەتایبەتی بەرەچەڵەك کوردەکان‌و، کۆنەپەرستانی نارازی لە رژێمی ئێستایان وەرگرتبێ. بەڵگەی پرۆپاگەندەی دینی بە راگەیەندراوی (بەلاغ)و قسە هەیەو، دەڵێن ژمارەیەکی زۆر گوند یارمەتیی کوردیان داوە. راگەیاندنیی ئیبراهیم تاڵع بەگ ئەمەکداریی زۆربەی خەڵك بۆ حکومەت بەرز دەنرخێنێ‌و، ئاماژەیش بەوە دەکات کە خەڵکێکی زۆر بە ئارەزووی خۆیان لە هێزەکانی حکومەتدا ناونووس کراون.

٥- هێزەکانی ئەم داگیرکارییە لەسەر سنووری ئێران کۆکراونەوەو، جەخت لەسەر ئەوەیش دەکرێ کەدەزگاکانی ئێران هاوکارییان کردوونو، پێداویستییان دابینکردوون. ئەم هێزانە دووتەشکیلەبوون. یەکەمیان لەلایەن رەسووڵ[1] بەڕیوەبراوەو، کوڕانی کۆر حوسەین[2]و ئەمین پاشا فەرماندەی تەشکیلەی دووەم بوون.

ناوی رائید محەمەدی ئەفسەری هەڵگەڕاوەی تورك، وەك سەرکردەیەکی چەتەو ڕێگرەکان هاتووە.

٦- ئەو باندانە، ناوەڕاستی مانگی حوزەیران، لە گەوەری سامیان (Achigiran)ەوە لە سنوور پەڕینەوەو، بەرەو ئەرجیش پێشڕەوییان کردو، هەندێ کوردی ئەو دەڤەرەیان لە هێزەکانیاندا ناونووس کرد؛ ئەو گوندانەشیان ویرانکرد ، کە بەرهەڵستییان کردن، ئەمانە هێرشییان کردە سەر ئەرجیش[3]و موردایە[4]و پاتنۆس (Patnos)[5]و، سەرکەوتوو نەبوونو، لەباکووری ئەرجیش لەگەڵ هێزی سوارەی بەرفەمانی یەشار بەگ کەوتنەشەڕو، لێرەش شکستیان خوارد.

---

[1] سەید رەسووڵ بەرزنجی کوڕی حاجی برۆیە. دوای شۆڕشی شێخ سەعید دوورخرایەوە بۆ ئیزمیرو، لێی هەڵات. سەردەستەیەکی گەورەی فیداییەکانی شۆڕشی ئاگریش بوو (شۆڕشی نەتەوەیی کورد لە تورکیا، ل١٩، ٢٠؛ خۆیبوونو شۆڕشی ئاگری، ل٧٧، ٧٨، ٧٩). (س)

[2] حسێن پاشای کۆرە سەرۆکی هۆزی حەیدەرانی بەدەسەڵاتترینی ناوچەکانی دەوری وانو بایەزید بووە. مەمۆ و نادری کوڕانی لە سەردەستە فیداییەکانی شۆڕشی ئاگری بوون. بەماڵو منداڵەوە دوورخرایەوە بۆ رۆژاوای ئەنادۆڵ. لەگەڵ حاجی مووسا بەگدا هەڵاتە سووریا لای حاجۆ ئاغای هەڤێرکی. ١٩٢٨ کاتێ بەرێوەبوو بۆ چوونە پاڵ ئاگری، بەدەستی مەدەنی حاجی مووسا بەگو بەفیتی کاربەدەستانی تورك خافلکوژکرا (شۆڕشی نەتەوەیی کورد لە تورکیا، ل٣٨، ٣٩؛ خۆیبوونو شۆڕشی ئاگری، ل٤٧، ٤٩، ٥٠، ٦٤، ٧٧، ٧٨، ٧٩). (س)

[3] قەزایەکی باکووری ویلایەتی وانە لەسەر گۆلی وان (س)

[4] ناحیەیەکی نزیکی رۆژهەڵاتی قەزای ئەرجیشە. (س)

[5] ناحیەیەکی بەشی باکووری رۆژهەڵاتی ویلایەتی بدلیسە. (س)

٧ـ پیادەی فەیلەقی باشوور، وەك لە نووسراوی ژمارە (٥)مدا ئاماژەم پێکردووە،، (٥)ی مانگی تەمووز لەدۆڵی زیلانی سەرووی ئەرجیش لەگەڵ یاخییاندا بەیەك گەیشتن‌و بەپشتیوانی چەند فرۆکەیەك پەلاماریان دان. شەڕەکە بۆ (٩)ی مانگ‌و تا لەناوبردنی کوردە رزگاربووەکانی ئەو ناوچانە درێژەی کێشا. زۆر لەیاخییان کەکوڕی کوڕ حوسەینیشیان تێدایە، خۆیان بەدەستەوە داوە، کوژراوانیش بە (١٥٠٠) کەس مەزەندە دەکرێن. فەسیلێکی تریش لەبەرزاییەکانی سوپحان داغ[١] خۆی بەدەستەوەداوە، ئێستا بێ سەرو شوێنە.

٨ـ فرۆکەوانەکان دەڵێن لەم شەڕەدا، لەبۆمببارانکردن‌و تەقاندنی شەستیرەکانیاندا لەبەرزاییەکی کەمەوە، بەجەرگییەکی زۆریان نیشانداوە. دەڵێن ئەمە کاری زۆری لەخێڵەکیەکان کردووە. لەلایەکی تریشەوە، لانی کەم، سێ فرۆکە بەئاگری تفەنگ‌و چەکەکان خراونە خوارەوە، کوردەکان فرۆکەوانەکانیان کوشتووەو شێواندویانن.

٩ـ زوو خۆ بەدەستەوەدانی هەلاتوانی ئەم هۆزانە پێشبینی دەکرێ، بەلام دانی پێدادەنرێ کەزیاتر لە(١٥٠٠)کەس لەئاگری داغ ماون‌و، ساڵەح پاشا فەرماندەیی کاری تەفرو توناکردنیان دەکات.

١٠ـ دیارە ئەم راپەڕینە پەلی هاویشتووەو، مەبەستیان لێی ئەوە بووە کەببنە خاڵی ئاژاوەو نائارامی لەسەرتاسەری هەرێمەکانی رۆژهەلاتدا. پێم وایە رێی تێدەچوو سەرکەوتنی زیاتر بەدەست بهێنرایە، ئەگەر لەگەڵ یاخیبوونی زووتری ئاگری داغدا کەپێش وەخت بەرپابوو، هاوکات بوایە.

١١ـ لەلایەکی ترەوە، ئاشکرایە حکومەتی تورك گەرەکیەتی مەترسیی کوردی دابمرکێنێتەوە. هێزەکانیان چەند مانگێکە رێکخراون‌و، دەبوو جموجۆڵی هەردوو فەیلەقەکە، لەگەڵ هی سوارە، هاوکات بوایە. دەستبەکاربوونی فەیلەقی باکوور بەر لە گەیشتنی ئەوی باشوور بۆ ناوچەی ئۆپەراسیۆنەکە، بەقازانجی حکومەت

---

[١] ناحیەیەکی باکووری رۆژهەلاتی ویلایەتی بدلیسە. (س)

کەوتەوە، چونکە بواری دایە ژمارەیەکی زۆری هێزی کورد کە نزیك بە گۆلی وان کۆببنەوەو، ئەمەیش شکستی تەواویانی بەدوای خۆیدا هێنا. گرفتی شەڕکردن دژی پارتیزان، لەوەدایە کە ناتوانرێ دوژمن راپێچی دوا قۆناغەکانی شەڕبکرێ.

١٢ـ زانیاری دروست، لەبارەی قوربانیانی تورکەوە، لەبەردەستدا نییە.

١٣ـ ئاگادارکرامەوە کە فەوجی (٢٨)ی ئەرزرۆم رازی نەبووە شەڕ دژی کورد بکاتو، یاخی بووە، بەڵام ئەم قسەیە پێویستی بەپشت راستکردنەوە هەیە.

١٤ـ قوماندانە تورکەکانی ئەم کردەوە سەربازییە، ساڵح پاشاو زەکی پاشا بوون. بەڵام نەمتوانی ئەرکی هەریەکەیان بەتەواوی بزانم. ئەکرەم بەگی بەرپرسی ئەم دواییەی پۆلیسی قوستەنتەنییەیش سەرۆکی ئەرکانە.

بی.جەی. ئۆلێری

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٢/٤٢٤، ل:١٥-١٦، ژ:١/١٨

*** *** ***

## ژ: ٦٧

## لە سێرجی کلارکەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن (٢١ی تەمووز گەیشتووە)

**ژمارە: ٢٧٥**

**قوستەنتەنیبیە، ١٦ی تەمووزی ١٩٣٠**

**گەورەم،**

ئاماژە بەنووسراوەکانی ژمارە (٢٧٣ی دوێنێ‌و ٢٧٤ی ئەمڕۆم، خاتوو (ماك گرات) کە زیاتر بە(ڕۆزیتا فۆربێس) ناسراوە، هەینیی رابردوو لەڕێگەدا بۆ حەڵەب و لەندەن بەئێرەدا تێپەڕی، ئەم زانیارییانەی خوارەوەی دامێ‌و، بەبەراوردکردنیان لەگەڵ قسەکانی دوازدەی ئەم مانگەی تۆفیق رۆستوودا، تاڕادەیەك گرنگن.

٢ـ خاتوو ماك گرات راستەوخۆ لە سنووری تورکیا– ئێرانەوە کە(١١) رۆژی پێش (٢٣)ی حوزەیرانی تێدا بەسەربردبوو، هاتبوو، ئەو بەگەشتێك لەئێران بووبوو و، ویستبووی بچێتە رووسیا، بۆیە نامەیەکی وەزیری دادی بۆ زەفەرودەولەی جەنەڕاڵی ئێرانی فەرماندەی هێزەکان لەئازر بایجان، پێگەیشتبوو. خاتوو ماك گرات کە گەیشتبووە تەورێز بۆی دەرکەوتبوو کە، بەپێچەوانەی ئەو قسانەی وا تۆفیق رۆستوو بە منی وتبوون، ئێران لە سنووری قۆقازدا گرفتی گەورەی لەگەڵ کاربەدەستانی سۆڤیەتدا هەیە. ئەوخۆی ژمارەیەك پەنابەر کە رۆژانە هاتبوونە ناوەوەو، یازدە برینداریکی رزگاربوویشی لەو (١٠٠–٢٠٠)کەسەی کە وەك بڵاوکراوەکان رایانگەیاند؛ ویستبوویان رووبارەکە بەمەلە ببڕن‌و، سەربازانی سۆڤیەت لەناو ئاوەکەدا تەقەیان لێکردبوون، بینیبوو. ئیتر بەم جۆرە وازی لە چوونە ناو رووسیا هێنابوو. بەڵام کە بیستبووی کێشە لە سنووری تورکیادا هەیەو، دەرفەتی چوونیشی بۆ رەخساوە، ئارەزووی رۆژنامەوانی پاڵی پێوەنابوو هەوڵێك بۆ ئەم ویستەی بدات.

٣ـ بەهۆی چاوساغێکی تـرەوە، پـەیوەندیی بەکوردێکـەوە کردبـوو. خـاتوو مـاك گرات لەگەڵ کوردەکەدا تەورێزی بەجێ هێشتبوو و، لەرێگەی (خۆی)یەوە چووبوونە باشووری ماکۆو، ئیتر لەوێ ئوتۆمبێلەکەیان بەجێ هێشتبوو و، خۆیان رۆیشـتبوون. ئەمجا بەسـواری ئەسـپ کەوتبوونـە رێو، یـازدە رۆژ لـەناو کوردەکـاندا مابوونـەوە. خاتوو ماك گراتو کوردەکە، بەپێی نەخشەیەکی زۆر ناتەواو و، ناوی ئەو شـوێنانەی بیسـتبوونی، کـەمێك لـە سـنووری تورکیـا پەڕیبوونــەوەو، لەشــەڕەکان نزیــك نەبووبوونەوە. ئەو خاتوونە سێ رۆژی لـەگوندەکانی سـەر ئـاراڕات بەسـەریردبوو و، لەوێ وێنەی فڕۆکە تێکشاوەکانی گرتبوو، بەڵام داگیرکەرە بەدبەختەکانی نەبینیبوو کە کوردەکان کوشتبوویانو، بە داریانەوە بەستبوونەوەو، لەسـەریان نووسـیبوون: (( ئەمە ئەو چارەنووسەیە کـە چاوەڕێی فڕۆکـەوانانی تـورك دەکـات)). هـەر لـەوێ تۆپێکی دەست بەسەرداگیراوی تورکەکانیشـی بینیبـوو کـە کوردەکـان نـەیانزانیبوو بـەکاری بـهێننو، داوای تۆپچییـان لــە زەفەرووددەولــە کردبـوو، جەنــەڕاڵ، جــا لەبەرئەوەی بووبێ کەئێرانییەکانیان بۆ رازی نـەکراوە، یـاخود کـەمێك دوو دڵ بـووە لایـەنگرییان بکـات، هیـچ کــام لــە تۆپچییــەکانی خــۆی نــەناردبوو، بــەڵام چــەند ئەرمەنییەکی چارە رەش کە دەترسان ئەگەر تۆپـەکان بتـەقێنن، ئـەوا تورکـەکانو، لەکاتی نەکردنیشیدا، کوردەکان بیانکوژن، داوایان لەخاتوو ماك گرات کردبوو لەتەك خۆیدا بیانباتەوە تەورێز. ناوبراو ناوبەناو گوێـی لەتەقـەی تفـەنگ بـوو بـووو، چـەند بریندارێکشی دیبوو و، سەرەڕای برێکی زۆر کەم یۆد کە لایان دەستکەوتبوو، کاری پزیشکیی بۆ کردبوون.

کـوردان کـە ژنـەکانیان کۆرپـەکانیان بەکۆڵـەوەو برنــەویان بەدەســتەوە بــوو، وادیاربوون کە شەڕ زیاتر بەمایەی رابواردنو خۆشی، وەك لە هەر شتێکی تر، ســەیر

بکەن. سەرکردەکەیان لە ئاراپات کوردێکی باڵا بەرز بووەو، ناوی (تەلۆ– Telo)[1] بووە.

٤ـ ئەمجا خاتوو ماك گرات، بەنیازی ئەوەی کە لە بدلیسەوە بێتە ناو تورکیا، بەرەو باشوور بەدیوی تورکیای سنوورەکەدا کەوتبووە ڕێ. کاتێ: لەگەڵ چاوساغەکەیدا گەیشتبوونە شاخەکانی نزیك (ئارجك– Archag)[1] کە بەسەر گۆلی واندا دەڕوانن، بیستبوویان شەڕێکی قورس لە بدلیس و مووش و ساسۆن و[2] نۆرسان (Norsan)[3] قەوماوەو، ناتوانن تێپەڕن، ناچار بەرەو ڕۆژهەلات وەرگەڕا بوون، بەئاراستەی سنوور تا (زینودۆلا– Zinudola)[4] ملی ڕێیان گرتبوو. پاشان لەوێوە بە دیانەدا [5] کە فەسیلێکی سەربازیی ئاشوورییەکانیان تێدا بینیبوو، چووبوونە خاکی عیراقەوەو، تا ڕەواندوز ڕۆیشتبوون.

٥ـ خاتوو ماك گرات، لەسەرتاسەری گەشتە سنوورییەکەیدا، هیچ نیشانەیەکی کارمەندو سەربازانی تورکی بەدی نەکردبوو، زۆرکەمیشی لەبارەی شەڕو شۆڕەوە بیستبوو. ئەو لەیارمەتی و هاوکاریی ئێران بۆ یاخییەکان دڵنیابوو، چونکە شایەتی ئەوەبوو کە چاوساغە کوردەکەی لەگەڵ جەنەڕاڵدا لە تەورێز کۆبووبووەوەو، دەیزانی تەقەمەنی و کەلوپەل بەشێوەیەکی ڕێکوپێك و بەردەوام لەئێرانەوە بەسنووردا دەپەڕنەوە.

---

[1] لەمیرانی مەزگرتە، ئەڵقەیەکی پەیوەندیی نێوان ئاگری و ناوچەکانی‌تری کوردستان بوو (شۆڕشی نەتەوەیی کورد، ل٢٤). (س)

[1] ناحیەیەکی باکووری ڕۆژهەلاتی نزیکی شاری وانە. (س)

[2] قەزایەکی باکووری ڕۆژهەلاتی شاری دیاربەکرە. (س)

[3] ڕەنگە (نورشین)ی ناحیەیەکی باکووری ڕۆژاوای نزیکی شارە بدلیس بێ. (س)

[4] مادام ناوی دیانە هێنراوە، دوور نییە دۆلی زینۆی شێخی نێوان ڕەواندزو شنۆ بێ. (س)

[5] یەیەکی ئێستای سەر بە قەزای ڕەواندزە.(س)

٦. وامەست دەکەم چاوساغەکەی خاتوو ماك گرات هەوڵی باشی دابوو بۆ دوورکەوتنەوە لەهەر سەربازێکی تورك. سەرباری ئەمەیش، گومانی تێدا نییە، خاتوو ماك گرات سەلامەتی خۆیو پەیوەندیی ئێمەو تورکیایشی لەو شاخو کێوەدا خستبووە مەترسییەوە. بۆیە هیوامە ئەم نهێنیانەی بپارێزرێن، ئەگەر نا چاوساغەکەی کە گەشتەکەی بۆ سازکردبوو، ئەگەرچی بەپارە کردوونی، بەڵام زۆر دڵسۆزو بەوەفابووە، تووشی سزای قورس دێ. جا لەبەر ئەمە پێی وتم: ناتوانێ هیچ زانیارییەك لەم بارەیەوە، بە چاپەمەنیە ئینگلیزیەکان بدات.

٧. کۆپیی ئەم راپۆرتەم بۆ نوێنەری خاوەنشکۆ لەتاران و بریکاری کۆمیساری باڵا لە بەغدا ناردووە.

جۆرج. ئار. کلارك

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ١٦-١٧، ژ: ١٩

****************

## ژ: ٦٨

## لە سێرجی. کلارکەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن (٢١ی تەمووز گەیشتووە)

ژمارە: ٢٧٦

قوستەنتەنییە، ١٧ی تەممووزی ١٩٣٠

گەورەم،

لەراپۆرتەکانی ژمارە(٢٧٣و ٢٧٤، ٢٧٥)مدا، هەوڵمداوە چەند هەواڵێکی رووداوەکانی ئەم دواییەی کوردستانتان بۆ بنووسم، هەرچەندە زانیاریی جگە لە پرۆپاگەندەو راپۆرتی پەیامنێری چاپەمەنیە تورکیەکان، دەست ناکەوێ.

٢. سەختە ئەوئەنجامە بەدەست بهێنن کە ئایا ئەم شەرە لە زنجیرە هێرشی کوردەکانەوە بۆ سەر بنکەکانی پێشەوەی سوپای تورك، وەك لە راپۆرتی مانگی نیسانی کونسوڵی تەورێزی خاوەنشکۆدا هاتووە، سەرچاوەی گرتووە، یاخود ئەو هێرش‌و پەلامارانە زادەی کارە سەرکوتکاریەکانی تورك بوون کە لە پشتەوەی گۆلی وان دژ بەکورد دەستیان پێکردبوون.

٣ـ چاودێرێکی بلیمەت، پاش دامرکانەوەی ساڵی ١٩٢٥ی کورد، وتی: ئەمانە هەرگیز خۆیان بەدەستەوە نادەن، بەڵکو پێنج ساڵی ترو، کاتێ لەم شکستەیان هەڵدەسنەوە، جارێکی تر رادەپەڕن. لەلایەکی‌ترەوە، سیاسەتی (کۆنترۆڵکردنی ئاشتییانە)ی ئیبراهیم تاڵع بەگی پشکنیاری گشتیی ویلایەتەکانی رۆژهەلات پێشکەوتنی بەرەو رۆژهەلاتی دیاربەکری بەخۆوە نەدیوە، بۆیە دەشێ بڕیار لەسەر رێوشوێنی توندوتیژ تر بدرێ. چونکە وەك لە دووتوێی لاپەڕەی رۆژنامەکانەوە دەردەکەوێ، بەئاشکرا ترسی ئەوە لەئارادایە کە رەنگبێ نائارامیی پەرەسەندووی کوردستان، ئەگەر دانەمرکێنرێتەوە، تەشەنە بۆ ناوچەکانی‌تر بکات‌و، ببێتە مایەی سەرهەڵدانی ناڕەزایی‌و بێزارییە شاراوەکان.

٤ـ ڕێی تێدەچێ حکومەتی تورك لەبەرئەوە بڕیاری دابێ ئەمساڵ کێشەی کورد بەباشی چارەسەر بکات بەگشتی بەخت یاری تورکەکان بووە، ئەگەرچی خەرجی لەوەی وا پێشبینی دەکرا، زیاتری تێچووە. ئەمە بەقازانجی تورك شکایەوە کە شەڕوشۆڕ بەرلەدەستپێکردنی لە ئەرجیش، وەك ڕائید ئۆلێری ئاماژەی پێدەکات (بڕوانە ڕاپۆرتی ژمارە ٢٧٤م) لە دەوروبەری چیای ئاراڕات بەرپابوو، پشتگیریی ئێرانیش بەڵگەو بیانووی ڕەوای بەدەسەڵاتدارانی تورکیا بەخشی تا خۆیان چۆنیان مەبەستە پێ لەسەر دەستکاریو ودیاریکردنەوەی سنوور دابگرن دواجار ئەم یاخیبوونە دەبێتە بیانووی حکومەت بۆ لەناوبردنی کوردستانو خەڵکەکەیو، سەرکوتکارییە کاریگەرەکەیش گشت ناڕەزاییەکان لەجێیەکانی تر لەناو دەبات. تۆفیق ڕۆستوو پێی وتم: پێویستە هەرێمەکە بە پەنابەرانی تورکی شوێنەکانیتر ئاوەدان بکرێتەوە.

٥ـ سەرەڕای ئەمە، بەدڵنیاییەوە حکومەت، زۆر کاتو ساتی ناخۆشی دیوە. هەرچەندە دەشێ تەرازووی مەسەلەکە، دوایی، بەبەرژەوەندیی تورکیا بشکێتەوە. سەرجەم دوژمنانی ئەم وڵاتەو حکومەتی ئێستاش، دەتوانن ئەو کوردانەی کە لە سزای دڕندانەی ئێستا هەڵدێن، بەهاوکاری خۆیان دابنێن.

٦ـ وێنەی ئەم ڕاپۆرتەم بۆ نوێنەری خاوەنشکۆ لە تارانو بریکاری کۆمیسارى باڵا لە بەغدا ناردووە.

جۆرج ئار.کلارك

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل:١٧، ژ:٢٠

## ژ: ٦٩

## لە سێرجی کلارکەوە بۆ مستەر ئێی هندرسن (٢٨ی تەمموز گەیشتووە)

**ژمارە: ١٧٤**

**تاران (٢٨ی تەممووزی ١٩٣٠)**

**برووسکە**

ئەمەی خوارەوە لەتەورێزەوە گەشت (ژمارە:١٨):

(هەموو لۆرییەکانی ئێرە بۆ گواستنەوەی سەرباز بەرەو ماکۆ، دەبرێن، چونکە تورکەکان دوای چەند بارە کردنەوەی گللەییەکانیان لەوە کە کوردانی ئێران هاوکاری ئەوانەی ئاراپات بوون، هەرەشەی شکاندنی سنووریان کردووە)

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل:٢٣، ژ:٣٠

*************

## ژ:٧٠

## لە سێرجی کلارکەوە بۆ مستەر ئێی هندرسن (٥ی ئاب گەیشتووە)

**قوستەنتەنییە، ٣١ی تەممووزی ١٩٣٠)**

**گەورەم**

دوو هەفتەی رابردوو زانیارییەکی کەمێ تایبەت بەراپەڕینی کورد، لە ناوچەی سنووری ئێران، لەچاپەمەنییەکانەوە بڵاوکرایەوە. بێگومان هەروەك لەنووسراوی ژمارە (٢٧٣)ی ١٥ ئەم مانگەدا، ئاماژەم پێدا، حکومەتی تورکیا وتی: یاخییان لە ئەرجیش تەفرو توونا کراون و، تەنها ئەوەندە ماوە، کوردە هەڵاتووەکانی بەشەکانی سەرەوەی ئاراپات دەستگیر بکرێن.

٢ـ لەکاتێکدا یاخییان لەئەرجیش شکستی کاریگەیان هێناوەو زۆریان لێ کوژراوە، راپۆرتی ناوبەناوی چاپەمەنییەکان ئەوە دەخەنەڕوو کە هەرچەندە حکومەت جڵەوی بارودۆخەکەی باش گرتووە، کەچی هێشتا پرۆسەی پاکسازیی ئەو دەڤەرە یاخییە تەواو نەبوە. کردەوە سەربازییەکان بۆ ماوەیەك راگیراون.

دەڵێن یاخییان گەمارۆدراونو، نەبوونی پێداویستییو هاتنی وەرزی زستان ناچاریان دەکات جموجۆڵەکانیان کەم بکەنەوەو، ئیتر بەبێ لەدەستدانی سەربازی تورك لەشەڕدا سزای خۆیان وەردەگرن. دەکرێ لەم بارودۆخانەدا پشت بەم تاکتیکانە ببەسترێ، بەڵام ئایا گەمارۆی تورك بەڕاستی تەواو و مەحکەمە ؟! یاخود ئیتر زۆر لەیاخییان ناتوانن هەڵبێنە گوندەکانی دەوروبەر؟! ئەو بیرۆکەیە ئێستا تەواو بڵاوەکە (چەتەکان) لەئێرانەوە هاتبوونو، هەموویش لەسەر ئەوە کۆك بوون کەسەر هەڵدانەکە یەکێکە لەوانەی کوردانی تورکیا کە لە ئێرانەوە پشتیان گیراوەو، بەردەوام تەقەمەنیو پێداویستیان بۆ دابین کراوە.

٣ـ بەڵام جگەلە پەلاماری خێڵی بارزان بۆ سەر بنکەو سەنگەرەکانی تورك لە (ئۆرامار– Oramar)[1]، ئەگەر رۆژنامەکان زانیارییەکی کەمیان لەسەر رووداوی بچووك هەبوایە، ئەوا بوارێکی فراوانیان دەڕەخساند تا بەگشتی ئیدانەی نەخشەو پیلانی دەرەکی بۆ کێشەنانەوە لە تورکیا بکەن. ئەمە بەتەواوی ئاراستەی ئێران کراوە، کە شاڵاوی راگەیاندن لەدژی پەرەی سەندووەو، گومانیشی تێدا نییە کە پەیوەندییەکانی تورکیا –ئێران لەم ساتەدا بەبارێکی نالەبارو ئاڵۆزدا تێدەپەرن. دوا مەبەستی تورك هەرچییەك بێ، عیسمەت پاشا لە گوتەی (٢٨)ی ئەم مانگەی ئەنگۆرەیدا، ئیشارەتی بەوەداوە کە رێی تێناچێ پەیوەندییە ئاساییەکانی هەردوو وڵات، بەبێ ئارامیی سنوور، سەربگرێ. تورکیا ئێستا ئەو ئارامییەی نییەو ئەگەرچی حەزیش ناکات کەس ئازار بدات، بەڵام دەبێ بەرگریی رەوای خۆی بکات. هەروەها

---

[1] ناحیەیەکی ویلایەتی حەکارییە. (س)

پێویستە ئەوە روون بکاتەوە کەوا، پێش دەستەبەر بوونی ئەو ئامانجە، گەلی تورك پاشەکشە ناکات.

٤. قسەکانی سەرۆك وەزیر کەم بەهانین، چونکە وا رادەگەیەنرێ کە تورکیا خەریکە بەتوندی سەرنجی حکومەتی ئێران رابکێشێو، دەقی سەرنجەکەیشی رۆژانی ئایندە چاپو بڵاودەکرێتەوە. سەرنجەکە، بەپێی رۆژنامەی رەسمی وەڵامی تێبینییەکی بەم دواییە گەیشتووی تاران دەداتەوەو، ئەوە رەتدەکاتەوە کە گوایە حکومەتی ئێران ئاگای لەچەکدارکردنی چەتەکان نییە لەناو خاکی ئێرانداو، هەموو هەوڵێکی بۆ پاراستنی ئارامیی سنور خستووەتە گەڕ. هەروەها دەریدەخات کە هەموو بەڵێنێکی نیازپاکیی رۆژنامەکان، بایەخیان نابێ، دواتر، هەر بەپێی هەمان سەرچاوە، سەرنجەکە ئەو هەڕەشەیش تێدایە کە ئەگەر پەیمانەکانی نیازپاکیو هاوکاری کاریان پێ نەکرێ، ئەوا حکومەتی تورکیا هەر هەنگاوێك دەنێ کەبۆ پارێزگاریو بەرگریی سنورەکانی بەپێویستی بزانێ.

٥. ئەگەرچی دەشێ شێوازی سەرنجێکی لەم جۆرە ببێتە هۆی بێزاریی ئێران، بەڵام رەنگە راستییەکە تەنها بیانوو هێنانەوە بێ بۆ داگیرکارییەکی بەناو هەمیشەیی ناوچەی دەوری دامێنی رۆژهەڵاتی چیای ئاراڕات کە تورکیا دەمێکە دەیەوێ دەستکاریی سنووری ساڵی ١٩١٣ی خۆی بکات.

٦. وێنەی ئەم راپۆرتەم بۆ نوێنەری خاوەنشکۆ لە تارانو بریکاری کۆمیساری باڵا لە بەغدا ناردووە.

جۆرج ئاڕ کلارك

وەزارەتی دەرەوە،٢٧٣/٤٢٤،ل:٢٦-٢٧، ژ:٣٥

## ژ:٧١

## دوو برووسکەی ڕۆیشتوو هاتووی (٦)ی ئاب

(١)

لە وەزیری کاروباری وڵاتانی کۆلۆنیالکراوەوە بۆ کۆمیساری باڵا لە عیراق
"برووسکە"

برووسکە ژمارە (٥٣)ی قوستەنتەنییە بۆ وەزارەتی دەرەوە بۆتان دووبارە کراوەتەوە.

هەواڵی راستەقینەی پشتگیریی داگیرکاریی کوردان چۆنە؟

(٢)

لە بریکاری کۆمیساری باڵاوە لە عیراق بۆ وەزیری کاروباری وڵاتانی کۆلۆنیالکراو.

برووسکە

ئاماژە بە برووسکە ژمارە(٥٣)ی (٢٦)ی تەمموزی قوستەنتەنییە بۆ وەزارەتی دەرەوە، حکومەتی عیراق ناتوانێ پشتیوانی لە دروستیی رووداوە کە بکات، بەڵام بەڵگەی ئەوە هەیە کە شوێنکەوتووانی شێخی بارزان لەهەرێمی ئۆرامار یارمەتیی کوردەکانیان داوە. حکومەتی عیراق دەسەڵاتی تەواوی بەسەر شێخی بارزاندا نییە، دەزانم ئەمە بۆ حکومەتی تورکیا قسەیەکی جێی قەناعەت پێکردن نییە، بەڵام هۆی مانەوەی شێخ بە ئازادیو دوور لە دەسەڵاتی حکومەتی وڵاتەکەی، زادەی ئەو هاوکارییە مەعنەویەیە پێدەچێ ماددیش– کەزووتر حکومەتی تورکیا کردوویە. (بڕوانە لاپەڕە (٦)ی کورتەی چاپکراوی کۆبوونەوەی ئاسایی ژمارە شەشی لیژنەی سنوور)[1]

ئەم برووسکەیە بۆ قوستەنتەنییەیش نێردرا.

وەزارەتی دەرەوە،٢٧٣/٤٢٤، ل:٢٦،٢٧، ژ:٣٧

---

[1] چاپ نەکراوە.

ژ:٧٢

**لە مستەر هیلمەوە بۆ مستەر هندرسن- (٥ی ئاب گەیشتووە)**

**ژمارە:٦٣**

**قوستەنتەنییە،٥ ئابی ١٩٣٠**

**برووسکە**

ئەمەی خواروە بۆ بەغدا نێردراوە، ژمارە(٥):

"برووسکەی ژمارە (٣٦٢)تان بۆ وەزارەتی کۆلۆنییەکان"

" لەهەلومەرجێکی ئاوادا، پێم باشە هیچ قسەیەك لەگەڵ وەزیری دەرەوەدا نەکرێ، تاخۆی جارێکیتر دەپرسێتەوە، خۆشحاڵم، بۆ زانیاریی خۆم، بزانم ئایا وەڵامی نوێنەری تورکیا لە بەغدا دراوەتەوە یان نا؟ خۆ ئەگەر دراوەتەوە، چییە؟

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤،ل:٢٧، ژ:٣٦

******

## ژ:٧٣

## لەبریکاری کۆمیساری باڵاوە لەعیراق بۆ وەزیری کاروباری وڵاتە کۆڵۆنیالکراوەکان

.........(٨ی ئاب بە وەزارەتی دەرەوە گەیشتووە)

**برووسکە**

**بەغدا، ٦ی ئابی ١٩٣٠**

ئەمەی خوارەوە بۆ قوستەنتەنییە نێردراوە:

" ئاماژە بە برووسکەی ژمارە (٦٣)ی وەزارەتی دەرەوەتان"

وەزیری دەرەوەی عیراق وەڵامی نوێنەری تورکیا دەداتەوە، دەڵێ:

حکومەتی عیراق بەرەهایی رەتیدەکاتەوە هەرجۆرە پشتگیرییەکی بزووتنەوەکانی کوردی دژی حکومەتی تورکیای کردبێ،و، هەموو هەوڵەکان خراونەگەڕ بۆ کۆنترۆلکردنی تیرەو خێڵەکانی سەرسنوور. بەڵام حکومەتی تورکیا دەزانێ ئەمە تاسەر ئاسان نییەو، هەروەها دەکرێ حکومەتی تورکیا دڵنیا بێ لەوەی کە رێ لەپەرەسەندنی هەر خواستێکی نەتەوەیی جیاییخوازیی خێڵە کوردەکانی عیراق دەگیرێ. سیاسەتی حکومەتی عیراقیش بریتییە لەوەی کە ئەوان پێویستە وەك خەڵکێکی عیراقیی چاك ئارام بن،و، نە حکومەتەکەیان،و نەئەوانەی دراوسێیان هەراسان نەکەن.

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل:٢٧،ژ:٩

***　　***　　***

## ژ: ٧٤

## لە بریکاری کۆمیساری باڵاوە لە عیراق بۆ وەزیری کاروباری دەوڵەتە کۆلۆنیالکراوەکان......(٩ی ئاب گەیشتووەتە وەزارەتی دەرەوە )

**برووسکە**

**بەغدا، ٦ی ئابی ١٩٣٠**

دواترین زانیاری ئەوەیکە دەورووبەری، (٢١)ی تەمموز شەڕ لەنێوان خەڵکی ئۆرامارو سەربازانی تورکدا بەرپابووەو، شێخی بارزان (١٠٠) سەد گردی Girdi[1] بۆ یارمەتیی ئۆرامار ناردووە، بەڵام ئاشکرا نییە شەڕەکە لە خاکی عیراقەوە یان لەناو تورکیاوە هەڵگیرساوە. ئەم شەڕە، زیاتر پێدەچێ لەوی دواییانەوە کەوتبێتەوە.

(بۆ قوستەنتەنییەیش نێردراوە)

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤/٢٧٣،ل:٢٩،ژ:٤١

***************

## ژ:٧٥

## لە مستەر هێلمەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن

**ژمارە:٢٩٨**

**قوستەنتەنییە، ٦ی ئابی ١٩٣٠**

**گەورەم**

پێم خۆشە، وەك باڵوێزی خاوەنشکۆ لەبڕگەی چواری راپۆرتی ژمارە (٢٩٢)ی (٣١)ی مانگی رابردوویدا پێشبینی کردبوو، ئەوەتان پێی رابگەیەنم کە حکومەتی

---

[1] گردی ناحیەیەکی سەر بە قەزای شەمدینانە. رەنگە مەبەست دانیشتوانی ئەم ناحیەیە بێ. لەوانەیشە خێڵی گەردی مەبەست بووبێ. (س)

تورکیا (١)ی ئاب باڵوێزی وڵاتەکەیی ئاگادارکردووە تاسەرنجی زیاتر لەسەر دوا رووداوەکانی سنووری تورکیا– ئێران بداتە حکومەتی ئێران.

٢ـ دەقی نامە گۆڕکێکە، بەپێچەوانەی ئەوەوە کە پێشبینی دەکرا، بڵاو نەکرایەوە، بۆیە ناکرێ ئاستی پەیوەندییەکانی نێوان هەردوو وڵات بزانرێ. دواتێبینی تورکیا، بەپێی چاپەمەنییەکان. (توندوتیژ، بەڵام دۆستانە) بوو. لەسەرچاوەیەکی بەناوبانگەوە زانیم، لەکاتێکدا شێوازی سەرنجەکە تەواوو دۆستانەیە، حکومەتی تورکیا، حکومەتی ئێرانی لەهەڵبژاردنی دوو ڕێگەی نەخوازراو سەرپشك کردووە، ئەوانیش بریتین لە دیاریکردنەوەی خێرای سنوور بەشێوەیەك کەدیوی رۆهەڵاتی شاخی ئاراڕات وەك بەری رۆژئاوای دەخاتە سەرنەخشەی تورکیا، یاخود ڕێگەدان بەسەربازانی تورك تا شوێن پێی هەڵاتوانی کورد بۆ ناو خاکی ئێران هەڵگرن‌و، لەوێ چاریان بکەن.

٣ـ کاری سەربازیی لەناوچەی سنوورو، بەتایبەتی دژی کوردان، لەئاراڕات، کاتی گەیشتنی وەڵامی پێشنیارەکانی تورکیا، رادەگیرێ. لەگەڵ ئەمەدا، چالاکییەکی بەرچاو لەدام‌و دەزگاکانی حکومەتی تورکیادا هەیەو، ئەمەیش هەروەك جیاوازیی زمانی سەرکۆمار (بڕگەی ٥ی نووسراوی ژمارە (٢٨٨)ی (٢٩)ی تەممووزی سێر جی کلارك) کە بەئاشکرا ئێرانیان وریا کردەوە، باوەڕێکی وەهای دروستکردووە کە هەردوو سەرکردە لەسیاسەتیاندا سەبارەت بە ئێران زۆر کۆك نین. عیسمەت پاشا وا دەردەکەوێ خوازیاری ئیجرائاتی توندبێ، بەڵام غازی دەیەوێ گرفتە کە بەگفتوگۆ چارەسەر بکات.

جا وابێ یان نا، وا هەست دەکرێ ئەم سەرنجەی تورکیا بۆ ئێران، لەوەی کە سەرەتا بیری لێکرابووەوە، نەرمتر بووە. هاوکات ئەوەش گرنگە کە هەفتەی رابردوو توندوتیژیی چاپەمەنییەکان، بەشێوەیەکی بەرچاو کەم بووبوونەوەو، دەم‌و دوویەکی ناوەند گر (معتدل)تریان هەبوو. هەروەها ئیبراهیم تەڵع بەگی پشکنیاری گشتیی کوردستان کە وەك پەیامبەری هێورکردنەوەی ئەم ناوچەیە، بە قەناعەت

پێکردن و دروستکردنی رێگەوبان و، پەروەردە، سەیردەکرێ، ئەو کاتەی کە شاڵاوی چاپەمەنییەکان دژی ئێران لەوپەڕی برەویدابووو، رۆژنامە هێرشی کردە سەر خۆی و سیاسەتەکەی، کتوپڕ گەیشتە ئەنگۆرە. ئەمجا پاش یەك دوو رۆژ بەئازادی وتووێژ لەمەڕ گواستنەوەی بۆ پۆستێکی ترو جێگرتنەوەی لەلایەن جەنەڕاڵ جەودا پاشا (Cevat Pasha)ی ناوبانگ باشی سنووری عیراقەوە کرا. عیسمەت پاشا لە یالۆڤا (Yalova)[1] سەردانی غازیی کردو، ئێستا لەوەدایە بگەڕێتەوە دیاربەکر.

دەڵێن خوسرەو بەگی هاورێی غازیش کاری باڵوێزی لە تاران لەئەستۆ دەگرێ بەڵگەی لەم جۆرە لەبەردەستدایەو، ئەو راستییە دەخاتە روو کەسیاسەتی ناوەندگری تەنها بۆ ساتێك سەرکەوتن بەدەست دێنێ و، وەك وەزیری دەرەوەی ئێران بە سێر ئاڕ. کلایڤی وت: (راپۆرتی ژمارە ٣٢٨ی ١٤ی تەممووزی تاران) حکومەتی سۆڤیەت گەرەکییەتی تۆوی ئاژاوە لەنێوان ئێران و تورکیا بچێنێ. سەرکەوتنی ئەم هەوڵانە سنووردارە. گۆڕانکاریی ئایندەیش، دەکەوێتە سەرجۆری وەڵامی ئێران بۆ دواتێبینیی تورکیا.

٤ـ خۆ ئەگەر پەیوەندییەکان (دە) رۆژی دوایی کەمێك باشیش بووبن، هێشتا ئەوە جێی گومانە کە ئاخۆ باش بوونێکی هاوشێوە لە بارودۆخی کوردستانی تورکیادا هەبووە یان نا. چاپەمەنییەکانیش تەواو لەمە بێدەنگ بوون.

بەهێزکردنەوەی سوپا، بەردەوام و بەشێوەیەکی رێك و پێك، لەهەرێمی کوردانددا بەدی دەکرێ. پاشکۆی سەربازیی باڵوێزخانەی خاوەنشکۆ زانیویەتی، تائێستا (٨-١٠) فرۆکەی تورکی لەو هەرێمەدا لەناوچوون و، باندە یاخییە پەرەوازەکانیش هێشتا زۆرن. هەروەها کەم لەبارەی هێرشی کوردانی بارزانەوە بۆ سەر ئۆرامار، بڵاوبووتەوە. هێندەی کە من ئاگادارم، هیچ پێشنیارێك لەسەر تێبینییەکانی عیراق و بریتانیا بڵاونەکراوەتەوە. بەڵام ئاشکرایە کە کوردانی تورکیا، نزیك سنووری عیراق،

---

[1] ناحیەیەکی باشووری رۆژاوای ویلایەتی ئیزمیتە لەسەر دەریای مەرمەرە. شوێنی حەسانەوەی مستەفا کەمال پاشا (ئەتاتورك) بووە. (س)

بەردەوام سەرچاوەی گرفت و کێشەن. ئەگەر ئاژاوەی سەردوو سنوورەکە بەس نەبووبێ، خۆ ئەمڕۆ ڕایشگەیەندرا کە دەستەیەکی شەست کەسی بە فەرماندەیی حاجۆ[1] ی دوژمنی دێرینی تورک نزیك بەنسێبین سنووری سووریایان بڕیوەو، وایەری برووسکەکانیان لەو ڕێگەیەدا قرتاندوە. ئەوەیش وتراوە کە سەربازانی تورك خەریکی بەرەنگاریی ئەم داگیرکارییە نوێیەن، کە لەبەر برانی پاسەوانانی سنوور بۆ کۆنترۆڵکردنی بارودۆخی باشوور، بەئاسانی ئەنجام دراوە. حاجۆ ئێستا لە (Habad)[2]ی زێدی باووباپیری جێگیربووەو، بە بەیاننامەیەك ئاشکرای کردووە، کار بۆ سەر بەخۆیی ی کورد دەکاتو، کوردان بۆ تۆڵەی کارەساتی براکانیان لە تورکەکان بانگ دەکات.

٥- وێنەی ئەم ڕاپۆرتە بۆ نوێنەری خاوەنشکۆ لە تاران و بریکاری کۆمیساری باڵا لە بەغدا دەنێرم.

ئەی. کەی. هێلم

وەزارەتی دەرەوە ٤٢٤/٢٧٣،ل:٣١—٣٢/ژ:٤٦

*** *** ***

---

[1] حاجۆ ئاغای سەرۆکی هۆزی گەوری هەڤێرکییە، ساڵی ١٩٢١ خەریکی خۆسازدان بوو لە دیاریەکر بۆ بەرپاکردنی شۆڕشێکی چەکدار دژی تورك. بەڵام سەری نەگرتووەو ئینگلیز هاوکاری نەبوە. بەشداری شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران نەبووو، دژی ڕاوەستان. پاشان هاتە سووریاو، لە ناوچەی توریا سپیی (قامیشلی) نیشتەجێ بوو. ١٩٢٧ بوو بە دامەزرێنێك و ئەندامی یەکەم کۆمیتەی ناوەندیی (خۆیبوون). هاوکاری و پشتیوانیی شۆڕشی ئاگری کرد. ١٩٤٠ کۆچی دوایی کرد (لەبارەیەوە بڕوانە: خۆیبوون و شۆڕشی ئاگری، ل٣١، ٣٢، ٣٢،٣٣،٨٣؛ د.کەمال مەزهەر، چەند لاپەڕەیەك لە مێژووی گەلی کورد، ب٢، ئامادەکردنی عەبدوڵڵا زەنگەنە، هەولێر، ٢٠٠١، ل ٤٩٧-٥٠٤). (س)

[2] حاجۆ ئاغا خەڵکی ناوچەی (تورعابدین)ە، بۆیە ڕەنگە ئەوناوە هەڵەبێ. (س)

ژ: ٧٦

**لە مستەر ئار ئێچ کامپبێلەوە بۆ مستەر ئێی هندرسن (١٥ی ئاب گەیشتووە)**

**ژمارە:٩٣٩**

**پاریس، ١٤ی ئابی ١٩٣٠**

**گەورەم**

خۆشحاڵم پێتان رابگەیەنم کە ئەم بەیانییە نوێنەری ئێران سەری باڵوێزخانەی خاوەنشکۆیدا. ئەو وتی بەرێنوێنی حکومەتەکەی نەهاتووە، بەڵام تەنها خۆی ویستوویەتی سەرنجم بۆ شکانی سنووری ئێران لەلایەن سەربازانی تورکەوە بۆ راوەدوونانی کوردەکان رابکێشێ. سەربازانی تورک، بەقسەی ئەو، چوونەتە ناو خاکی ئێران و، نەیشیدەزانی کەی دەڕۆنەوە، یاخود نیازیانە تا کاتێکی دیاری نەکراو بمێننەوە یان نا. پێی وابوو ئەم کارە بە فیتی حکومەتی سۆڤیەت بووە، چونکە بەڵگە لەسەر سنووری ئێران– رووسیای سۆڤیەت لەبەردەستدایە. هەروەها وتی ئەم کارەی تورکیا گرفت بۆ حکومەت و کورد لە ئێران دروست دەکات.

٢- ئەو وتی برووسکەی بۆ حکومەتەکەی کردووە تا بزانی دەیانەوێ چی بکەن و، واتێگەیشتووە کە بەنیازن یان لەم کاتەدا داوای یارمەتیی هێزەکانی تر بکەن، یاخود خێرا مەسەلەکە بخەنە بەردەست کۆمەڵی نەتەوەکان. ئاگاداریشی کردمەوەکە دوێنێ ئەم راستیانەی، وەك بۆم دەرکەوت بێ هیچ رێنوێنییەکی تایبەت، بە حکومەتی فەرەنسە گەیاندووە. سوپاسی کردم ئەگەر من ئەمانە بە بەڕێزتان رابگەیەنم، چونکە وەك وتی: نوێنەری ئێران لە لەندەن نییەو، دوێنێ کار هەڵسووڕێنی ئێران لەوێ نەیدەزانی چی بکات.

ئار. ئێچ. کامپبێل

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل:٣٤، ژ:٥١

***

## ژ:٧٧

## لە مستەر هیلمەوە بۆ مستەر هندرسن (١٨ی ئاب گەیشتووە)

**ژمارە: ٣١٨**

## قوستەنتەنییە، ١٤ی ئابی ١٩٣٠

**گەورەم،**

دوێنێ وەزیری دەرەوەم لە ئەنگۆرە بینی و، باسی هێرشەکانی شێخی بارزانم بۆ تورکیا، (برووسکەی ژمارە ٥٣ی ٢٦ی مانگی رابردووی سێر جی. کلارك) کرد. تۆفیق رۆستوویش لێی پرسیم: ئاخۆ هیچ زانیارییەکی بەغدام پێ گەیشتووە، یان نا.

٢ـ بەکورتی لەوەلامی حکومەتی عیراق دووام کە درابووە نوێنەری تورکیا لەبەغداو،جەختم کردەوە کە تورکیا دەتوانی لەوە دڵنیابێ کەوا نەحکومەتی خاوەنشکۆو نەحکومەتی عێراقیش پشتیوانیی هیچ خواستێکی ناسیونالیزمی جیایی خواز ناکەن و، جموجۆڵی لەو جۆرەیان بۆ بێزار کردنی دەوڵەتانی دراوسێ پێقبوولٚ نییە.

وەزیری دەرەوە لەوەلامدا وتی: راپۆرتێکی درێژی تاهیر لوتفیی پێگەیشتوەو، بەدڵنیا کردنەوەکەی حکومەتی عێراق و ئیجرائاتی ئەو وڵاتە دژی هێرشەکان رازییە. تورکیا، بەپێی قسەکانی بەڕێزی، ترسی عێراقی‌نییەو، مەترسییەکە لەجێیەکی‌ترە، بەلام روونی نەکردەوە مەبەستی ئێران یاخود ناوخۆی تورکیایە.

٣. کاتێ زانیم جێگری سەرۆك وەزیری عێراق و جێگری کۆمیساری بالاٚ ویستوویانە (٨)ی ئەم مانگە بچنە کوردستان، بەباشم زانی هەندێ لەوقسانەی پێبڵێم کەچاوەڕێ دەکرا پێمان بگەن و، سەرنجیشی بۆ ئەو راگەیاندنە رابکێشم کە تایبەت بووە بە چالاکیە سیاسیەکانی کورد. بەڕێزی وتی: قسەکانی خوێندوەتەوە.ئەمەیش سەرسامی کردم، چونکە هێشتا لە چاپەمەنیەکاندا

نەخراونــەڕوو. هــەروەها دەیزانــی ئــەو قسـانە بۆچـی کـراون‌و، پێشـوازیی لــەو ڕاگەیاندنەکرد. ئەمجا وتی(( بایەخێکی زۆر بەکورد دەدرێ)).

٤. هـەر خێرا هاتـە سەرباسـی ڕێکەوتننامـەی بـەم دواییـە بـەئاکام گەیشــتووی ئەنگلۆ- عێراقی‌و، وتی: تورکیا بەمە خۆشحاڵە، چونکە ئارامی‌و ئاشـتیی خـوارووی ڕۆژهەلاتی سنووری تورکیایان سەقامگیر کردووە. ئـەو کاتـێ سـەرگوتاری ڕۆژی (١) ئـابی " Temps" ی خوێندبـووەوە، زۆر بـێزار بووبـوو و وتـی: زیانبـەخش بـووە، چونکـە ڕەخنــەی لەڕێکەوتننامەکــە گرتبـــوو و، ئامانجــە بەدینەهاتووەکەیشـــی دروستکردنی ناکۆکی‌و دووبەرەکی بوو لە نێوان‌و تورکیا لەلایەک‌و عێراق‌و بریتانیـای مـەزندا لەلایـەکی تـرەوە. دەیزانـی لـەپێش ئەمـەوە، مەسـەلەی بۆرییـەکان هەیـە. خۆئەگەر بابەتی تری وەهالێرە بڵاوبێتەوە، ئەوا، هەرچەندە حەزی نـەدەکرد شـتی وەها ڕوویدات‌و ئەم قسەی لەسەر بکات، هەرشتێ دەڵێ. هەروەها ئەیویست هەلی بۆ بڕەخسـێ تـا لـەم بـارەوە گفتوگۆ لەگـەل بـاڵوێزی فەڕەنسـە بکـات‌و، لــە (مسـیو دوشـامبغون- M. de Chambrun) بپرسـێ: ئـاخۆ هەسـتی بەرامبـەر ئــەم تاکتیکانـــە چۆنـــە؟ وەزیـــر ئەوەیشـــی وت، کـــەوەك (Temps) دەڵـــێ، ئـــەو ڕێکەوتننامەیـە بـۆ بریتانیـا زۆر گرنگە، فەڕەنسـەیش کـارێکی بـاش دەکـات ئەگـەر ڕێکەوتنێکی لەو جۆرە لەگەڵ سوریادا ئیمزا بکات.

٥. وێنەی ئەم نووسراوەم بۆ جێگری کۆمیساری باڵا لەبەغدا ناردووە.

ئەی. کەی. هێلم

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ٤١، ژ: ٥٧

## ژ: ٧٨

## برووسکەی جێگری کۆمیساری باڵا لەبەغدا بۆ وەزیری کاروباری وڵاتە کۆڵۆنیالکراوەکان (٢٥ی ئاب گەیشتووەتە وەزارەتی کۆڵۆنیەکان)

**١٥ی ئابی ١٩٣٠**

ئاماژە بەبرووسکەی (٦)ی ئابم (بڕوانە بەڵگەنامەی ژمارە ٧٣)، راپۆرتەکان ئەوە دەگەیەنن کەشوێنکەوتووانی شێخی بارزان دەوروبەری (٨)ی ئاب دیسان لەگەڵ سەربازانی تورکدا کەوتوونەوە شەڕو، شێخ بەنیازە بارزانیو زێباری(Zibor)ی زیاتر بەمانای ئۆرامارەوە بنێرێ.

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ٤٤، ژ: ٦١

***************

## ژ: ٧٩

## لەسێرئار. کلایڤەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن (١٨ی ئاب گەیشتووە)

**تاران، ١٨ی ئابی ١٩٣٠**

**برووسکە**

برووسکەکان ( رۆیتەر– Reuter) لەئەنگۆرەوە کە دەڵێن سەربازانی تورک نزیکی ئاراراتی بچووکو( Ay beydagh) سنووریان بەزاندووە، بەپێی قسەی کونسوڵی خاوەنشکۆ لە تەورێزو باڵوێزی پێشووی تورکیا، هەڵبەستراون.

تورک بەپێی هەواڵی تەورێز، لەنزیك (ئاراليك– Aralik)[1] تووشی شکستیتر هاتوونو، باڵوێزی تورکیا کەبەم زووانە بەرەو ئەنگۆرە دەکەوێتەڕێ، دانی پێدانا کە ئەگەر ئێران زوو هاوکاریی پێویست نەخاتە بەردەست بۆ چەککردنو بڵاوەپێکردنی

[1] ناحیەیەکی باکووری رۆژهەلاتی شاری بایەزیدە نزیك بە سنووری تورکیا– ئەرمەنستان. (س)

پەنابەرانی کورد، ئەوا پێدەچێ سەربازانی تورک ناچارین ناوچەی ئاراراتی بچووك داگیربکەن.

ئەم نوسراوە بۆ قوستەنتەنییەیش نێردراوە.

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ٤٣، ژ: ٥٩

*******************

## ژ: ٨٠

## لە مستەر سترانگەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن (٢٨ی ئاب گەیشتووە)

## مۆسکۆ، ١٨ی ئابی ١٩٣٠

گەورەم

سێرئار. کلایف لە نووسراوی ژمارە(٣٢٨)ی (١٤) تەممووزی ساڵی ١٩٣٠یدا کە وێنەیەکی چاپیم پێگەیشتووە، دەڵێ: وەزیری کاروباری دەرەوەی ئێران تەواو لەو باوەڕەدایە کە حکومەتی سۆڤیەت بە تاوانبارکردنی هەڵەی حکومەتی ئێران بەهاندانی یاخییانی کورد، خەریکە کێشە لەنێوان هەردوو حکومەتی ئێرانو تورکیادا بنێتەوە. خۆشحاڵم ئاگادارتان بکەم کە چاپەمەنیە سۆڤیەتیەکان ئاماژەی تری پێچەوانەی قسەکەی فەرووغی خانیان بەم مەسەلەیە داوە، ئەگەرچی ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کەناوبراو هەڵەبووە.

٢. ( ئیزڤێستیا- Izvestia)ڕۆژی چواردەی ئاب برووسکەیەکی ئەنگۆرەی ئاژانسی تاسی بڵاوکردەوەو، تێیدا هاتووە: پرۆپاگەندەکانی تایبەت بەئاڵۆزیی پەیوەندیەکانی تورکیا- ئێران تەواو بێبنەمانو، پەیوەندیی نێوان هەردوو وڵات هێشتا دۆستانەیە.

" ئیزڤێستیا" لەبارەی ئەم برووسکەیەوە نووسیویەتی:

چاپەمەنیە بیانیەکان ئەم دواییە پرۆپاگەندەیان بلاوکردەوە کە گوایە کێشەی تورکیا- ئێران لەتەقینەوەدایە. سەرچاوەی ئەم پرۆپاگەندانەیش ئەو کوردانەن کە لە رۆژهەلاتی ئەنادۆڵ دژی حکومەتی ئەنگۆرە یاخیبوون. ئەم کوردانە لە خاکی ئێران، کە جارێك لۆرەنسی ناودار تێیدا ماوەتەوە، بەپەنابەری ژیاون و هەر لەوێوە رێکخراون و، حکومەتی تورکیایش لەسەرنجەکەیدا ئیشارەتی بۆ نارێکوپێکی ئەم بارودۆخەی ئێستا کردووە. وادیارە دانوستانی هەردوو حکومەتی تاران و ئەنگۆرە لەسەر ئەم مەسەلەیە، ئاکامێکی باشی لێ بەدیهاتووە. بۆیە ئاژانسی (رەسمی)ی ئەنادۆڵ توانیویە زانیاریەکەی پێشوو بنێرێ ئێمە لەلای خۆمانەوە ئەتوانین تەنها پێشوازی لە پاراستنی ئەو پەیوەندیە دۆستانەیەی هەردوو گەلی برا بکەین، کە چەندین ئامانجی سیاسی دەرەکی و ناوخۆییی هاوشێوەی هەن و، بووەتە چقڵی چاوی دوژمن. ئیمپریالیستەکان، بەپێی قسەی پەیامنێرێکی رۆژنامەکانی بەرلین، بۆ لێدانی پەیوەندیەکانی تورکیاو ئێران، هانی یاخیبوونی کوردیان داوە. بەپێی زانیارییەکانی ئاژانسی ئەنادۆڵیش ((ئەم هەوڵە سەرناگرێ)).

٤. قسەکەی تایبەت بەم بابەتە نامەیەکی پەیامنێری تورکیای "Kurier Borsen"ی بەرلین بوو، لە (ئیزڤێستیا)ی (١٢)ی ئابەوە وەرگیرابوو، پەیامنێرەکە تێیدا پشت راستی کردبووەوە کە باندە کوردەکان بەرەشاشی ئینگلیزی و دوا جۆری دەمانچە چەکدار کراون و، پەنابەرێکی محەمەد ناوی تورك کە بەبزوێنەری رێکخراوێکی دینیی کۆنەپەرست لە میسر ناسراوە، فەرماندەییان دەکات. هەروەها لەسەری دەڕواو، دەڵێ: مانگی شوبات کۆلۆنێل لۆرەنس کە لەسەر شێوەی مەجید مەحموود سەری لە بەغداو کوردانی بازاڕی دابوو، پێشبینیی کردووە کە بەم زووانە شتێك روو دەدات. ئەمجا لۆرەنس گەیشتووەتە شارۆچکەی ماکۆی ئێران کە لە سنووری تورکیاوە دوورنییەو فەرماندەیی یاخیانیشی لێبووە.

" ئامانجی یاخیبوون کە سەربەخۆیی کوردەکانە، لەگەڵ بەرژەوەندیی ئیمپریالیزمی بریتانیادا یەکدەگرێتەوە کە دەیەوێ خاڵێکی ستراتیژی دژی کۆماری

سۆڤیەتی سۆشیالیستیی یەکگرتوو لەهەرێمەکەدا دامەزرێنێ. دامرکاندنەوەی ئەم یاخیبوونە، زۆر لەسەر تورکیا کەوتووە. بەم شێوەیە گەرەکیەتی باری ئابووری تورکیا لاواز بکات، ئیتر زیاتر پشت بەیارمەتیە داراییەکانی بریتانیا ببەستێ.

جا لە رێگەی یاخیبوونی کوردانەوە، پێدەچێ بە بەردێك دوو چۆلەکە بکوژێ. قازانجی دووەمیش شێواندنی پەیوەندیەکانی تورکیا– ئێرانە.

نامەکە بەوە دوایی دێ کە دەڵێ: پێکدادان لەگەڵ تورکیادا هەر مەسەلەیەکی لاوەکییەو، مەبەستی سەرەکیی خۆسازدانە بۆ شەڕی یەکێتی سۆڤیەت. بۆیە دوژمنانی دەیانەوێ شوێنی ستراتیجیی گونجاو بۆ خۆیان بگرن.

٥. ئەم بیروڕایانە زۆر لەوانی" ئیزڤێستیا"وە نزیکن، لێرە بەگەرمی پێشوازییان لێ دەکرێ.

ویلیەم سترانگ

وەزارەتی دەرەوە ٢٧٣/٤٢٤، ل: ٤٦، ژ: ٦٤

*************

## ژ: ٨١

## لەمستەر هێلمەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن( ٢٥ی ئاب گەیشتووە )

**ژمارە: ٣٢٨**

**قوستەنتەنییە، ٢٠ی ئابی ١٩٣٠**

**گەورەم،**

سەرەڕای راپۆرتە ئاگادارکەرەوەکانی چاپەمەنیەکانی ئەوروپاو، لەو کاتەوەی نووسراوی ژمارە(٢٩٨)ی (٦)ی ئەم مانگەم نووسیوە، هیچ پێشکەوتنێکی گرنگ لە بارودۆخی کوردستانی تورکیا، یاخود پەیوەندیەکانی تورکیاو ئێراندا نییە.

٢. دە رۆژێك لەمەوبەر، وەڵامی ئێران بۆ سەرنجی (١)ی ئابی تورکیا، گەیشتە ئەنگۆرە. ئەم وەڵامە، بەپێی بۆچوونی تورکیا، مایەی رەزامەندی نەبوە، چونکە

هەردوو ڕێگەی ئاماژەپێکراوی سەرنجەکەی تورکیای داوەتە دواوە. ڕێگەکان بریتیبوون لە دیاریکردنەوەی سنووری نزیك ئاراڕات، یان ڕێگەدان بە سەربازانی تورك بۆ ڕاونان و شوێن پێهەڵگرتنی یاخییانی کورد لەناو خاکی ئێراندا. ئەم ڕازی نەبوونەی ئێران شتێکی چاوەڕێ نەکراو بوو. حکومەت ئەمەی باسانایی وەرگرت و، چاپەمەنیەکان پێیان داگرت کە حکومەتی ئێران لەمەودوا ڕێوشوێنی پێویست بۆ چارەکردنی کورد لەخاکی خۆیدا دەگرێتە بەرو، ئیتر نایەڵێ کوردانی تورکیا بەسنووردا بپەڕنەوە. هەواڵ هەیە کەهێزە سنووریەکانی ئێران سازو تەیار کراونەوە. ئەوەیش پشت ڕاست کرایەوە کە هێزە ئێرانیەکان دەستەیەك چەتەی کوردیان لەنزیکی سنوور لەناوبردوەو، دەڵێن ئەفسەرانی هەردوو وڵات لەڕاوێژدان پێکەوەو هاوکات و هەریەك لەخاکی خۆیەوە دەست بەکاربێ. هەرلەم کاتەدا، برووسکەیەکی ئەنگۆرە بڵاویکردەوە کە فەرمانی دەست پێکردنی ئۆپەراسیۆن دژی ئاراڕات و چوونە ناو خاکی ئێران، ئەگەر پێویست بکەن، دراوەتە سوپای تورك. بێگومان ڕاپۆرتەکە لەدەزگا بەرپرسەکانی ئێرەدا، بەهەند وەرنەگیراو، هەر زوو و دواتر نکوولیی لێکرا.

٣. هەفتەی ڕابردوو ڕۆژنامەکان خۆیان زیاتر بۆ دامەزراندنی پارتە سیاسیە نوێیەکە تەرخانکردبوو، کە بۆ بەخشینی بوارێکی زیاتر بە کوردستان هاتووەتە گۆڕێ. ڕۆژانە دەوترێ بارودۆخ "ئارام"ە، بەڵام ناشێ ئەمە بکرێتە وێنەیەکی ڕاستەقینەی هەلومەرجەکە. بەلای کەمەوە کوردەکانی ئاراڕات هێرشێکیان کردووەتە سەر هێزەکانی تورکیاو، ڕووداوی بچووکیش لێرەو لەوێ باس دەکرێ و، وەزعەکە جێی نیگەرانییە. ڕەنگە بیر لەوە بکەنەوە کە کورد ناچاری خۆبەدەستەوەدان بکەن و، پێیشدەچێ بەهیوای جۆرێك لە هاوکاریی ئێران بن. لەوکاتەدا، وەزیری دەرەوە ڕایگەیاند سەر لە" یالۆڤا" دەدات بۆ وەرگرتنی ڕای غازی و عیسمەت پاشا لەبارەی ناردنی یاداشتێکی نوێوە بۆ تاران، بۆیە هیچ کارێکی خێرا ناکرێ. هێشتا ڕێی تێدەچێ کردەوەی توندوتیژ بەرامبەر بە ئێران بنوێنرێ،

بەلام کاتی ئەم جۆرە کارانە بەسەرچووەو، شتەکان بەرەو سەقامگیربوونێکی دیپلۆماسییانە دەچن. چاپەمەنیەکان بڵاویان کردەوە:

کۆمسیۆنی دیاریکردنی سنوور دەست بەکاردەبێتەوەو، شاندی تورکی دەکەوێتەوە هەوڵی دیاریکردنەوەی سنوور وەك خۆی مەبەستیەتی و، لەبەرامبەردا، دەست لە باشووری دوورتر هەڵدەگرێ. بالۆێزی نوێ لەتاران، لە چاوپێکەوتنێکدا وتی: بەهیوایە هەر زوو وپاش ئەوە کە دەگاتە پایتەختی ئێران، بتوانێ مەسەلەی سنوور یەکلایی بکاتەوە.

٤. هەواڵی خوارووی رۆژهەلاتی تورکیا نییە. پەلامارەکەی حاجۆ کە پێشتر ئاماژەم پێکردوو بەتوندی بەرپەرچ درایەوە. ئەو نەیتوانی هاوکاریی کوردانی ناوخۆ بەدەست بهێنێ و، هەر کە سەربازانی تورك دەرکەوتن، بەسەر سنووردا هەلاتەوەو، یەکسەر هێزەکانی فەرەنسە لە سووریا دەستگیریان کردو، لەسنوور دووریان خستەوە. ئەم هەنگاوەیش جێی رەزامەندی دەزگاکانی تورکیا بوو.

٥ـ وێنەی ئەم نووسراوەم بۆ نوێنەری خاوەنشکۆ لە تاران ناردووە.

ئەلێکس. کەی. هێلم

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ٤٤، ژ: ٦٢

## ژ: ٨٢

## لەسێرئاپ. کلایڤەوە بۆ مستەرئێی. هندرسن( ٤ی ئەیلول گەیشتووە)

**ژمارە: ٤١٥**

## گوڵحەق، ٢٦ی ئابی ١٩٣٠

**گەورەم،**

لە برووسکەی ژمارە(١٩٤)ی (١٧) ئابمدا، ئاگادارم کردنەوە راپۆرتە وەرگیراوەکانی پەیامنێری قوستەنتەنییەی رۆیتەر، لەسەر داگیرکردنی تا باشووری رۆژهەلاتی چیای سەرەکیی ئاراڕات لەلایەن سەربازە ئێرانییەکانەوە، راست نین. ئەم زانیاریانەم لە گفتوگۆیەکی مەمدووح شەوکەتی باڵوێزی پێشووی تورکیاو برووسکەی گەیشتووی کونسوڵی خاوەنشکۆ لە تەورێز، گەڵاڵە کردوون. چەند رۆژێك دواتر، حکومەتی ئێران لەچاپەمەنییەکانی تاراندا، درۆیەکی تاڕادەیەك رێگری بڵاوکردەوەو، لێرەدا وەرگێڕدراوەکەی هاوپێچ دەکەم.

٢. بێدەنگیی حکوومەتی ئێران، دووریی ناوەندی دوژمنایەتیەکە کە بەدەگمەن گەشتیارانی ئەورووپی سەری لێ دەدەن، وایان کردووە بەزەحمەت زانیاریی دروست لەسەر رووداوەکان دەست بکەون. کونسوڵی تەورێزی خاوەنشکۆیش، پشت بەو زانیاریانە دەبەستێ کە ئەفسەری قوماندانی ئازربایجان دەیانداتێ. راپۆرتەکانی رۆیتەر کە هەندێکیان لە چاپەمەنیی بێتەلی ناوەن ( Nauen wireless press)ەوە وەرگیراون، هەمان بۆچوونی هەڵەی برووسکەی ژمارە(٢٠)ی (٢٩) تەمموزی لەمەڕ داگیرکردنی خاکی ئێرانن و، لە قوستەنتەنییە وەردەگیرێن. جا بۆیە ئەگەر بارودۆخەکە، وەك بەدرۆخستنەوەکەی ئێران روونی دەکاتەوە، جیاوازو ناوازە نەبێ، خەڵك وادەست دەکات حکومەتی تورکیا نیازیەتی ئەم پڕۆپاگەندانە رەت بکاتەوە. ئەگەرنا، ئەوا سیاسەتی وایە، وەك هەڕەشەیەکی ناڕاستەوخۆ، سوود لەو ئیجرائاتانە وەربگرێ کە دەشێ پاشتر ناچاربێ بیانکات. لەلایەکی ترەوە،

حکومەتی ئێران پێدەچێ باش دەرکی بەوە کردبێ کە لەبەر ئەوەی کەسانێکی سەربەخۆ نین بەچاو رووداوەکانیان دیبێ. ئاسانترین رێگەی مامەڵەی هەلومەرجێکی مایەی بێزاریی وا، نکوولی لێکردنێتی. ئەوان، پێنج رۆژ بەر لە بڵاوکردنەوەی وەلامەکەیان، چاوەڕێیان کردو، وەك (شەفەقی سورخ، Shafagh- Surkh) رۆژی پاش دەرچوونی ئامـاژەی پێکرد، سەختە پێشبینی بکرێ چاپەمەنیە ئێرانیەکان راپۆرتی ئاژانسە بیانیەکان پشتگوێ بخەن، ئەمە لەکاتێکدایە کە حکومەت بەر لەوزانیارییە بڕواپێکراوانە دەگرێ کە تەنها ئەوان، ئەگەر بیانەوێ، ئەتوانن پەیدایان بکەن. هەرچەندە وادیارە ئاگادارکردنەوە رەسمییەکە زۆر کاریگەربووە، "Messager de Teheran" لە ژمارەی رۆژی (١٩)ی ئابیدا گرنگی دایە هەڵە وەرگێڕانی برووسکەی ئاوەن. ئاوەن دەڵێ: ((وەك چەند رۆژنامەیەك لەقوستەنتەنییەوە رادەگەیەنن، لایەنە رەسمییەکانی تورك هەمیشە بانگەشە دەکەن کە هیچ جۆرە جموجۆڵێکی هێزەکانی تورك لەخاکی ئێراندا نەبوە))[١].

بەلام Messager de Teheran بەسەر دێڕی ((بایەخێکی زۆر بە کوردان دەدرێ))، نووسیویەتی:

((دەزگا رەسمییەکانی تورکیا، بەپێی زانیاریەکانی قوستەنتەنییە، دژی هەرکارێکی چەکداریی تورکن لەسەر خاکی ئێران))[٢] ..............[٣]، بۆیە بۆ ئەندامانی ئەم باڵوێزخانەیەی ئەمریکای روونکردەوە کە بۆچوونەکانی لەگەڵ حکومەتەکەیدا یەك ناگرنەوەو، هەروەك باڵوێزی خاوەنشکۆ لە قوستەنتەنییە، منیش بێگومانم کە بانگکردنەوەی ناوبراو زادەی ئەو جیاوازیی رایە بووە.

---

[١] بەڕێز د. کوردۆ عەلی لە کۆلێجی هونەری زانکۆی سلێمانی ئەم برگەیەی لەئەڵمانییەوە بۆ کردمە کوردی، سوپاسی دەکەم.

[٢] ئەم برگەیە فەرەنسییە.

[٣] ئەم رستەیە ناتەواو بوو.

بەدڵنیاییەوە، ئەویش وەك زۆرینەی هاونیشتمانیەکانی تری ئێرانی زۆر خۆشی ناوێ، بەڵام پیاوێکی ئاشتیخوازو ناوەندگرەو، وەك پرۆفیسۆرێکی مێژوویش بینیویە، ناکۆکە لەگەڵ ئەو سیاسەتی هێورکردنەوەیەدا کەحکومەتی ئەنگۆرە بە ڕێوشوێنی توندوتیژی وێرانکەر گرتوویە بەر. کاتێ ئەم نووسراوەم ئامادەکرد، خۆی سازدابوو خێرا تاران جێبهێڵێ‌و، وا دەردەکەوت فەرمانی پێدرابێ تا خوسرەو بەگ دەگات، چاوەڕوانی بێ.

٣. ئەترسم ئەم ڕاپۆرتە کەم ڕووداوەکانی کوردستان روون بکاتەوە. چاپەمەنیەکانی ئێران، جگە لە تاوانبارکردنی دەستێوەردانی بریتانیا کە نموونەیەکی(شەفەقی سورخ)ی لەبارەوە هاوپێچ دەکەم شاڵاوەکەیان پشتگوێ خست هەڵوێستیان لە هەڵس‌وکەوتی وشترمرانەی حکومەتی ئیمپریالی وەرگرت. پێدەچی کۆمیساری باڵای خاوەنشکۆ لە عێراق کە ناڕاستەوخۆ نێوانی لەگەڵ خێڵ‌و تیرەی پەیوەندیداری یاخییاندا هەبوە، بتوانی حاڵەتەکە روون بکاتەوە.

وێنەی ئەم نووسراوەو هاوپێچەکانی بۆ ناوبراوو باڵوێزی قوستەنتەنییەی خاوەنشکۆ دەنێرم.

٤ـ کاتی نووسینی ئەم ڕاپۆرتە، ئەم یاداشتە هاوپێچ کراوەی پاشکۆی سەربازیی باڵوێزخانەی خاوەنشکۆم پێگەیشت. هێندەی پێکراوە پوختەی حاڵەتەکەی نووسیوە.

ئاڕ. ئێچ. کلایف

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل:٥١-٥٢، ژ:٧١٤

***

## هاوپێچی ژمارە (٨٢)
## بارودۆخی کورد

وا دیارە تورکان لە ئۆپەراسیۆنەکانی حوزەیران و تەممووزیاندا سەرکەوتووبوون، کوردەکانیش ناچاربوون ئەرجیش و دۆڵی زیلان و رووبارەکانی (حاجی دەری– Haji Deri) و بەرزایی( Abagha)و، بەگشتی ناوچەی باکوور و باکووری رۆژئاوای گۆلی وان جێ بهێڵن، دەیشڵێن سێ هەزار کەسی بێ چەك لەو ناوچەیەدا بەدەستی تورك قەتلوعام کراون.

نیوەی یەکەمی مانگی تەمووز شەڕ گەرمبوو، زەرەرو زیانی ئەو ماوەیەی تورك بە(٤٠٠–٨٠٠٠) کوژراو مەزندە دەکرێ کە نیوەیان بە (ون) لەقەڵەم دراون، بەلام راستیەکەی لە دوژمن هەلاتوون. حوزەیرانیش هێرشێکی سەرنەکەوتوو لە باکووری (ئیغدیر) رووی‌دا.

هێزەکانی یاخییان بەرەو ئاراڕات پاشەکشەیان کردو، لەوێوەو، بەتایبەتی لەئارالیك و نزیکی بایەزید، کەوتنە پەلاماری سەربازە تورکەکان. شەڕ لە ناوچەیە قورس بووەو، شارەکەش چەندین جار دەستاو دەستی کردووە ئافرەتانی کورد رۆڵی کاریگەریان لەو شەڕانەدا بینیوە، تورکەکان فەرماندەییان لە قەرەکۆسە داناوە.

ساڵح پاشای قوماندانی فەیلەقی (٩) فەرماندەی باڵایەو، جێی سوبحی پاشای گرتوەتەوە، ئەکرەم بەگ سەرۆکی ئەرکانی ساڵح پاشایەو، زەکی پاشای فەیلەقی حەوتیش پشتیوانیی ئۆپەراسیۆنەکە دەکات.

ئیبراهیم بەگی سەرخێڵی جەلالی کە ئیحسان نووری ناوێکی ئەفسەری پێشووی تورك و رائید محەمەد بەگ ئامۆژگاریان کردبوو، سەرکردایەتیی کوردانی کردووە.

لە پاشکۆی سەربازیی تورکیاوە لە تاران، زانراوە هێزەکانی سەرتاسەری ئەو هەرێمەی تورکان (١٠–١٥)هەزار جەنگاوەرو، هی کوردانیش بە (٥–٨) هەزار

چەکدار مەزندەدەکرێن، وا باوەڕ دەکرێ تورکەکان (١٥) فڕۆکەی بۆمب هاوێژیان بەکارهێنابێ کە یاخییان هەندێکیان لێ خستوونە خوارەوە. کوردەکان چەند تۆپێکیان هەیە کە رەنگە لە تورکەکانیان گرتبن، بەلام تەقەمەنیی ئەو تۆپانەیان نییە. هەروەها ژمارەیەك رەشاشیان هەیە. هێزی کوردان بۆ چەند فەسیلێك دابەشکراون‌و، هەریەکەیان کەسێکی هەڵبژێردراو سەرپەرشتی دەکات‌و، ناوچەیەکی دیاریکراوی پێ سپێردراوە.

هەرێمی شەڕەکان بۆ سەربازانی نیزامی زۆر سەختەو، ئاوی خواردنەوە کەمەو، هیچ شتێك لەناوەوە دابین نەکراوەو، پەیوەندیکردنیش یەکجار خراپە، ئەمانە سەرباری سەختی دەڤەرەکەو بەتایبەتی نزیك بەئاڕارات.

هەرکە تورکەکان پێشڕەوی بکەن، وڵاتەکە وێران دەکەن‌و، گوندەکان دەسووتێنن‌و، دانیشتوان قەتل‌و عام دەکەن‌و، سەربازان هیچ شوێنێك ناپرسن‌و نابوێرن.

وردە وردە کوردەکان زیاترو زیاتر راپێچی ناوچەی ئاڕارات دەکرێن‌و، هێزەکانی تورك بەنیازن لەوێ گەمارۆیان بدەن‌و، ناچاری خۆبەدەستەوەدانیان بکەن.

ئاشکرایە سنووری تورکیا– ئێران بەلوتکەی ئاڕاراتی بچووکدا دەڕوات، بۆیە ئەو زنجیرە چیایە، تەنها بە داگیرکردنی خاکی ئێران لەلایەن سەربازانی تورکەوە یاخود هاوکاریی هێزەکانی ئێران بە بەستنی بەری رۆژهەڵاتی ئاڕاراتی بچووك، شیاوی گەمارۆدانە.

سەربازانی تورك‌و فڕۆکە جەنگییەکان، مانگی تەمموز، یەك جار تا (١٠) دە کیلۆمەتری ناو خاکی ئێران دوای یاخییان کەوتوون، بەلام هەر زوو سەربازەکان پاشەکشەیان کردووەو، رووداوەکەیش هێوربووەتەوە.

پارێزگاری شاری تەورێز داوای لەیاخییان‌و تیرەی جەلالیی کوردی ئێرانی داڵدەدەری ئەو یاخییانە کرد،بچنەوە ناو خاکی تورکیا، یان خۆیان بەدەست هێزەکانی ئێرانەوە بدەن‌و، چەکەکانیان بدەنێ. نزیکەی (٢٠٠)دوو سەد کەسێکیان

بەدەم ئەم داوایەوە هاتن‌و، ئێستا هێزێکی پێکهاتوو لە یەکەکانی رۆژهەڵات‌و رۆژئاوای فیرقەی تەورێزی ئێران لەشەڕی ئەوانەی تردان.

سەربازانی ئێرانی، دەوروبەری (٩)ی ئاب، شکستێکی گەورەیان خواردو، چوار ئەفسەرو سەد کەسێکیان لیّ کوژرا. دەسەڵاتدارە ئێرانییەکان حەزیان بەم ئاکامەی رووداوەکان نەدەکرد. تازە پێڕەوکردنی سیاسەتی بەنەرمی جووڵانەوە لەگەڵ خێڵە کوردەکانی خۆیانداو هێورکردنەوەیان بەگوشاری سیاسی، نەك کردەوەی سەربازی، درەنگ بووە. ئێستا حکومەتی ئێران ناچارە، دوژمنایەتیی ئاشکرای کوردەکانی خۆی بکات‌و، ئەم کارەیشی جگە لە هاوکاریی ئۆپەراسیۆنی تورکەکان، هیچ پاساوێکی تر هەڵناگرێ. هێندەی تێبینی دەکرێ، دەسەڵاتدارانی ئێران لەو بارودۆخە نەشیاوو نەخوازراوەیاندا زۆرباش کاردەکەن‌و، زۆر رێتێدەچێ بەرامبەر بەو (٢٥٠٠٠) کوردەی ژێر رکێفیان بکەونە گێژاوێکی تاقەت پڕوکێنەوە.

لەلایەکی ترەوە، حکومەتی تورکیا کات‌و پارەیەکی زۆری بۆ سازدانی ئەو هێرشە بەخەرج داوەو، کۆششێکی زۆری بۆ کردووە. مەبەستیشیان دوایی هێنانە بەگرفتی کوردانی ئاراڕات‌و، نایانەوێ دەست لەم ئامانجەیان هەڵگرن. ئەمەیش بەستە بە حکومەتی ئێرانەوە، لەو رووەوە کەتا چ رادەیەك ئەتوانێ سنووری خۆی بپارێزێ‌و، رێ نەداتە کوردانی یاخی بکشێنەوە، ناو خاکەکەی‌و، کوردانی هاوسۆزی ئەم وڵاتە پەیوەندی بەیاخیبوونەوە نەکەن. باوەڕ وایە تەنها هەشت سەد سەربازێکی ئێران پاسەوانیی سنوور دەکەن کە پشتێنەیەکی بێ هێزن‌و، کوردانی ئاراڕات دەتوانن بەقازانجی خۆیان بیبڕن.

رۆیتەر رۆژانی ١٢و ١٤ی ئاب لەقوستەنتەنییەوە هەواڵێکی بڵاوکردەوە کە حکومەتی تورکیا بەتوندی سەرنجی ئێرانی راکێشاوەو، هێزەکانیشی هەرێمی قەرەداغی رۆژهەڵاتی ئاراڕاتی بچوکیان داگیر کردووە، چونکە ئێران ناتوانێ سنووری خۆی بپارێزێ‌و، کوردانی تورکیا پەنایان بۆ خاکەکەی بردووە. بەڵام حکومەتی ئێران، بەبەیاننامەیەکی رەسمیی خێرا، ئەم هەواڵەی رەتکردەوە، پەیامنێرانی

چاپەمەنییە بیانییەکان لە ئەستەمبووڵ، شەش هەفتەیە سەرگەرمی بڵاوکردنەوەی سەرنج و یاداشتی ئاڵوگۆڕکراوی هەردوو حکومەتی تورکیاو ئێرانن. هیچ پشت راستکردنەوەیەك بۆ ئاڵوگۆڕکردنی شتی لەو بابەتە لە تاراندا نییە، بەڵام پڕۆپاگەندە هێندە بەردەوامە کە ناتوانرێ پشتگوێ بخرێ، دەشێ تورك بەرەسمی گلەیی لە ئێران کردبێ کە کوردەکانی پشتگیری یاخییانی ئاراراتییان کردووە. بەڵام هەرچەندە ئەمە تارادەیەك راستە، کەچی حکومەتی ئێران نکوڵیی لێدەکات. ئامـاژە بەراپۆرتی سەرچاوەیەکی بڕواپێکراو دەکەم لەسەر ئەم مەسەلە گرنگە، ئەویش ئەوەیە کە G.O.Cی فیرقەی رۆژهەڵات- رۆژئاوای تەوریز بەئاشکرا چەك و تەقەمەنی بە یاخییانی کورد دەفرۆشێ. رەنگە دواتر حکومەتی تورکیا ئێرانی بەوەترساندبێ کەلەبەرئەوەی حکومەتی ئێران ناتوانێ سنووری خۆی و خێڵەکانی سەرسنوورەکەی کۆنترۆڵ بکات، پێویستە سەربازانی تورك رۆژهەڵاتی ئاراراتی بچووك داگیر بکەن، جا پێدەچی سازو تەیارکردنەوەی هێزەکانی ئێران لەبەر ئەم هەڕەشەیەبن.

گرانە هۆی ئەو شاڵاوەی تورکان کە دژی ئێران دەستیان داوەتێ، دیاری بکرێ، بەدەگمەن رێتێدەچێ تەنها بۆ دەستنیشانکردنەوەی سنووری نزیك ئاراراتی تورکیا- ئێران بێ. لە پاشکۆی سەربازیی تورکیاوە بۆم دەرکەوت، باڵوێزخانەی ئەو وڵاتە لەتاران بەم هەڵوێستەی ئەنگۆرە نارازییە. باڵوێزەکە کە زووتر پێشبینی دەکرا بگوێزرێتەوە، ئێستا دانراوەتەوە، ئەو بۆچوونی بەهێزی هەبوون، پێشتر جارێك دەستی لەپۆستەکەی هەڵگرتبوو، بەڵام دواتر مۆڵەتی چاوخشاندنەوە بەبڕیارەکەیدا درا.

ئێرانییەکان، بەرامبەر بەدەستنیشانکردنەوەی، باشووری دوور بەقازانجی وڵاتەکەیان، واز لەم ناوچەیە ناهێنن، ئەمەیش رەنگە بەهۆی نیازی حکومەتی تورکیاوە بێ بۆ داگیرکردنی سەربازیی ناوچەی قەرەداغ.

مەسەلەی ئیحتیمالی هەڵایسانی شەڕ لەنێوان تورکیاو ئێراندا، لە تاران تاووتوێکرا. ئێران، بەتایبەتی لەم کاتەدا کە قەیرانی ئابووریی هەیەو، لەگەڵ خێڵەکانی نزیک شیرازدا لەگێرەو کێشەدایە، خۆی بۆ ڕووداوێکی وەها ئامادە نەکردووە.

لەلایەکی ترەوە، ماندانی خێڵە سنوورییەکانی سەرووی ڕۆژهەڵات لەلایەن ئێرانەوە بۆ هاوکاریی کوردانی ئاراراتو دابینکردنی تەقەمەنیو جەنگاوەر بۆیان، بۆ تورکیا باش نابێ. ئاشکرایە ڕوسەکان، لەنزیکی سنووری یەریڤان، پەیوەندیی توندوتۆڵیان بەتورکەکانەوە هەیەو، سەبارەت بەگرفتەکانی تورکیا– ئێرانیش، ئێران پێی وایە دوژمنکارییە دیارو نیمچە شاراوەکانی ڕووسیا ڕێی دەستیان گرتووە.

پی.سی. ئار.دۆد

پاشکۆی سەربازی

تاران، ٢٦ی ئابی ساڵی ١٩٣٠

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل:٥٢–٥٤، ژ:١/٧١

## ژ:٨٣

## لەسێر ئار. کلایڤەوە بۆ مستەر ئێی هندرسن. (٤ی ئەیلوول گەیشتووە)

**ژمارە: ٤٢ – نهێنی**

نوێنەری خاوەنشکۆ، لەدرێژەی ڕاپۆرتەکانیدا بۆ وەزیری دەرەوە، نووسراوەکانی ژمارە (١٥٤، ١٤٧، ١٤٩[١]، (١٥١)ی کونسوڵی خاوەنشکۆتان لەتەورێز، لەسەر بارودۆخی کورد، بۆ دەنێرێ.

تاران، ٢٦ی ئابی ساڵی ١٩٣٠

***

---

[١] ئەم هاوپێچە چاپ نەبوە.

## هاوپێچی (١)ی ژ: ٨٣
## لە کونسوڵ پاڵمەردوە بۆ سێر ئار. کلایڤ

**ژمارە: ١٤٥ — نهێنی**

**تەورێز، ١١ی ئابی ١٩٣٠**

**گەورەم،**

خۆشحاڵم ئەمانەتان پێ رابگەیەنم:

١ـ گوندەکانی دامێنی ئارارات چۆڵکراون، یاخییان و خێزانەکانیان بەسەر شەست و سێ کامپی بچووکدا دابەش دەکرێن، هەر چادرگەیەك (١٤—١٥)خێزانی تێدا نیشتەجێ دەکرێ.

٢ـ فەرماندەی باڵا ئیبراهیم بەگی سەرخێڵی کوردی جەلالیی تورکیا[1] و ئێرانە. سەرۆکی ئەرکانیشی ئیحسان نووریی بدلیسە[2] کەپێشتر ئەفسەری تورك بووە،

---

[1] ئیبراهیم بەگ حەسەکی زادە یا (برۆیی حەسەکی تیلی) لە بنەماڵەی حەسەسۆرییە. کاتی خۆی وەزیفەیەکی وەك والییەتیی وانی هەبوە؛ چالاکانە شەڕی رووسی کردووەو رێی نەداوە بگەنە ناوچەی ئاگری. دوای شۆڕشی شێخ سەعیدی پیران کە بەشداری نەبوە، تورك ناچاری کردووە بداتە شاخ و لە ئاگری خۆی بشارێتەوە. مەردانە تا کۆتایی شۆڕشی ئاگری شەڕی کردووە. دواییش وازی نەهێناوە، ١٩٣٢ لە شەڕێکی دیوی ئێراندا بەدەستی جەندرمەی تورك شەهید کراوە (خۆیبوون و شۆڕشی ئاگری، ل٦٥—٦٨). (س)

[2] کوڕی عەلی قولییەو، ١٨٩٣ لە بدلیس لەدایك بووە، خراوەتە بەر خوێندن تا مەکتەبی حەربییەی ئەستەمبووڵی لە ١٩١٠دا بریوەو بووە بە ئەفسەر. لە ئەلبانیاو یەمەن و بەیزوون و گورجستان وەزیفەو شەڕی دیوە. بووە بە ئەندامی (جەمعییەتی تەعالیی کوردستان— ١٩١٨). ١٩٢٠ دوورخراوەتەوە بۆ سەر سنووری گورجستان. هاتووەتەوە بۆ دیاربەکر. ١٩٢٤ سەرکردایەتیی راپەڕینی (بیت الشباب)ی هەرێمی هەکاریی کردووە. کە راپەڕینەکە سەری نەگرت، هەڵاتە عیراق. فریانەکەوت بەشداریی شۆڕشی شێخ سەعید بکات. ١٩٢٧ خۆی گەیاندە چیای ئاگری و رێبەریی شۆڕشێکی کرد تا ١٩٣٠ کە (خۆیبوون) نەخشەسازو جێبەجێکەری بوو. دوای شکانی شۆڕشەکە، چووە ئێران و بە پەنابەر وەرگیرا. ١٩٧٦/٣/٨—

راوێژکاری گشتیشیی شێخ خەلیل- ناوێکی خوازراوە-یکی هەرێمی بۆهدان (Bohdan)[1]ی باشووری وانو باکووری ئەلجزیرە.

٣- بەگشتی (٣٠٠٠) چەکداری یاخی هەنو، دەکرێ بەئاسانی ژمارەیان لەخێڵەکانی دەوروبەرەوە بۆ (٥٠٠٠) زیاد بکات.

٤- بولاقباشی (Bulackbash) سەربازگەیەکی ئێرانە لەو سنوورەداو، نزیکەی (١٢٠٠) یارد لە یەکەم رەبیەی تورکانەوە دوورە. ئەوی تورکان ئەم بەهارە چۆڵکراو، ئێستا هیچ گاردێکی تورك تا پشت بایەزید لەو دەڤەرەدا نییە، چونکە ئەم بنکەیە هەمیشە لەژێر هەڕەشەی کوردەکاندایەو، زوو زوو دەستاو دەست دەکات.

تائێستا کوردان دەستیان لەو پۆستەی رێی بایەزید نەداوە کە لە باشوور هاتوچۆ دەکات.

٥- رووبەری سووچی باشووری رۆژهەڵاتی نزیك بەسنووری دەشتی بایەزید کەمو زۆر (٣٦)میل چوار گۆشەیەو، قامیشی درێژ دایپۆشیوەو، زۆنگێکی چڕو سەختە. سێو چواری تەمموز تورکان چوونە گۆشەی باشووری رۆژهەڵاتی ئەم زۆنگاوەو، لەنزیکەوە کامپی کوردەکانیان بۆمبباران کرد، بەڵام کوردان پەلاماریان دانو، (٥٠) دیلو (٤) رەشاشو چەکی سووکیان لێ گرتن.

٦- پاش چوار پێنج رۆژ دیلەکانیان ، بێ ئازاردان، ئازادکرد. بەڵام ئیسماعیل ئەفسەری تۆپخانە کە کوردێکی ئەرزڕۆمە، جێی نەهێشتنو پەیوەندی پێوەکردن.

٧- تورکان، کەوا پێشبینی دەکرا پەلاماری ئێرانییەکان بدەن، ئەو هێرشە سەرکەوتووەی سەرەوەیان بۆ گرتنی دەربەندی بولاقباشی (بڕوانە خاڵی چواری سەرەوە) برد.

---

- بەکارەساتی مۆتۆرسایکل کۆچی دوایی کرد. نووسەرێکی توانا بوو، لە گۆڤاری "ژین" ی ئەستەمبوڵو (کوهستان)ی تاراندا نووسینی هەیە. بیرەوەرییەکانی لە سەر شۆڕشی ئاگری بڵاو بووەتەوە (شۆڕشی نەتەوەیی کورد لە تورکیا، ل٤-٨). (س).

[1] ناوچەی بۆهتان (بوتان)ە. (س)

٨ـ دوو ڕێگە لە بولاقباشییەوە بەرەو ئاراڕات دەچن، یەکیان بەنێوان بناری ئاراڕاتو ڕۆنگاوی ئامارژە پێکراوداو، ئەویتریان بەلای ڕاست (باکوور)ی یەکەمدا دەڕواتو، هەریەکیان بیستو چوار سەعات پیادە ڕێیە، ڕێگەی دووەم بێ ئاوەو، پڕە لەزۆر جۆرە ماری ژەهراوی.

٩ـ دیارە ئەم بارودۆخانەی سەرەوە ئۆپەراسیۆنە سەربازییەکانیان لەو هەرێمەدا قورس کردووە.

١٠ـ چەند ئەشکەوتێك لەئاراڕاتدان کە گەورەترینیان ڕووەو ڕووسیایەو، گشت یاخییانو ماڵو خێزانو ماڵاتەکانیان دالّدە دەدات، ئەم ئەشکەوتە تەنها ئەو دوو ڕێگەیەی بڕگەی (٨)ی هەنو، کوردەکان بەئاسانی دەتوانن بەرگری لە یەکێکیان بکەنو، سروشتی ئەوی تریشیان وایکردووە لەهاویندا نەبڕدرێو، زستانیش بەفر دەیگرێ.

١١ـ کامپی ئیسماعیل بەگ تا دەشتی بایەزید نزیکەی (٨) میلە.

١٢ـ کوردان (١٣) ڕەشاشیان هەیە، خاوەنی تۆپیشن، بەڵام گوللەتۆپیان نییە.

١٣ـ تورکان ئەڵێن (١٥) فڕۆکەی بۆمب هاوێژیان لەکاردایە، کەچی تەنها شەش فڕۆکە پێکەوە بینراون.

١٤ـ کوردەکان دابەشبوون بۆ چەند باندێكو، هەر کۆمەڵێك ناوچەیەکی لەژێر ڕکێفدایە کەئاژەڵی خەڵکی تری بۆ ڕاپێچ دەکاتو، ئاژاوەی لێوە دەنێتەوە. ئەو ئاژاڵانە خێرا سەر نابڕێن، بەڵکوو لە کاتێکی دیاریکراودا بەرامبەر بە بەخشینی پارە یان تەقەمەنیی دەدرێنەوە بەخاوەنەکانیان، ئیسماعیل بەگ کوشتنی کشتیارانی تورکی قەدەغە کردووە.

ئەم باندە تا سەرووی ئیغدیر لەلایەكو ئەرزڕۆم لەلایەکی ترەوە پەلامار دەدەن.

١٥ـ فەرماندەیی ئێستای تورك قەرەکۆسەیەو، دەڵێن فەرماندەی گشتییش ساڵح پاشای قوماندانی فیرقەی (٩)و ئۆپەراسیۆنەکانی ئێستای ڕۆژهەڵاتە. ئەڵێن پێشتر سوبحی پاشا هێرشی سەرەکیی مانگی حوزەیرانی بەڕێوە بردووە، کە لە ئیغدیرەوە دەست پێکرابوو.

١٦- زەکی پاشای فەرماندەی فیرقەی حەوتیش، لەم شەڕانەدا بەشدارە.

١٧- ئەکرەم بەگی بەرپرسی پێشووی پۆلیسی قوستەنتەنییە سەرۆکی ئەرکانی ساڵح پاشایە.

١٨- کۆلۆنێل لۆرەنس، بەپێی قسەی ئەو کوردانەی کەسەردانی بنکە سەربازییە ئامازەپێکراوەکانی ئێرانیان کردووە، یارمەتیی کوردان دەدات.

١٩- یاخیيانی جەلالی لەم سێ ناوەندەدا بوون، ئیبراهیم بەگ لە شاخەکانو، خالید بەگ لە بەری ئێرانو، سێیەمیش کە ناوەکەی نەزانراوە لە قەرەسوو (Karasu)ی نێوان خالید بەگو ئیبراهیم بەگ. ئەڵێن ئەمی سێیەم پەیوەندیی باشی بەرووسەکانەوە هەیەو، وا هەست دەکرێ سەرچاوەی ئەو پڕۆپاگەندە یەك لەدوایەکانەی چاپەمەنییە رووسیەکان بێ کە لەبارەی کۆلۆنیل لۆرەنسەوە بڵاودەبنەوە.

دەڵێن پێویستە ئەو سەرکردەیە زۆر بەتوندی وریابکرێتەوە کە پەیوەندییەکانی بەرووسەکانەوە بپچڕێ.

٢٠- ئەم زانیارییانە لەیەکێك وەرگیراون کە هەفتەیەك لە ئاراڕات بوو و، لەوێوە هاتبوو و، خۆی ئەو شتانەی دیبوون، ئەم هەواڵانە سێ هەفتەیەیان بەسەردا تێپەڕیوە، چونکە فارسەکان ئەم پیاوەیان، کاتی گەیشتنی، دوو هەفتە زیندانی کردبوو.

٢١- ئەم هەواڵانەم ئەمڕۆ لەو بەڕێزەوە پێگەیشت کە وەك کونسوڵی ورمێ رامسپاردبوو.

٢٢- تائێستا سەرباز دەنێردرێتە ماکۆ.

٢٣- کۆپی ئەم نووسراوە بۆ باڵوێزی خاوەنشکۆ لە ئەنگۆرەو کۆمیساری باڵا لەبەغدا دەنێرم.

ستانهەوپ پاڵمەر

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل:٥٥، ژ:١/٧٢

***

## هاوپێچی (٢)ی ژ: ٨٣
## لە کونسوڵ پاڵمەرەوە بۆ سێر ئار. کلایف

**ژمارە: ١٤٧- نهێنی**

**تەورێز، ١٢ی ئابی ١٩٣٠**

دەمەوێ پێتان رابگەیەنم کە دەوروبەری (٩)ی ئاب شەڕێکی قورس نزیک بە ماکۆو سنووری تورکیا لەنێوان سەربازانی ئێران و کوردانی جەلالیدا، کە ئێرانییەکان فەرمانیان پێدرابوو نەهێڵن بپەڕنەوە ئاراڕات، بەرپابوو.

٢ـ کوردەکان، بەدڵنیاییەوە، بێ زیان نەبوو، بەڵام (١٠٠)سەد سەربازو چوار ئەفسەری فارسیش کوژراون.

٣ـ گومانی تێدانییە ئەفسەرێکی ئاغاسی (Aghasi) ناوی ئەرمەن کە کاتبی دووەمم دەیناسی، کوژراوە.

٤ـ سەربازەکانی ئێران هەوڵی شاردنەوەی زیانەکانیان دەدەن، بۆیە ناتوانم لێیان بپرسم. بەهەر حاڵ، چەنەڕاڵ، چەند رۆژی پێشوو، لە ماکۆ بووە.

٥ـ بەم دواییە، (٥٥٠)و دوێنێ (٢٠٠) سەربازو (١٠و١١)ی مانگیش (٣) تۆپی دەشتو (٦)ی شاخو (١٠) رەشاش لێرەوە نێردراونە ماکۆ.

٦ـ ژمارەی سەربازانی ئێران بەگشتی لە هی چەکدارانی کورد کەمترە.

٧ـ وێنەی ئەم راپۆرتە بۆ باڵوێزی خاوەنشکۆ لە ئەنگۆرەو کۆمیساری باڵای خاوەنشکۆ لە بەغدا دەنێرم.

ستانهەوپ پاڵمەر

***

## هاوپێچی (٣)ی ژ: ٨٣
## لەکونسوڵ پاڵمەرەوە بۆ سێر ئارِ. کلایڤ

**ژمارە: ١٥٠**

**تەوریز، ١٩ی ئابی ١٩٣٠**

**گەورەم،**

پێم باشە لەم زانیارییانەی وا بەڕێز ئەردەروونی (Mr. Ardaroony) لە پیاوێکەوە کە چەند ڕۆژێك لەمەوبەر ماکۆی بەجێهێشتبوو، وەریگرتوون، ئاگادارتان بکەم.

٢ـ بۆ ئەوەی لە ڕووداوەکان تێبگەن، پێویستە سەرەتا کەمێك ڕوونکردنەوەی جوگرافی بخەمەڕوو، کە هیوادارم یارمەتیدەر بێ بۆ شیکردنەوەی ستراتیجی تورکیا.

٣ـ گوندێك بەناوی "ئارالیك"ەوە، لەسەر نەخشە، لەنزیکی ڕووباری ئاراسدایە، بەڵام هەر ئەو ناوە هی ئەو دەشتەیشە کە لەنزیکی ئیغدیرەوە بەرەو باشووری ڕۆژهەڵات و نێوان ئاراڕات و ڕووبارەکە درێژ دەبێتەوە.

٤ـ وا دەردەکەوێ تورك دوو ئامانجی هەبێ کەبریتین لە:

أـ ڕاونانی کوردەکان بەرەو ئێران، کە پێشبینی دەکرێ ئێرانییەکان لەوێ چاریان بکەن.

ب ـ ناوچەی ئاراڕات لەم پرۆسەیەدا پاك بکەنەوە.

٥ـ هێزە سەرەکییەکانیان بەدرێژایی هێڵی ئیغدیر– بایەزید مۆڵداوە، کەچی لە سەرەوەی ئاراڕات تەنها دووبنکەی بچووکی دەشتی ئارالیکیان هەیە.

شاخی ئاراڕات بەلای کەمەوە لەسێ لاوە گەمارۆدراوە، بەڵام بەری باکووری زۆر بەهێز نییەو، هێزی گەڕۆکیش جارجار لەنێوان بایەزیدو ئارالیکدا بەیەك دەگەن. شاری بایەزید بەپێی هەواڵ، بەردەوام لەدەست تورکەکاندایە.

٦ـ دیارە قوماندانی تورك دەركی كردووەكە پۆستەكانی دەشتی ئارالیكی بێ هێزن، بۆیە ئێستا دەڵێ داوای هاوكاریی رووسەكانی كردووە.

٧ـ سێیەم هەفتەی مانگی تەمووز (٥٠٠) سوارەیەكی رووس دابەزینە دەوەلوو (Davallu)[1]ی نزیك رووباری ئاراس‌و، دوو رۆژ مانەوەو، شەو ون بوون. گوندنشینانی دەوەلوو لەو باوەڕەدان كە پەڕیونەوە بۆ ناو خاكی توركیا، بەڵام هیچ بەڵگەیەكیان نییە ئەمە پشت راست بكاتەوە.

٨ـ فەرماندەیی رووسی سوپای ئەرمینیای سۆڤیەت لە ئەلێكساندراپۆل (Aleksandrapol) واتە لێنینەكان ( Leninakan)[2]ی ئێستادایەو، لەوێوە (٤٥) بنكەی سەربازی بەدرێژایی، رووباری ئارپەچایی (Arpa- chai)[3] تا ئانی (Ani)[4] كە لەگەڵ ئاراسدا یەكدەگرێو، ئەمجا بەدرێژایی رووباری ئاراس تا ماغری[5] (Maghri) لەهەرێمی چاپان (Chapan)ی زەنگیزوور (Zengizur) بڵاوبوونەتەوە. سوارە بە كۆمەڵی (٢٠-٢٥) كەسی لەنێوان هەردوو بنكەیەكدا وەك هێزی گەڕۆك دەردەچن‌و، شوێنە تەنكاوەكانی رووبارەكانیش بەتەلی دڕكاوی گیراون‌و، دەیشڵێن شەوان سەگی پاسیان تێدا دەبەستنەوە.

٩. سەرجەم هێزە رووسەكانی ئەرمینیا (٩-١٠) هەزار كەسن‌و، گشتیان سوارەن. دەڵێن دوو بنكەی نهێنییان، كەپێشبینی دەكرێ تۆپخانە یا جبەخانە بن، لەدەوەلوو هەیەو، نایەڵن كەس لێیان نزیك ببێتەوە.

---

[1] شارۆچكەیەكی باشووری شاری ئەریڤانە نزیكی سنووری ئەرمەنستان– توركیا. (س)

[2] شارێكی باكووری رۆژاوای ئەرمەنستانە نزیكی سنووری توركیا. ئێستا (گومرو)ی ناو. (س)

[3] كەوتووەتە سەر سنووری نێوان توركیا– ئەرمەنستان لە بەشی باشووری رۆژهەڵاتی ویلایەتی قارس‌و، تێكەڵ بە ئاوی ئاراس ئەبێ. (س)

[4] شارێكی كۆنی ئەرمەنستانە، بوومەلەرزەی ساڵی ١٣١٩ وێرانی كرد. دارو پەردووی لەسەر كەناری رووباری ئارپەچاییە. سەدەی هەشتەم كەوتە بەر حوكمی خولەفاو، سەدەی (١٠-١١) بووە پایتەختی ئەرمینا. مەمالیك ساڵی ١٠٦٤ داگیریان كرد (المنجد في الاعلام، ص ٥). (س)

[5] رەنگە (چاغری) بێ كە شارۆچكەیەكی بەشی باشووری رۆژهەڵاتی ئەریڤانە. (س)

١٠. رووسەکان تورکیان دڵنیاکردوەتەوە کە ئەگەر هاوکاریی برگەی (٧)ی سەرەوەیش پێشکەش نەکەن، ئەوا بەوردی چاودێریی سنوورەکە دەکەن.

١١. شالاوی پێشووی بایەزید، کە لەبڕگەی (٥)ی نووسراوی ژمارە (١٤٥)ی (١١) ئابمدا ئاماژەم پێکردوە، بەڵگەی ئەوە بەدەستەوە نەبوو کە تەواو سەرکەوتووبووە، هەرچەندەبووە مایەی پێکدادانی (٩)ی ئابی ئێران و کورد (نووسراوی ژمارە ١٤٩م) سەربازی بنکەکانی ئارالیك (٥)ی ئاب هێرشێکی تریان دەست پێکرد، بەلام پێیان وتم بەرپەرچ دراونەوەو، بنکەکانی خۆیشیان لەدەست داوەو، بەئاراسدا راونراون. ئەمەم لەبڕگەی (١٢)ی راپۆرتی ژمارە (٤٩) مدا نووسیوە.

١٢. لەسەرچاوەیەکی تریشەوە پێم راگەیەندرا کە فەوزی پاشای سەرۆکی ئەرکانی تورك خۆی، ئێستا سەری لە بەرەکانی شەڕ داوە.

١٣. جەنەڕاڵ زەفرەلدەولە هەر دوای دەستپێکردنی کارە سەربازییەکە پێی وتم: پێی وایە تورك ئارالیك داگیردەکات، بەلام ناتوانن ماوەیەکی درێژی تێدا بمێننەوە. کاتی خۆی ئەم رایەم پێ‌ڕاگەیاندن.

ماکۆ

١٤. ئەو کەسەی کەزانیاریەکانی دامێ، پێی وانەبوو کۆمسیۆنی سنووری تورکیا هێشتا دەست بەکاربووبێ.

١٥. ئێرانیەکان سنوورێکی زۆریان هەیە کە دەبێ کۆنترۆڵ بکرێن، چونکە کوردەکان تەنها بەرەو ماکۆو بولاقباشی سنوور نابەزێنن، بەڵکو چەندین میل بەرەو باشوور دێن تا خاڵێکی پاس نەکراو بدۆزنەوە.

هەرێمی باشوور:

١٦. ئێرانییەکان پێیان راگەیاندم کە پشتێنەیەکیان لە سابلاخەوە تا سەقز دروست کردووە.

١٧. وێنەی ئەم نووسراوە بۆ کۆمیساری بالای خاوەنشکۆ لە بەغداو، بۆ بالوێزی خاوەنشکۆ لەئەنگۆرە نێردراوە.

ستانهەوپ پالمەر

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ٥٧، ژ: ٣/٧٢

ژ: ٨٤

## لە مستەر هێلمەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن( ٣ی ئەیلوول گەیشتووە )

**ژمارە: ٣٣٥**

**قوستەنتەنییە، ٢٧ی ئابی ١٩٣٠**

**گەورەم،**

دەمەوێ پێتان رابگەیەنم کە خوسرەو بەگی بالۆێزی نوێی تورکیا لە تاران، (٢٥)ی ئەم مانگە بەرەو جێی کارەکەی کەوتەڕێ. خوسرەو بەگ، کاتی ئۆغرکردنی، لە چاوپێکەوتنێکدا پێی لەسەر ئەوە داگرت کە پەیوەندییەکانی تورکیا– ئێران زۆر دۆستانەیەو، هەروەها وای نیشان دا کە بڕوای وایە گرفتەکانی سنوور، هەرزوو وپاش ئەوەی دەگاتە تاران، چارەسەر دەکرێن.

٢. دوێنێ شەو گفتوگۆیەکم لەگەڵ کارهەڵسووڕێنی ئێراندا کرد کە چەند رۆژێك بوو هاتبوە قوستەنتەنییە. سەعید خان ناڕەزایی خۆی لەو ڕاپۆرتە وریاکەرەوانەی ئەم دواییەی چاپەمەنیەکانی ئەورووپا دەربڕی‌و، وتی لەڕاستییەوە دوورن. بەقسەی ئەو: سنوور نەبەزێنراوەو، دانوستان بەهێمنی بەڕێوە دەچێ‌و، هیواداریش بوو چەند رۆژی دواتر لەگەڵ وەزیری دەرەوەی تورکیادا رێك بکەون. حکومەتی تورکیا، وەك پێشتر ئاگاداربووم، گۆڕینەوەی خاك بەوجۆرەی کە هەموو ئاراڕات بکەوێتە سنوورییەوەو، هاوکات ئۆپەراسیۆنی هاوئاهەنگی دژی کوردانی پێشنیارکردبوو. حکومەتی ئێران بەئاگاوە خۆی لەوەڵامی پێشنیاری یەکەم بواردبوو و، پاشتریش ئاماژەی پێنەدرا. سەعید خان دڵنیا نەبوو کە حکومەتەکەی ئەتوانێ دەست لەو پارچەیەی خاکەکەی هەڵگرێ، بەڵام وای هەست دەکرد خوسرەو بەگ بچێتە تاران‌و، تەگبیری تازەی بۆ کرابێ کە هەموو هەوڵێك بخاتەگەڕ تاکو سنوور، بەوشێوەیەی کە مەبەستیانە، دیاری بکرێتەوە.

٣. حکومەتی ئێران بۆ وەڵامی دووەمیش رایگەیاندووە کەناتوانێ رازی بێ سەربازانی تورك بچنە ناو خاکی ئێرانەوە یاخود ئەوانەی ئێران بێنە تورکیا. سەرباری ئەمەیش، ئێران پێشنیاری هاوکاری و کاری سەربازیی هاوکاتی هەردوو دیوی سنوورەکەی کردووەو، سەعید خان ئومێدەواربوو چەند رۆژێکی‌تر رێکەوتنێك لەگەڵ وەزیری دەرەوەی تورکیادا گەڵاڵە بکەن.

٤. سێ چوار هەزار کەس، بەڕای سەعید خان، ئێستا لە ئاراراتا گەمارۆدراون‌و، هیچ کۆمەکێکیان پێ ناگات. سەرەڕای ئەمەیش حکومەت شەڕێکی لەدژیان بەرپاکردووە. ئەم شەڕە خەرجییەکی زۆری دەبێ، جەنەڕاڵ وینتەر ( Winter) بەم زووانە سەرکەوتنێکی تەواو بۆ تورکان دەستەبەر دەکات‌و، رەنگیشە کە هاوکاریی تورکیا- ئێران رێك خراو بەر لە هاتنی وەرزی زستان، لێبوردن بۆ ئەو کوردانە دەربکات کە ماوەیەکە گەمارۆ دراون‌و، ئەوانەیش لەناوببات کە نەیانتوانیوە گەمارۆیان بدەن‌و، لەبەرزاییەکانەوە هێرشی بەکۆمەڵیان کردووە. سەربازانی تورك لەدیوی خۆیانەوەو،هی ئێرانیش لەدیوەکەی ترەوە سەرجەم بنکەکان کۆنترۆڵ دەکەن‌و، بەم جۆرە ئەم بزووتنەوەیەی کوردیش دادەمرکێنرێتەوە.

وێنەی ئەم نووسراوەم بۆ نوێنەری خاوەنشکۆ لە تاران ناردووە.

ئالیکس کەی. هێلم

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ت: ٤٩-٥٠، ژ: ٦٨

## ژ: ٨٥
## لە (میەید)ی بریکاری کونسوڵەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن (١٣ی ئەیلوول گەیشتووە)

**ژمارە : ٦٨ نهێنی**

**حەڵەب، ٢٩ی ئابی ١٩٣٠**

**گەورەم،**

ئامـاژە بەنووسـراوی ژمـارە( ٦٤)ی (٢٤)ی ئـابم لەمـەڕ سـەرهەڵدانی کـوردان، خۆشحاڵم چەند زانیارییەك لەبارەی ئەو بۆچوونە بڵاوانـەی حەڵەبـەوە بەرزبکەمـەوە کە ڕەنگە ڕاستو جێی بایەخ بن. ئـەو کەسـەی کـە زانیاریـەکانی داومـێ، کوردێکـی ناسراوەو، کەسێکی بڕواپێکراوو بێلایەنە.

٢. سێ ڕێکخراوی کوردی هەن.

ا. تەعالیی کورد: لە کوردستانی باکوورەو، کوڕانی شێخ سەعیدی لـەخۆگرتووە. دەڵێن ئەم ڕێکخراوە پەیوەندیی توندو تۆڵی بەبۆڵشەڤیکەکانەوە هەیە.

ب. خۆیبوون: لە سووریایەو، نووسـینگەی سـەرکردایەتیی لـە بەیرووتـەو، داوای هاوکارییان لە ڕێکخراوی تاشناق (Tachnack)ی ئەرمەنی کردووە.

ج. خەلاسکەران: لە تورکیاو ئێراندایـەو، ژمارەیـەك تـورکو فـارس ئـەندامی ئـەم کۆمەڵەن.

٣. کوردانی سووریا، ئاسایی، بایەخ بە پێشکەوتنی ئەم ڕاپەڕینە دەدەن. لەگەڵ ئەمەیشدا، یاخییان پشتگیریی تەواو ناکرێن، چونکـە سـەرهەڵدانەکە بنـەمای دینـی، نەك سیاسیی هەیەو، کوردی سوریایش چاوەڕێو ئاواتەخوازی بەرزبوونەوەی بانگی سـەربەخۆییە. هاوکـات دەزگـا فەرەنسـییەکانیش، خۆیـان بـۆ سـەرکوتکردنی هــەر جموجۆڵێك ئامـادە دەکـەن. ئەگـەرچی هـەواڵی پـەلاماری سـنوور لەئارادایـە، بـەلام پێدەچێ چالاکییەکەی سوریا پڕۆپاگەندەبێ.

٤. کوردانی تورکیای نزیك بەسنووری سووریا، بەپێی هەواڵ، دەیانەوێ یارمەتی پێشکەش بکەن. لێرەیشدا تورکان چەكو تەقەمەنیی تەواویان بۆ پارێزگاریی هەرێمەکە نەناردووەتە دیاربەکر. خۆ کوردەکانیش هەر بەشەرکەر لەدایك نەبوون، بۆیە شەڕی ئاشکرا ناکەن و، کاری نهێنییان، وەك هەوڵدان بۆ بەرزکردنەوەی ورە لە سووریا، پێباشترە.

٥. لەمانەیش زیاتر، وادیارە یاخییان پەیوەندیی توندو تۆڵیان بە بۆلشەڤیکەکانەوە هەیەو، ئەمانیش تەنها پێداویستەکانیان بۆ دابین دەکەن، بەلام بریتانیەکان هاوکارییان نەکردوون. کوردەکان لێرە باوەڕیان وایە کە "خەلاسکەران" چالاکانە لە هەوڵی داواکردنی هاوکاریی بریتانیادا بن.

٦. فەوجی (٥٣)ی تورك، بەپێی هەواڵەکانی ئێرە، پەیوەندیی بەیاخییانەوە کردووەو، سەرەنجام تورکەکان لەگشت بەرەکانی شەڕدا شکستیان هێناوە. بۆیە تورکان بەنیازن هێزەکانیان کۆبکەنەوەو، هێرشێکی سەرتاسەری ببەن.

٧. وێنەی ئەم نووسراوە بۆ باڵوێزی خاوەنشکۆ لە ئەستەمبووڵ بریکاری کونسوڵی گشتیی بریتانیا لە بەیرووت و کونسوڵی خاوەنشکۆ لە دیمەشق دەنێرم.

جیفری میەید

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٢/٤٢٤، ل: ٧١، ژ: ٨٣

ژ: ٨٦

## لەسێرئار. کلایڤەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن (١٨ی ئەیلوول گەیشتووە)

ژمارە: ٤٣١

گوڵحەق، ٣ی ئەیلوولی ١٩٣٠

گەورەم،

مەمدووح شەوکەت بەگی باڵوێزی تورك، (٣١)ی ئاب تارانی بەجێهێشتو، چەند ڕۆژێکیتر جێگرەوەکەی ئاشکرا دەکرێ.

٢. مەمدووح شەوکەت ڕۆژێك پێش ئەوەی تاران بەجێ بهێڵێ، ماڵئاوایی‌ی کـردو، هۆی بانگکردنەوە، یان دەست لـەکار کێشـانەوەکەی ڕوونکـردەوە. هـەروەها وتـی: ڕاگەیاندنی ڕەسمی‌و هەواڵی وەگـیراوی قوستـەنتەنییەو ئـەنگۆرەی چاپەمەنیـەکان، ئەگەر تەواو لەڕاستیشەوە دوور نەبن، ئەوا هـەر زۆر زیادە ڕۆییـان تێدا کراوە. بـە نموونـەی هێنایـەوە کـە هیـچ ئینزارێك نەدراوەتـە حکومـەتی ئـێران، کـەچی بـەپێی ڕۆژنامەکان: کاربەدەستانی ئەم وڵاتە سێجار زیاتر ورياکراونەوە. هەروەها جـەختی لەسەر کردەوە کەتاکە سەربازێکی تورك نەهاتوەتە ئێرانەوەو، حکومەتی تورکیایش هەرگیز هەڕەشەی بەزاندنی سنووری نەکردووە. ئەمجا لێم پرسی: حکومەتی تورکیا گلەیی لە حکومەتی ئێران هەیە؟ لەوەڵامدا وتی:

هیچ گازەندەیەکیان نییە، ئـەوە نـەبێ کـە چوارسـاڵ لەمەوبـەر دوو سـەرکردەی ناوداری کوردی تورکیا لەبەری ئێرانی سنووردا جێگـیربوونو، سـەرباری نـاڕەزایی‌ی چـەند بـارەی حکومـەتی تورکیـاو بـەڵێنی دەوڵـەتی ئـێران، هـەنگاو بۆ ڕاماڵینییـان نەنراوە. لەلایەکی ترەوە، دیاریکردنەوەی سنوور، بەپێی قسەی ئەو، بۆ تورکیـا زۆر گرنگ بوو، چونکە ئەمە وادەکات ئەم وڵاتە بتوانێ لـەئایندەدا کۆنـترۆڵی ڕۆژهـەڵاتی ئـاراراتی بچووك بکـات. ئـەمجا بـە هـەر فێڵوتەڵەکەیـەك بـوو، پرسـیم: ئایا بـانگ کراوەتەوە یان دەستی لەکارکێشـاوەتەوە؟ ئـەو وتـی: دەسـتی لەکارکێشـاوەتەوە.

ناوەڕاستی هاوین بیروڕاکانی ئەم لەگەڵ ئەوانەی حکومەتەکەیدا نەدەگونجان. دڵنیای کردمەوە کە حکومەتی تورکیا ئێستا لە هەلومەرجەکە گەیشتووەو، هیچ هۆیەك بۆ ناکۆکیی هەردوو حکومەت لەئارادانییە. هاوکات بە ڕۆیشتنیشی خۆشحاڵ بوو. پێنج ساڵ بوو لێرەبوو و، پیشەیشی کاری دیپلۆماتی نەبوو و، پێی خۆش بوو دوایی پۆستێکیتر وەربگرێ (هێندەی من بزانم حەزی لە کاری باڵوێزی دەکرد لە مۆسکۆ). زۆر بەختیاربوو بەئارامی لەگەڵ خێزانەکەیدا لە قوستەنتەنییە بژی. حەزیشی بەتوێژینەوەی مێژوو و ئیتنۆلۆجیا ( ڕەگەزناسی مرۆڤ) دەکرد.

٣. دواجار لێم پرسی: پێی وایە حکومەتی سۆڤیەت ماسی لە ئاوی لێڵدا ڕاوبکاتو، ئەم هاوینە هۆکاری نائارامیی نێوان تورکیاو ئێران بووبێ؟ ئەو تەواو نکۆوڵیی لەمە کردو، پێی داگرت کە کوردەکان لەدیوی رووسیای سنوور ئارامن، ئەگەرچی ئەرمەنیەکان وەك هەمیشە سەرچاوەی مەترسی بوون. بۆیە هیچ پاساوێکی وەهای نەبوو، تاواهەست بکات کاربەدەستانی سۆڤیەت کاریان بۆ کێشە نانەوە کردبێ. ڕێتێدەچێ ئەمە ڕاست بێ، بەڵام مەمدووح شەوکەت کە هاوڕێیەکی دڵسۆزی (داڤتیان) ناوی باڵوێزی ئێرەی سۆڤیەت بوو، سۆزێکی زۆری بەرامبەر رووسەکان هەبوو.

٤. دوێنێ نیوەڕۆ کە سەردانی تەیموور تاچم کرد، لە بەڕێزیم پرسی: ڕای لەبارەی کێشەی ئەم دواییەی کوردەکانەوە چییە؟ سەرەتا بەگشتی لە سیاسەتی تورك دواو، ئاماژەیشی پێکرد کە عیسمەت پاشا خوێرییەکی نمونەییەو، بووەتە مایەی وروژاندنی زنجیرە ڕاپۆرتێکی زیادەڕۆی چاپەمەنیەکانی قوستەنتەنییە بۆ قایمکردنی جێپێی.تۆفیق روشدی بەگ، هەرگیز مەسەلەکەی بەجیدی وەرنەگرتووە. وەزیری دەرەوەی تورکیایش بەهیچ ڕازینییەو، ئامادەیە هەرساتێك سیاسەتێکی جیا بگرێتەبەر، بەڵام کێشەکەی ئەوەیە کە لە تێڕوانینی غازی ناگات، چونکە غازی لەلایەکەوە هیچی بۆ ڕاگرتنی ئەم پرۆپاگەندانەی دژی ئێرانی چاپەمەنیەکان نەکردووەو، لەلایەکی تریشەوە زۆر بەشانو باڵی دۆستایەتی تورکیا-

ئێراندا هەڵدەدات. سەبارەت بە دەست لەكار كێشانەوەی مەمدووح شەوكەتیش، وتی: بێگومان ئەمە دەرهاویشتەی دژایەتیی ئەركانی گشتیی توركیایە كە تاوانباریان كردووە بە كاركردن بۆ قازانجی ئێران‌و پشتیوانی نەكردنی سیاسەتی وڵاتەكەی لە كوردستان.

٥. ئەمجا بەڕێزی باسی سیاسەتی هەرسێ دەوڵەتی توركیاو ئێران‌و عێراقی‌كرد بەرامبەر بەكورد. وتی سیاسەتی هەرسێ دەوڵەت لە بنچینەوە لەیەكتر جیان حكومەتی توركیای سایەی عیسمەت پاشا، دەیەوێ كورد لەناوببات. هەڵبەت ئەمەیش كارێكی مەحاڵە، چونكە كەس ناتوانێ گەلێك لەبەین بەرێ. سیاسەتی ئێرانیش، بەڕای ئەو، زوو وابووە كە شتەكان وەك خۆیان بەجێ‌بهێڵێ. ئەوان هیچیان بۆ كوردان نەكردووەو، هاوكات بێزاریشیان نەكردوون. حكومەتی عێراقیش كە بە ئامۆژگاریی بریتانیەكان دەجووڵێتەوە، سیاسەتی رێگەدانی كوردان بە بەكارهێنانی زمانەكەیان‌و، كردنەوەی قوتابخانەو، هەوڵدان بۆ بەرزكردنەوەی ئاستی بژێوییان پێڕەو دەكات. ترسی هەبوو ئەم سیاسەتە لەدواییدا كارێكی خراپ لە كوردانی توركیاو ئێران بكات. وتی: ئەگەر خۆیشی كوردێكی ئێران یان توركیا بوایە، ئەوا هەروەك ئەوان پشتیوانیی ئەم سیاسەتەی عێراقی دەكرد. جابۆیە بەدوودڵییەوە لە ئایندەی دەڕوانی‌و، هەرئەمەیش، بەقسەی ئەو شای تووشی دڵەڕاوكێ كردووە. هەرچەندە دەشێ حكومەتی عێراق پشتیوانی كوردستانێكی یەكگرتوو نەكات، بەڵام ئەم سیاسەتەی ئێستای هەنگاوی یەكەمە بەو ئاڕاستەیە. بەڕێزی وتی: ئەو قسانەی خوێندووەتەوە كە میجەر (رائید) یۆنگ‌و جەعفەر پاشا، بەم دواییە، لە سلێمانی كردبوویان، بەڵام چونكە هەستی بەدڵسۆزیی حكومەتی عێراق‌و راوێژكارە بریتانیەكان، بۆ ئەم مەسەلەیە، كردبوو، حەزی‌دەكرد لە بۆچوونی خۆی ئاگادارم بكاتەوە. هەروەها هاوڕای مەمدووح شەوكەت بوو لەبارەی راستیی حكوومەتی سۆڤیەتەوە لەمەڕ ئەم مەسەلەیە، بەڵام لەگەڵ ئەمەیشدا لە ئەرمەنییەكان بەگومان بوو.

٦. دواجار، مەسەلەی دیاریکردنەوەی سنوورم لە ئاراراتی بچووك لەگەڵدا کردەوەو، لێیشم پرسی: ئایا ئەم داواکردنە بەڕەوا دەزانێ؟ وتی: ئامادەنییە رای خۆی لەم بارەیەوە دەربڕێ، بەڵام ئاماژەی پێدا کە ئەرکانی گشتیی ئێران بەتوندی دژایەتیی هەر ئیمتیازێکی لەوهەرێمەدا کردووە بۆ تورکیا. دیارە ئەمەیش لەبەر پێگەی ستراتیجیو نارەزایی‌ی کوردەکانە لەم دیاریکردنەوەیەدا کە تورکیا مەبەستیەتی، جگە لەمەیش تاوانەکە بەگشتی دەکەوێتە ئەستۆی حکومەتی ئێران.

ئار. ئێچ. کلایف

*******************

**(٥)ی ئەیلوول**

کاتێ ئەم نووسراوەم نووسی، وێنەیەکی نووسراوی ژمارە (٩٣٩)ی (١٤) ئابی پاریسم پێگەیشت.

دەزانم (علاء)ی نوێنەری ئێران لە پاریس سەرقاڵە، بەڵام پێویستە سەردانی هاوینی (١٩٢٩)یتان بۆ لەندەن بیربهێنمەوە. هەنگاوی بێهۆی دیپلۆماسیی ئەم دواییەی، بێهیچ رێنوێنییەك، لەسەر توندیی راگەیاندنی رەسمیی چاپەمەنیەکان کە ئێستا دەزانرێ هەڵەو تێکدەر بووە، سەرسامی کردم.

وێنەی ئەم نووسراوە بۆ باڵوێزی خاوەنشکۆ لە قوستەنتەنییە، حکومەتی هیندستانو کۆمیساری باڵا بەوەکالەت لەعێراق دەنێرم.

**(٨)ی ئەیلوول**

برووسکەی (٧)ی ئەیلولی پەیامنێری تاران بۆ تایمز (Times) تایبەت بە Foreing[1]هاوپێچ دەکەم.

ئار. ئێچ. سی.

وەزارەتی دەرەوە ٢٧٣/٤٢٤، ل: ٧٢–٧٣، ژ: ٨٥

---

[1] ئەمە زیاتر پێدەچێ Foreign و مەبەست لێی کاروباری دەرەوە بێ.

ژ: ٨٧

**لە سێرجی کلارکەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن**

**ژمارە: ٩٠**

**قوستەنتەنییە، ١٧ی ئەیلوولی ١٩٣٠**

**برووسکە را پۆرت**

**نووسراوی ژمارە (٣٣٥)ی مستەر هێلم.**

چاپەمەنیەکان دوو رۆژی رابردوو دامرکاندنەوەی تەواوی کوردانی هەرێمی ئاراراتیان راگەیاند. زانیاریی دروست لەبەردەستدانییە. بەڵام گوتەکەی سەرۆکی ئەرکانی گشتی، رەنگە ئەم هەواڵە پشت راست بکاتەوە. ناوبراو ئەو قسانەی لەکاتێکدا کرد کەبەناو بۆ سیواس و، بەڵام لەڕاستیدا وەك رۆژنامەکان دەڵێن، بۆ بەرەکانی شەڕی هەرێمی رۆژهەڵات دەچوو و، سەرۆك وەزیر خوا حافیزیی لێ کرد.

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ٧٢، ژ: ٨٤

****************

ژ: ٨٨

**لەسێرجی. کلارکەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن( ٢٣ی ئەیلوول گەیشتووە)**

**ژمارە: ٣٦٤**

**قوستەنتەنییە، ١٨ی ئەیلوولی ١٩٣٠**

**گەورەم،**

لەبرووسکەی ژمارە (٩٠)ی (١٧) ئەیلوولمدا ئاگادارم کردنەوە کە ئۆپەراسیۆنەکانی دژی کورد لە هەرێمی ئارارات، بەپێی راگەیاندنی رەسمیی حکومەتی تورکیا، دوایی هاتوون.

٢. لێرەدا دوو راپۆرتی تایبەت بەم مەسەلەیەی پاشکۆی سەربازی باڵوێزخانەی خاوەنشکۆ، کە بۆ منی ناردوون، هاوپێچ دەکەم. یەکەمیان باسی دوا ئۆپەراسیۆنەکان دەکات کە (٥) رۆژیان خایاند. رائید ئۆلێری، لە دووەمیشیاندا، بەکورتی دیمەنێکی گشتیی جوڵانەوەکەی کوردان‌و، رێوشوێنی حکومەتی تورك بۆ بەرەنگار بوونەوەی دەخاتەڕو. زانیاریی دروست بەدرێژاییی ماوەی ئۆپەراسیۆنەکان دەست نەدەکەوتن، چونکە راپۆرتی رۆژنامەکان، بەشێوەیەکی بەدناو، جێی متمانەنین‌و، سەرچاوەی‌تری زانیاری لەو بارودۆخە تایبەتەدا کە باڵی بەسەر رۆژهەڵاتی تورکیادا کێشابوو، شك نەدەبرا. واهەست دەکەم، لەبەر ئەوە، راپۆرتەکەی رائید ئۆلێری جێی بایەخ بێ، چونکە تۆمارێکی بڕواپێکراوی رووداوەکانە.

٣. حکومەتی تورکیاو چاپەمەنیەکان بەسەرکەوتنی ئۆپەراسیۆنەکەیان دڵخۆشن، چونکە بێگومان کێشەی کورد لەهاوینی رابردوودا تووشی دڵەراوکێی زۆری کردوون. وا زستان لەو ناوچە شاخاوییە نزیك دەبێتەوەو، ئیتر رێیتێدەچی ئارامی بۆ ماوەیەك سەقامگیر بێ، بەڵام پێدەچێ یاخیبوون‌و ناسیونالیزمی کورد جارێکی دی سەرهەڵبدەنەوە. خۆنەگەر حکومەتی تورك جێگرەوەیەکی ژیرانە بۆ سیاسەتی توندوتیژی ئەم دواییەی سەرکوتکاری دانەنێ، ئەوا پرۆسەی " بەتورككردن"ی کورد، وەك ئەمڕۆ دەردەکەوێ، ئاسان نابێ‌و، ملکەچ کردنیشیان بەئاکام ناگات.

٤. وێنەیەکی ئەم نووسراوەم بۆ نوێنەری خاوەنشکۆ لە تاران نارد.

جۆرج. ئار. کلارك.

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٢/٤٢٤، ل: ٧٤، ژ: ٨٦.

*****

## هاوپێچی (١)ی ژ: ٨٨
## لە رائید ئۆلێرییەوە بۆ سێرجی. کلارك

ژمارە: ٨

قوستەنتەنییە، ١٦ای ئەیلوولی ١٩٣٠

گەورەم،

خۆشحاڵم ئەوەتان پێ رابگەیەنم کەهێزە تورکییەکانی بە فەرمانی سالح پاشا، بەپێی هەواڵی رۆژنامە خۆجێییەکان کە لە برووسکەکانی ئاژانسی ئەنادۆڵەوە وەریانگرتوون، شکستێکی کاریگەریان بەسەر یاخییانی هەرێمی چیای ئاراراتدا هێناوە.

دوا قۆناغی ئەم کردەوە سەربازیانە، (٧)ی ئەیلوول، بەبزوانێك لە باکووری شاخەکەوە دەست پێکرا. سالح پاشا توانی (١٠)ی ئەیلوول بەرزاییی نێوان هەردوو ئاراراتی گەورەو بچووك داگیربکات. ئەمجا کوردەکان بەرەو باشووری رۆژهەڵات، چەندین کوژراویان پاش خۆیان بەجێهێشتووە. دەڵێن ئێستا هەموو جۆرە بەرگرییەك کۆتاییی هاتووە.

مارشاڵ فەوزی پاشا برووسکەی پیرۆزبایی بۆ سالح پاشا ناردو، بۆ ئەوەی ناوچەی ئارارات بپشکنێ، ئەنکەرەی بەجێهێشت.

لەگەڵ ئەوەی کەئەم دامرکاندنەوەیەی یاخیبوونی کوردەکان لەسەرچاوەیەکی رەسمییەوە وەرگیراوە، بێگومان هێشتا وەختی ئەوە نەهاتووە کە وابزانین ئیتر هیچ ئۆپەراسیۆنێك، بەر لەگەڕانەوەی هێمنی بۆ ویلایەتەکانی رۆژهەڵات پێویست نابێ.

بی. جەی. ئۆلێری

مەیجەر جی. ئێس

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ٧٤، ژ: ١/٨٦

* * * *

## هاوپێچی (٢)ی ژ: ٨٨
## لە رائید ئۆلێرییەوە بۆ سێرجی. کلارک

ژمارە: ٩

قوستەنتەنییە، ١٧ی ئەیلوولی ١٩٣٠

گەورەم،

کورتەی جموجۆڵی سەربازی مانگی شوبات بەرەو رۆژهەلاتی تورکیا، بۆ تەواوکردنی راپۆرتی ژمارە (٨)ی دوێنێم لەبارەی سەرکەوتنی هێزە تورکییەکانی بەرفەرمانی ساڵح پاشاوە، هاوپێچ دەکەم.

ئەم هەواڵە پێناچێ زۆر دروست بێ، چونکە لەگەڵ زۆر سەرچاوەدا بەراورد کراوەو، هەندێ پێشبینیشی تێدایە.

بی. جەی. ئۆلێری
مەیجەر جی. ئێس.

## هاوپێچی (٣)ی ژ: ٨٨
## پوختەی جموجۆڵی سەربازی لە رۆژهەلاتی تورکیا
## یاخیبوونی کورد، ساڵی ١٩٣٠

ئەم زانیارییانەی لای خوارەوە رووداوە سەربازییەکانی بەهارو هاوینی ئەمساڵی کوردستان، لە راپۆرتی ژمارەیەك سەرچاوەی جیاجیاوە کە متمانەیان لێك جیاوازە، وەرگیراون. بەڵام بەداخەوە هیچ زانیارییەکی ئەوتۆ لەمەڕ هۆیەکانی یاخیبوون و پەرەسەندنی و قۆناغەکانی سەرکوتکردن، هەرگیز لەلایەن هیچ راوێژکارێکی حکومەتی تورکیاو ئەرکانی گشتییەوە ئاماژەی پێنەکراوە. بۆیە، ئەوی دەکرێ تەنها خستنەرووی دیمەنێکی ئۆپەراسیۆنەکانە لەگشت سەرچاوەکانەوە. بەم جۆرە،

ئەگەرچی رەنگە درێژەی هەواڵەکە تەواو راست بێ، دیمەنەکە لەگەڵ بارە راستەقینەکەدا یەکدەگرێتەوە.

٢. لە یاخیبوونی ساڵی (١٩٢٥)ی کوردەوە، هەرچەندە چەند حاڵەتێکی جەردەیی نزیك بەسنوور روویانداوە، ویلایەتەکانی رۆژهەڵات ماوەیەك لە ئارامیدا بوون. پێناسەی شایستەی ناوچەی نێوان دیاربەکرو گۆلی وان، هەروەکو کۆتایی‌ی مانگی مایسی ئەمساڵ، بریتییە لە هێمنیی تەواو و وردە وردە هەنگاونان بەرەو شارستانێتی بەرپێبەریی ئیبراهیم تالع بەگ .

٣. خواستو ئامانجی کوردەکان لە ئارامی دوور بوو و، ژمارەیەك نارازی نەخشەی سەرهەڵدانێکی گشتییان کێشا. لەنێوان ئەو نارەزاییانەشدا، ئیراهیم تالع بەگی سەرۆکی کوردانی جەلالیو خالیس بەگی کوڕی شێخ عەبدولمەجیدو، سەلاحەدینی کوڕی شێخ سەعید، کە ساڵی (١٩٢٥) لەسێدارە درا، وکوڕانی کور حوسەینی سەرخێڵی حەیدەرانلی دیارو بەرچاون. ئاشکرانییە چۆن ئەم سەرکردانە رێك کەوتوونو، ناشزانرێ ئایا گشت ئەکەسانەی هاوکات لەیاخیبووندا بوون، بەشێك بوون لەپیلانە سەرەکییەکە یان نا؟! رەنگە کردەوەی توندی سەرکوتکاریی حکومەتی تورکیا هەندێ یاخییان لەبەشداری پەشیمان کردبێتەوەو، کوردانی تری ئارامیشیان والی کردبێ، پەیوەندی بەیاخیبوونەوە بکەن. هەرچۆنێك بێ، سەرەتای ساڵ هەوڵێکی زۆر لەرێی پرۆپاگەندەو هەرەشەوە درا بۆ ئەوەی، هێندەی بکرێ، تیرەو خێڵ لەبزووتنەوەکەوە بگلێنرێ.

٤. دەستگیرکرانی مانگی شوباتی خالیسو سەلاحەدینو سەرکردەیەکی بە مۆرهەڵکەن ناسراو، هۆی یەکەمی ئەم کێشەیەی کوردستان بوو. جەلالییەکان، هەرزوو ودوای ئەم رووداوە، کەوتنە پەلاماری گوندەکانی ناوچەی ئاراپات. خالیس هەڵاتو، چووە ناو خاکی ئێرانو، لەوێوە دەستی کردە هاندانی کوردان بۆ یاخیبوون، مانگی نیسان، چەند شەرێك لەنێوان سەربازانی حکومەتو یاخییاندا روویان داو، دەرەنجامەکانیشیان نادیار بوون.

٥ـ ئەركانی گشتی، ماوەیەك بەر لەمە، دەركی پێكرد كە بارودۆخەكە تاڕادەیەك مەترسیدارەو، پێش لەسەر ئەوە داگیرا كە پێویستە هەوڵی تەنها گەڕانەوەی نیزام نەدرێ، بەڵكو مەسەلەی كورد بۆ هەتا هەتایە دابمركێنرێتەوە، سوداد پاشای فەرماندەی فەیلەقی (٩)، بڕوای بەم كارە نەبوو، بۆیە بەساڵح پاشای قوماندانی فەیلەقی (٨)، كە پیاوێكی گەنجترو تواناتر بوو، جێی گیرایەوە. هێزێك لە تەشكیلە جیاجیاكانی جووتە فەیلەقی پێكەوەنراوی سەربازیی راهێنراو، دروست كراو، پۆلە فرۆكەیەكی سوپای تورك نێردرایە رۆژهەلات. هەردوو فەیلەقەكە خرانە بەر فەرمانی حوسەین و عومەر خالیس پاشا. سەرجەم هێزەكە بە (١٥٠٠٠) چەكدار مەزندە دەكرێ، ئەمە جگە لە ژمارەیەك یەكەیتر كە لە رۆژئاوای توركیا سازو تەیارن[1]

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل:٧٥، ژ: ٣،٢/٨٦

**ژ:٨٩**

**لە سێرجی كلاركەوە بۆ مستەر نێی هندرسن.. (٣ی تشرینی یەكەم گەیشتووە)**

**ژمارە: ٤٦١**

**گوڵحەق، ٢٣ی ئەیلوولی ١٩٣٠**

**گەورەم،**

ئاماژە بەنووسراوی ژمارە (٤٣١)ی (٣)ی ئەم مانگەم، پێتان رادەگەیەنم: رێزوان بەگ ئۆغڵوو خوسرەو بەگی باڵوێزی نوێی توركیا لە تاران، (١٥)ی ئەم مانگە نامەی متمانە (اوراق اعتماد)ی خۆی پێشكەش كرد.

٢ـ ئێران، لە چاوپێكەوتنێكی نوێنەرەكەیدا لەگەڵ خوسرەو بەگدا، رایگەیاند: بەرێزی ئاماژەی بە دیاریكردنەوەیەكی ئێستا جێی باسی سنووری توركیا ئێران

[1] بەشێكی ئەم بەڵگەنامەیە پێدەچێ لەخوارەوە پەڕیبێ.

کردووه، ئەو وتوویەتی، ئـەم دیاریکردنەوەیە، گۆڕینـەوەی هـەرێمی (ئاگری داغ)ی پارچە خاکێکی گڕکانیی بێ بایەخی بێ پیت بۆ ئێران، بـەخاکێکی بـەرەو باشووری بەپیتی پڕ قازانج بۆ ئەم وڵاتە دەبێ. تورکیا، بـەم ئاڵوگۆڕە، پێگەیـەکی بـەهێزی ستراتیجی بۆ راونان و سزادانی یاخییانی کورد بۆ خۆی دەستەبەر دەکات.

٣ـ وێنەی دوا راپۆرتەکانی تایبەت بەبارودۆخی کورد کـە لـە کونسوڵی تـەورێزی خاوەنشکۆوە پێم گەیشتوون، هاوپێچ دەکەم.

٤ـ وێنـەی ئـەم نووسـراوەم بـۆ حکومـەتی هندسـتان و بـاڵوێزی خاوەنشـکۆ لـە قوستەنتەنییەو وەکیلی کۆمیساری باڵا لە عیراق نارد.

جی. کلارك

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل:٨٠، ژ:٩٣

***

## هاوپێچی ژ: ٨٩

## بەشێك لە(رۆژانەی سیاسی و هەواڵی سەربازیی تەورێز)

## ژمارە (٨)ی (٧)ی ئاب- ٦ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠

**بارودۆخی کورد**

**لە تورکیا:**

١٤ـ پـاش خوێندنـەوەو بیسـتنی چـەند وتەیـەکی زیـادەڕۆی ژمارەیـەك تـورك، ئەوانەی کەسـانی شـارەزای وەك قەشـەی ئەرمەنییـەکان و بـەڕێز ئـەردەروونیم پێـی پەسـەندترە، کەبـەڕای ئـەوان: تـورك (٧٠٠٠–٨٠٠٠) چەکداری لـەدەوری ئـاڕاڕات و (٤٠٠٠)یشـی لەدەوریـەری باشـقەلعەو شـەمزینانەوە بـەرەو باشـوور، بـۆ بەرەنگاربوونەوەی یاخیبوونێکی نوێـی هەرێمەکـە، داناوە. هـەروەها (١٥) فڕۆکـەی هەن کە هاوکات زیاد لە (٥–٦)یان کاردەکەن، بەلای کەمەوە (پێنج)یان لێ خراونـە خوارەوە.

١٥- سەرجەم راپۆرتەکان دەریدەخەن: کوردەکان باش پرچەکن‌و، جیاجیا دەجەنگن‌و، تورکەکانیش سەرکەوتنێکی کەمیان بەدەست هێناوە.

١٦- هێرشێکی ئارالیك بەرەو، باشوور شکستی هێناو، تورکەکان تەنانەت دوو رەبیە سەرەکیەکەی دەشتی ئارالیکیشیان لەدەستداو، بەئاراسدا رووەو رووسیا راونران.

١٧- لەوێ مامەڵەی میوانیان لەتەکداکراو، چەکە لێ سەنراوەکانیان دانەوەو، دوو رۆژ دواتر بەرەو ئیغدیر گەڕانەوە.

١٨- لێرە باوەڕوایە روسەکان هاوکاریی تورك دەکەن. تەنانەت دەوترێ ئەو تەیارکردنەوەیەی هێزەکانی تورك، کەهێرشی سەرەوەیان پێکرد، لەخاکی ئەرمینیای کۆماری سۆڤیەتەوە دەست پێکراوە.

١٩- من بڕوام بەمەهەیە، چونکە هێزێکی نهێنی نەناسراوی سوارە دووشەو لە نزیکی دەڤالوو جموجووڵیان بووەو، وا هەست دەکرێ بەئاراسدا پەڕیبنەوە ئەم هێزە، بەپێی هەواڵ، روسی بووە.

٢٠- رووسەکان هێزی توانایان نزیك بە ئیغدیرو دەڤالوو بەدرێژایی‌ی ئاراس هەیەو، ئەوەیش دووبارە جەختی لەسەر دەکرێتەوە کەهێزەکانیان شەڕی کوردەکانیان کردووە.

٢١- (٣)ی ئەیلوول پێم راگەیاندرا، (٢٢)ی ئاب، تورك سێ هێرشی تری کردووەتە سەر ئاراڕات‌و، هەرسێ جارەکەیش شکستی خواردووە.

٢٢- جەنەراڵ ئاگاداری کردمەوە، دڵنیایە تورکان دەستیان بە گفتوگۆ کردووەو، خۆ ئەگەر ئەم هەوڵانە سەرنەگرن، کەڕێی تێدەچێ، ئەوا پێویستە شالاوەکە بەر لەمانگی نۆڤەمبەر رابگیرێ‌و، ئەمجا کوردەکانیش لە گوندەکانی داروسیۆوە درێژە بەهێرشەکانیان دەدەن.

ئەو تەواو پێشبینی دەکرد کە سەرتاسەری کوردستان، لەئاراڕاتەوە تا سنووری عیراق، بەهاری ئایندە چەك هەڵگرن.

٢٣ـ لێرە وای بۆ دەچن (سەرکەوتنەکان)ی نزیکی ئەرجیش و زیلانی تورك، لەراستیدا بەرامبەر بەکەمێك چەکدارو بێ چەکێکی زۆر بەدەست هاتوون.

## لە ئێران: هەرێمی باکوور

٢٤ـ سەعات (٤)ی بەرەبەیانی (٩)ی ئاب، باندێکی دووسەد- سێ سەد کوردی هەڵاتووی هەرێمی ئاراڕات پەڕینەوە بۆ ئێران و، هەوڵی گەمارۆدانی رەبیەیەکی بچووکی ئەو وڵاتەیان دا، ترسێکی زۆر لەئارادابووو، زۆرینەی سەربازان هەڵاتن. تەنها دوو ئەفسەرو دوو N.C.O بەرگرییان کردو، هەر چواریان کوژران.

هەر دوولا خۆیان سازدایەوەو، خالید ئاغای جەلالییش هاوکاریی کوردانی کرد، دواجار کوردەکان راپێچی گردەکانی نزیك ماکۆ کران، زیانی ئێرانییەکان، کەم و زۆر، (١٠٠) کوژراوو بریندار دەبێ، هێندێ لە برینداران هێنراونە ئێرەو، ئەوانەیش کەوا زامەکانیان سەختە لە (خۆی) ماونەوە.

زیانی کوردیش زۆرەو، حەسەن ئاغای مامی خالیدو مستەفا ئاغای رێبەرانی نزیك ئەرجیشی یاخیبوون، لە کوژراوەکانن.

٢٥. تورکان سوپاسی هاوکاریی ئێرانیەکانیان کرد، بەڵام لەڕاستیدا بەشکستی ئەوان خۆشحاڵبوون، چونکە ئەوان هانی خالید ئاغایان دا هێرش بکاتە سەر تورکەکان و، کەوتنە چاڵی خۆیانەوە.

٢٦. هەموو دەسترۆکانی ئێران، بیرۆکەی دیاریکردنەوەی سنوورو گەمارۆدانی رۆژهەڵاتی ئاراڕاتی بچووکیان لەلایەن تورکیاوە رەت کردەوە. دەڵێن ئەم جۆرە گەمارۆدانە سەرەتای پڕۆپاگەندەی پان- تورکیایەو، رێ بۆ داگیرکاریی دواتر، جابەئاشتی بێ یان شەڕ، خۆش دەکات.

٢٧. وەزارەتی دەرەوەی ئێران بەڕەسمی نکوولیی لە هێرشی تورك بۆناو خاکی ئێران کرد، بەڵام جەنەڕاڵ پێشتر ئەم راپۆرتە ناوبەناوانەی پێدراوم کە تۆپبارانی

کوردەکان لە (١٠) کیلۆمەتری ناو خاکی ئێرانەوە، تورکانی پاشەکشە پێکردووە، بۆیە بڕوام بە ڕەتکردنەوە رەسمییەکە نییە.

هەروەها ئەردەرووونی درێژەی ئۆپەراسیۆنەکانی تورك لەبایەزیدەوە بەرەو سنووری ئێرانی پێراگەیاندمو، ئەوەیش کە بەنیازن بولاقباشی داگیر بکەن.

سەربازان لە تارانەوە،

٢٨. (١٤)ی ئاب پێم راگەیاندرا کە سەربازان لێرەوە بەئاراستەی ماکۆ رۆیشتوون.

**لەئێران: هەرێمی باشوور**

٢٩. جەنەڕاڵ تەئکیدی کردەوە کەپشتێنەیەکی بەهێزی لەسەقزەوە بۆ سابلاخ دروست کردووە. کەواتە دەشێ لەدەرەوەی ئازربایجانەوە بەرەو سەقز کەوتبنە جووڵە.

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ٨١–٨٢، ژ: ١/٩٣

**ژ: ٩٠**

**لە سێرجی. کلارکەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن (١٣ی تشرینی یەکەم گەیشتووە)**

**ژمارە: ٣٨٧**

**قوستەنتەنییە، ٨ی ئۆکتۆبەری ١٩٣٠**

**گەورەم،**

خۆشحاڵم پێتان رابگەیەنم: نەقیب کۆلۆنێل سێر هەمفریزی کۆمیساری باڵای خاوەنشکۆ لە عێراق، (٤)ی ئەم مانگەو لەڕێگەیبەرەو بەغدایدا گەیشتە ئێرەو دوانیوەرۆی ئەمڕۆ ئێرەی بەجێ هێشتو، بەرەو بەغدا کەوتەڕێ.

٢. (٥)ی تشرینی یەکەمو، بۆ ماوەی دوو رۆژ لەگەڵ سێر فرانسیس هەمفریزدا چوینە ئەنکۆرەو، ئەو لەوێ چاوی بەسەرکۆمارو سەرۆوەزیرو وەزیری دەرەوە

بەوەکالەتو جێگری کاتیی وەزیر کەوتو، ئەم بەیانییەیش وەزیری دەرەوەی بینی کە دوێنێ لە رووسیا گەڕابووەو، ئەم شەو دەچێتەوە ئەنگۆرە.

٣. بێگومان، کۆمیساری باڵا بابەتی ئەم دیدارانە بۆ نووسینگەی کۆلۆنیەکان بەرزدەکاتەوەو، ئیتر پێویست ناکات من لێرە بەدرێژی لەسەری بدوێم. بەڵام پێدەچێ بوارم هەبێ باسی کاریگەریی چاکی سێر فرانسیس هەمفریز بەسەر هەستی دەسەڵاتدارانەوە بکەم. ئەمە جگە لەوەی کەوا هەست دەکەم ئەم سەردانە پەیوەندییەکی گرنگی شەخسیی لەکاتێکی شیاودا دروست کردووەو، بۆ ئەو کاتە کەڵکی دەبێ کە کۆمیساری باڵا لەگەڵ عیراقدا تاووتوێی سیاسەتی ئەو وڵاتە بەرامبەر بەتورکیا دەکات.

٤. دەسەڵاتداران زۆر بەگەرمی پێشوازییان لەکۆمیساری باڵا کرد. دیداری غازیو کەشەکەو هەردوو خوانی نیوەڕۆ کەیەکەمیان وەکیلی وەزیرو دووەمیان من سازم دابوو و، سەرۆك وەزیریش، بە پێچەوانەی نەریتی خۆی ئامادەیان بوو، زۆر دۆستانە بوون. غازی دوو سەعاتو نیو باسی رەگەزەکانی (Autochtonic) [1] ی هندو میزۆپۆتامیای بۆ کردینو، بەبێ پەردە، رای خۆی لەبارەی شانەماتۆڵڵای پێشووەوە دەربڕیو، چیرۆکی نهێنیی پیوەندیی بەئەنوەر پاشاوە، کاتێك لەدوا دەمەکانی فەرمانڕەواییدا بووە، بۆ گێڕاینەوە.

٥. کێشەی کورد کە کاری لەعێراقو تورکیا کردووە، لە چاوپێکەوتنە رەسمییەکانی ترماندا لەگەڵ دەسەڵاتدارانی تری تورکدا، بە روونیو گیانێکی دۆستانەوە تاووتوێکرا. راستەوخۆ گلەیی لە بێهێزیی عێراق نەکرا، کە بەهۆیەوە شێخی بارزان توانیویە یارمەتیی یاخیانی کورد بدات. حکومەتی عێراق، لەڕاستیدا، نەیتوانیوە هەرێمی شێخ بەتەواوی کۆنترۆڵ بکات. داوا لە کۆمیساری باڵا کرا، حکومەتی عێراق رازی بکات بەوەی کەپێویستە رێوشوێنی کاریگەر بۆ قازانجی

---

[1] ئەشێ Autochthonic بێ بە مانای ئەسڵیو بنەڕەتیو خۆوڵاتی. بەو پێیە ئەبێتە رەگەزە ئەسڵی یا خۆوڵاتیەکان .(س)

هەردوو وڵات دابنێ، بەڵام پێم وایە سێر. ئێف. هەمفریز توانیویەتی تورک قەناعەت پێبکات کەئەمە بەزەبری ماددە دەکرێ‌و، دیارە بەغدایش ئەمەی نییە. هەروەها دڵنیای کردنەوە کەگەڕایەوە خێرا حکومەتی عێراق لەڕاستیەکان ئاگادار دەکاتەوە. ئەمە جێی بڕواو ڕەزامەندیی تورکەکان بووە.

٦. سێر. ئێف: هەمفریز ئەمەی بەهەل زانی‌و، ئاماژەی بەوەکرد کە کۆمسیۆنی هەمیشەیی سنوور بۆئەم مەبەستە پێکهێنراوەو، شتی زیاتریش دەکرێ ئەگەر کۆمیتەکەو، بەتایبەتی ئەندامانی تورکیا، چالاکانەو بەرپرسانەتر کارەکانیان بکەن.

٧ـ سەردانی کۆمیساری باڵا، هاوکات بوو لەگەڵ گەیشتنی برووسکەی ژمارە (٨٨)ی (٣)ی ئەم مانگەتاندا سەبارەت بە ئیحتیمالی کۆششی حکومەتی تورکیا بۆ وەرگرتنی مۆڵەتی بردنە ناوەوەی سەرباز یان سازدانی ئۆپەراسیۆنی سەربازی لە خاکی عێراقدا. خۆشبەختانە، بەڕێوەبەری هەمیشەیی، وەك لە برووسکەی ژمارە (١١)ی ئەمڕۆمدا ئاماژەم پێکردووە، باسی باری ئێستای سەربازانی سنووریی تورکی کردو، بۆخۆیشی وتی: نیاز نییە داوای مۆڵەتی پەڕینەوە لە سنوور بکرێ. هەروەها ڕێنوێنیی نوێ بە ئەفسەری فەرماندەی تورك دراوە کە ڕێز لە یەکپارچەیی‌ی خاکی عێراق بگرێ.

٨. کۆپیی ئەم نووسراوەم بۆ کۆمیساری باڵای خاوەنشکۆ لە بەغدا نارد.

جۆرج. ئار. کلارك

وەزارەتی دەرەوە ٤٢٤/٢٧٣، ل: ٩٢-٩٣، ژ: ١٠٢

ژ: ٩١

**لە سێرجی. کلارکەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن (٣ی تشرینی دووەم گەیشتووە)**

**ژمارە: ٤١٣**

نوێنەری خاوەنشکۆ لەقوستەنتەنییە راپۆرتێك بۆ وەزیری دەرەوەی خاوەنشکۆ دەنێرێ و، وێنەیەکی نووسراوی ژمارە( ١١)ی (٢٣)ی ئەم مانگەی پاشکۆی سەربازیی خاوەنشکۆی ئەو باڵوێزخانەیشی لەسەر بارودۆخی رۆژهەڵاتی تورکیاییی لەگەڵدایە.

قوستەنتەنییە، ٢٥ی ئۆکتۆبەری ١٩٣٠

************

**هاوپێچی ژ: (٩١)**

**لە رائید ئۆلێرییەوە بۆ سێرجی. کلارك**

**ژمارە: ١١**

**ئەنگۆرە، تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٣٠**

**گەورەم،**

لە تەواوکاریی نووسراوی ژمارە (٩)ی (١٧)ی ئەیلوولی (١٩٣٠) مدا، ئەم تێبینیانە لەبارەی باری رۆژهەڵاتی تورکیاوە دەنێرم.

٢. دەسەڵاتدارانی تورك بڕیاریان داوە هەر سەرچاوەیەکی ئاژاوەی کوردستان، دوای سەرکەوتنەکەی هەفتەی دووەمی مانگی ئەیلوولی نزیکی چیای ئاراڕات، سەرکوت بکەن. بەڵام هێشتا گومان هەیە، بەتایبەتی لە باشقەلەی خوارووی رۆژهەڵاتی گۆلی وان، بەرگری مابێ و، سەربازو جەندرمەیش لەشەڕی یاخییانی کورددا بن.

## ژ: ٩٢

## لەسێر. ئێف. هەمفریزەوە بۆ لۆرد راسفیڵد( ١٢ی کانونی یەکەم بەوەزارەتی کۆلۆنییەکان گەیشتووە)

**نهێنی**

**بەغدا، ٢٠ی ئۆکتۆبەر- ٢٠ نۆڤەمبەری ١٩٣٠**

**گەورەم لۆرد،**

تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٢٩، کە لەندەنم بۆ گرتنە دەستی کارەکانم لە بەغدا بەجێهێشت باڵوێزی خاوەنشکۆ لە قوستەنتەنییە پێشنیاری کرد دوای نموونەی ئەوانەی پێش خۆم بکەوم، بەئەنگۆرەدا گەشت بکەم، بۆ ئەوەی دەسەلاتدارە سەرەکیەکانی تورکیا بناسم. جا چونکە رێوشوێنی پێویستی گەشتەکەم بە میسرو فەلەستیندا تەواو بووبوون، جێبەجێکردنی داوای باڵوێز بۆ گەڕانەوەی ئەمساڵم، لە لەندەن دواکەوت.

٢. (٤)ی ئۆکتۆبەر گەیشتمە قوستەنتەنییەو، رۆژی دواتر لەگەڵ سێر. جۆرج کلارکدا چوومە ئەنگۆرە. پاش سەردانی عیسمەت پاشاو شوکری قایای وەکیلی وەزیری دەرەوە، نیوەڕۆ خوانێکی رەسمیی خۆشم بۆسازکراو، ئەمجا چاوم بەمستەفا کەمال پاشا کەوت. غازی زۆر بەگەرمی پێشوازیی کردمو، سەرەتا لەبارەی راپەڕینیی ئەفغانستانو، بەتایبەتی هۆکانی مەرگەساتی رووخانی شا ئەمانوڵلاوە پرسیی. من روونم کردەوە، ئەمانوڵلا هەڵەیەکی کوشندەی کرد کەوای دەزانی پاڵەوانێکی خۆشەویستی جەماوەرەو، سوپایەکی بەئەمەکی لەپشتەو، دەتوانێ نوێکاریی کاریگەر بەسەر خێڵەنەزانو دواکەوتووەکاندا بسەپێنێ. وای دەبینی کەغازی لەتورکیا چیی کردووە، ئەمەیش ئەتوانی لەئەفغانستان بیکاتو، لەبیری کردبوو هەیبەتی خۆیو توانایی سوپاکەیو عەقڵیەتی هاوولاتیانی، تەواو لەمان جیاوازن. سەربای ئەمە، وەزیری ناشارەزاو نادڵسۆز خیانەتیان لێکرد. من

٣. خۆشبەختانە، پێشنیاری بەزاندنی سنووری عێراق لەلایەن تورکەکانەوە جێبەجێ نەکرا. ئەو کارە جەردەییانەی نزیك ئورفەیش، رەنگە بەشێوەیەکی سەرەکی زادەی کشانەوەی بەتالیۆنەکانی درێژایی هێڵی سنوور بێ.

٤. پەیامنێرێك لە بەغدا، کەبەگشتی لەسەر بارودۆخی کوردستان دەنووسێ، پێیوایە ئەمساڵ هیچ نیشانەیەکی جووڵانەوەی واقیعیی نێوان کوردانی عێراق و ئەوانەی تورکیاو ئێران نییە. لەلایەکی ترەوە، بەڵگەی هەیە کەتورك لەمانگی نیسانەوە بەردەوام خەریکی چەککردنی خێڵەکانە.

٥. خۆییبوون، (١١)ی ئەیلوول، راپۆرتی چەند کارێکی سەربازیی (١١)ی حوزەیران تا (٩)ی ئابی دژی سوپای تورکی بڵاوکردەوە. باسی هیچ شکستێك نەکراوەو، رایشگەیاندراوە: حکومەت (٤٠٠٠) سەربازی قوربانی داوە. هاوکات تورکیا بەکاولکردنی (٥٠٠) گوندی کوردو لەناوبردنی (١٢٠٠٠) پیاو ژن و منداڵ تاونبارکراوە. ئەو هەواڵە گەیشتووەتە ئەمریکاو، لەوانەیشە لەناو لایەنگرانی سەربەخۆییی کوردستاندا ئەو هیوایانەی بووژاندبێتەوە کە ئومێدی بەدیهاتنیان کەمە.

بی. جەی. ئۆلێری

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ٩٧-٩٨، ژ: ١/١١٤،١١٤

وتم: سۆزێکی زۆرم بۆ ئەمانوڵڵاو گەلی ئەفغان هەبوو، دڵگران بووم کە هەوڵە باشەکانی بوونەمایەی ئەو کارەساتەی عەرشەکەیو ئازاری ناشایستەی خەڵکەکەی.

غازی ئەم شیکردنەوەیەی کێشەی ئەفغانستانمی پێپەسەندبوو، بەڵام وتی: لە گفتوگۆی ئەمانوڵلادا هەمیشە هەستی بەناڕاستیی بۆچوونەکانی کردووەو، وایشی هەست دەکرد ئەولاوە ئۆتۆکراتە نەفامو کەللەڕەقە، شایانی بەزەیی نەبوە. ئیتر نازانم ئەم هەستە تاڕادەیەك توندە لەو ڕاستییەوە سەرچاوەی گرتووە کە غازی لەبنەڕەتدا، بەئامۆژگاریی سۆڤیەت، پشتگیریی ئەمانوڵڵای، بۆ بردنەوەی شەڕی ناوخۆ کردووە، یان نا؟

٣. ئەمجا هاتینە سەرباسی کۆنو ئیتنۆلۆجیا. غازی زۆری هەوڵ دا بیسەلمێنێ کە ڕەگەزەکانی ڕۆژئاوای ئەوروپا تورکە عوسمانیەکان یەك بنەچەیان هەیەو، خۆشحاڵبوو بەوەی کە بیستی سەرم لە نیشتمانی دێرینی تورکان لە ناوەڕاستی ئاسیا داوە. لەم وتوویژانەدا وتم: ساڵی (١٩٢٢) کاتێ نوێنەر بووم لە کابوول، داوای یارمەتیی پارەو چەکی لێکردم. بۆ ئەوەی Basmarch بتوانن کۆتی سۆڤیەت بپسێنن. ئەم یادەوەرییە، وای لەغازی کرد چەند چیرۆکێکی پەیوەندیی لەگەڵ ئەنوەردا بگێڕێتەوە. وتی هەموو هەوڵێکی خستبووە گەڕ بۆ دوور خستنەوەی تورکیا لە شەڕێکی گەورەو، دژایەتیی ئەو سیاسەتەی ئەنوەریشی دەکرد کە دەیویست سەروەتو سامانی وڵات بۆ ئەڵمانیا بەکاربێنێ. باسی سێ نامەی ئەنوەری کرد کە بۆیی نووسیبوونو، دەریان دەخست چەند کورت بینو بەهەڵپەبووە.

+ یەکەمیان، کاتی کوودەتایەك کەئەنوەری وەك دیکتاتۆرێك دەکردە تاکە دەسەڵاتدار، نووسراوەو، فەرماندەیی لەشکرەکانی قوستەنتەنییەو دەردەنیلی بەغازی بەخشیوە. ئەمیش داوای بینینی ئەنوەری کردبوو، پێشنیارەکەیشی دابووە دواوە.

+ نامەی دووەم، دوای شەڕ لەمۆسکۆوە نووسرابوو و، پێشنیاری دامەزراندنی کۆمەڵەی دەوڵەتانی ئاسیای کردبوو، کە تورکیاو ئێران و ئەفغانستان و بوخارای دەگرتەوەو، کۆنترۆڵی بێگانەی بەسەرەوە نەدەبوو. لەغازی داواکرابوو، پەیوەندی بە کۆمەڵەکەوە بکات بۆ پتەوکردنی ئەو یەکێتیە. ئەویش لەوەڵامدا وتی: ئەو شوێنەی ئەنوەر نامەکەی لێنووسیبوو، رادەی سەربەخۆیی ئەو یەکێتییە ناکۆکەی دەسەلماند، بۆیە رازی نەبووبوو کار بۆ ئەو پرۆژەیە بکات.

+ ئەنوەر نامەی سێیەمی، ماوەیەکی کەم پێش مەرگی، لە بوخارا نوسیبوو و، داوای پارەو چەکی بۆ ئازاد کردنی Khanatesئاسیای ناوەڕاستی لەدەست سۆڤیەت کردبوو. ئەم نامەیە کە وەڵام نەدرابووەوە، مۆرێکی تازەی لێدرابوو و، خۆی تێدا بە "شای بوخاراو زاوای خەلیفە" ناو بردبوو.

هەستم کرد غازی، بە گێڕانەوەی ئەم چیرۆکە، دەیەوێ وەك کەسێکی ئاگادار لە مێژووی جووڵانەوە پان- تۆرانی و پان ئیسلامیەکانی ئاسیا، پێم بڵێ ئەو هەمیشە دژی ئەو بزووتنەوانەو هاوپەیمانیی ئاسیایی بووەو، ئێستا تورکیای نوێ دەڕوانێتە رۆژئاوا. هاوکات ئەوەیش بە باڵوێزی خاوەنشکۆ رابگەیەنێ کە هاوپەیمانێتیی تورکیا لەگەڵ مۆسکۆدا ناچارییەو، ئێستایش کەپەیوەندییەکانی ئەنگلۆ- تورکی ماوەی چوارساڵی سێر جۆرج کلارك لەقوستەنتەنییە پتەوبوونێکی دیارو بەرچاوی بەخۆوە دیوە، پەرەسەندنی ئەو پەیوەندییە توندو تۆڵەی ئینگلتەرە بەباشتر دەزانێ.
دواجار غازی لە وەڵامی پرسیارێکمدا وتی: پێی وایە عێراق رێکەوتنێکی باشی ئیمزا کردووەو، پەیوەندیشی لەگەڵ دراوسێکانی باشووریدا زۆر باشە. ئەم دیدارە دوو سەعات و نیوی خایاندو، کەسێتیی زاڵی غازی و فراوانیی ئارەزووەکانی و جێگیریی ئامانجەکانیم، تێدا بۆ دەرکەوت.

٤. رۆژی دواتر عیسمەت پاشاو شوکری قایا سەریان لێدامەوەو، باسی پەیوەندیی تورکیا- عێراق و بەتایبەتی کوردستانمان کرد. روونم کردەوە، سیاسەتی حکومەتی خاوەنشکۆ، وەك هێزی ماندات (دەسەڵاتدار)ی سەر عێراق، ئەوەیە کە

قەناعەت بە عەرەب بکات بە سۆزو دادپەروەرییەوە لەگەڵ کورددا بجووڵێنەوەو، رازییان بکەن وەکو هاونیشتمانییەکی دڵسۆزو بەختیار لە دەوڵەتی تازەی عێراقدا بژین. بیرۆکەی کوردستانی سەربەخۆ هۆشمەندانە نییەو، مەحاڵە. ئەو پڕوپاگەندانەیش کە گوایە حکومەتی خاوەنشکۆ پشتگیری ئەم بیرۆکەیە دەکات، راست نییە.

بۆ وەڵامی ئەو پرسیارەیش کە حکومەتی عێراق چ هەنگاوێك دەنێ تامافی پەنابەری بەکوردانی هەڵاتوو لە سوپای تورك بەرەو ئەو وڵاتە، نەدات؟ وتم حکومەتی عێراق چیی پێبکرێ بۆ چەککردنی پەنابەرانی کوردو بەکارنەهێنانی خاکەکەی وەك بنکەیەك دژی تورك، دەیکاتو، دڵنیایشم کردنەوە کە نەبوونی هەر کارێکی خێراو کاریگەر، دەرەنجامی نەبوونی سەرچاوەکانی زانیارییە نەك هی نیازپاکی. هەروەها جەختم کردەوە کە کۆمسیۆنی هەمیشەییی سنوور دەتوانێ لە سەقامگیرکردنی ئاشتیی سنووردا هاوکاربێ، ئەگەر گرنگی بەگەڕخستنی دەرەنجامەکانی بدرێ. ئەگەرنا، لایەنە ستەم لێکراوەکان بەردەوام بەڕێگەی خۆیان تۆڵەی خۆیان دەسەننەوە.

هەردوو وەزیر کە زۆر دۆستانە بوون، دڵنیایان کردم کە لە خواستی دۆستانەی حکومەتیعێراق رازینو، پەیمانیان دا، لەبەرگرتنی پەلامارەکانی سنووردا، هاوکاری بکەن. هێرشەکانی ئەم دواییە، کەدەشێ بەهۆی کشانەوەی پۆستە تورکییەکانی نزیك سنوورەوە بووبێ، وێرانکارییەکی بەرچاویان لە کوردستانی باشووردا کردووە.

٥. عیسمەت پاشا لەو نیوەڕۆ ئاهەنگەدا کە سێر جۆرج کلارك رێکی خستبوو، زۆر کراوەبوو و، چەند چیرۆکێکی لۆرد کورزۆن (Lord Curzon) ی پێ راگەیاندم کە سەرەڕای جیاوازیی زۆری سیاسییان، زۆر پێی سەرسام بووە. وتی هیچ گلەییەکی لە عێراق نییە، بەڵام هیواداربوو: هەرچی زووە هەوڵ بدرێ شێخی بارزان کە زۆر هاوکاریی یاخییانی کوردی تورکیا دەکات، کۆنترۆڵ بکرێ. بیری هێنامەوە کە حکومەتەکەی بەرژەوەندیی دارایی هەیە لە گەشەپێدانی

نەوتەلانەکانی موسلداو، وتیشی: ئەگەر حکومەتی عێراق رێگە بدات بۆریەکان بەسوریادا تێپەڕن، ئەوا فەرەنسە دەرفەتی بۆ دەرەخسێ خۆی بەسەر ئەو وڵاتەدا بسەپێنێو، ئیتر هەرگیز پێشبینیی ناکرێ فەرەنسە دەست لە ماندانی سووریا هەلگرێ. بۆیە ئەدەنەی بە باشترینو سەلامەترین رێگەی دەرچوونی نەوتی مووسل لەقەلەم دا.

٦. رۆژی (٨)ی ئۆکتۆبەر لەگەڵ سێر جۆرج کلارکدا گەڕامەوە قوستەنتەنییەو، لەوێ چاوم بەتۆفیق روشدیی وەزیری دەرەوە کەوت، کە تازە لە مۆسکۆ گەڕابووەوە. ئەو، نیگەران بوو لەوەی پێویستە فەرەنسە رازیبێ ( دەنووکی مراوی– bec de canard) کە بە قەراغێکی بێکەڵکی نێوان تورکیاو عێراقی دانا، چۆڵ بکات.

توانیم، بەهۆی باڵوێزی خاوەنشکۆوە، دانوستانی گرنگ لەگەڵ سەرجەمی ئەو گەورە بەرپرسانەدا ساز بکەم. پەیوەندیی شەخسییش بۆ کارەکانم لە بەغدا زۆر سوودبەخش دەبێ. من، بۆ بەرهەمو دەرەنجامەکانی ئەم سەردانە، قەرزاریاری رێزو دووربینیی سێر جۆرج کلارکم.

٧. وێنەی ئەم نووسراوەم بۆ باڵوێزی خاوەنشکۆ لە قوستەنتەنییە ناردووە.

ئێف. ئێچ. هەمفریز

کۆمیساری باڵا لەعێراق

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤/٢٧٣، ل: ١٢٢–١٢٤، ژ: ١٤١

## ژ: ٩٣

## لە سێرجی. کلارکەوە بۆ مستەر ئێی هندرسن( ١ی کانوونی یەکەم گەیشتووە)

**ژمارە: ٤٤٥**

نوێنەری خاوەنشکۆ لە قوستەنتەنییە راپۆرتی پێشکەش بە وەزیری خاوەنشکۆ بۆ کاروباری دەرەوە دەکات، وێنەی نووسراوی ژمارە( ١٢٤)ی (١٥) تۆفەمبەری کونسوڵی تەرابزوونی خاوەنشکۆی لەسەر ئۆپەراسیۆنی سەربازیی دژی کورد هاوپێچ کردووە.

قوستەنتەنییە، ٢٣ی تشرینی دووەمی ١٩٣٠

* * *

## هاوپێچی ژ: ٩٣

## لە کونسوڵ ماتیۆسەوە بۆ سێرجی. کلارك

**ژمارە: ١٢٤**

**تەرابزوون، ١٥ی تشرینی دووەمی ١٩٣٠**

**گەورەم،**

خۆشحاڵم ئاگادارتان بکەمەوە کە ئۆپەراسیۆنەکانی هەرێمی ئاگریداغ دژی کورد کۆتاییان پێهات، پۆستی سەربازی لە خاڵی جیاجیای شاخەکاندا، بۆ رێگرتن لە گەڕانەوەی کوردان لەرووسیاو ئێرانەوە، جێگیربوون.

٢. پێم راگەیاند( کاری سەرکوتکردن) بەو شێوەیەی کەساڵی (١٩١٥) دژی ئەرمەنیەکان ئەنجام درا، ئێستا دژی کوردانی ناوچەی دەرسیم بەڕێوە دەچێ.

دەبلیوو. دی. دەبلیوو. ماتیۆس

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ١١٩–١٢٠، ژ: ١/١٣٧،١٣٧

ژ: ٩٤

**لە سێرجی. کلارکەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن (٨ی کانوونی یەکەم گەیشتووە)**
**ژمارە: ٤٥٣**

**ئەنگۆرە ٣ی دیسەمبەر ١٩٣٠**

**گەورەم،**

ئاماژە بەنووسراوی ژمارە (٥٣٢)ی (٣)نۆڤەمبەری کارەهەڵسوڕێنی بریتانیا لە تاران، پێتان رادەگەیەنم کە بەپێی قسەی هاوکارێکی ئیتاڵی پاشکۆی سەربازی ئەم باڵوێزخانەیە، حکومەتی تورك بەنیازە، پارچە زەوییەکی نزیك شارۆچکەی "قوتوور"ی ئێران کە دەکەوێتە(٣٨) میلی سەرووی رۆژهەلاتی باشقەلعەی ویلایەتی وان، بەرامبەر بە پارچەیەکی هاوشێوەی نزیك بولاقباشی خاکی ئێران کە دەکەوێتە (١٣) میلی باشووری ئاراراتی بچووك، بداتە ئێران. ئەم پارچەیەی دوایی، بێگومان، گشت بەرزاییەکانی ئاراراتی بچووك دەخاتە ناو خاکی تورکیاوەو، لێژاییەکانی باکووریش لەناو ئێراندا دەمێننەوە.

٢. سەرچاوەی ئاڵۆزی ئەم پێشنیارە، بەم دواییە لە چاپەمەنیەکانی تورکیادا دەرکەوتوون‌و، وانیشان دەدەن کە ئێران بەم داوایەی تورك رازی بووەو، ئیتر کێشەی سنور لەنێوان هەردوو حکومەتدا نەماوە. کارەهەڵسووڕێنی ئێران لەوەلامی پرسیاری ئەندامێکی دەستەکەمدا، ئاخۆ ئەم راگەیاندنانە بەڕاستی بارودۆخەکەیان دەرخستووە؟ وتی: ئەمانە پێشوەخت نووسراون. ئەوی تا ئێستا کراوە، ئەوەیە کە حکومەتی تورکیا چەند پێشنیارێکی ئەرکانی گشتیی تورکی خستوەتە بەردەم ئێران‌و، ئێستا چاوەڕێی راوبۆچوونی ئەرکانی گشتیی ئێران دەکرێ. محەمەد خان سەعید، گەشبین بوو بەوەی کە پێدەچێ چەند مانگی کەمی داهاتوو دەرفەت بۆ رێککەوتننامەیەك هەڵبکەوێ، وەلام لەسەر چەند پارچە زەوییەکی کەمتر لەوەی وا تورك پێشنیاری کردووە. ئێران بیر لە ئایندە دەکاتەوەو، نەیتوانیوە سنوورێکی

ناستراتیجیی ترسناك، با لەگەڵ دراوسێیەکیشدا بێ کە پەیوەندییە هەنووکەییەکانیان زۆرباش بێ، پەسەند بکات.

٣. کارهەڵسووڕێنی ئێران، لە وەڵامی پرسیارێکی مستەر ڕۆبەرتسدا لەمەڕ راوبۆچوونی سەبارەت بە بارودۆخی کوردستانو، وتی پێی وایە بەهاری ئایندە کاری زیاتری سەربازی، بەڵام بەپانتاییەکی کەمتر لەوەی ئەمساڵ، دەکرێن. تورکەکان سەرکەوتوانە دوو فەسیلیی (٥٠٠و ٢٠٠٠) کەسیی یاخییانیان دەستگیر کردەوە، بەڵام ئەمە برێکی کەمی هێزێکە کە بە (١٢) هەزار چەکدار مەزەندە کراوە. دیارە ئەوانەی کەماون پەراگەندە بوون. جگە لەمانە، کەس لە ڕابەرە سەرەکییەکان نەگیراوەو، زۆربەیان، بەتایبەت ئیحسان نووری ناوێك کە ئێستا لە تارانە، هەڵاتوونە ئەودیوی سنووری ئێران. حکومەتی تورکیا داوای تەسلیم کردنەوەی ناوبراوی کردبوو و، حکومەتی ئێرانیش، کە بە پەنابەری سیاسیی داناوە، نەیتوانیوە بیدات بەدەستەوە.

٤. پاشکۆی سەربازیی باڵوێزخانەی خاوەنشکۆ بۆ ژمارەی یاخییانیش، کە لە برگەی پێشوودا باس کراوە، پێی وایە ناکرێ ژمارەی تەواوی هێزی کورد بخەملێنرێ، چونکە هەموو ژنو کوڕێکیان دەتوانن تفەنگ بەکاربێنن. رائید ئۆلێری ئیشارەتی بەوەیش دا کە حیسابەکەی محەمەد خان سەعید لە (٣٠٠٠) قوربانی تێناپەڕێ کەدەڵێ (٥–١٠)ی تەمموز لەزیلان دەرەو، هەروەها ژمارەیەکی زیاتر مانگی ئابو ئەیلوول لە دەوروبەرو سەر چیای ئارارات، لەناوچوون.

جۆرج ئار. کلارك

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ١٢٠–١٢١، ژ: ١٣٩

## ژ: ٩٥

## لە سێرجی. كلاركەوە بۆ مستەر نێی. هندرسن (٥ی كانوونی دووەمی ١٩٣١ گەیشتووە)

**گەورەم،**

نوێنـەری خاوەنشـكۆ لـە قوسـتەنتەنییە تەواوكاریـەكانی پێشكەشـی وەزیـری خاوەنشكۆ بۆ كاروباری دەرەوە دەكات و، لێرەدا وێنەی راپۆرتی ژمارە (١٣)ی (٢٢) دیسەمبەری پاشكۆی سەربازیی ئەم باڵوێزخانەیەی خاوەنشكۆی هاوپێچ كردووە كە تایبەتە بە گفتوگۆیەكی لەگەڵ نوری بەگدا لەسەر بارودۆخی كوردستان.

قوستەنتەنییە، ٢٩ی كانوونی یەكەمی ١٩٣٠

* * * *

## هاوپێچی (١)ی ژ: ٩٥

## لە رائید ئۆلێرییەوە بۆ سێرجی. كلارك

**ژمارە: ١٣**

**ئەنگۆرە، ٢٢ی كانوونی یەكەمی ١٩٣٠**

**گەورەم،**

خۆشحاڵم چەند تێبینییەك لـەبارەی ئـەو گفتوگۆیـەوە پێشـكەش بكـەم كـە ئـەم بەیانییە لەگەڵ كۆڵۆنێل نوری بەگ ئەندامی ئەركانی گشتیی توركدا سازم كردووە.

كۆڵۆنێل، یەك سەعات بەئازادی و خێرایی قسەی كرد. لەبەر ئـەوەی زانیاریـەكانم لەبارەی توركەوە دیاریكراوبوو، نەمتوانی فریای هەموو وشەكانی بكەوم، بـەڵام پێـم وانییە بەهەڵە لە سەرنجە نووسراوەكانم گەیشتبم.

هەرچەندە خۆم ئامادە نەکردبوو سەرجەم بابەتی قسەکانی نوری بەگ پەسەند بکەم، وائەست دەکەم جێی رەزامەندی بن، چونکە تارادەیەك بەڕوونیو بێپەردە لەمەسەلەکان دوا.

بی. جی. ئۆلێری

مەیجەر جی. ئێس

* * *

## هاوپێچی (٢)ی ژ: ٩٥

((چەند سەرنجێکی کۆلۆنێل نوری بەگی ئەرکانی گشتی لەسەر کوردستان))

کۆلۆنێڵ نوری ویلایەتەکانی رۆژهەڵات باش شارەزایەو، حەوت ساڵ بەر لەشەڕ خزمەتی تێدا کردوون. دەڤەرەکە، ئەوکاتە، زۆر سەخت بووەو، رێگەوبانی نەبوە، بەڵام لەوکاتەوە چەند جادەیەکی تێدا دروست کراون. هەروەها کونسوڵی سەربازیی بریتانیای لە "وان" دەناسی. پێی وابوو مانەوەی درێژ خایان لە ویلایەتەکانی رۆژهەڵات عەقڵیەتی مرۆڤ دەگۆڕێو، تەمەڵو لەش بەباری دەکاتو، بۆ نموونە هەفتەی دووجار ریش دەتاشێ.

کوردەکان رەگەزێکی ئاڵۆزو جێی گومانن‌و، یەکێتیی نەتەوەییان نییەو، لەسەدان خێڵو تیرەی جیاجیا پێکهاتوون. بەڕای ئەو، جیاوازیی رەگەزیی کورد لەلایەك‌و، تورکمان‌و چەرکەس‌و ئەرمەن لەلایەکیتر، جێی گومانن. بۆ ئەمەیش، نموونەی لەزمانی کوردی هێنایەوە کەوشەی زۆر کەمی تێدایە تورکی، عەرەبی چەرکەسی یان ئەرمەنی نەبن‌و، زۆر لەوشێوە زارە تورکیانە دەکات کەلە چەند ناوچەیەکی ئەنادۆڵی وەك نزماییەکانی ئەرجیش داغ قسەیان پێدەکرێ. پێی وابوو زۆرینەی کورد لە تورکە سەلجووقیەکانی پێش داگیرکاریی عوسمانییەکانن. وتی کورد لە دوا قۆناغی دەسەڵاتی عوسمانیدا لە خزمەتی سەربازی رزگاربووە. ئەمەیش

وای لە زۆرێك لە تورکان کردووە خۆیان بەکورد لەقەڵەم بدەن و، وەك کورد بژین و بیربکەنەوە.

کوردان زۆر خاسیەتی باشیان هەن، بەلام دزو جەردەیەکی سروشتییشن و، لەچارکردن نایەن. هەروەها زۆر دڵ رەقن و، چەند حاڵەتێکی بینیبوو، کاتێك لەگەڵ نەستۆریەکاندا لەکێشەدابوون، وەك درندەی کێوی رەفتاریان کردبوو. وای هەست دەکرد کورد ناتوانێ چەکدارێکی زۆر کۆبکاتەوەو، دیسپلینان نییەو، هەر لە تالانی و جەردەیی دەگەڕێن. نوری بەگ، کاتی شەڕ، پەیوەندیی بە فیرقەیەك سوارەی خێڵەکییەوە هەبوەو، شتی زۆر نەشیاوی لێبینیون.

تورك گەلێکی رۆژئاواخوازەو، وازی لە نەریتی عوسمانی هێناوە، بەلام کوردان تەواو ناشارستانین. ئەوانەیان کەسەربازی دەکەن و، فێری خوێندنەوەو نووسین و ژیان لەژێر سەقفێکی شیاوو گەشت بەشەمەندەفەرو ئوتومبیل دەبن، زۆربەیان ناگەڕێنەوە شوێنەکانی نیشتەجێ بوونیان و، لەشارۆچکەکاندا دادەنیشن، یان دەچنە قوستەنتەنییەو ئەنگۆرە. لەگەڵ ئەمەدا، بیری نوێ هەر بلاو دەبێتەوەو، تەنها چەند گوندێکی کەم بەرەنگاریی خزمەتی سەربازی و تازەگەری بوونەتەوە. بۆ ئەمەیش سێ گوندی نزیکی پالومەر( palumer)[1]ی باشووری ئەرزنجانی بەنموونە هێناویانە. نوری بەگ پێی لەسەر ئەو راستییە داگرت کە زۆرینەی ئاژاوەگێڕانی یاخیبوونەکەی ئەم دواییە، لەئێرانەوە هاتبوون. هەروەها بۆ بەڵگەی ئەو قسەیەی کە چەکداری یاخییان بێهێزبوون، وتی لە ئەرجیش کە بەتالیۆنێکی لێبوو و، شوێنە بچووکەکانی تر کە تەنها کەرتی بچووکی پیادەیان تێدابووە، سەربازانی حکومەت بەسەرکەوتوویی بەرپەرچی هێرشی هەزاران یاخییان داوەتەوە. زیلانیش بەرگری کرد. تەنها چەند شوێنێکی بچووك کە لە سەرباز چۆڵ کرابوون، کەوتبوونە دەست

---

[1] ئەمە (پولومەر)ە کە قەزایەکی باشووری رۆژهەلاتی ئەرزنجانە. (س)

یاخییان. شەڕی زیلاندەرە[1] بەسەرکەوتنی تورک کۆتایی‌ی هاتبوو. سەرباز لەناوچەی ئاگری‌داغو باشوورەوە هێنرابوون‌و، گورزێکی کاریگەریان لە خێڵەکان وەشاندبوو.

کۆلۆنێل نوری جارێکی‌تر دووبارەی کردەوە کە فرۆکەوانانی تورک خزمەتی زۆر باشیان کردووە. وتی: ئەمانە زۆر جەربەزەو سەرەڕۆ بوون‌و، دوو فرۆکەیان، کە بۆ لێدانی دۆشکەکانی کورد نزم بوویوونەوە، لەدەست دابوو. فرۆکەیەك لەسەر شاخی ئاراراتِ گرفتی مەکینەی هەبوو، بەڵام توانیبووی (٣٠کم) بفڕێ بۆ جێیەکی ئارام.

ئیحسان بەگی سەرکردەیەکی یاخی‌بوونی ئاگری‌داغ، کاپتنێکی تورك بووەو، کاتی کێشەی نەستۆریەکان هەڵاتووە. بێگومان ویستوویەتی، لەم یاخی‌بوونەی دواییدا پۆستێکی بەرز لەناو کورداندا بەدەست بێنێ. نوری بەگ نەیدەزانی ئیحسان لە تاران ئازادە یان نا، بەڵام وای هەست دەکرد هەرچۆنێك بێ کۆنترۆڵ کراوەو ناتوانی زیان بەتورکیا بگەیەنێ.

ئێران‌و تورکیا بنکەی سەربازییان لەسەر شاخی ئاراراتِ داناوە. ساڵی ئایندە راپەڕینی گشتی روو نادات، ئەگەرچی رێی تێدەچێ پێکدادانی بچووك لێرەو لەوێ بێنە ئاراوە. گوندنشینەکان زۆر لەیاخییان بێزارن، چونکە خەریکی تاڵانی‌و داگیرکردن‌و مەڕو ماڵات دزینن. وتووێژی دۆستانە بۆ دیاریکردنەوەی سنوور لەگەڵ ئێرانییەکاندا بەردەوامە، بەڵام وادیاربوو کۆلۆنێل باوەڕی بەم دانوستاندنانە نەبوو. وتی لیژنەکە هەر کۆدەبێتەوەو گفتوگۆ دەکاتو دەخوات، کەچی سنوور هەر هێڵێکی خەیاڵی‌و بێ مانایە، ئەگەر سەرباز نەبێ چاودێریی بکات. ئێرانییەکان سەربازیان لەسەر سنوور نییە. سوپایەکی (٤٠٠٠) سەربازییان هەیە، بەڵام ئەمە بەس نییەو لەگەڵ سوپای تورکدا بەراورد ناکرێ، هەرچەندە سوپاکە پێك دەهێنرێتەوەو، روو لەباش بوونە. بەهەرحاڵ ئەگەر سنووریش دیاری بکرێتەوە، ئەوا رێگەیەکی نوێی داگیرکاریی خێڵەکیەکان ئاڵوگۆڕی زیاتری زەوی پێویست دەکات.

[1] واتە دۆڵی زیلان کە ناحیەیەکی نزیکی باکووری قەزای ئەرجیشە لە ویلایەتی وان.(س)

نوری پاشا حەزی دەکرد مۆڵەت بدرێتە سەربازانی تورك لە سنووری عێراق بپەڕنەوە، بەڵام کاتێ والیی هەکاری ئەم داوایەی لەعێراق کرد، حکومەتی ئەو وڵاتە داواکەی دایە دواوە. جالەبەر ئەوە تیرەکان دەتوانن بێهیچ سزایەك لەسنوور بپەڕنەوەو، ئەمەیش بە دوژمنانیان رەوا نەبینراوە، ناتوانرێ تەواو هێور بکرێنەوە. ئەرکانی گشتی خۆشحاڵ بوو یاخی بوونەکەی، بەبێ خەڵك کردنە سەرباز، دامرکاندووەتەوە. کاری تاکتیکیی خۆجێیی پێشبینی کرابوو و، شەڕەکانی دژی کورد کەمێك سەخت بوون،........[1]

٢٢ی دیسەمبەری ساڵی ١٩٣٠

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ٢-٣، ژ: ٢

ژ: ٩٦

**لە مستەر مۆرگنەوە بۆ مستەر ئێی هندرسن(١٦ی ئاداری ١٩٣١ گەیشتووە)**

ژ: ٨٣

**قوستەنتەنییە، ١٢ی مارسی ١٩٣١**

**گەورەم،**

خۆشحاڵم ئاگادارتان بکەمەوە کە سەلاحەدینیی کوڕی سەرۆکی کوردەکان بابەتی نووسراوی ژمارە (١٩٤)ی (٣) حوزەیرانی (١٩٣٠) ی مستەر ئەدمۆندز، بە (١٥)ساڵ زیندانیو کاری قورس سزا دراوەو، حوکمەکەیش دادگای تاوانی ئەنگۆرە دەری کردووە. بەڵام لەبەر ئەوەی ئەو تاوانبارە کاتی پیلانی ئەرزۆم کە بەهاوکاریی رێکخستنی تاوانبارکراوە، (٢١) ساڵی تێنەپەڕاندبوو، حوکمەکەی بۆ (١٢)ساڵو (٦) مانگ کەم کرایەوە. هاوکارێکی سەلاحەدین بە (١٠) ساڵ زیندانیو

[1] ئەم بڕگەیە ناتەواوە.

کاری قورس،و، یەکێکی تریان بە (١)مانگ زیندانیو غەرامەی (٥١) لیرەی تورکی، سزادراون. دووانی تریش، کە یەکیان نوێنەری پێشووی بایەزید بوو، ئازادکراون.

٢. کەئەم حوکمانە، لەگەڵ ئەو خنکاندنە بەکۆمەڵانەی ئەم دواییەی مەنەمەندا بەراورد دەکەین، دەگەینە ئەو ئەنجامەی کەوا هیچ خیانەتێك دژی کوڕی شێخ سەعیدو هەڤاڵانی نەسەلماوەو، ئاماژە بەهیچ جۆرە هاوکارییەکی بریتانیای وەك ئەوانەی وا لە راپۆرتەکەی مستەر ئەدمۆندزدا هاتوون، نەکراوە.

٣. وێنەیەکی ئەم نووسراوە بۆ کۆمیساری باڵای خاوەنشکۆ لە عێراق دەنێرم.

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤/٢٧٣، ل: ٥٤، ژ: ٢٢

## ژ: ٩٧

## لە مستەر پارەوە بۆ مستەر نێلی. هندرسن ( ١٧ی ئادار گەیشتووە )

**ژمارە: ٤٥**

**تاران، ١٧ی ئاداری ١٩٣١**

**برووسکە،**

ئەمەی خوارەوە لە برووسکەی ژمارە(٩)ی کونسوڵی تەورێزەوە گەیشتووە. " کوردەکان نزیك بە ماکۆ کەوتوونەوە پەلامارو، ئەفسەری گشتیی فەرماندە، بە خۆسازدانێکی بەرچاوەوە، بەپەلە بەرەو ئەوێ کەوتە رێ. سەربازی زیاتری بەرەو شنۆ (ئۆشنۆ– Ushnu)دەبرێن"

ئەم نووسراوە بەژمارە (١٤) بۆ کۆمیساری باڵا لە عێراقو، ژمارە (١) بۆ قوستەنتەنییە دووبارە کراوەتەوە.

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤/٢٧٣، ل: ٥٤، ژ: ٢٣

## ژ: ٩٨

**لە مستەر پارەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن ( ١٧ی مارس گەیشتووە )**

**ژمارە: ٤٦**

**تاران، ١٧ی ئاداری ١٩٣١**

**برووسکە،**

ئەمەی خوارەوە لەبرووسکەی ژمارە(١٠)ی کونسوڵی تەورێزەوە گەیشتووە.

" بەسەربازگیراوە دێرینەکان بانگ دەکرێنەوەو، لۆری‌و ئەسپ بە بێگار گیراون‌و، چوار تۆپیش نێردراونە ماکۆ.

" سانسۆرێکی توند لەسەر هەواڵەکانەوە، نایشتوانم هیچ لە مەدەنی‌و کاربەدەستە سەربازییەکان‌و کونسوڵی تورك وەربگرم. بەگشتی باوەڕوایە تورك (٢٤) کیلۆمەتر نزیکی ئاڕارات چووبێتە خاکی ئێرانەوە.

" کونسوڵی تورك، چەند رۆژێك پێش ئێستا پێی وتم ئەمساڵ سوپای تورك سنووری خۆی کۆنترۆڵ دەکات‌و، داواکارە ئێران کوردەکان لەخاکی خۆیدا گەمارۆ بدات. ئیتر ئۆپەراسیۆنەکان ئاسان دەبن."

ئەم نووسراوە بەژمارە (١٥) بۆ کۆمیسارى باڵا لە عێراق‌و، ژمارە (٢) بۆ قوستەنتەنییە دووبارە کراوەتەوە.

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ٥٥، ژ: ٢٤

## ژ: ٩٩

## لە مستەر مۆرگنەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن( ٧ی نیسان گەیشتووە )

**ژمارە: ١٠٢**

**ئەنگۆرە، ٢٨ی ئاداری ١٩٣١**

**گەورەم،**

ئاماژە بەبرووسکەی ژمارە(٤٦)ی سێر رۆبەرت کلایڤ، نووسراوی رائید بی. جەی. ئۆلێریی پاشکۆی سەربازیی ئەم باڵوێزخانەیە کەتایبەت بەبارودۆخی ئێستای کوردستانە، بەرز دەکەمەوە.

٢. پێم وایە هەڵسەنگاندنی رائید ئۆلێری بۆ بارودۆخەکە بەبایەخەوە دەخوێنرێتەوە. بەڵام دیدو بۆچوونی، بەرای من، لەمەڕ سروشتی جووڵانەوەکەی کورد جێی قەناعەت پێکردن نین.

٣. وێنەی ئەم نوسراوە بۆ نوێنەری خاوەنشکۆ لە تاران و کۆمیساری باڵای بریتانیا لە عێراق دەنێرم.

جەیمس مۆرگن

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ٦١، ژ: ٣٠

* * * *

## هاوپێچی ژ: ٩٩
## لە رائید ئۆلیرییەوە بۆ مستەر مۆرگن

ژمارە: ٢

ئەنگۆرە، ٢٤ی مارسی ١٩٣١

گەورەم،

هەرچەندە لێكۆڵەرەوەكانی بارودۆخی رۆژهەڵاتی توركیا كۆكن لەسەر ئەو رایەی كە بەهار كورد یاخی دەبێتەوە، رای زۆر دوور لەیەك لەبارەی مەودای ئۆپەراسیۆنەكانەوە بەدی دەكرێن. ئەو پەردەیەی كە بەسەر رووداوەكانی ویلایەتەكانی رۆژهەڵاتدا كێشرابوو، ئێستا لە ساڵانی پێشوو تەنكترەو، پێشبینیی ئایندەیش دوو هێندەی جاران گرانترە، چونكە دەكرێ رووداوەكانی زوو و هەلومەرجی ئێستا تەنها مەزندە بكرێن.

هەواڵی رەسمیی تورك كە دەڵێ كێشەی كورد تەواو ئارام بووەتەوە، بێگومان راست نییە. چەند وردە شەڕێكی ناوچەی باشقەلعەو داگیركاری لە بارزان و سوریاوە مانگی ئەیلول و دوای شەڕی ئاگریداغ، كە ساڵح پاشا دەیوت گورزێكی كوشندەیان لە یاخییان وەشاندووە، راگەیەندراوە. نائارامیی نێوان كوردانی عێراق و بێنیزامیی گشتیی رۆژهەڵاتی توركیاو ئارەزووی تۆڵە سەندنەوەی سزای هێزە توركیەكان و كاردانەوەی دژی پرۆسەكانی بەشارستانیكردن و نوێكردنەوە هەموویان، كاتێك هەوا خۆش دەبێ، خێڵەكان هاندەدەن بۆ چەك هەڵگرتن.

سەرەڕای ئەمە، شالاوە بەهێزەكەی هاوینی رابردووی ساڵح پاشا، شكستی بەكوردەكان هێنا. ئایا هەوڵە جیاجیاكان باشتر رێكخرابوون، لەیەك كاتدا ئەنجام دران؟ ئایا یاخییان خۆیان لە بەرەوڕوو بوو نەوەی شەڕێكی نیزامیی تورك بواردو،

شەڕی پارتیزانییان لەسەرتاسەری وڵاتدا لەئاراراتەوە تا (نەهری)[1]و، بەرەو ڕۆژئاوا تا مووش درێژە پێدا؟ بەدڵنیاییەوە، خەڵك بەسەرباز دەگیرێن‌و، تەنها هاوینێکیش بۆ سەرکوتکردنی یاخیبوونەکە بەس نییە.

کوردەکان دوو شکستیان خواردووەو، زۆرێك لەسەرکردەکانیان لەدەست داوەو، لە سەرکردایەتییان لە ئاگری‌داغ دابڕاون‌و، تەقەمەنی‌و سەرچاوەکانی تریشیان نەماون. ئەوان بەرەو ڕووی شالاوێکی نوێ دەبنەوە کەبەئاشکرا لەڕووی ماددی‌و مەعنەوییەوە، لە چاوپار، بەهێز نییە. هەرچەندە هێشتا توانایی بێزارکردنیان زۆرە، بەڵام ئومێدی سەرکەوتنی یەکجارییان نەماوە.

پێم وایە نەبوونی یەکێتی لە یاخیبوونەکەی کورددا، دەرهاویشتەی بارودۆخە ناخۆشەکان نییە، بەڵکوو نیشانەی لێك نەچوونی ئەو خێڵ‌و تیرە شاخاویانەیە. شەڕی یەکێتی‌و سەربەخۆیی ڕەگەزێکی بەئاگاو هۆشیار دژ بەستەمی تورك، تەنها تیۆریی ڕێکخراوە پڕۆپاگەندەچییەکانی وەك خۆیبوون‌و داشناقدا کەکوردو ئەرمەنی ڕۆژئاواخوازن، یاخود لەمێشکی ئەوانەدایە کەبەو پروپاگەندانە فریویان خواردووە. شەڕەکان زۆرجار لەخۆوە ڕوو دەدەن‌و، هیچ ڕێکخراوێکی ناوەندی ئاراستەیان ناکات. هەروەها پەیوەندییەکی کەم لەنێوان نووسەران‌و جەنگاوەراندا هەیە. کێشەی هەرەگەورەی سیاسەتی تورك بەرامبەر بە گەلی کورد، لەوەدایە کە حکومەت ناتوانێ خۆی بڕیاری لە سەربدات. حکومەت ناتوانێ ژمارەی دانیشتوان کەم بکاتەوە، بەڵام بەرپرسان دەبێ لە پڕۆسەی هێورکردنەوەدا بەڕێگەی قڕکردن( ابادة) ، پشوودرێژو لەسەرخۆ بن.

بی. جەی. ئۆلێری

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٣/٤٢٤، ل: ٦٢، ژ: ١/٣٠

---

[1] واتە شەمدینان کە قەزایەکی ڕۆژهەڵاتی ویلایەتی حەکارییە.(س)

ژ: ۱۰۰

## لە سێرجی. کلارکەوە بۆ مستەر ئێی. هندرسن (۲۳ی حوزەیران گەیشتووە)

ژمارە: ۲۰٤

قوستەنتەنییە، ۱۷ی حوزەیرانی ۱۹۳۱

گەورەم،

ئامـاژە بەنووسـراوی ژمـارە(۱۱۸)ی نیسـانی مسـتەر مۆرگن، خۆشـحاڵم پێتـان رابگەیەنم کە باڵوێزی ئێران لە گفتوگۆیەکی دەسـتەکەمدا وتـی: واپێشبینی دەکات وتووێـژی دیاریکردنـەوەی سـنووری تورکیـا– ئـێران بـەم زووانـە لـەتاران دەسـت پێبکاتەوەو، سەربکەوێ.

۲. لایەنەکان رێککەوتوون لەسەر ئەوەی کە تورکیا دەست لە دوو جێگـەی نزیـك قوتوورو بازرگان کـە رێگـای مـاکۆو بایـەزیدیان بەسـنووردا دەپەڕێتـەوە، هـەڵگرێ. هێنـدە مـاوە، رووبـەری ئـەو شـوێنە دەسـت لێهەڵگیراوانـەی لەسـەرەوە ئامـاژە پێکراون و ئاراڕات دیاری بکـرێ. ئـەوی تورکـان لەراسـتیدا پێویستیانە، ناوچەیەکـە بتوانن بەدەوری شاخەکەدا، لەسەر ئەو خاکە کە ئێستا هی ئێرانـە، دروسـت بکـەن. ئەو جێیەی ئەوان داوای دەکەن ستراتیجییەو، لەبەرامبەریشـدا زەوییـەك دەبەخشـن کە هیچ بایەخ و بەهایەکی نییە.

۳. بەڕێزی وتیشی ئەمساڵ پێشبینیی کێشەی کـورد ناکـات. هاوکـاریی هەرسـێ حکومەتی پەیوەندیدار کە ئێسـتا لەئارادایـە، زۆر شـتی گۆڕیـوە. گـەمارۆدانی شـێخ سەعید، بەقسەی ئەو، زۆر گرنگ بووە. پار تورکەکان خۆیان بێ ئاگا کردبوو، بـەڵام تەواو وریان.

٤. وێنەیەکی ئەم نووسراوە بۆ نوێنەری خاوەنشکۆ لە تاران کۆمیسـاری بـاڵا لـە عێراق دەنێرم.

جۆرج. ئاڕ. کلارك

وەزیری دەرەوە، ۲۷۳/٤۲٤، ل: ۸۹، ژ: ٥٤

## ژ: ١٠١

## لەسێرجی. کلارکەوە بۆ مستەر ئەی. هندرسن (٤ی ئاب گەیشتووە)

**ژمارە: ٢٤٨**

**قوستەنتەنییە، ٢٨ی تەمووزی ١٩٣١**

گەورەم،

ئاماژە بە نووسراوتان ژمارە ٢٥٨ی ٩ی مایسی ١٩٣١، خۆشحاڵم راپۆرتێکی گرنگو پڕ بەهای مستەر رۆبەرتسی سکرتێری یەکەمو مستەر راڤێنزدەیی سکرتێری سێیەمی باڵوێزخانەی خاوەنشکۆتان لەسەر گەشتێکیان بۆ ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتی تورکیا بۆ بەرزبکەمەوە.

٢ـ ئەوەی کە لەم راپۆرتەدا جێی سەرنج بێ سەقامگیر بوونی یاساو نیزامی ئەم هەرێمە نائارامانەداو سەرکەوتنی حکوومەتە لەهێورکردنەوەی کێشەی کورددا.

هەلومەرجی جوگرافیو کەشوهەوا گەشەی باری ئابووریان کردووەتە کارێکی سەخت، بەڵام راپۆرتەکە دەریدەخات کە، لەگەڵ ئەمانەشدا هەوڵی راستەوقینەو جیدی دراوەو ئاماژەیش دەکاتە بەرنامەی هێڵی ئاسنی عیسمەت پاشا.

٣ـ سوپاسی پشکنیاری گشتیی ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتو وەزیرانی ناوخۆو کاروباری دەرەوە دەکەم بۆ ئەو پێشوازیو کار ئاسانیانەی پێشکەش بەمستەر رۆبەرتسو مستەر راڤینزدەیلیان کردووە.

جۆرج ئار. کلارک

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤/ ٢٧٥، ل:٦، ژ:٦

## هاو پێچی ژ: ۱۰۱
## ڕاپۆرتی مستەر رۆبەرتس و مستەر ڕاڤینسدەیڵ لەسەر گەشتێکی ویلایەتەکانی ڕۆژهەلاتی تورکیا

پرۆگرامی گەشت.

ڕەنگە مەبەستی گەشتی ویلایەتەکانی ڕۆژهەلاتی تورکیا، ئامادەکردنی ئەم ڕاپۆرتە نەبووبێ. ئەم گەشتە(٢٦)ی حوزەیران لە فەوزی پاشای سەر خاڵی بەیەك گەیشتنی هێڵە تازەکەی مەلاتیە -دیاربەکرەوە دەستی پێکردو، (١١)ی تەمموز لە تەرابزوون دوایی هات. ئێمە بەشەمەندەفەر تاکۆتایی ڕێگە ئاسنەکە لە مەلاتیەو، لەوێشەوە بە ماتۆڕ بەناو ئەلعەزیز، دیاربەکر، بدلیس ، وان، قەرەکۆسە، قارس‌و ئەرزرۆمدا، کە ١٨٧٩ کیلۆمەتر دەبوو، چووینە تەرابزوون. گەشتەکە لەگەڵ وەزیری ناوخۆو ئیبراهیم تالی بەگی پشکنیاری گشتیی ویلایەتەکانی ڕۆژهەلاتدا کە ماوەیەکی کەم پێش دەرچوونمان لە ئەنگۆرە بوو، ڕێکخرا. هەر بەهۆی ڕێزی ئەمی دواییەوە، لە ویلایەتەکانی سنووری دەسەلاتیدا، وەك میوانێکی پێشوازیمان لێکرا. ئێمە سەرمان لە (٦) لە (٩) ویلایەتەکەی دا.

### ئەنجامی گشتی

گەشتەکە کە لەسایەی پارێزگارییەکی ڕەسمیدا بوو، هێندە خێرا بەڕێوە دەچوو، دەرفەتمان نەبوو بگەینە سەرچاوە سەربەخۆکان، یان ئەنجامەکان لە مەسحێکی سەرتاسەریدا بەراورد بکەین. بۆیە پێمان باش بوو ڕاپۆرتەکەمان وەك گێڕانەوەیەك دابڕێژرێ، لە هەموو شوێنەکانیشدا ڕای خۆمان‌و هەر زانیارییەکی دەست کەوتوو تۆمار بکەین. بارودۆخی ئەو گوندانەی کەتێیاندا ماینەوەو ناوەندە گرنگەکانیشمان، بێ هیچ دوو دڵییەك، باس کردوون، چونکە وامەست دەکەین تەنها بەم شێوەیە دەتوانین ڕووی ڕاستەقینەی هەرێمەکە پیشان بدەین. چەند ئاکامێکی گشتیمان لەلا

گەلاڵە بوو و، دەستپێکی راپۆرتەکەمانیان پێ دەکەینەوە. ئیتر خوێنەر خۆی سەرپشکە بڕیاری پشتیوانیمان دەدات یان نا.

١ـ حکوومەتی ناوەندی، ویلایەتەکانی رۆژهەڵاتی، بەبیانووی دوورییان، تا ئەم ساڵانەی دوایی پشتگوێ خستبوو. سیفەتی شاخاویی ناوچەکە پەیوەندییەکانی سەخت کردبوو و، ئەمەیش بوو بووە کۆسپی سەرڕێی پەرەسەندنی خۆشگوزەرانیی ماددیو، سەقامگیرکردنی یاسا. داگیرکارییە پەیتاپەیتاکانی رووسیایش، بارەکەی نالەبارتر کردبوو. ئەرمەنییەکان کاتی کشانەوەیان لەدواشەڕدا، کاولکارییەکی بەکۆمەڵیان کردبوو و، پاشماوەی ئەرمەنیەکانیان لەگەڵ خۆیاندا بردبوو. حکومەتی کۆمار، خۆراگرانە بەرەورووی ئەم گرفتانەبوو بووەوە. یاخیبوونی ساڵی (١٩٢٥)ی شێخ سەعید، دەریخست هەنگاوی رادیکاڵی پێویستەو، دواتریش پێکهێنانی پشکنیاریی گشتیو دانانی ئیبراهیم تاڵع بەگ بە سەرۆکی، بیانوویان بۆ پەیدا بوو. ویلایەتەکانی ژێر رکێفی ناویراو تارادەیەك مشوورڕیان دەخورێ، کەچی قوستەنتەنییەو ئەنگۆرە لەمە بێبەشن. ئەوان، بەباشیی بارودۆخیاندا، وادەردەکەون شوێنی کارمەندی ناشایستەو گەندەڵ نەبن. هەروەها ئاڵوگۆڕی رێکوپێك لەگەڵ پۆستە زۆرباشەکانی ویلایەتەکانی رۆژئاوادا دەکرێو، هەروەها دەبێ هەموو کارمەندێکی مەدەنیو ئەفسەرێکی سەربازی ئامادەبکرێن تا، وەك پێی دەڵێن، نۆرەکاری خۆیان لەرۆژهەڵات تەواو بکەن. ئەو والییانەی کە بینیمانن، گشتیان جێدەستی زۆرباشیان هەبوە. ئەم والییانە زۆریان گەنجنو، پێویستیی هەرێمەکانیان دەزاننو، هەر کە وەرزو فشاری ئیشوکار دەرفەت بدەن، بەشەکانی ناوچەکەیان بەسەر دەکەنەوە. بەردەوام دەوترێ: ویلایەتەکانی رۆژهەڵات لەماوەی (دە) ساڵدا سنوورێك دروست دەکەن کە لەوانەی رۆژئاوایان جیابکاتەوە. ئەم بۆچوونە، بەتایبەتی لەدەمی قەیرانەکاندا، زۆر باوبووەو، بێگومان رۆژهەڵاتی هەرگیز ناگاتە ئاستی خۆشگوزەرانیی رۆژئاوا، بەڵام بڕوابەخۆبوونی پێشبینیکراوی ناوچەکە، بایەخی خۆی دەبێ.

٢ـ شارە هەرێمیەکان، هەریەکەو بەپلەیەکی جیا، خەریکی بڵاوکردنەوەی رۆشنبیری‌و گیانی نوێی وەرگیراوی ئەنگۆرەن. ئەمانیش، وەك نیازی بەئەورووپایی بوونی ئەنگۆرە، دەیانەوێ وەك دەوڵەتانی باڵکان دەست بە بەرەوپێش چوونێکی مامناوەندی، بەڵام راستەقینە، بکەن. گوندەکان هێشتا بەم بیرە نوێیە ئاشنانەبوون، بەڵام بەتێپەڕبوونی کات دەکەونە بەر کاریگەریی شارەکان‌و قوتابخانەی سەرەتایی‌ی گوندە گەورەکان‌و خولی شەوانەی ئەو قوتابخانە بۆ مێرد منداڵان‌و خزمەتی سەربازی.

٣ـ لە هەموو جێیەك، داوای هێڵی ئاسن دەکرێ. هێڵی ئاسن بیرو هۆشی تورکی داگیرکردووەو، بەگشتی بە پێویستییەکی رزگاربوونی دەزانن. خەریکە بڕیار لەسەر درێژکردنەوەی هێڵی سیواس بۆ ئەرزڕۆم دەدرێ. هەروەها پرۆژەیەکی بنیاتنانی لقێك، لە عوسمانییەی (٦٣) کیلۆمەتری باکووری رۆژئاوای دیاربەکرەوە بۆ مووش‌و تادوان (Tadwan)[1]ی کۆتایی رۆژئاوای گۆلی وان، لەئارادایە.

جا لەبەر زۆر دووری‌و سەختیی سەرماو سۆڵەی زستان‌و فراوانیی ئاڵوگۆڕی سەرەکی (ناردنە دەرەوەی دانەوێڵەو ماڵات‌و هێنانی پێداویستیی بیناکردن‌و سووتەمەنی‌و ئامێرو.....هتد)، رەوانییە رەخنە لەبڕیاری دروستکردنی رێگەی ئاسن لەپێش جادەبگیرێ. جگە لەمە، هێڵی ئاسن، ئەگەر جموجۆڵی هاتوچۆ دەست پێبکات، کەمترین چاککردنی پێویستە، بەڵام جادەکان سێ‌ئاستی (خراپ‌و زۆر خراپ‌و تەواو لەکەڵك کەوتوو) یان هەیەو، پێویستە دروست بکرێنەوە. کاڵا ناردنە دەرەوە، تائەوکاتەی هێڵی ئاسن دەگاتە ناوچە دوورەکان، تەنها لە مەڕو ماڵات‌و وڵاغدا، کە خۆیان دەتوانن بگەنە بازاڕو بەندەرەکان، دەمێنێتەوە. خۆ هەتا ئەو هەرێمانەیش کاڵاناردنە دەرەوەیان زیاد نەکەن. جوتیاران ناتوانن ئاستی گوزەرانیان بەکڕینی بەرهەمە دەرەکیەکان بەرزبکەنەوە. کشتیاران گۆشت‌و نانیان زۆرەو نرخی بەرهەمە کشتوکاڵیەکان، بەتایبەتی دانەوێڵە، وای کردووە ئەوانەیان کە

[1] تاتوان، ناحیەیەکی باشووری رۆژئاوای گۆلی وانە لە ویلایەتی بدلیس.(س)

شایانی بردنــە بـازاڕ نـین، زیـاتر بـەکار بـهێنرێن. هەسـتمان کـرد هیـچ شـتێکی وەك ناخۆشـیو برسـێتی لــە گوندەکـاندا بـەدی نـاکرێ، بـەڵام خۆشــگوزەرانییەکی راستەقینەیشیان تێدا نییە. خۆشیو لەش ساغیش، بەژمارەیەکی یەکجار کەمی دارو خانووی لەقوڕ دروستکراوو بەتەپاڵە گەرمکراو، دەستەبەر نابن، ئەو هەرێمانە، تەنها بـەهۆی هێڵـی ئاسـنەوە، دەتوانـن سـووتەمەنیو کەرەسـتە پێویسـتەکانی خـانوو دروستکردن بەئاسانی دابین بکەنو، نرخ لەسەر ئەو بەروبوومە خۆجێییانـە دابنێـن، کەدەیانەوێ ئاڵوگۆڕیان بکەن. هەندێ شت بۆ چاککردنی بـەخێوکردنی مـەڕوماڵاتو چۆنایەتیی بەرهەمە شیرەمەنییەکان کراوەو، هێشتا زۆریش ماوە بکرێ. سـەرەڕای ئەمە، دەشێ گومان لەوە بکرێ کەناوچە دوورترەکـانی ویلایەتـەکانی مـووشو وانو بایەزیدو ئەرزڕۆم، بەر لەبەرچاوگرتنی درێژیی زستانو سروشـتی شـاخاویی زۆربـەی هەرێمەکەو تەرخانکردنی تەنها بەرزاییەکانو بنکی دۆڵـەکانو بـۆ کشـتوکاڵ، بگەنـە ئاستێکی بەرزتر لـەوەی ئێسـتای ژیانیـان، یـاخود هاوکـاریی پـتر لـەزیادبوونی ئـەو ژمـارە کەمـەی ئێسـتای دانیشـتواندا بکـەن. جـا کەبەرهەمـهێنانی ئـەو بـڕە زۆرەی دانەوێڵە هێندە گرفت بێو، بەخێوکردنی مەڕوماڵاتیش بەتەنـها بـەس نـەبێ، کەواتـە راسـترین چارەسـەری ئـابووری پرۆژەیـەکی فراوانـی چـاندنی دارسـتانە. لێژایـیی چیاکان تا رادەیەکی زۆر وادەرناکەون کە خاکەکەیان راماڵرابـێو، رێ لـەم پرۆژەیـە بگرێ. بەڵام ئەم کارە هێندە گەورەیـەو، گەڕانـەوەی هاوڵاتیـان بـۆ ئـەو دەڤەرانـە ئـەوەندە دوورە کەشـتێکی لـەم جـۆرە پێشـبینی نـاکرێ بـۆ ئـەم نەوەیـە. راسـتە رێکخراوێکی دۆستی دارو درەخت هەیـە بـەناوی "پاراسـتنی دارو درەخـت- ئاغـاچ کۆروما جەمعییەتی"یەوە، بەڵام هێشتا کارو چالاکیەکانی بـۆ خۆشـکردنی سنووری شارو گوندەکان، نەگەیشتوونە ئاستی زیادکردنی ناشتنی دارو درەخت.

٤. کێشەی کورد بەگرفتی ئابوورییەوە بەستراوە. کوردەکان زۆر دەمێکە لەگـەڵ داگیرکردندا راهاتوونو، ئەو شاخانەی کە لەسـەریان دەژیـن، خۆراکـی تـەواویان بـۆ دابین ناکەن. بۆیە جارجار پەنا دەبەنەبەر پـەلاماردانی ناوچـە خۆشـگوزەرانەکانو،

دەسەڵاتی حکومەت ڕەتدەکەنەوە کە دەیەوێ قەناعەتیان پێبکات واز لە ژیانی کۆچەری بێنن‌و، ملکەچیان بکات باج بدەن. هەندێکیان هێشتا لەسەردەمی شوانکارییدا دەژین‌و، ڕەنگە مەحاڵبێ هۆی شەڕو شۆڕی ناوبەناویان، وەك خۆیبوون لەئەمریکا پڕۆپاگەندەی بۆ دەکات، ئارەزووی ناڕەزایی‌ی ناسیونالیزمی کوردی بێ. خەڵکێکی هێندە کەم ڕۆشنبیرن، کەزۆربەیان هیچ جیاوازییەکی دینییان لەگەڵ ڕەگەزی فەرمانڕەوادا نییە، بەتێپەڕبوونی کات تێکەڵ دەبن‌و دەتوێنرێنەوە. ئێمەیش بڕوامان بەو چەندین دڵنیاکردنەوەیە کرد کەدەریدەخەن پرۆسەی بەتورککردن وردە وردە بەرەوپێش دەچێ. زانیاریی تایبەت بەم مەسەلەیە کە لە شوێنە جیاجیاکان دەستمان کەوتووە، لەکۆتایی‌ی ڕاپۆرتەکەماندا دەخەینەڕوو.

### فەوزی پاشا[1]- مەلاتیە

ئەم ڕێگەیە کە گرووپێکی سویدی– دانیمارکی دروستیان کردووە، شەش مانگێکە کاری پێدەکرێ. شەمەندەفەرێکی لێکدراو، هەفتەی سێجار، بۆ پۆستەی خێرای تۆرۆس بەسەریدا دەڕوات‌و، لە (١٢)سەعاتدا(٢٥٠) کیلۆمەتر دەبڕێ. سەرەتا هێڵەکە شۆڕ دەبێتەوەو، بەدەشتی گۆلی گاوور Giuur Golu دا کە ژمارەیەکی زۆر جەلەبی ئاژەڵی تێدایە، درێژ دەبێتەوە. ئەلۆغلۆو( Eloglu) وێستگەی مەرعەشەو، لەپشت زنجیرە گردێکی نزمی باکوورەوە لەچاو ون دەبێ. مرۆڤ دەتوانێ لەوێستگەی نارلی (Narli) [1]یشەوە، کە جادەی مەرعەش– غازی عەینتابی تێدا لەگەڵ هێڵە ئاسنەکەدا یەك دەبڕن، بچێتە ئەلۆغلۆو. هێڵەکە دەچێتە هەرێمێکی شاخاوی کە دوور بەدوور دارستانی هەن‌و، بەدۆڵی (ئاق سۆ)دا هەڵدەکشێ‌و، سێ دەریاچەو پاشتریش قەراغ ئاوێکی نزم دەبڕێ‌و، ئەمجا دەگاتە

---

[1] شوێنێکی نزیك بە سەرووی قەزای ئیسلاحییەی ڕۆژئاوای شاری غازی عێنتابە. پێشتر سەر بە ویلایەتی (جەبەل بەرەکات) بوو.(س)

[1] شارۆچکەیەکی نزیکی باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری مەرعەشە. (س)

دەربەندی سەرنج ڕاکێشی قـاپی دەرە( Kaoi Dere)[1]. لـە لوتکەکەوە دەچێتـە بەرزاییەی باش داچێنراوی وێران شەهر" Viran sehir"[2]و، لەوێوە، بەدەڤـەرێکی رووتەن‌و بێ دارو درەختدا، بەرەو مەلاتییە دەچێتە خـوارەوە. ژمـارەی گەشـتیاران زۆربوون‌و، شەمەندەفەرەکە عەرەبانەیەکی زۆری پڕکەلوپـەلی پێوەبـوو. ئـەو رایـەی کە گوایە هێڵە ئاسنینە تازەکانی تورکیا ستراتیجین، ئـەم هێڵـە ناگرێتـەوە، چونکـە کاتی شەڕ هێڵی فەوزی پاشا لە سنووری باشوورەوە دەبێتـە خـاڵێکی زۆر بـێ‌هێزو، ئیتر سەلامەتترین ڕێگەی مەلاتیە، لە سیواسەوە دەبێ. لەلایەکی‌ترەوە، ئەم هێڵە لە مەرسینەوە دەبێتە دەروازەیەکی ئابووری بەرەو هەرێمێکی گەورەو سەخت.

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤/٢٧٥،ل: ٧-٩، ژ: ١/٦

**مەلاتیە**

ویلایەتی مەلاتییە کە لە رۆژئاوای رووباری فوراتـەو، ناچێتـە بازنـەی دەسـەلاتی ئیبراهیم تـاڵع بەگـەوە، لـە هـەرێمێکی نـاوازە دەچـێ، تەنـها ئێرەو ئـەرزڕۆم لـەو ویلایەتانەی کە سەرمان لێدان، زۆرترین دانیشوانیان هەبوو.

ژمارەی دانیشتوانی ئەم شارە (٣٠٠)هەزار کەسە. قەیسی، سـامانی گەورەیـەتی کە لە دەوروبەری شار، بەرهەم دەهێنرێو، لە ساڵێکدا بڕی (١) ملیۆن لیرەی تورکی داهـاتی دەبێ، بەداخـەوە، بەرهـەمی ئەمسـاڵ، بـەهۆی بـارینی بـەفرێکی درەنـگ وەختەوە، بەگشتی خراپ بووە، هەروەها ئەفیوون سـەرچاوەیەکی تـری سـەرەکیی داهاتی ئەم ناوچەیەیە، بەڵام بەم دواییە بەهای کیلۆیەکی لە (٤٥)ەوە بۆ (٨) لیرەی تورکی دابەزیوە، تووتن‌و پەمۆ لـە دەوروبـەری (ئادیامـان– Adiaman)[3]ی باشـووری ویلایەتەکە، بەڕێژەیەکی زۆر بەرهەم دەهێنرێن.

---

[1] شارۆچکەیەکی باکووری رۆژهەلاتی شاری مەرعەشە.(س)

[2] شارۆچکەیەکی باشووری ناحیەی پۆلاتی باشووری رۆژئاوای شاری مەلاتیەیە.(س)

[3] واتە (حصن منصور)، قەزایە. (س)

مەڵاتیەی پایتەختی ئەم ویلایەتە، شارێكی جەنجاڵی (٢٠) هەزار كەسییە، ئەم شارە (١٠٠)ساڵە دروست بووە، چونكە شارە كۆنەكە كە چەند میلێك لە فورات نزیكتر بووە، كاتی شەڕ لەگەڵ میسردا ماوەیەكی درێژخایان داگیرو چۆڵ كراوبووە.

گوندێكی گەورەی نارێك كەوتووتە دووریی (٢٥) میل لەم شارەوەو، لەناو باخێكی دڵگیری قەیسیدایە كە بەشێوازی كۆن ئاودەدرێ. ئەم گوندە جادەیەكی تەسكی بەرزو نزمی هەیە كەجێی نارەزایی دەسەڵاتدارانە. بەڵام گەیشتنی هێڵی ئاسن پێویستییەكانی بیناكردنی زۆر هەزاران كردووەو، دەرەنجامەكانیشی ئاشكران.

پایەی ئاسن، یەكەمجار دەتوانرێ بهێنرێو، نرخی یەك كیس چیمەنتۆ لە (٩-١٠)ەوە بۆ (٢,٥) لیرەی توركی هاتووە خوارەوە، كاتێك وێستگەی وزە، چوار پێنج ساڵ لەمەوبەر دروستكرا، گواستنەوەی ئامێرەكان لە سامسۆنەوە (٥٠) هەزاری لە كۆی گشتی خەرجیی (٣٢٠) هەزار لیرەی توركیی تێچوو.

ئێمە ئەم وێستگە نوێیەی كارۆئاویمان پشكنی كە كۆمپانیای (Siemens Schuuckert) دابینو ئەندازیارێكی ئەڵمانی سەرپەرشتیی كردووە، كۆمپانیا كە لە باجی (٥٠) ساڵ بەخشراوەو، حكومەت هاوكاریی ماددی لەدامەزراندنیدا كردووە.

كە عیسمەت پاشا دوای چەند ساڵێك دووری سەر لە زێدی خۆی دەدات، پاساوی ئەوەی دەبێ، بۆ گەشەكردنێكی ماددی كە لەسایەی حكومی ئەودا بەدیهاتووە، پیرۆزبایی لەخۆی بكات، بەڵام نازانرێ ئایا لەو پێشكەوتنە رووناكبیرییەی مەڵاتیە رازییە یان نا. مەڵاتیە، بەپێچەوانەی شارەكانی بندەستی ئیبراهیم تاڵع بەگەوە، لە تۆپی پێو دیدەوانیی كوڕانو سەمای نوێ بێبەشە، بەڵام ناوەندێكی وەهای ئیسلامیشە كە دانیشتوانی چوار پێنج ساڵ بەر لە ئێستا، بێ یارمەتیی هیچ لایەك، مزگەوتێكی تازەیان بە بەرد دروستكردووە. ئەم شارە قوتابخانەی ناوەندیو سەرەتایی تێدایەو، بینایەكی تازەیش بۆ سەرەتایی لە بەرد بنیات دەنرێ، هەروەها ئۆجاغێكی لێیە كە پەیوەندیی بە پارتی گەلەوە هەیەو، كاتێ سەرمان لێدا كەسی

تێدا نەبوو. کلینیك (عیادە)ی تەراخوما خەریکی چارەی تووشبووانی ئەم نەخۆشییەیە کە کاتی شەڕ لە سوریاوە هاتووەو، لە خوارووی ویلایەتەکە زۆر بڵاوە، بۆیە رێکخراوی بەرەنگاریی تەراخومای تێدا جێگیربووە.

تۆفیق بەگی والی، هەژدەمانگەو، لەو ساتەوەی نەزمی بەگ پێش ئەو گوێزراوەتەوە بۆ غازی عەینتاب، هاتووەتە ئێرە. تۆفیق بەگ پێشتر والیو ئەمجا سەرۆکی شارەوانیی برووسەی زێدی خۆی بووە، ماوەیەك لە ڤیەنناو بۆداپست بووە، بەڵام پێناچێ بەزمانی بیانی بدوێ. کەسێکی چوارشانەیەو لە بازرگانێکی ئینگلیز دەکات، ئۆفیسەکەی پاكو خاوێنەو، پۆستەی سەرجەم کاروبارەکانی پێدەگات، بەداخەوە، لەبەر قەرەباڵغیو بەرهەمهێنی هەرێمەکە، ساڵی تەنها جارێك دەتوانێ سەفەربکات.

هێڵە ئاسنەکەو، کۆتایی مانگی ئاب تاسەر رووباری فورات تەواو دەبێ، هەموو شتێ، جگەلە هێڵی ئاسنو بەرد رێژکردن، تەواوبوون، پردێکی پتەو کە سێ کەڵەپردی بەردی لە ناوەڕاستی ئاوەکەدا هەیە، نزیکەی (١٠) کیلۆمەترو لەسەر بەندەری ئیسۆغلوو[١] پێشکەوتنی باشی بەخۆوە دیوە، بەڵام کارەکانی بەهۆی لافاوی ناوەختی نائاساییەو دواکەوتوون. جێگری ئەندازیارە دانیمارکیەکە پێی وتین:

ساڵێکیترو ئەم کاتانە ئامادە دەبێو، دەست بەکاری بەشەکانی تری هێڵی سەر رووبارەکەیش کراوە.

---

[١] رەنگە (ئیزۆلی) بێ کە ناحیەیەکی باشووری رۆژاوای شاری ئەلعەزیزە لەسەر رووباری فورات. (س)

## مەلاتیە- ئەلعەزیز

ڕێگەکە، بەناوچەیەکی بەرزو نزمو ناوگردی بێ دارو درەختدا، دەگاتە فوراتو، لە بەندەرێکی ساکارەوە لە ئێزۆغلوو دەپەڕێتەوە. هەروەها چەند پایەیەکی بەردینی پردێك کە هی سەردەمی شەڕن، بەدی دەکرێن. ڕێگەکە، لەوبەرەوە، بەهۆی بارانی خوڕی سێ ڕۆژ لەمەوبەرەوە، تەواو لەناوچووە، ئەو بارانە ئۆتۆمبیلێکی فۆردی بردووەو، وەك بینیمان تەنها سوکانەکەی دۆزراوەتەوە، ئێستا ئۆتۆمبیلەکە بە ڕووبارەکەدا کۆمورخان Komur Han[1] دەچێتە خوارەوە. گرووپی ڕێگەی ئاسن، لەدەمی دەربەندەکەدا، سەرگەرمی دروستکردنی پردێکن کە لە یەك تاق پێکدێو، مانگی نیسان تەواو دەبێ، جادەکە، لەو خاڵەدا، بەچەمێکدا بەرز دەبێتەوەو، بەناو هەرێمێکی چێنراوی بێ دارو درەختدا تێدەپەڕێو، ئەمجا بەرەو دەشتی بەپیتی ئەلعەزیز شۆڕدەبێتەوە.

### ئەلعەزیز:

ژمارەی دانیشتوانی ئەم ویلایەتە زۆر لە هی مەلاتیە کەمتر نییەو، نزیکەی (٢٢٠)هەزار کەس دەبێ. لۆکە گرنگترین بەرووبوومی کشتوکاڵییەتیو، ساڵانە (٥٠٠) تەنی لێ بەرهەم دێنێ. کارگەیەکی ڕستن لەم شارەدایەو، داوای ئامێری ئینگلیزی بۆ کراوە، نموونەی چنراوەکە نێرراوەتە بریتانیاو، جۆرەکەش باش دەرچووە، ئەو دەشتەی کە پایتەختەکەی تێدایەو بەشاخی ڕووتو قووت دەورەدراوە، دانەوێڵەی تێدا چێنراوە. ئەم دانەوێڵەیە تەنها بەشی ناوخۆ دەکات. کەچی ویلایەتەکانی سیواسو ئەرزڕۆمو دیاربەکری هاوسێی، بەناوەندی گەورەی بەرهەمهێنانی دانەوێڵە دانەنرێت. ئاودێری بە ئاوی گۆلی گۆڵچوك (Golcuk)[2]، پرۆژەیەکی کۆنی بەپیتکردنی بووژاندوەتەوە. هەروەها شارەزایەکی هۆڵەندی نەخشەیەکی بەم دواییە

---

[1] ڕەنگە (گورخانە) بێ کە شارۆچکەیەکی نزیکی ڕووباری فوراتە لە باشووری ڕۆژهەڵاتی ئێرزیل بە دیوی شاری مەرعەشدا. (س)

[2] گۆلاوێکە نزیك بە باشووری ڕۆژهەڵاتی شاری ئەلعەزیز. (س)

ئامادەكردووەو، بەو پێیە تونێلێكى (٦٠٠) مەترىو جۆگەیەك بەهەمان درێژیى دروست دەكرێن. بەشى زۆرى باكوورى ئەم ویلایەتە كە دەكەوێتە پشت موراد سۆى لقى خوارووى فورات، لە سنوورى دەرسیمدایە. دەرسیم ناوچەیەكى شاخاویى جێ لەوەڕەو، دانیشتوانەكانى كوردنو، بە دارگوێزو بەڕووو ورچو یەكانەكانیدا جیادەكرێتەوە. كانە مسە بەناوبانگەكانى ئەرغەنى- مەعدەن دەكەونە نزیك سنوورى باشوورى ویلایەتەكەو، هەر كە هێڵى ئاسنیان پێ گەیشت، بەشێوازى نوێ، دەكرێنەوە. ئێستا داخراون، بەڵام ڕۆژانە (٣٠) تەنیان هەر لێ دەردەهێنرێ.

ئەم كانانە موڵكى كۆمپانیایەكن كە لە گروپێكى ئەڵمانىو بانكى ئیش (Is Bankasi) كە بووەتە میراتگرى بانكى ئیعتمادى میللى (Milli Itimat Bankasi) پێكهاتووە.

ئەلعەزیز لە مەلاتیە تازەترە، دانیشتوانى قەڵاى بەردینى خەرپووتى یەك دوو میلى باكوور، (٤٠) ساڵ پێش ئێستا ئەو قانەعەتەیان لەلا پەیدا بوو كە پاش كارى ڕۆژانەى دەشتو دەریان ئەوەندە ماندوو دەبن، ئیتر ناتوانن سەركەون بۆ قەڵاكە، بۆیە شوێنێكى تازەیان نزیك بەشوێنى كارەكەیان دروستكرد. ئێستا تەنها چەند هەزار كەسێك لە خەرپووت ماونو، ئەلعەزیز شارێكى كەم گەشەكردووى سەركەوتوو ترەو، دانیشتوانیشى (١٢-١٥)هەزار كەس دەبن، جادە فراوانەكانیشى جێى شانازین. خانووەكان، وردە وردە شوێنى ئەو ماڵە ساكارانە دەگرنەوە كە سەریان بەتەنەكەگیراوە. گیانێكى پێشكەوتنو بەهێزبوونیان لەناودایەو، دەیانەوێ لە مەلاتیە باشتربن. گەیشتنى هێڵى ئاسن قازانجێكى كاتیى، لەم پێشبڕكێیەدا، بەم شارە بەخشیوەو، عیسمەت پاشایش لەم بارەدا سوودى خۆى هەبووە.

وا خەریكە دەرەنجامەكانى ڕێگەى ئاسن لەئەلعەزیز دەردەكەونو، نرخى چیمەنتۆ لێرەش، هەروەك مەلاتیە، زۆر دابەزیوە. خەریكە وێستگەى وزەى كارەبا دروست دەكرێو، داواى دەزگاكەیشى لە (Ruston & Hornsby)كراوەو، (Morell of Milan) ئەركى بەستنى لەئەستۆدەگرێ. سیستمى وشككردن بەجێ دەهێنرێو، دواتر ئاو بۆ شارەكە دابین دەكرێ. بارى تەندروستیان باشەو، تەراخوماو مەلاریا كەمن. سەرەراى لقى بانكەكانى عوسمانىو كشتوكاڵى، بانكى ئابوورى ئەلعەزیز

(Elaziz Iktisat Bankasi)ی خۆجێییش هەیەو، سەرمایەکەی (١٠٠) هەزار لیرەی توركییە.

ئەلعەزیز لەڕووی ڕووناکبیرییەوە، زۆر لەپێش مەلاتیەوەیە. سەما زستانان دەکرێو گروپێکی دیدەوانیی کوڕ هەیەو، تۆپی پێش پەیدا بووە. ئۆجاغی پێشووی تورك، تائێستا وەك یانەیەك کار دەکاتو، دیسان لقی ناوخۆیی پارتی گەل ماوەیەکی تر دەکرێتەوە. ساڵێ (١٩٢٥) هیچ بنکەیەکی ئەم حیزبە لە ئەلعەزیز نەماو، بەرپرسەکەی، لەبەر پێویستیی زۆر، نێردرایە ڕۆژئاوا.

ئەلعەزیز، جگەلە قوتابخانەی سەرەتاییو ناوەندی، زەمینەی شیاویشی بۆ قوتابخانەکانی سەربازیو ڕاهێنانی مامۆستایانو لانەی بێ باوکان ڕەخساندووە.

نیزامی بەگی والی تازە هاتووەتە ئێرەو، فەخری بەگی پێش ئەم چەند مانگێکە کۆچیی دوایی کردووە. ئەم پێشتر والی دیاربەکر بووەو، لەوێ ئەدمۆندزی دیوەو، ئەوەیشی گێڕایەوە کە ئەدمۆندز بەهۆی خواردنەوەی بڕێکی زۆری دۆوە، حاڵی شڕبووە. ئەم هەروەها والیی وان بووە. نیزامی بەگ ڕەبەن بوو زۆریش لەماڵەکەیدا هێشتینیەوەو، ناودارانی بۆ بینینمانو خوانی نیوەڕۆ بانگ کرد.

ئەو کاتە لێیان پرسین: جلی شەومان پێیە، یان بۆمان ئامادە بکەن؟ ئەم بە فەڕەنسی دەدوا. خوڕەم بەگی سەرۆکی شارەوانی کەپیاوێکی گەنج بوو، ئەم دواییە وازی لە خزمەتی کونسوڵی لەڤیەننا هێنا بوو. Cok kibar Komilfo bir adam[1]. نیزامی بەگ، هەرچەندە خەڵکی قوستەنتەنییە بوو، بەلام ئەلعەزیزی بەلاوە خۆش بووە هەروەها وتی: ئێرە بۆ هەموو کارمەندان دلگیرە. ئەو هاوکاریی والییەکانی ئەنگۆرەو سمیرناو قوستەنتەنییەی هەبوو، بۆیە دەیتوانی بەردەوام گەشت بکات. ناوبراو زۆر ئارەزووی ئەسپ سواری دەکردو، دوێنێ لە سەردانی دەرسیم گەڕابووەوە. فەرمانبەرێکی بەتواناو لێهاتوو دیار بوو.

[1] پیاوێکی(...............) زۆر گەورەیە، بۆم ساخ نەبوەوە (Komilfo) چییە. ڕەنگە هەڵەی چاپی تێدا بێ. (س).

## ئەلعەزیز- دیار بەکر

جادەکە بە دەشتی ئەلعەزیزو، پاشتر چیاکانی سنووری خواروویدا تێدەپەڕێ. ئەم دەشتە لە تەختەی شەترەنج دەکاتو، شاخە بەفراویەکانی دەرسیمیش لە پێشیەوە دەردەکەون. ڕێگەکە، پاش ئەوەی دەگاتە لوتکە، بەرەو گۆلی گۆلچوك شۆڕدەبێتەوە. ئەم دەریاچەیە بەهۆی جۆگەیەکەوە کە دەڕژێتەوە ئەرغەنی سۆو ئەمیش دەچێتەوە سەر دیجلە، وشك کراوە. ڕێگەکە بەم دۆڵەدا دادەگەڕێو، بە(مەعدە)دا، وەك بەگشتیی پێی دەڵێن، ڕەت دەبێ. نیوەی خانوەکانی ئێرە چۆڵنو، دانیشتوانیشی لە (٦٠٠٠) ەوە بوونەتە (٣٠٠٠)، داری دوور لەیەكو کورت کورت نیشانەی دارستانەکانین کەبۆ سووتەمەنیو ئیش‌وکاری مس رووتێنراونەوە، چەمەکەیش کە ماسیی تێدا ناژی، بەناو سەوزاییەکی قەشەنگدا دەڕوات. ئەم جادەیە پاش ماوەیەکی کەم بەدۆڵەکەدا سەردەکەویو دەچێتە دەشتی بەرزی دیاربەکر کە خاکە بەپیتەکەی بەروبوومێکی زۆری دانەوێڵەی هەیەو، لەوەڕی ژمارەیەکی زۆری ڕانەمەڕو ڕەشە وڵاغ دابین دەکات. شارۆچکەی عوسمانییە والە هەردوو دیوی سەر ڕێگەکە، ئەمە بەپێچەوانەی نەخشەکانەوە کە بە (ئەرغەنی) ناویان بردووەو، لەدیوێکی جادەکەدایە، بۆ یەکەمجار لێرە گەنمە شامیمان بینیو، ئیتر تا نزیکی تەرابزوون نەماندییەوە.

## دیاربەکر

شتێکی گرنگی ئەوتۆ نییە لەبارەی دیاربەکرەوە ئاماژەی پێبکەین. مستەر هێڵمو مستەر ئەدمۆندز زۆر بەدرێژی لەم شارە دووان. چونکە پشکنیاری گشتی لێرە نەبوو، لەڕاو بۆچوونی سەبارەت بەبارودۆخەکە بێ بەش بووین. دیاربەکر، وەك مستەر ئەندمۆندز بۆی دەرکەوتبوو، شێوەیەکی ئەنگۆرەیە. هەمەچەشنیی ئەفسەرو فەرمانبەرو ژنەکانیان، خاسیەتێکی تایبەتیان بەم شارە بەخشیوە. ژمارەیەك ئافرەت کە جلی ئەورووپی دەپۆشن، پاش ڕۆژئاوابوونو، کاتێ خەڵکی شار بۆ

هەڵمژینی هەوایەکی خاوێن دەچنە پارکێکی دەرەوەی دەروازەی ئەلعەزیز، دەبنە جێی سەرنج. دەستەیەك سەرباز مۆسیقای ڕۆژئاوایی پێشکەش دەکەن، وادیارە گوێگرانیش بەو ئاوازە گومان لێکراوانە خۆشحاڵن. ڕەنگە بەشە رووخاوەکانی دیوارەکان " ڕێگە بدەنە هەوا تابێتە ناو شارە کۆنەکە". بەڵام هەرچۆنێك بێ هەوای دەرەوە بەشەو لەهی ناوەوە خاوێنترەو، بێگومان دروستکردنی بینا لەدەرەوەی دیوارەکان لەئایندەدا بڕیارێکی ژیرانەیە. بەڵام هێشتا ئەم شارە تازەیە گەشەیەکی ئەوتۆی بەخۆوە نەبینیوە. ئێستا بەکارهێنانی خشتی قوڕ قەدەغەیەو، چاوەڕێی ئەوکاتە دەکرێ کە هێڵی ئاسن چیمەنتۆ بگەیەنێتە دەروازەی شار. هاتوچۆ ئێستا لەماردینەوە دەکرێو، دواکەوتنی ئەو ڕێگەیەیش زۆر جێی نیگەرانییە. بیرەی قوستەنتەنییە کە لە ئەلعەزیز خواردمانەوە، لە دیاربەکر کەم بەکاردێ، چونکە تادەگاتە جێ خراپ دەبێ.

د. غەفوور بەگی سەرۆکی شارەوانی زۆر پەرۆشی خۆشگوزەرانی زێدی خۆیەتی. ئەو، وەکو پزیشکێك، بەختەوەرە کە ئاوی زۆرو پاکی دابین کردووە. بەنیازیشە کەڕێگە ئاسنەکە گەیشتە دیاربەکر، بۆریی تیرە (٨٠) سانتیمەتر داوا بکاتو، گشت ناوچەکە بە قەرەجەداغ ( Karaca Dag )[1] بگەیەنێ. ئێستا بۆریە کۆنەکانی سێ‌تاچوار کیلۆمەتری دەرەوەی دیوارەکەیش چاککردوەتەوەو، تا ئەوکاتەی بەشەکەی تری لێ‌دەبەسترێ، دایخستوون. تەراخوماو مەلاریا لەویلایەتەکە کەمنو، هەنگاوی باشیش بۆ لەبەین بردنیان نراوە. ئامێری نوێی ئەڵمانی، ئەم دواییە، لەئاشی سەرەکی ئاردی شاردا دانراوەو، دەزگایەکی تاڕادەیەك سادەی کارەبا کەبەشی تەنها شەقامو چەند ماڵێك دەکات، نوێ دەکرێتەوە. بڕێکی کەم ئاوریشمیش بەرهەم دێو، لەگەڵ دانەوێڵەو مەڕو ڕەشەوڵاغو خوریو کەرەو برنجدا، سامانە سەرەکیەکانی ویلایەتەکە پێك دەهێنن. نزمیی بەهای بەرهەمە کشتوکاڵیەکان، هیچ کێشەیەکی ڕاستەقینەی نەهێناوەتە ئاراوە، بەڵام هەندێ

---

[1] شاخێکی باشووری ڕۆژئاوای ویلایەتی دیاربەکرە. (س)

مەترسی لە ئاکامی بەردەوام دابەزینی نرخەکاندا هەیە. دڵخۆش بووین کە لە د. غەفوور بەگمان بیست شارەوانی بەرامبەر بەسامانی میژوویی دیواری شارەکەیان، کەبەشێکی هی سەردەمی فەرمانڕەوایی مەلیك ساڵحی سەلجوقییە، هۆشیارەو، وتیشی وێرانکردنی بەشێکی دیوارەکەیش زیانبەخش بووەو، ئیتر وێران ناکرێ.

ئیبراهیم تالع بەگ، ئەگەرچی لەسەفەربوو، لەماڵەکەیدا خۆشمان گوزەراند. ماڵەکە، هەروەك نەریتی ناوخۆ، بەدەوری حەوشەکەیداو بەبەردی رەشی گڕکانیی هەرێمەکە خۆی دروست کراوە. ئەم بەردانە گەرمای خۆر وەردەگرن‌و، پاش رۆژئاوابوون دەیدەنەوە. ئێمە مومتاز بەگی جێگری‌وقەدری پاشای راوێژکاری سەربازیمان بانگ کرد. ئەمی دوایی هەستێکی باشی لەلا دروست کردین‌و، وادەردەکەوت کەئەو عەقلیەتە تەسك‌و گومان لێکراوەی ئەرکانی گشتیی تورکی نەبێ. هەروەها دەرکمان پێکرد، بەهۆی پۆستی راوێژکاری سەربازی‌و بەتایبەتی هەڵبژاردنی خۆشبەختانەی خاوەنەکەیەوە، بەگشتی هاوکارییەکی باش لەنێوان دەزگا مەدەنی‌و سەربازیەکانی دیاربەکردا هەیە.

## دیاربەکر- بدلیس

باشترین رێگەی هاوین بە" سیلوان"دا تێناپەڕێ، بەڵکوو بەهێڵی دیجلەداو لە جۆگەی باشووریەوە بەبەندەرێکدا تا باتمان سۆ دەڕوات. باتمان سۆ لە شوێنێکەوە سەرچاوە دەگرێ کە بە ساسۆن ناسراوەو، بەکۆمەڵکوژیی ساڵی (١٨٩٦)ی ئەرمەنیەکان بەدناوە. مەلەتۆداغ(Meleto Dag)ی خال خاڵ بەفرین بەرزایی‌ی سەرەکیی هەرێمەکەیەو، نزیکەی میلێك بەسەر ناوچەکەدا زاڵە. رێگەکە کە وردەوردە بەرەو غەرزان [١] سەردەکەوێ‌و، کشتوکاڵیش بەزیاتر دوورکەوتنەوە لەدیاربەکر، کەم‌و کەمتر دەبێتەوەو، دەبێتە ناوچەی زەبەندی گژوگیا. دانەوێڵە دیسان لە غەرزان بەدی دەکرێتەوە، بەڵام بەروبوومەکان تەنها بەشی ناوخۆ دەکەن.

---

[١] قەزایەکی باکووری رۆژهەلاتی شاری دیاربەکرە. (س)

مەڕو بزن و ڕەشەوڵاخ بابەتی سەرەکیی ناردنە دەرەوەن و، بەهاران بەرەو خوار بۆ حەڵەب و پایزان بەرەو سەر بۆ تەرابزوون و بازاڕی قوستەنتەنییە دەنێردرێن. ساڵانە کاڵای بۆ دەرەوە نێردراوی ئەم قەزایە، نزیکەی (٢٠٠) هەزار سەرمەڕە. میوەو بەتایبەتی ترێیش بەرهەم دێن و، بەرەو باکوور ڕەوانە دەکرێن. ئەم قەزایە (١٣) هەزار دانیشتوی تێدایەو، سەر بەویلایەتی سعرتە کە دوای ئەنگۆرە، دووەم مەڵبەندی بزنی موهێرەو، رایەخی نایابیان لێ دروستدەکرێ، مووەکان هەر بە ڕەنگە سروشتییەکەی خۆیان دەچنرێن و، تووکەکان لەدیوێکەوە بەجێدەهێڵرێن، گوندی غەرزان کەوتووەتەسەر بەرزاییەک و رووی لە باشوورەو، شوێنێکی ناخۆش و بەپیووتەو، دانیشتوانی تەنها (٨٠٠) کەس دەبن و، ئەمەیش نیوەی ژمارەی دانیشتوانی پێشوویەتی، لێرە ئیتر چووینە ناوچەی شەڕەوە، کەمێك دوورتر، کاتێ بەدۆڵی بدلیس سۆدا شۆڕبووینەوە، گەیشتینە (زیارەت– Ziyarat)[1]ی سنووری پێشڕەویی رووسەکان، زیارەت لە دیاریەکر نزمترە، خۆشبەختانە کەبەدۆڵەکەدا هەڵگەڕاینەوە، لەگەرماکەی رزگارمان بوو، چونکە هێشتا هەندێك لە دارستانەکەی زوو مابووو، دوای ئەو بەشەی گەشتەکەمان بەگردە رووتەکانی دامێندا، تێیدا حەساینەوە، ڕێگەکە ئەڵقەیەکی پەیوەندیی گرنگی سیستمی ڕۆژهەڵاتی تورکیایە، تاڕادەیەك نوێ و ساکارە، کەمێك بەر لەوەی بگەینە بدلیس، خەریك بوو خۆمان بەئەسپێکدا بکێشین، ئەسپەکە بەو هێڵە تەلەفۆنەوە بەسترابوو، کە بە درێژایی ڕێگەکە جێگیرکرابووو، بەزەحمەت خۆمان لێ قوتار کرد.

### بدلیس

تەنها بیرەوەرییەکانی بدلیسمان، لە سەرتاسەری گەشتەکەماندا، خۆشبوون. شارەکە لەدەوری قەڵایەکی بەردین کۆبووەتەوەو، قەراغەکانی دێنە سەر ئاوەکانی بدلیس سۆو چەمێکیتر. ئەم شارە بەگشتی لەبەردی سووری قاوەیی باوی ناوچەکە

[1] ویس القرنی، شارۆچکەیەکی نزیکی غەرزانە لە باکووری ڕۆژهەڵاتی دیار بەکر. (س)

دروستکراوەو، ماڵەکان بەسەر گردەکەدا پەرش‌و بڵاو بوونەتەوەو، درەختەکانیش سەریان بەیەکدا کردووە. ئێرە شاری چەندین کانی‌و پردو ئاوی کانزایی نایابە، بەڵام بەداخەوە بەدەست شەڕەوە زۆری چەشتووەو، زۆرینەی ماڵەکان تەنها چوارچێوەیەکی بەتاڵن. دانیشتوانی ئەم شارە سەرەتا (١٥) هەزار بوون‌و، ئێستا تەنها (١٢) هەزار کەس دەبن. خەڵکەکە کەم کەم دەگەڕێنەوەو، پاریش(١٠٠)خانوو چاك‌و ئاوەدانکراونەوە. جا بە هۆی گرنگیی شوێنەکەیەوە، کە دەکەوێتە سەرخاڵی بەیەکگەیشتنی رێگەکانی مووش، گۆلی وان‌و دیاربەکرو سعرت‌و بدلیس، بووەتە ناوەندێکی جەنجاڵی بازرگانی‌و، بەشێوەیەکی سەرەکی بەبازرگانیی ترانزێتەکەی دەژی. ئێرە تاکە جێیەك بوو کە، کاتێ ویستمان شتێکی بچووك لە بازاڕ بکرین، دراوی زیوی کۆنمان تێدا بینی. وتیان ئەم دراوە، بەرەو باشوور تا مەڵاتیە هەیە، کەچی بەرەو باکوور لە ویلایەتەکانی بایەزیدو ئەرزڕۆم بەو لاوە کاری پێ ناکرێ. دابەزینی بەهای زیووو وەرنەگرتنی دراوی کۆنیش لەباجی دەوڵەتدا، رێژەکەیان لە (٢٥) قرشی زیوەوە بۆ پاوەندی کاغەزو (٤٥) قرۆشی زیو بەرزکردۆتەوەو، ئیتر دراوی زیو وردە وردە دادەبەزێ‌و لەکار دەکەوێ. قەزای بدلیس دانەوێڵەو میوەو تووتن بەرهەم دێنێ‌و، بازرگانیی سەرەکیش مەڕو بزن‌و رەشەوڵاغە.

لەبەرئەوەی قایمقام لێرە نەبوو، کاپتن ئەحمەد نەبی بەگی خەڵکی ئایدن‌و قوماندانی جەندرمەو نوێنەری قایمقام پێشوازیی کردین. بیرەوەریی خۆشمان لەگەڵ خانە خوێکەماندا هەیەو، زانیاریی گرنگی داینێ لەو بارەیەوە کە تاوان‌و توندوتیژیی بەپێی تاقیکردنەوەکانی خۆی، لەچاو جاران زۆر کەم کراونەوە.

کێشەو گیروگرفت کە جاران دەبوە مایەی پێکدادان‌و خراپتریش، ئێستا لە قسەی بەرزو نزم‌و جنێو زیاتر تێناپەڕن. زیادبوونی جەماوەری تۆپی پێ‌و دامەزراندنی تاقمی گەڕۆکی دیدەوانی‌و دروستکردنی یاریگای تێنس، کە ئێستا بەدەستەوەیە، پێشکەوتنی شارستانی نیشان دەدەن. هەروەها پرۆژەی بیناکردنی وێستگەیەکی وزەو ئاشێکی ئارد لەبەرنامەدان.

**بدلیس —ئەرجیش**

سەرەتا ڕێگەکە بەردەوام هەڵدەکشێ تا دەگاتە ئەو جێیەی کە لقی مووشی لێ جیادەبێتەوە. هاتوچۆ لەم بەشەدا زۆر سەختە. لێرە بۆ یەکەم جار، عەرەبانەی دووپێچکە (کانی)مان بینیو، ئیتر لێرەوە هەر ئوتومبیلو وڵاخی باریەری وەك وشترو ئەسپو گوێدرێژمان بەرچاوکەوت. سەیربوو! ئەم عەرەبانانە ئەو جیڕەیەیان لێوە نەدەهات کە لە ڕۆژهەڵاتی تورکیادا بوویووە نیشانەی هاتوچۆیان. ئیتر تا نەگەیشتینە ئەرزرۆم— قارس، ئەم دەنگە باوەمان نەبیستەوە. جادەکە، پاش ئەوە کە ڕێگەی مووش لقی لێدەبێتەوە، دەگاتە حەوزی گۆلی وانو دیمەنی قەشەنگی سوبحان (Suphan) [1] کە لە لوتکەی بەفرپۆشەوە، لەدوای ئاڕاڕاتو ئەرگوش(Argoeus)، بەرزترین چیای تورکیایە. داوامان لێکرا درێژترین ڕێگەی بەشی باکووری دەریاچەکە بەرەو وان بگرینەبەر، بەڵام لە (وان) زانیمان ڕێگەی باشوور بۆ ڕۆیشتن تەواو بەکەڵکە. ئێمەیش ڕێگەی خوارەوەمان گرتو، لەراستی (تاتوان Taduan)ەوە کە لە داهاتوودا دەبێتە کۆتاییی هێڵی ئاسنی عوسمانییەو مووش لە ئەخلات (Ahlat)[2]، گەیشتینە دەریاچەکەیو، بەکەنارەکەیدا تا (عادل جواز— Adilcuaz)[3] ڕۆیشتین. ئەم دوو شوێنە کە جێی چەرکەسیەکانو ڕزگاریان بووە، بەسەوزاییەکی دڵگیر دەوردراون، بەڵام کەنارەکان بەگشتی رووتن. خاکەکەی سووكو لمینەو، بەرووبوومی زۆر کەمەو، زۆربەی لەوەڕگا بەجێماوە. بڕێکی خەیاڵیی کا بۆ خۆراکی زستان ئاژەڵەماڵیەکان پێویستە، چونکە بەرووبوومی خۆراکی دەست ناکەوێ.

---

[1] ناحیەیەکی باکووری ڕۆژهەڵاتی بدلیسە.(س)

[2] قەزایەکی ڕۆژاوای گۆلی وانە، لە باکووری ڕۆژهەڵاتی بدلیس. (س)

[3] ناحیەیەکی سەر کەناری بەری ڕۆژاوای گۆلی وانە لە ویلایەتی بدلیس. (س)

رەنگە هەر لەبەرئەمەیش بێ کەنەتوانراوە ئاژەڵێکی زۆر لەم ناوچەیە بەخێو بکرێن. رێگەکە لە (عادل جوان)ەوە بەبەری کەناراوی دەریاچەکەدا دەڕوات و، کورتترین مێڵ بەرەو ئەرجیش دەگرێتەبەر.

## ئەرجیش

ئەرجیش گوندێکی (٣) هەزار کەسییەو، ناوەندی قەزایەکە کە (٢٥) هەزار دانیشتووی تێدان، شەومان لەوێ بەخۆشی بەسەربرد، چونکە نەدەکرا ئەو رۆژە، بەڕێگەی باکووردا بگەینە (وان). دانەوێڵەو میوە لێرەبەشی ناوخۆ بەرهەم دەهێنرێن.بەڵام گەورەترین پیشەسازی، هەروەك لەناوچە شاخاوییەکانی تر، ئاژاڵی ماڵیی بەتایبەتی مەڕەو، هەروەك لە غەرزانیش بینرا، بەهاران بەرەوحەلەب و هاوین بە پایز بەرەو تەرابزوون و قوستەنتەنییە لەباکوور دەنێردرێنە دەرەوە.

والیی نوێ زۆر لەسەر دارستان رواندن سوورەو، هەر ئەم بەهارە (٣)هەزار دار رووێنراون، ئەم گوندە قوتابخانەیەکی سەرەتایی تێدایەو، تۆپی پێ و دیدەوانیش ئەنجام دەردێن. (٢٠–٢٥) لەسەدی هاوولاتیان،بەڕای قایمقام خوێندەوارن، بەڵام بەڕێوەبەری قوتابخانەکە ئەم رێژەیەی بەکەمزانی و، دانی پێدانا کە (١١٠٠)لاو تەنها لە ئەرجیش و گوندەکانی دەروبەریدا بڕوانامەیان وەرگرتووە کە دەتوانن بخوێننەوەو بنووسن.

## ئەرجیش. وان

رێگەکە بەردەوام روو لە رۆژهەڵاتەو، تا دەگاتە ئەوپەڕی دەریاچەکە، چەمی بەندی ماهی (Bandimahi Cay)[1]ی تێدەڕژێ، لێرەوەتا ئەرجیش، جبەخانەیەك و حەوزێکیشیان بۆ کەشتییەکی نەوت هەڵگر دروستکردووە، کەهەر (١٠) رۆژ جارێك هاتوچۆی نێوان وان و تاتوان دەکات. ئەمە میراتی رووسەکانەو،

[1] ئاوێکە لە باکووری رۆژهەڵاتەوە ئەڕژێتە ناو گۆلی وان. (س)

تورکەکانیش دوو بەلەمیان بۆ زیادکردبوو، هیچ جۆرە پیشەیەکیتر لەسەر دەریاچەکە نەبوو. ئەو ژمارە کەمەی بەلەم کە زووتر هەبوون، کاتی شەڕ تێکشاونو، ئێستایش نەبوونی دار بووەتە ڕێگرێکی کاریگە لەبەردەم دورستکردنی هی تازەدا، جبەخانەکە، لەکاتە زیادەکانیدا، پارەیەکی باش بەچاککردنەوەی ئوتومبیل پەیدا دەکات. ڕێگەکە بەرەو ڕۆژئاواو بەدرێژاییی بەشی خوارووی دەریاچەکە هەر زوو لە کەنارەکە جیا دەبێتەوە، بەزەویو هەرێمێکی چەند گوند تێدا چۆڵکراودا تا وان کە دیسان دەریاچەکە دێتەوە بەر چاو، تێدەپەڕێ. قەڵای بەردینی ئەم شارە، بەسەر دەشتێکی فراواندا دەڕوانێ.

## وان

وان شانو شکۆی نەماوە. بدلیس تاڕادەیەك ڕوویەکی گەشی هەیە، کەچی وان لەقوڕ دروستکراوەو، بووەتەوە بەخۆڵ لەسەر خۆڵ. دەڵێن ئەم خانووە قوڕانە، ئەگەر باش خزمەت بکرێن، (١٠٠-٢٠٠) ساڵ بەرگە دەگرن، شاڵاوی وێرانکردن، خێراتر ئەم ماڵانەی کاولتر کردووە. سەرەتا ئەم شارە (١٦) هەزار خانووی تێدا بووەکە بەناوەڕاستی سەوزاییو ئاوی خوڕی باخەکانیاندا بڵاو بووبوونەوە، بەڵام ئێستا ئێمە ماوەی (١٠) دەقیقە بەرەو ئەو گۆشەیەی کە (٥٠٠٠) دانیشتووی شارەکەی تێدا کۆبوونەتەوە، بەوێرانەیەکی تەواودا ڕۆیشتین.

ئەوان زۆر ژیرانە شوێنێکی بەرزی دوور لە دەریاچەکەیان هەڵبژاردووەو، مێشوولەکانی کەوا زەوییە زەلکاوییەکانی دەوری قەڵاکەیان هەراسان کردووە، بەدەگمەن دەگەنە ئەم شارە تازەیە. خەڵك لێرەش وردە وردە روو لەزیادبوونەو، دووساڵی رابردوو (٤) هەزار کەسی تری بۆ هاتوون، کە یان لە قۆقاز پەنابەر، یا هەر دانیشتووی دێرینی وان بوون. ئەمانەی دوایی حەز دەکەن خانووەکانیان لەسەر زەوییەکانی خۆیان بنیات بنێنەوەو، دەسەڵاتدارانیش بۆ ئەوەی کێشەی کارگێڕی کۆنتڕۆڵ بکەن، ناچاریان کردون لەدەوری مەڵبەندە نوێییەکە جێگیربن. جێی داخە،

زۆرینەی ئەم تازە گەڕاوانە کشتیاران و، پیشەسازەکان بەرەبەرە دەگەڕێنەوە، ویلایەتەکە تەنها (٨٠) هەزار کەسی تێدا دەژی و، بەشێوەیەکی سەرەکی مەڕو وڵاغی تێدا دەلەوەڕێنرێ. مەسەلەی ناردنە دەرەوەی دانەوێڵەیش، بەهۆی نەبوونی پەیوەندییەوە، هەر لەئارادانییە، بۆیە مانگای شیر لە (٢٠) لیرەی تورکی زیاتر ناکات، ڕێگەی ماتۆڕ تا باشەقەلعە هەیەو، تا جوڵەمێرگی پایتەختی ویلایەتی هەکاری درێژدەبێتەوە. دەریاچەکە، (١٧٠٠) مەتر سەروو ئاستی دەریایە. زستان درێژو سەختە، بەڵام نەك وەك زستانی قەرەکۆسەو ئەرزڕۆم. بەفر تەنها سێ مانگ دەبارێ. ئاشێکی ئارد خەریکە دروست دەکرێ و، لقێکی بانکی کشتوکاڵیشی لێیە. سەما لە ئۆجاغە پێشووەکەی تورك جارجار پێشکەش دەکرێ و، هەفتەیەك پێش گەیشتنمان بۆ یەکەمجار یاریی تۆپی پێی لێکرابوو، بەڵام تا ئێستا تیمی گەڕۆکی دیدەوانیی تێدا نییە.

میداد بەگ (Mitat Bey)ی والی، پێشتر یاریدەدەری والیی ئەلعەزیز بووە. میداد گەنجێکی دۆست و توانایەو، میواندارییەکی زۆر گەرم و گوڕی کردین. تازەیەو، سێ مانگە هاتووەو، مانگ و نیوێکی بەگەڕانی ویلایەتەکەی بەسەر بردووە. سەرۆکی شارەوانی کەخەڵکی شارەکەیەو تەمەنی (٤٥) ساڵێك دەبێ پێی وتین: ئەوەندەی بزانێ، دەریاچەکە وردە وردە بەرزبووەتەوەو، گەیشتووتە (١٠٠–٢٠٠) مەتر بەرزتر لەزەویی نزمی وان. هەروەها پێمان ڕاگەیەندرا کە ماسی، لەبەر بوونی سۆدە ، لە دەریاچەکەدا ناژی، بەڵکوو تەنها لەو رووبارانەدان کەتێی دەرژێن.

### وان- قەرەکۆسە

ڕێگەی ڕۆژی پێشوومان تا ئەرجیش گرتەوەبەرو، ئەمجا لەو خاڵەوە کەوتینە سەر ڕێگەیەك کە بە حەوزی واندا بەرەو فورات سۆ هەڵدەکشاو، نەهامەتییەکی زۆری تووش کردین. ڕێگەکە بەروونی دیاری نەکراوەو، بەرزو نزمی زۆرەو، تەنها یەك ماتۆڕمان بەدرێژیی ڕێگەکە بینی. بەخێراییەکی بەردەوامی (٥–١٠) کیلۆمەتر

سـەعات دەڕۆیشـتن و، لـە جۆگـەئاوێك پەڕینـەوە، حۆمـان بـەگوندی پـاتنۆس (Patnos)دا كرد. لێرە چـەند چاككارییـەك بەشـێوەیەكی كـاتی ئـەنجام درابـوون، نـەمانتوانی پێش داهـاتنی شـەو بگەینـە قەرەكۆسـە، بۆیـە شـەو لـەوێ ماینـەوەو، كاتێكی خۆشمان لەلای (مودیر) بەسەربرد. پاتنۆس (٤٠٠) كەسـێكی تێدا دەژینو، ناوەندی ناحیەیەكی (١٠-١٢) گوندیو (٢٠٠٠) كەسییە. هەروەها دەكەوێتە لەوەڕگە بەرزەكانی بناری سومچان داغو خاڵی بەیەككگەیشتنی ڕێگەكانی ئـەرجیش، مـووشو مەلازگردو قەرەكۆسە، لەسەر بەخێوكردنی ئاژاڵە ماڵییەكان دەژین. دەشتو دەرەكە رووتـنو، بزنـی برسـی نایـەڵێ هـەولی درەخـت چـاندن سـەر بگـرێ. قوتابخانـەی سـەرەتایی، ئـەم دواییـە، داخرابوو، چونكـە ژمـارەی خوێندكارانی زۆر كـەم بـوو. رۆژنامـەی (كۆیلـوو غەزەتەسـی- Koylu Gazatasi)كـەبۆ رووناكبـیركردنی كشتیاران دەردەچێ، بەخۆرایی دەگاتە ئێرە، بەڵام كەم كەس دەتوانن بیخوێننەوە. (حاكمییەتی میللی) بەرەسمی بـۆ (مودیـر) دابـین دەكـرێو ئیـتر هیـچ رۆژنامەیـەكی دیكە ناگاتە ئێرە.

رۆژی دواتر بەرەو قەرەكۆسە كەوتنە رێو، رێگەی بـەرەو بـاكوورو گۆشـەی لای راستی رێگەكەی پێشوومان گرتەبەر. رووی ئـەم رێگەیـە لـەوی رۆژی پێشـوو باشـتر بوو، بەڵام لەزۆر جێـدا دۆزینـەوەی ئاسـان نـەبوو، چونكـە لەگـەڵ چـەند رێگەیـەكی ئاڵۆزی خۆڵیندا تێكەڵ دەبوو. (توتاق)[1]ی ناوەندی قەزایەك هـەمان دووریـی هەیـەو، ئەكەوێتـە ئەوبـەری مورادسـۆوە، رێگەكـە ئاراسـتەی چەمەكـە بـە دۆڵێكـی تەسـكدا دەگرێتـەوە بـەرو، پـاش كـەمێك دەگاتـە قەرەكۆسـە، ئـەمجا بـۆ گونـدی حـامورر Hamur[2] كـە ئـاڕاراتی لێـوە دیـارە، بەرزدەبێتـەوە. زەویەكـە لـەم دۆڵـەدا تەختكراوەو، بەردی بۆ كۆكراوەتـەوە، بـۆ ئـەوەی رێگەیـەكی پـێ دروسـت بكـرێ، رەنگە رووسەكان ئەم كارە ئەنجام بدەن. ئەم دۆڵە بەگشتی گیای تێدا رواوە.

---

[1] قەزایەكی سەروو ناحیەی پاتنۆسو خوار قەزای قەرەكۆسەیە لە ویلایەتی بایەزید. (س)

[2] ناحیەیەكی نزیكی باشووری قەزای قەرەكۆسەیە. (س)

### قەرەکۆسە

قەرە کۆسەیش لەشەڕدا وێران بووە؛ لەدوورەوە، بە سەربانی ماڵەکانیدا، لەخۆڕاگر دەکات و، لەراستیدا شوێنێکی مامناوەندیی (٣-٤) هەزار کەسییە، چوار ساڵ لەمەوبەر مەڵبەندی کارگێڕی لەبایەزیدەوە کە قەوارەی هەر هێندەی هی ئەم دەبێ، بەلام لەسنوورەوە نزیکەو، لەوپەڕی ویلایەتدایە، گوێزرایەوە. هێشتا بەمی دوایی دەڵێن: ویلایەتی بایەزید. گەورەترین شار ئیغدیرەو، لەدۆڵی ئاراسدایەو، حەوت هەزار کەسێکی تێدا دەژین. کەشێکی تەواو جیاوازی، لەبوارێکی زۆر تەسکدا، بەدی دەکرێ. قەرەکۆسە، کە دەکەوێتە ناوەندی زەوییەکی بەرزو چەند سەرچاوەیەکی موراد سۆی پێدا تێدەپەڕن و، چیای کۆسەداغ (Kose Dag)ی (٣٤٠٠) مەتریش بەسەریدا دەڕوانێ، (١٧٠٠) مەتر بەرزەو، کەش و هەواکەیشی لەمی گشت ئەوجێیانە کە سەرمان لێدابوون، ناخۆشتربوون. بەفر شەش مانگ دەمێنێتەوەو، پلەی گەرما دەچێتە (٤٥) پلەی ژێر سفری سەدی. وەك سەرۆکی شارەوانی وتی: ئێرە سیبریای تورکیایە. تەنانەت ئەرزرۆم، کە کەمێك بەرزترە، پلەی گەرمای زستان لە (٣٢) پلەی سەدی تێناپەڕێ. چیا نشینەکانی قەرەکۆسە باسی سەختیی ئیغدیریان دەکرد کە (٩٠٠) مەتر لەسەروو ئاستی رووی دەریاوەو، دەکەوێتە دۆڵی ئاراسەوەو ئاوو هەوای هاوینی کەمەرەیی (استوائی)یەو، لانەی مەلاریایە کە سەرجەم دانیشتوان تووشی بوون. ئاوی پاکی خواردنەوەی نییەو، ئەویشی لایانە لە Orgof و شاخەکانەوە دەیهێنن. لۆکە بەرووبوومی سەرەکییەتی و، ساڵانە (٣-٤) هەزار تەن بەرهەم دێنێ و، بەشی هەرەزۆریش لەسنوورەوە بۆ رووسیا دەنێرێ، بۆیە ئیغدیر هەر لەخەیاڵی بازاڕی رووسیادایە، چونکە رووسیا کەبەرووبوومەکەیش دەبات، پارەکەیان بەڕێکوپێکی نادات.

ئیغدیر هەندێك برنج و سەوزەی تازە، بەشی ناوچەکانی تری ویلایەتەکەی، بەرهەم دێنێ. ناوچەی شاخاوی بەشێکی زۆری ویلایەتەکەی گرتووەتەوە، وەك

ویلایەتەکانی دراوسێی، بۆ لەوەڕی ئاژاڵە ماڵییەکان بەجێ هێڵراوە. ئەم ئاژاڵانە دەنێردرێنە رووسیاو ئێرانو تەرابزوون، بڵاوبوونەوەی تاعوونی رەشە وڵاغ، ئێستا کارێکی زۆری لەبازرگانی کردووە. دانیشتوانی ویلایەتەکە، لەهی وان زیاترنو، (١٠٤) هەزار هاوولاتی دەبن.

قەرەکۆسە لەئایندەدا ئاشێکی ئاردی دەبێو، ئامێرەکانی بۆ کارەبا بەمەبەستی رووناکی بەکاردێن. کلایتۆن (Clyton)و شوتلۆرت (Shuttleworth)ی بۆدابست ئەو ئامێرانە دابین دەکەنو، سەرمایەدارێکی تەرابزوون جێبەجێی دەکات، بانکی کشتوکاڵیی تاکە بانکی قەرەکۆسەیە، لێرە، تەنها قوتابخانەیەکی سەرەتایی بەدی دەکرێ. بارودۆخی ئیغدیرو بایەزید وەکو یەکن، بەڵام باشیی خەڵکی ئیغدیر رێی بۆ کردنەوەی قوتابخانەی ناوەندی لەساڵی داهاتوو خۆشکردووە. قوتابیانو سەربازان دەستیان داوەتە یاریی تۆپی پێ، بەڵام دەستەی گەڕۆکی دیدەوانیو سەما، هێشتا باسیان لێوەناکرێ، نەخۆشخانەیەکی سەربازی لەم شارەدایەو، یەکێکی مەدەنیش ساڵی رابردوو تەواو بووەو، تائێستا چاوەڕێی پزیشکێکی نەشتەرگەری دەکاتو، بە (١٠) قەرەوێڵەوە دەکرێتەوە. ئەحمەد موختار بەگی والی دەڵێی لە چاخی ناوەندا دەژیو، ئەم دواییە لە ئانتالیا (Antalya)[1] وە هاتووەو، بە فەرەنسی دەدوێ، خێزانەکەی بۆ ئاو چووبووە باشقەلعە[2]. لەخانووە بەردەکەیو قەراغی لای شاری باخچەکەیدا، کاتێکی خۆشمان بەسەربرد. ئەم ماڵە، چەند ساڵێك لەمەوبەر ، وەك جێیەکی رەسمی دروستکرابوو، ئەم پیاوە هەژارەیش، چاوەڕێی زستانێکی سەختی دەکرد. بەگشتی لەگەڵ سەرجەم کارمەندەکاندا کۆبووینەوە، ئەو هیچ گلەیی نەبوو، بەشی خۆیی بەباشی وەردەگرت.

---

[1] ویلایەتێکی باشووری رۆژاوای تورکیایە لەسەر دەریای سپیی ناوەڕاست. (س)

[2] قەزایەکی باشووری رۆژهەڵاتی ویلایەتی وانە. (س)

## قەرە کۆسە- قارس

ویستمان بەبایەزیدو ئیغدیرو (قاغزمان Kagizman)[1] دا بچینە قارس، بەڵام چەند شتێك هاتنە گۆڕێو، ناچاریان کردین، واز لەم بیرۆکەیەمان بێنین. ئەوەندە نەبوو گەیشتبووینە قەرەکۆسە کە گەردەلوولێك هەڵیکرد، بەڵام ئەو رۆژەباران نەباری. رێگەی گرنگی بازرگانیی تەرابزوون-تەورێز، کاتێ لەجادەی ئەرزرۆم-قارس لادەدات، خۆڵینەو، تاساڵی ئایندەیش چاك ناکرێ زانیشمان رێگەی بایەزید بێ کەڵکەو، هی بایەزید- ئیغدیر وەکو خۆی ماوەو، ئیتر لێرەوە رێگە باشە. ئێمە نەمان دەویست بەم بەهارە درەنگ وەختە تووشی گرفتیتر ببینو، رەنگ بوو گەشتەکەمان، بەهۆی بارانی زۆرەوە، بپچڕێو، دوورتر نەڕۆین؛ هەر بۆیە بڕیارمان دا کورتترین رێگەی ئەرزرۆم، قارس بگرینەبەر. دەشتەکەمان کە بارانێکی کەم کردبوویە قوڕوچڵپاو، بەبێ کێشە بڕیو، ئەمجا گەیشتینە ئەلەشکرد (Eleskert)[2]، ئەم شوێنە لەکاتی شەڕەوە لەجێی خۆیدا، کە بە توپراق قەلعە (Tobrak kale)یش ناسراوە، نەماوەو، چووەتە جێیەك کە لەسەر نەخشە بەزەردەکان (Zerdekan)ناوبراوە. لێرەوە بەچیاکەدا هەڵگەڕاینو، تووشی تەرزەیەکی توندو دواتر بارانێکی بەردەوام بووین. ئیتر رێگەکە لەکەڵك کەوت، بەڵام خۆشبەختانە کۆمەڵێك گاو گامێشمان دۆزییەوە کە تا ئەوبەری گوندی تاهیر (Tahir)[3]، رایانکێشاین، لێرە، جگە لە خۆشبوونەوەی کەشەکە، چاوەڕێیی هیچی ترمان نەدەکرد. ئەمەیش شەوی بەسەرداهێناین. لە ژووری میوانی دەوڵەمەندێکی گوندەکەدا، کە خۆی لە تەرابزون بوو، دانراینو خۆشمان بەسەر برد. هەموو ناوفەرشی ژوورەکە، بە فەرشی جوان داپۆشرابوو. پاشان براینە دیوان کە

---

[1] قەزایەکی باشووری شاری قارسە لەرۆژهەڵاتی تورکیا. (س).

[2] قەزایەکی باکووری رۆژاوای ویلایەتی بایەزیدە. (س)

[3] شارۆچکەیەکی نزیکی رۆژاوای قەزای ئەلەشکردە. (س)

پەنجەرەیەكی زۆری لەسەربوون‌و، ساپیتەكەی بەپایەی بەهێز، بۆ پاراستنی لەبەفری زستان، راگیرابوو. لەدەریشەوە بەردەوام باران دەباریّ. شوێنەكەمان هەر لە بەهەشت دەچووەوتیان: تەنها دوو هەفتەیە بەفر لەو جادەیە چووتەوە كە لێوەی هاتبوین. والیی قەرەكۆسەیش ناچار لەئەرز رۆمەوە بەدەوری قارس‌و ئیغدیرو بایەزیددا گەیشتبووە شوێنی پۆستەكەی.

تیمێكی گەرۆكمان بینی كە لە دوو نەشتەرگەری دروستی ئاژەڵ پێكهاتبوو. ئەفسەرێكی سوارەی فەرماندەی فەسیلێكی بچووكی نیشتەجێی گوندەكە، بانگی كردینە. ناو دەوارەكەی بۆ قاوە خواردنەوەو، بۆ خوانی ئێوارە هاتە ژوورەكەمان. باران خۆشی كردەوەو، بەخۆشحاڵییەوە لەدەرەوە تەماشای ئاهەنگێكی بووك گواستنەوەمان كرد كە بووكەكە لەگوندێكی هاوسێوە هێنرابوو، سەرو رووی بەقوماشێكی جوان داپۆشرابووو، دایك‌و خوشكی زاوایشی لەتەكدا بوون. ئەمانە سەرباری دەنگی تەپڵ‌و زورناو نمایشی سوارەی پیاوانی بنەماڵەكان‌و دەنگ‌و هەرای سەرنج راكێش. كەبووك گەیشتە ماڵی زاوا، یەكێك لەپیاوەكان، وەك نەریتێك، لەسەر ئەسپەكەی بازی دایە خوارەوەو، هەڵات‌و، ئەوانی تریش كەوتنە لێدانی، دواتر پیاوەكان لەهەڵپەركێیەكی بازنەییدا كە دەستی هەریەكەیان لەسەر شانی ئەوی تەنیشتی بوو وزیاتر لە كۆلۆو هۆرا (Kolo & hora)ی باڵكانییەكان دەچوو، بەشدارییان كرد.

تاهیر كە دەكەوێتە دۆڵێكی بچووكی ناوچەیەكی بێ دارو درەختەوە، گوندێكی تەنها (٢٠٠) كەسییە، بەڵام قوتابخانەیەكی سەرەتایی تێدایە. دڵنیا كراینەوە كە (٧٠٪)ی پیاوان‌و (٣٠٪) ئافرەتان دەتوانن بنووسن‌و بخوێنن‌و، خەڵك پەرۆشی فێربوونن، تاوانكارانیش بە باجی (١٢٥)قرش سزا دەدرێن، ئەم گوندە زووتر تەواو لە سنووری رووسیا نزیك بووەو، دەیان وت: هێشتا یادەوەریی تاڵی داگیر كردنە ناوبەناوەكانی روسەكانیان لەبیرماوە. تاهیر سەرگەرمی لەوەڕاندنی مەڕو ماڵاتەو، دواتر حكومەتیش ویستی بزنی موهێریان بداتێ. حكومەت‌و بانكی كشتوكاڵی گاو

بەران، بۆ چاککردنی رەگەزەکان، دەگێڕن‌و، تۆوی گەنمەشامی باش دابەش دەکەن. حکومەت مەنجەڵی گەورەی بۆ زیادکردنی بەرهەمی کەرە دروستکردووەو، بانکی کشتوکاڵیش پشتیوانی (٥) ساڵ دەداتە کشتیاران، تا بتوانن ئەو مەنجەڵانە بکڕن. هەروەها کۆمەڵەی پاراستنی درەخت (Agac koruma Cemiyati) لەڕێگەی بەخشینی دیاری‌و مەدالیاوە، خەریکی هاندانی خەڵکە بۆ دار رواندن.

خۆشبەختانە، بەیانیی دواتر خۆرهەڵهات‌و، هێندە گەرمبوو، رێگەکەی وشککردەوەو، توانیمان بەئاسانی رێی ساچ داغ (Sac Dag) ببڕین‌و، ئیتر گرفت‌و کێشەکانمان دوایی هاتن. بۆمان دەرکەوت ئەو رێگەیەی کە لەم وەرزەدا پێویستە بگیرێتبەر، ئەوە نییەکە وەك لەنەخشەدا دیاریکراوەو، بەپردێکی بەردین لە کۆپروکۆی (Koprukoy)[1] لەگەڵ جادەی ئەرزڕۆم– قارسدا یەکدەگرێتەوە، بەڵکو رێگەیەکە بەتاهیر خۆجا (Tahir hoca)دا دەڕوات‌و، لە خۆراسان Horosan[2] دەچێتەوە سەر ئەورێگەیەو، ئەمجا بەهۆی پردێکی دارینەوە بەئاراسدا دەپەڕێتەوە. لەم کاتەدا بەرەو باکووری رۆژهەڵات‌و قارس رۆیشتین‌و،وردە وردە لەدۆڵی ئاراسەوە سەرکەوتین‌و، لە قەرە ئۆرغان (Karaurgan)[3] کە ناوەندی ناحیەیەو (٤٠٠) هاووڵاتیی تێدا دەژی، گەیشتینە سنووری کۆنی رووسیا. ئەم شوێنە قوتابخانەیەکی سەرەتایی‌ی تێدایەو، بەڕێوەبەرەکەی شانازیی دەکرد کە (٩٠) قوتابی هەن‌و، نزیکەی (٩٠) کوڕێکی گەنج‌و (٧٠–٨٠) ئافرەت دەتوانن بخوێنن‌و بنووسن. خوێندن، لە قوتابخانەکانی شەو (قوتابخانە میللییەکان– Milli Mektepler)یش بەزۆرە.

رێگەکە بەردەوام بەرەو لوتکەیەك هەڵدەکشێ کە لە (ساری قامیش) زۆر نزمتر نییە. ئەم رێگەیە، هاوشانی رێیەکی تەسکی ئاسنە کەلە ئەرزڕۆمەوە هاتووە. هێڵە

---

[1] شارۆچکەیەکی قەزای حەسەن قەلعەی رۆژهەڵاتی شاری ئەرزڕۆمە. (س)

[2] ناحیەیەکی رۆژهەڵاتی ویلایەتی ئەرزڕۆمە.(س)

[3] ناحیەیەکی باچشووری رۆژاوای ویلایەتی قارسە. (س)

ئاسنەکە لەساری قامیش‌و قارس دوو پچڕانی تێدایەو، وا دیارە پێوەرێکی مامناوەندی لەنێوان هێڵێکی زۆر تەسکی رۆژهەڵات‌و یەکێکی فراوانی رووسیادا هەیە. هەردوو دیوی لوتکەکە تامەودایەك سەوزاییەکی دڵگیریان پۆشیوەو، ژمارەیەکی بەرچاو داری سنەوبەریان پێوەیە کە، بەداخەوە هەندێکیان سەردەمی شەڕ، نەك ئەم ساڵانەی دوایی، کەوتوون. لەقارس وتیان ئەم ناوچەیە، بەهۆی گرانیی گواستنەوەوە بەش خوراو بووەو، زانستی دارستان تەنها لەدەوروبەری ئارتوین (Artvin)[1]ی نزیکی ئەو دەڤەرە کەداری تێدا لە چۆروخ (Coruh)[2]ەوە بەرەو باتووم دەنێردرێ، جێبەجێی دەکرێ. ساری قامیش، هێشتا دەکەوێتە هەرێمی دارستان‌و سەر رێگەیەکی دور لەجۆگەکە. هەرێمی سەربازییش کە بریتییە لە قشڵەکان، گەشتیاران بێزار ناکات. گوندەکەی پێیدا تێپەڕین، جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئەوانی‌تردا کە پێیان ئاشنابووین، نییە. خانووەکان لە قوڕیان بەردو، بانەکانیان تەختن. ئەم ماڵانە بڵاوبڵاون‌و، تا نیوەیان لەخاکدایە، بۆ بەرەنگاریی سەرما.

پاش ئەوەی گردەکانمان بڕی‌و، بەرەو بەرزاییە روتەن‌و وشك بووەکانی نزیکی قارس چای (Kars Cay) بووینەوە، دوو جیاوازیی سەیرمان بینی.

گەیشتینە دوو گوندی سەلیم (Selim)[3] کەپێشتر پێیان دەوترا نۆڤە سەلیم Nove Selim و ڤیلادی قارس Viladi Kars و ماڵەکانی لەتەختەن‌و، بانەکانیان قیرکراون‌و، لەهەردوو بەری شارێی گوندەکە ریزبوون. ئەم دوو گوندە، پێشتر هی خێڵی مۆلۆکان (Molo Kan) بوون، جا لەبەرئەوەی بەخزمەتی سەربازیی‌و بیروباوەڕی رووسەکان رازی نەبوون، ناچار برانە ئەوپەڕی سووچی ئیمپراتۆرییەتەکە. ئێستا تاکە رووسێك لەویلایەتە نوێیەکانی تورکیا نەماوە، جگە لە

---

[1] ناوەندی ویلایەتێکی باکووری رۆژهەڵاتی تورکیایە بە هەمان ناوەوە، بەشێکی لەسەر دەریای رەشە. (س)

[2] ناحیەیەکی باشووری شاری ئارتونیە. (س)

[3] ناوەندی ناحیەیەکی باشووری رۆژاوای شاری قارسە. (س)

(٤٠) خێزانێکی مۆلۆکان کە زۆربەیان ئاشەوانن، یان عەرەبانە یان هەیە. ئەمانە ئەو گوندانەیان چۆڵکردووە، کـە پەنابـەرانی تورکـی قۆقـاز بـەکرێیان دەگـرنو، دیمـەنی دڵتەزێنو وێرانکاریو پشتگوێ خستنیش، دەیخەنـەروو کـە خاوەنـەکانیان گۆڕاون. هـەردوو گوندەکـە قوتابخانـەی سـەرەتاییان تێدایـە. هـەرێمی سـەربازیی قـارس لەڤیلادی قارسەوە، دەست پێدەکاتو، لێرەوە ئیتر ئەفسـەرێك پارێزگاریی کردین. ئەم هەرێمە لەئاڕاستـەکەی تریشـەوە، هـەتا مـەزرە (Mezre) سـەر ڕێیـی ئاسنی بـەرەو سـنووری رووسـیا دەکشـێو، دوو ناوچـەی قەدەغـەکراوی تێـدان کەتەنـها سـەربازان دەتوانـن بچنـە ناویانـەوە. یـەکێکیان لەرووبارەکـەوە تـا پشـت قەڵاکـە دەڕواتو، ئەوی تریان قشڵەکانی دەرەوەیە.

## قارس

قارس ویلایەتێکی گەورەیەو، (٢٠٨) هەزار دانیشتووی تێدایەو، بڕێـك کشتوکاڵی لێ دەکـرێ، بـەلام لـێرەش بەشـێوەیەکی سـەرەکی مـەڕومالاتو رەشـە ولاغ بەخێودەکرێن. رەگـەزەکان زۆرباشـنو روسـەکان بەشـداری باشـکردنیان بـوون. مانگایـەکی شـیر (٨٩٠) لـیرەی تورکـی دەکـات، ئـەم ویلایەتـە شـتومەك دەنێرێتـە دەرەوە بۆ (خۆپـە Hopa)[1] و رووسیا. هـەروەها بەکارگەیـەکی پـەنیر لەقارسـدا، بەرهـەمی ماسـتو کـەرەی نایـاب دەنێردرێنـە دەرەوە، ئـاڵوێری بازرگـانی لەگـەڵ رووسـەکاندا بـەردەوام دەکرێـنو، بەرامبـەر بەمانەیشـە کەلوپـەلی دروسـتکراو وەردەگیرێن. هـاتوچۆی چالاکی مـاتۆری تـەرابزوون بـەدرێژاییی رێگەکـە تێبینـی دەکرێ. ئێستا کار بـۆ ئـەوە دەکـرێ کـە رێگـەی ئـەو ناوچایـە بەکـەڵکی هـاتوچۆی ماتۆربێ، چونکە خۆپە دەروازەی سروشتیی خاکی تورکیایە. رێگەکەی تا ئاردەهان (Ardahan)[2] باشە، بەلام لەوێوە تا ئارتوین پێویستە هەتا کۆتایی ئەمسـاڵ چاك

[1] قەزایەکی باکووری رۆژهەلاتی ویلایەتی ریزەیە لەسەر دەریای رەش. (س)

[2] قەزایەکی رۆژاوای شاری قارسە. (س)

بکرێ. ئومێدیش دەکرێ ڕێگەیەکی نوێ بە (بۆرچیقە Borcha)[1]دا تا خۆپە، پایزی ساڵی ئایندە دروست بکرێ. مەبەست لەم ڕێگەیە ئەوە نییە کەتەنها وەك دەروازەیەکی ویلایەتی قارس بەکاربهێنرێ، بەڵکو بۆ بازرگانیی ترانزێتی ئێرانیشە کە لەقارسەوە بەڕێگەی ئیغدیرادا دەچێتە بایەزید. دیارە ئەمەیش، دووریی ڕێگەی تەرابزوون، بەشێوەیەکی بەرچاو کەم دەکاتەوە. ڕێگەکانی ویلایەتی قارس بەگشتی لە هەموو ئەوانەی ترکە پێیاندا هاتبووین، باشتر بوون‌و، ژمارەیەك پردی چاك‌و هی پایە ئاسنمان تێدا بینی.

کاریگەری خراپی ئەرکانی گشتیی تورك بەسەرشاری قارسەوە دیارە. نیوەی شارەکە لە خەڵکی مەدەنی قەدەغەیە‌و، لانە ڕووخاوەکانی ئەو بەشە رادەماڵرێن، بێگومان ئەم شارە کاتی شەڕ وێرانکراوە‌و، ئەمڕۆ تەنها (١٢) هەزار لە (٤٠) هەزار هاوولاتیی ڕۆژانی زووی تێدا دەژین. هاوکات ژمارەی دانیشتوانی، بەهۆی ئاوارەکانی قۆقازەوە، ڕوو لەزیادبوونە‌و، ساڵی ڕابردوو (٢) هەزار کەس گەڕابوونەوە‌و، بەر لە گەیشتنی ئێمەیش (١٤٨) کەس لەسنوور پەڕیبوونەوە. ئەم چیرۆکە لەهەموو جێیەکان دەبیسترێ: گوایە ڕووسەکان، بەپێچەوانەوەی ئەوەوەکە کاتی شەڕن لێیان چاوەڕێ دەکرا، زەرەریان نەداوە؛ بەلام ئەرمەنەکان، کاتێ هەرێمە داگیرکراوەکانیان چۆڵکردووە، وێرانکارییەکی بەربڵاو هەرەمەکی ئاسوودەی کردوون.

قارس ئێستا شارۆچکەیەکی گەلێ ناخۆشە‌و، قەشەنگیی قەڵاو بارودۆخەکەش هەروەکو ڕاپۆرتی مردنەکەی مارك تویین (Mark Twain)[2]، زۆر زیادەڕۆییان تێدا کراوە. ئەم شارە لەم بارەی ئێستایدا، دروستکراوێکی ڕووسەکانە‌و، لە (حامیە)یەکی ئەوان دەکات‌و، ئەرمەنی‌و یۆنانیی تێدا نیشتەجێن‌و، کڵێسەی هەردوو

---

[1] ناحیەیەکی نزیکی باکووری شاری ئارتوینە. (س)

[2] (١٨٣٥–١٩١٠): ئەدیبێکی ئەمریکاییە، لە ڕۆمانەکانیدا هەولی داوە ڕۆژاوای وڵاتەکەی بە دیمەن‌و نەریتەوە بخاتە بەرچاو (المنجد في الاعلام، ص ١٩٧). (س)

کۆمەڵەکەیشمان بینی. ئەم شارە کە کەمترین بینای لێ چاککراوەتەوەو ئەوانی دیکەی بەجێ هێڵراون، ئێستا رقی لە کاولکارییەو، وتیان هەر چاککردنەوەیەکیش کرابێ، هی دوو ساڵی رابردووە، پێشتر وەك شاری مردوو وابووەو، ئێستا خۆشترە.

سەلیم بەگی والی لە ماڵە گەورەو خۆشەکەیدا کەزۆر بەباشی چاککراوەتەوە، پێشوازیی کردین. ناوبراو کابرایەکی رووخۆشی تەمەن مامناوەندی بوو، زۆر شانازیی بەویلایەتەکەیەوە دەکرد، چونکە بەهۆی سیستمی باشی رێگەو بانەوە دەیتوانی بەئاسانی هاتوچۆ بکات، بەڵام نەیدەتوانی بێ مۆڵەتی تایبەت بچێتە ناوچە قەدەغەکراوەکان. فوئاد پاشای قوماندان باسێکی ئەمی کردو، بۆمان دەرکەوت پەیوەندیی نێوان دەزگا سەربازیو مەدەنییەکان زۆر باش نییە. ئەو ئەفسەرەی کە پاسەوانیی دەکردین، تەنانەت ناوی والیی نەدەزانی، ئەگەر چی سێ ساڵ بوو لە قارس بوو. فەرماندەیی جەندرمە لە ساری قامیش، هەواڵی گەیشتنی ئێمەی بە بروسکە دابووە دەزگا سەربازییەکانی قارس، ئەمانیش بەگرنگییان نەزانیبوو، والی ئاگادار بکەنەوە، تا ئەوکاتەی داوای بینینیمان کرد.

قارس سێ ئاشی ئاردی تێدایەو، نەمانزانی بەچی کاردەکات، وێستگەیەکی گازیی وزەیشی هەیە کەدەمانەوێ بیکەنە دەزگایەکی کارۆ ئاوی. ئێرە لقێکی بانکی کشتوکاڵیی تێدایەو، بانکی ئیش (Is Bankasi)یش دەکرێتەوە. نەخۆشخانەی سەربازیو مەدەنیش هەن، بەڵام دەردو پەتا لەناودان. لە قوتابخانەیەکی سەرەتاییو یەکێکی ناوەندیدا دەخوێنرێ. هەروەها، والی رایگەیاند (٤٠٪)ی گەنجان خوێندەوارانو، ویلایەتەکە، جیا لەوانیتر، لەم رووەوە پێشکەوتووەو، بەگشتیش ئارەزووی خوێندن دەکرێ. ئەو ویلایەتە تیپی دیدەوانیی تێدایەو، قوتابیانو سەربازان یاریی تۆپی پێ دەکەن، سەمایش مانگانە دووسێ جار لەحامیەکە دەکرێ.

## قارس – ئەرزرۆم

ڕێگەی ڕۆژی پێشومان تا (خۆراسان Horosan) گرتەوە بەرو، لەوێوە بەکۆپروکۆیدا، چوینە حەسەن قەڵعە (Hasan kale)[1] کە مەڵبەندی قەزایەکی ئەرزرۆمە. زانیمان ئەو دەورووبەرە لەرووی پەروەردەو خوێندنەوە پێشکەوتوون، قوتابخانەی سەرەتایی لەسەرجەم گوندەکاندا هەیەو، ٨٠٪ی دانیشتوان دەتوانن بنووسن و بخوێننەوە. لێرەوە هەرێمی سەربازیی ئەرزرۆم دەست پێدەکات و، ئەفسەرێك تا دوا جێگە پاسەوانیی کردین. ئەم هەرێمە لە ڕۆژئاواوە دەگاتە ئیلیجە (Ilica)[2]و، لەباکووریشەوە (٢٥) کیلۆمەتر درێژ دەبێتەوە، بەڵام سنوورەکەی لە باشوورەوە، بەهۆی سروشتی شاخاویی دەڤەرەکەوە، دیاری نەکراوە. ئەم هەرێمە چەند ناوچەیەکی یەکجار قەدەغەکراوی هەن، کە لەشارۆچکەکەوە دوورن و، گرفتیان بۆ ئێمە نەبوو. حەسەن قەلعەو ئیلیجە کانیی کانزایی (مەعدەنی) یان هەن و، خەڵکی ئەرزرۆم دەچنە سەریان.

## ئەرزرۆم

ئەم ویلایەتە قەرەباڵغەو، (٣٠٠) هەزار هاووڵاتیی تێدان. ئەو خەڵکە سەرگەمی کشتوکاڵ و، تارادەیەك زۆریش بەخێوکردنی ماڵاتن. مەڕو ڕەشە وڵاغ و خوری و بەرووبوومی شیرەمەنی، دەنێردرێنە دەرەوە. بڵاوبوونەوەی تاعوونی ڕەشەوڵاغ بازرگانیی پەك خستووەو، دە بازاڕەکەی مەڕو ڕەشەوڵاغی ئەرزرۆم، هەموویان داخراون . مانگای شیری ڕەگەز باشی رووسیی تا (٦٠) لیرەی تورکی دەکات و،ڕۆژانە (١٠) حۆقە شیر دەدات، کەچی ڕەگەزێکی ناوخۆ تەنها بە (١٠–٢٠) لیرەی تورکی دەفرۆشرێ و، نیوەی ئەو بڕە شیرەی سەرەوەیشی هەیە. خەڵکی ئەو

---

[1] قەزایەکی نزیکی ڕۆژهەڵاتی ئەرزرۆمە. (س)

[2] ناحیەیەکی نزیکی ڕۆژاوای ئەرزرۆمە. (س)

دەورووبەرە زۆر بێزارن‌و، نەیانتوانیوە هەلی ئەو زستانە درێژە بقۆزنەوە بۆ رستن‌وچنین لە ماڵەکانی خۆیان‌و، تاڕادەیەکیش دەست بڵاون.

شاری ئەرزرۆم چەندین جار تووشی داگیرکردنی روسەکان هاتووەو، ئێستا تەنها (٢٥) هەزار کەسی تێدا دەژین. ژمارەیەك ئاشی ئاردو وێستگەیەکی مامناوەندیی کارەبایی بەتوانایی (٥) ئەسپی تێدان‌و، بەگاز کاردەکەن. هەروەها دوو ئامێری تری بەتوانای (٢٥) ئەسپ، بەبەهای (١٠–١٥) هەزار لیرەی تورکی داواکراون‌و، پرۆژەیەکی کارۆ ئاوییش خراوەتە بەرباس‌و لێکۆڵینەوە. ئێستا وزە لەدووریی (٢٢) کیلۆ مەترەوە وەردەگیرێ‌و، خەرجییەکەشی بە (٤٥٠) هەزار لیرە تورکی مەزندە دەکرێ. والی‌و وەزیری ئابووری‌و دەوڵەت وەسفەکانی تاووتوێ دەکەن کە کۆمپانیاکە بەهەڵە بە ئەڵمانی، لەجیاتی تورکی، پێشکەشی کردووە. لقی بانکەکانی عوسمانی‌و ئیش‌و کشتوکاڵی لەئەرزرۆم هەن، بەڵام ئیش‌وکار کەمن‌و، پشتیوانەی جوتیاران بەشێوەیەکی سەرەکی بۆ بانکە تورکییەکان دەچێ. نەخۆشخانەیەکی سەربازیی‌و یەکێکی نوێی نموونەیی (Mumune hastahanesi)ی هەن. زستانان سەما دووجارو، بەتایبەتی لەیانەی ئەفسەراندا دەکرێ. یانەیەکی وەرزشی کە تیپێکی تۆپی پێی سەربەخۆی خۆی، جیا لەوی قوتابخانەکانی هەیە، لەم شارەدایەو، قوتابخانەکانیش دەستەی گەرۆکی دیدەوانیان هەن. فەوزی بەگی والی کە پیاوێکی پیری خەڵکی ئەنگۆرەیە، چەند ساڵێکە لەو پۆستەدایەو، لە وەرزی خۆشانیدا یەك دووجار بە ویلایەتەکەیدا دەگەڕێ. پێی وتین: رێگەیەکی نوێ، لە باشوورەوە، بەرەو خنس دروست دەکرێ. هەڵسەنگاندێکی زۆر چڕوپڕی بۆ باری خوێندەواری هەبوو، کە ئێمە لەجێیەکەوە بۆ جێیەکی تر پێی ئاشنا بووبووین. هەر ئەمەیش وای کرد، بیرو بۆچوونەکەی زۆر جێی متمانەبن.

(١٠١) قوتابخانەی سەرەتایی‌و، هەشت نۆ هەزار قوتابی لە سەرتاسەری ئەم ویلایەتەدان، هەشت قوتابخانەی سەرەتایی‌و یەکێکی ناوەندی‌و فێرگەیەکی راهێنانی مامۆستایانی کوڕو یەکێکی کچ لەناو ئەرزرۆم‌و، خانەیەکی منالانی بێ لانە (هەتیو

خانە) لە قزخاتوون (Kiz hatun)دان. رێـژەی گـەنجانی خوێنـدەوار، پێـش دووساڵ، تەنـها (٥٪)بـوو و، ئێستا بووەتـە (١٠٪)و، والییش هیـوای خواست ئـەم ڕێژەیە لە دە ساڵی ئایندەدا بەرزبێتـەوە بۆ (٥٠٪)و گوندنشـینان زۆرێکـی ئـەوتۆ، یان دەکرێ بڵێین هیچ زۆریـان لێ نەکراوە بۆ چوونـە قوتابخانـەی شـەو (قوتابخانـە میللییـەکان)، بـەڵکوو خۆیـان ئـارەزووی کتێـبو نووسینو ڕۆژنامـە دەکـەن. تەنـها کەمێکیش بێ تەلیان هەیە.

والی پێـی ڕاگـەیاندین کەهـەرێمی سـەربازیی ڕۆژهـەڵاتی تورکیـا تەنـها ئـەرزڕۆمو سـاری قـامیشو قـارسو ئـارارات دەگرێتـەوە. کونسـوڵی ئـێران کـە بـە مۆڵـەت ڕۆیشتبوو، سکرتێرەکەی نوێنەرایەتیی دەکرد، هـەرکاتێ بیویسـتایە لەشـار بچێتـە دەرەوە، دەبـوو ڕەزامـەندیی دەسـەڵاتی سـەربازیی وەربگرتایـەو، ئەفسـەرێك پاسەوانیی بکردایە. کەمێك بەر لە گەیشتنمان، دوو پشـکنیاری فەڕەنسـیو بریتـانی بانکی عوسمانی شەش هەفتە بەئیشی بانکەکە لە ئەرزڕۆم مابوونەوە. دەسەڵاتداران حوشترەوانە ئێرانییەکانی ڕێگەی ترانزێتەکەباش دەناسن، کەچەند ساڵێکە خەریکی ئەم پیشەیەنو، مۆڵەتی تایبەتییان پێدراوە. سەرمان لە ساڵح پاشای قۆماندان داو، لەبەرئەوەی لەوێ نەبوو، ئەفسەری سەرەکیی ئەرکان پێشـوازیی کردیـن. ئـەم پێـی ڕاگەیاندین کە وێنەگرتن لە ئەرزڕۆم، بەپێچەوانەی قارسەوە، قەدەغەنییە.

### ئەرزڕۆم- تەرابزوون

ئێمـە کـە ئەفسـەرێکمان تـا ئیلیجـە لەتـەکدابوو، دەشـتـی ئـەرزڕۆممان بـڕیو، گەیشتینە قەراغی بـاکووری دەشـتەکەو سـەر فـورات سـۆی لقـی سـەرووی ڕووبـاری فورات، ڕێگەکە مەودایەك بەتەنیشت چەمەکەدا دەڕوات، ئەمجا دەپەڕێیتەوەو، هـەر زوو بەڕێگـەی قـۆپ (Cop)[1]دا هەڵدەگـەڕێ. دامێنـێ چیاکـان لـێرەوە شـوێنەواری

---

[1] ناوچەیەکی نێوان سنووری ڕۆژاوای ویلایەتی ئەرزڕۆمو، ویلایەتی گوموشخانەیە. (س)

دارستانی زووتریان پێوەدیارەو، بێ ئەژمار عەرەبانەمان دی کە بەگا رادەکێشران و، دار بەڕوویان بۆ سووتەمەنیی زستان هەڵگرتبوو (قۆپ داغ- Cop Dag)[1] کە زستانان زۆر سەختە، لەمانگی تەممووزدا ترسی نامێنێ. ئەگەر چی ئەو رۆژە کە لەئەرزۆم ماینەوە باران نەباری، بەڵام کەمێك بارانی خوڕ لە شاخ بارییبوو، پاشان، رێگەکە بە ناوچەیەکی رووتەندا لە دۆڵی "چۆرۆخ"[2]ەوە بەرەو بایبورت (Bayburt)[3] کە کشتوکاڵێکی زۆری لەنزیکەوە کراوە، تێدەپەڕێو، بەڕێی ڤاڤووك- Vavuk)دا سەردەکەوێتەوە. دوایی بەدۆڵی خارشتی سۆ (Karsut su)[4]دا تا پشت گوموشخانە بەرەو خوار دەبێتەوە. دیمەنەکە لە لوتکەی رێگەی ڤاڤووکەوە دەگۆڕێو، شاخەکان لەجیاتیی ئەوی خڕبن، تیژ دەبن و، بنارە پەمەیی قاوەیی باوەکانیان هەمە جۆر درەختیان پێوەیە. گوموشخانە شوێنێکی گەلێ دڵگیرەو، خانووە سپیو بانە بەرزە لەتەختە دروستکراوەکانی کەلەسەوزایی بنکی دۆڵەکەوە سەردەردەهێنن، لەوە دەچن کەلەجیهانێکی جیاتر بن. رێگەکە لەدۆڵی زەیغەنەدەرە- zigana Dere[5]ی تەنیشتەوە بەناو دارستانێکی پچڕپچڕدا تا لوتکەی رووتەنی رێگەکە بەرەو سەردەڕوات و، جارێکی تر بەپشتێنەیەکی چڕی دارسنەوبەر بەرەو بنارێکی دەوڵەمەندی کشتوکاڵی و تەرابزوون دادەگەڕێ.

ئەم رێگەیە چەند قۆناغێکی چاککردنی تێدان و، رووەکەی لەسەر رێی قۆپ و، هەروەها لەڕێگەی ڤاڤۆکەوە تاگوندی زیغەنە- Zigana ، تەنیشتی رێگەی زیغەنەو یەك دووشوێنی لەخۆڵەکە باشترەو دوای باران کێشەی زۆرە. ئەو بەشەی

---

[1] شاخی قۆپی هەمان ناوچەیە. (س)

[2] رووباری چوروخ بە قەزای بایبورتدا تێنەپەڕێ. (س)

[3] قەزایەکی رۆژهەڵاتی ویلایەتی گوموشخانەی باکووری رۆژهەڵاتی تورکیایە. (س)

[4] چەمی خارشیت کە بە ناحیەی خارشیتی باکووری رۆژاوای ویلایەتی گوموشخانەدا ئەڕوات. (س)

[5] دۆڵی زیغەنە کە ناوچەیەکی نێوان سنووری باکووری ویلایەتی گوموشخانەو باشووری رۆژاوای ویلایەتی تەرابزوونە. (س)

نێوان هەردوو ڕێی ڤاقووکو زیغەنە بۆ دروستکردنەوە دانراوەو، تاسالّی ئایندە ناگاتە ویلایەتی بایەزید. کارەکان بەتایبەتی لەنێوان گوموشخانەو گوندی زیغەنەدا باش بەڕێوەدەچنو، ڕێگەکە لەزۆر جێدا فراوان دەکرێو، جۆگەو بەردەکان دەبڕرێنو، لادەدرێنو، دیواری پاراستنیش دروستدەکرێ. کارەکە بەپێی پێویست بەڕێوەناچێ، چونکە هەر چەندە کەرەسەی بەهێزکردن ئامادەو کۆکراوەتەوە، کێشەی چاککردنی رووی جادەکان لەئارادایە.

# نائارامیی کورد

لە ویلایەتی مەلاتیە بۆمان دەرکەوت نیوەی دانیشتوان کوردنو، سەرەڕای زمانی خۆیان، تورکییش بەکاردێننو، بەگشتی گوندنشین یا کرێکاران. بەشی هەرەزۆری هەرێمی بەدناوی دەرسیم، دەکەوێتە ویلایەتی ئەلعەزیزەوە. والی پێی وتین: ئەو ڕایەی قوستەنتەنییە، کە گوایە ئەم هەرێمەیە لانەی چەتەیەو، کەس لە سەرو ماڵی دڵنیانییە، ناڕاستە. جەندرمەیەك بەتەنیا دەتوانێ بچێتە گشت لایەکی دەرسیمو، ئەو ئەندازیارەیش کەکار بۆ ویلایەتەکە دەکات، زوو زوو کاری وەها رادەپەڕێنێ. پار چەند هێرشێك کرانە سەر ئەرزنجان، بەڵام لە ئەلعەزیزەوە نەبوون. ئەمساڵیش ئارامی باڵی بەسەر ناوچەکەدا کێشاوە. کێشەی سەرەکی هی ئابووری بووەو، هەلومەرجی نالەبار کوردەکانیان ناچارکردبوو پەنا بۆ داگیرکردن ببەنو، ئەمەیش هەمان چیرۆکی سنووری سکۆتلەنداو باکووری رۆژئاوای هندستانە. کوردەکان، بێگومان، خراپترین دوژمنی خۆیانن، چونکە دوژمنایەتیی نێوان تیرەو خێڵە جیاجیاکان هەر ماوە. کوردانی دەرسیم هەموو قزڵباش بوونو، زۆریان، لەپاڵ زمانی خۆیاندا، بەتورکییش دەدوان. والیی وان وتی کاتێ لە ئەلعەزیز یاریدەدەر بووە، توێژینەوەیەکی لەسەر دەرسیم کردووە. دەرسیم، بەپێی ئەو لێکۆڵینەوەیە، (٩٠٠) گوندی هەیەو، (٣٠٠) یان تورکو(٢٠٠) یان زازاو ئەوانی دی کوردن، بەڵام

دانیشتوانی گوندە تورکیەکان لە هی ئەوانیتر زیاترن. ئەویشی پشت راستی کردەوە کە دەتوانێ، لەگەڵ یەك جەندرمەدا، بە ویلایەتی واندا بگەڕێ.

مومتاز بەگ، لە دیاربەکر، ئەو قسانەی ئەنگۆرەی جەخت کردەوە کەپێمان وترابوون: ناوخۆی وڵات، ئەمساڵ، تەواو هێمنەو، تاکە گرفت پەلاماری ناوبەناوی سەر سنووری ئێرانە. ویستمان سەر لەودەڤەرە بدەین، بەلام ڕێیان نەداین. والیی (وان)یش هەر وەهای پێوتینو، شەڕی قورسو بیرۆکەی ئاژاوەگێڕیی بەدوور نەدەزانی. زۆرینەی کوردان هۆی ڕەواو بەردەوامی بژێوییان نییەو، لەسەر تالانکردنی هاوسێکانیان ڕاهاتوون. ئێرانیەکان سەرەتا هانیان دەدان لەسەر سنووری تورکیا تواناترین، کەچی ئێستا کە ڕاونراون، هاوکاریی تورکەکان دەکەن بۆ گەمارۆدانیانو، کوردەکان لە بارودۆخێکی ناهەمواردان.

حکومەتی تورك پشتیوانیی ژیانی کۆچەری ناکاتو، یارمەتیی کۆچەرییان دەدات جێگیربن( تاکە ڕەوەندێکمان لە سەرتاسەری تورکیادا نەدی، جێگیربووبێ). ئەو چیرۆکەی کە گوایە ئەمساڵ دەڤەرەکە تەواو ئارامە، لە هەموو جێیەك دەبیسترێ. سەرەڕای ئەوە، ڕێگەکانی ویلایەتی وانو بایەزید بە جەندرمە کە وا دیاربوو بەشێوەیەکی ڕێکوپێك ئەرکەکانیان جێبەجێ دەکردو بۆ پاراستنی ئێمە نەنێردرابوون، پاسەوانی دەکرێن. سەربازمان لەدەرەوەی ناوەندە گەورەکان نەبینی. چاودێریی بەردەوامی هاتوچۆ، ئەگەرچی کەمە، لەگشت ڕێگەکاندا بەدی دەکراو، ئەمەیش نیشانەی بەرقەراریی ئارامیی بارودۆخەکەیە. وەزیری ناوخۆ، بەر لەوەی ئەنگۆرە بەجێبهێڵێ، دانی پێدانا کە شتەکان تەواو ئاسایی نینو، ڕوونی کردەوە: لێپرسراوێتیی گەشتەکەمان هەڵناگرێو لەئەستۆی خۆماندایە. دواجار، وەزیری دەرەوە نامەیەکی بۆ باڵوێزی خاوەنشکۆ، ناردبوو و، ئەوەیشی تێدا ئاشکرا کردبوو کە بارودۆخ زۆر لە ساڵی ڕابردوو هێورترەو، پشت ڕاستیشی کردبووەوە کە ئاسایش هێشتا تەواو سەقامگیر نییە. بۆیە پێشنیاری کردبوو کە باشتروایە

گەشتەکەمان دوابخەین بۆ ساڵی داهاتوو، خۆئەگەر هەر بڕیاریشمان دا ئەمساڵ بیکەین، کارمان بۆ ئاسان بکەن.

توانیمان هەندێ زانیاریی گرنگ سەبارەت بە ڕووداوەکانی ساڵیپار لە پاتنۆس‌و ئەرجیش‌و قەرەکۆسە پەیدابکەین. لە پاتنۆس پێیان وتین: کۆمەڵێك کورد کە هەشت کەسێکیان چەکداربوون، (٢٧)ی حوزەیرانی (١٩٣٠)، لە باکووری ڕۆژهەڵاتەوە هاتبوون، بەڵام نەیانتوانیبوو بچنە گوندەکەوە. ئیتر(١)ی تەمموز بەرەو ئەرجیش هەڵاتبوون. لە ئەرجیش زانیمان (٨٠–١٠٠)کەسی کورد لەودیو سنووری ئێرانەوە چەند کیلۆمەترێك لەگوندەکە نزیك بوونەتەوە، دوای چوار پێنج ڕۆژ ڕاونران. چەك بەسەر گوندنشینەکاندا دابەش کرابوو، هەندی کوردیش بۆ وێرانکاری پەیوەندییان بەداگیرکەرانەوە کردبوو. ئەمجا پاشەکشەیان لەگەڵدا کردبوون‌و، وا ئێستا دەپارێنەوە ڕێگەیان بدرێ بگەڕێنەوە سەر ماڵ‌وحاڵی خۆیان. لە قەرەکۆسە وتیان: ئەم ڕووداوە بەشی یەکەم‌و، قۆناغی دووەمی لە مانگی ئەیلوولدا بووەو، شەڕەکە لەدەوری کێوی ئاراڕات ڕوویداوە. هەندێك لەوانەی کە لە ملکەچکردن بۆ تورك یاخی‌بوو بوون‌و هەڵاتبوونە ئێران، ئێستا مۆڵەتی گەڕانەوەیان پێدراوە. دەڵێن ئاراڕات ئەمساڵ تەواو هێمن بووەو، لە یاخییان پاك کراوەتەوە، بەڵام ڕاگەیاندنی وەك هەرێمی سەربازیی پلە "یەك"، پێشانی دەدات کە حکوومەت گەرەکیەتی لەئاییندەدا تووشی مەترسی نەبێتەوە. بەڵگەکان ئەوەیان خستەڕوو کە حکومەت کێشەی کوردی باش کۆنترۆڵکردووەو، دوای چەسپاندنەوەی نیزام‌و ئاسایش، هەوڵی باشکردنی باری ئابووری‌و کۆمەڵایەتی دەدات کە ملکەچیی کوردیان بۆ سنوورو ژیانی مەدەنی مەحاڵ کردبوو. بێگومان، ئەم "هێورکردنەوە"یە، بووەتە مایەی گوێڕایەڵی‌و بەکارنەهێنانی هیچ گوتەیەکی نەشیاو، ڕەنگە وەڕزی‌و تووڕەییشی هێنابێتە ئاراوە، بەڵام پرۆسەی بەتورککردنی کورد هەر بەردەوامەو، دەشێ بەئاکام بگات. (٨٠٪)ی کورد، بەپێی بۆچوونێك، ئێستا دەتوانن بە تورکی بدوێن.

**ئەرمەنیەکان**

ئەرمەنیەکان پاش ئەو هەڵسوکەوتو رەفتارانەیان، ناچارکران ئەو هەرێمەی کە داگیریان کردبوو، چۆڵی بکەن. سەیرنییە، کەسیان لەوناوچانەی رۆژهەلاتدا کە ژمارەیان تێدا زۆرو، زۆربەی دانیشتوانی دەوروبەری گۆلی وانیان پێکهێنابوو، بەجی نەمابێ. لە غەرزان پێیان وتین: هەزاران ئەرمەنی کە مابوونەوە، بەگوندە جیاجیاکاندا بلاوبوونەوە، پار پێیان راگەیەندرابوو کە ناتوانن لە گوندەکان بمێننەوە، بەڵکوو ئەگەر ئارەزوو بکەن دەتوانن لە شارەکان نیشتەجێ ببن. ئەوانیش ئەم داوایەیان دابوە دواوەو، کۆچیان کردبوو بۆ سووریا. هێشتا نزیکەی(٢٤٠٠) ئەرمەنی لە شارۆچکەی ویلایەتەکانی ئەلعەزیزو مەلاتیەو ژمارەیەکی هاوشێوەیش لە قەیسەری‌و ئەنگۆرە ماون.

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٢/٤٢٤، ل: ٢١، ژ: ١/٦

**ژ: ١٠٢**

**لە سێرجی. کلارکەوە بۆ مارکویس ئۆف ریدینگ( ١٣ی ئۆکتۆبەر گەیشتووە)**

**ژمارە: ٣١٨**

**قوستەنتەنییە، ٧ی تشرینی یەکەمی ١٩٣١**

**گەورەم،**

خۆشحاڵم کۆپی نووسراوی کونسوڵی خاوەنشکۆ لە تەرابزوون، لە سەرچەند خێزانێکی کورد کە بەم دواییە لەناوخۆوە گەیشتوونە ئێرەو، حکومەتی تورک بەنیازە لە رۆژئاوای وڵات جێگیریان بکات، بۆ بەرێزتان بنێرم.

٢. ئەو خێزانانە کە ژمارەیان (٤٠٥) دەبێ‌و، سەر بە خێڵی خالکانلی (Halikanli)ن‌و، بەکۆچەری ژیاون، بەپێی نامەیەکی نیمچە رەسمی کە لە ژمارەی رۆژی (٤)ی تشرینی یەکەمی، "میللەت" دا بلاوبووەتەوە، لە سنوور پەڕیونەوەو، داوایان لە حکومەتی تورک کردووە رێگەیان بدات لە رۆژهەلاتی ئەنادۆڵ

جێگیربن. بابەتەکە لەسەری دەڕواو دەڵێ خالکانلیەکان سەر بە تیرەی جەلالین و بەتورکی قسە دەکەن و، ٣٠٠–٤٠٠ ساڵ لەمەوبەر لە قۆنیەوە کۆچیانکردووە.

٣. وێنەی ئەم نووسراوە بۆ نوێنەری خاوەنشکۆ لە تاران دەنێرم.

جۆرج ئاڕ. کلارک

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤/٢٧٥، ل: ٤١، ژ: ١٨

*********

## هاوپێچی ژ: ١٠٢

## لە کونسوڵ ماتیۆسەوە بۆ سێر جی. کلارک

**ژمارە: ١٠٥**

**تەرابزوون، ٢٢ی سێپتەمبەری ١٩٢١**

**گەورەم،**

ئاماژە بەنووسراوی ژمارە(١٠٣)ی (١٤)ی ئەم مانگەم، چەند کۆمەڵە کوردێك لەو ڕۆژە بەدواوە لە هەرێمی ئاڕاراتەوە گەیشتوونە ئێرە. هەروەها(١٧)ی مانگ (٢٠٠) خێزانێك کەژمارەی ئەندامانیان(٥٠٠) کەس دەبوو، بە کەشتیی هەڵمیی ن "جمهوریەت"ی (سەیری سەفاین– Seyri Sefain )نێردراونە قوستەنتەنییەو، لەوێوە بەرەو ویلایەتەکانی، بەپێی ڕاپۆرتێك، قۆنیەو بورسا( Bursa)[1]و، بەپێی یەکێکیتر، ڕۆدۆستۆ( Rodosto)[2]و، (Trace)[3]بەڕێ دەکرێن. دەڵێن ئەمانە سەر بە خەلیل ئاغای سەرکردەی کوردی هەرێمی ئاگری داغن کە پار شەڕی تورکی کردبوو و، مانگی رابردوو لەگەڵ ١٢٠٠ خێزانی داروەستەیدا خۆی بەدەست جەنەڕاڵ

---

[1] ویلایەتێکی ڕۆژئاوای تورکیاو نزیکی دەریای مەرمەرەیە.(س)

[2] بەندەرێکی سەر دەریای مەرمەرەی تورکیایە( المنجد فی الاعلام، ص٣١٢).(س)

[3] ڕێی تێنەچێ هەڵەی چاپی تێدابێ و،Thraceبێ کەناوچەیەکی سنووریی ڕۆمەیلیی تورکیاو باکووری یۆنانە.(س)

ساڵح پاشاوە دابوو. چەند هەفتەیەك پێش ئەو کاتـە، ڕازی نـەبووبوو خـۆی تەسلیم بەعومەر خالیس پاشا بکات کە بۆ ئەو مەبەستە نێردرابووە ناوچەی ئـاڕاڕات. نـازانم بۆچی بەباشی زانیبوو خۆی بداتە دەست ساڵح پاشـا، نـەك عومـەر خـالیس پاشـا، بەڵام پێم وایە وای هەستکردووە هەتا پلەی ئەفسەرەکە بەرزتربێ تەسلیم بوونەکەی کەمتر نەنگ دەبێ. خەلیل ئاغا، پاش خۆبەدەستەوەدانی، چوو بۆ ئەرزڕۆم و، دەڵێن لەوێ (١٥٨) هەزار لیرەی تورکیی لەبانکی عوسمانیدا دانـاوە. بەهـەرحاڵ، مـن ئـەم زانیارییـە بەوریاییـــەوە دەدەم. ئـەڵێن نـاوبراو ئێسـتا سـەرگەرمی کۆکردنـــەوەی ماڵاتەکەیـەتی و، چاوەڕێ دەکرێ بـەر لـەهاتنی وەرزی زسـتان لەگـەڵ دوو تـاقمیدا بگەنە ئێرە. سەرداری کوردان کە ناوی مسـتەفایەو، هاتۆتـە ئـێرە، پێدەچـێ کـوڕی خەلیل ئاغا بێ.

٢. وا ڕادەگەیەنرێ: حکومەتی تورك (٨٥) هەزار لیرەی تورکیی بۆ گواستنەوەی ئـەو کوردانـە بۆ جێوشـوێنی نوێیـان تـەرخانکردبێ. ئەمانـە کاتـــێ لـە تـەرابزوون دەمێننەوە، دەخرێنە بەر چاودێری و، مۆڵەت نادرێتە بیانی لێیان نزیك ببێتەوە.

دەبلیو. دی. دەبلیو. ماتیۆس

هاوکـارە فەڕەنسیەکەم پێـی وایـە، ئـەم کوردانـە بەشـێکن لـەتیرەی جـــەلالی و، لەڕاستیدا خـەڵکی ئـێرانن، بـەڵام لەبـەر ئـەوەی هـاوولاتیی تورکیـان، ڕێیـان نـادرێ بینەوە خاوەنی مەڕو ماڵاتەکانیان.

دەبلیو. دی. دەبلیو. ماتیۆس

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤/٢٧٥، ل: ٤٢، ژ: ١/١٨

## ژ: ١٠٣

## لە سێر جی. کلارکەوە بۆ سێر جۆن سیمۆن( ١٦ی تشرینی دووەم گەیشتووە )

**ژمارە: ٣٨١**

نوێنەری خاوەنشکۆ لە تورکیا بەشی تەواوکەری راپۆرتەکەی پێشکەش بە وەزیری خاوەنشکۆ بۆ کاروباری دەرەوە دەکات، وێنەی ژمارە (١٢٤)ی (٢٩) تشرینی یەکەمی تەرابزوونیشی سەبارەت بە گواستنەوەی کوردان لە هەرێمی ئاراراتەوە بۆ رۆژئاوای تورکیا هاوپێچ کردووە.

ئەنکۆرە، ١١ی نۆڤەمبەری ساڵی ١٩٣١

******

## هاوپێچی ژ: ١٠٣

## لە جێگری کونسوڵ فالانگاوە بۆ سێرجی. کلارك

**ژمارە: ١٢٤**

**تەرابزوون، ٢٩ی ئۆکتۆبەری ١٩٣١**

**گەورەم،**

ئاماژە بەنووسراوی ژمارە(١٠٥)ی (٢٢)ی مانگی رابردووی تەرابزوون، کۆمەڵێك کوردی هەرێمی ئارارات( ٢٧)ی ئەم مانگە لەرێگەیاندا بەرەو ویلایەتەکانی رۆژهەلات، گەیشتنە ئێرە. دەڵێن: ئەم کۆمەڵە کە (٤٠٠) خێزان و(٢٠٠٠) کەس دەبوو و، سەر بە خێڵی خەلکانلیەکان بوو و، لە رۆژهەلاتی ئاگریداغ (ئارارات)، واتە ئەو بەشەی خاکی ئێران کە پێشتر سەربازانی تورك داگیریان کردبوو و، ملی بۆ دەسەلاتی سەربازیی تورك کەچ کردبوو، ژیاون. نزیکەی (٤) هەزار سەر مەڕو ماڵات و رەشەولاخ بەدوای ئەم کوردانەی بەرفەرمانی خەلیل ئاغای سەرخێڵەوە بوون. جا بۆ بەرگرتنی ئەم کوردانە لە بلاوبوونەوەو کاولکردنی ناوچەکانی سەر رێگەیان، خرابوونە بەر پاسەوانی و چاودێریی فەوجێکی پیادەی تورك.دوێنێ دووکەس لەم

کوردانە رایانگەیاند کە لە "نزیکی تەورێز"ەوە هاتوونو، تەنـها کـەمێکیان دەتوانـن بەتورکی بدوێن. وایان هەسـت دەکـرد لـە ویلایـەتی برووسـە جێگـیربکرێنو، لەسـەر خەرجیی حکومەتی تورکیش هاتوون. لە سەرچاوەیەکی ناوخۆی تورکەوە، زانیم کە تۆمارکـەرێکی خۆجێیـی نـاوی ئـەم کوردانـە تۆمـار دەکـاتو، ئـەمجا پەسـاپۆرتی تورکییان پێ دەدرێ. حکومەتی ناوەندی حیلمی بەگی بەڕێوەبـەری" بەڕێوبـەرێتیی گشتیی نیشتەجێکردن"ی نـاردووە تـا پرۆسـەی کۆچـی ئـەو کوردانـە بـەڕێوەببات. ناوبراو (٢٥)ی ئەم مانگە گەیشتە ئێرەو، ئێستا خەریکی رێکخستنی هەرچی زووتری ناردنیانـە. ئـەمڕۆ، کۆمـەڵێك کـورد کـە خـــەلیل بەگیشـیان تێدابــوو، بەکەشــتیی" جمهوورییەت"ی " سەیری سەفاین" رەوانەکرانو، ئەوانەیش کـە مـاون بـەم زووانـە دەنێردرێن.

جەی. جی. ئەی. فالانگا

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٥/٤٢٤، ل: ٦٨-٦٩، ژ: ٤٠

## ژ: ١٠٤

## لە مستەر مۆرگنەوە بۆ سێرجی. کلارك (٤ی کانوونی دووەم گەیشتووە)

**ژمارە: ٤٤٥**

**ئەنگۆرە، ٣٠ی دیسەمبەری ١٩٣١**

**گەورەم،**

ئاماژە بەنووسراوی ژمارە(٤٣٦)ی (٢٣)ی کانوونی یەکـەم تایبـەت بەسـەردانی وەزیری دەرەوەی تورکیا بۆ تاران، پێتان رادەگەیەنم کە تۆفیق رۆستوو بـەگ (٤)ی کـانوونی دووەم لـە دەریـای رەشو قۆقـازەوە، قوسـتەنتەنییە بـەرەو ئـێران بەجێدەهێڵێ. دوایی گەشتەکەیشی، لەڕێگەی بەغداوە دەگەڕێتەوە بۆ تورکیا.

٢. نـووری پاشـای سـەرۆوەزیری عـێراق کەئێسـتا لێرەیـەو، گفتوگـۆی رێککەوتننامەیەك لەگەڵ تورکیادا دەکاتو، هاوڕێی دێرینی تۆفیق رۆستوو بەگیشـە،

وتی: مەبەستی سەردانەکە تەواوکردنی وتووێژی نێوان تورکیاو ئێرانە لەمەڕ سنووری نێوانیان. نووری پاشا لەوە دەترسا حکومەتی ئێران ئەم گەشتە بقۆزێتەوە بۆ رێزکردنی هاوکاریەکانی تورکیا بۆ گوشار خستنەسەر عێراق، هەتا ڕازی بێ سەرتاسەری سنووری ئێران لەرووسیاوە تا کەنداوی فارس لەسەر ئەو بنەمایەی کە مەسەلەی ئەم سنوورە پێش شەڕ دانوستانی لەسەر کراوە ببێتە جێی لێدوان. ئەم گفتوگۆیانەی ئێستایش، تەواوکەری ئەوانەی پێش شەڕن. ڕاستە سەرەتاکانی دانوستان، دەست لەوەی کە ئێستا خاکی عێراقە هەڵگیراوە بۆ تورکیا، بەڵام ئێستا پێویستە بە تەنازولی تورکیا لە باکوورو هی عێراق لە باشوور، هاوسەنگ بکرێتەوە. نووری پاشا هۆی ئەمەی، ئەگەر بەڕاستی ئێران حەز بەمە بکات، بەشتێکی سەیروسەمەرەو بێمانا لێکدایەوە. بەڵام پێی سەیر نەبوو کە یەکێك لە ئاکامەکانی وتووێژی تورکیا– ئێران داوایەکی ئێران‌و پشتگیریی تورکیا بێ لەو داوایە کە عێراق ڕازی بێ شەتولعەرەب ببێتە هێڵی سنووری نێوان ئێران‌و وڵاتەکەی.

٣. بەقسەی نووری پاشا، بڕیاری ئێران بۆ داوەتکردنی تۆفیق ڕۆستوو بۆ تاران، بەهۆی هاندانی رووسیاوە بوو. ئەو تێبینی کردبوو کە تورکیا ساڵێك لەمەوبەر، لەبەر هێزە ڕۆژئاواییەکان، خۆی لەرووسیا دوورخستبوەوەو، زۆر کەوتبوە بە ڕتین‌و تاوی ئیتاڵیاو، بەم هۆیەوە لەگەڵ یۆناندا ئاشت بووبوەوە. ئێستایش کاریگەریی ئیتاڵیا کەم بووەتەوەو، ئەمیش بایداوەتەوە سەر رووسیای هاوەڵی‌و، پەیوەندییان لە جاران پتەوترە. تۆفیق ڕۆستوو، بەئامۆژگاریی رووس، چاوەڕێی هاوکاریی شا، نەك تەیموور تاچ، دەکات، بۆ ئەوەی بەسەر تەگەرەکانی سەر ڕێی دانوستانەکانی داهاتوودا زاڵببێ. دەڵێن: شا لە تەیمورتاچ ڕاشکاوترەو، ئاسانتر کۆنترۆڵ دەکرێ. خۆ ئەگەر تۆفیق ڕۆستوو، وەك لە نووسراوی ژمارە(٤٣٦)ی (٢٣) کانوونی دووەممدا هاتووە، بەڕاستی دڵنیای کردبمەوە کە سەردانەکەی تارانی بۆ حکومەتی خاوەنشکۆیش بەسوود بێ، ئەوا لەوانەیە، وەك نووری پاشا پێشبینیی کرد، پێشنیاری رووسیا بێ، بۆ ئەوەی هەستی حکومەتی خاوەنشکۆ ڕابگرێ.

٤. تۆفیق رۆستوو، لەقسەی بێسەرو بەرو ئاڵۆزەکانیدا لەگەڵ نوری پاشادا، پێشنیاری کرد کە پێویستە تورکیاو ئێران‌و عێراق بۆ هاوکاریکردنی یەکتر، کاتی سەرهەڵدانەوەی کێشەی کوردلە سنووری هەرکام لەم سێ وڵاتەدا، رێك بکەون. نوری پاشا رازی‌بوو چاودێریی سنووری تورکیا بکات، ئەگەر لە نزیکی سنووری عێراق تووشی کێشەی کورد هات، هەروەها سنووری ئێران بخاتە بەر چاودێری، ئەگەر ئێران گرفتی هاوشێوەی نزیکی سنووری خۆی لەگەڵ عێراقدا هەبوو، بەڵام نەیدەزانی چۆن ببێتە هاوکار، ئەگەر تەنگوچەڵەمەکان لە سنووری تورکیا- ئێران سەریان هەڵدا. دەشێ تۆفیق رۆستوو مەبەستی بووبێ عێراق، لەم حاڵەتەدا، لێدوانێکی رەسمیی هەبێ، یان هەندێ کار بکات بۆ رازیکردنی کورد لە سنووری خۆیدا تا پەیوەندی بە یاخییانی تورکیاو ئێرانەوە نەکەن‌و، بە یاخییان رابگەیەنێ کە عێراق پشتگیریان ناکات. تۆفیق رۆستوو شتێکی لە مەز یاتری لە قسەکانیدا باس نەکرد.

٥. وێنەی ئەم نووسراوە بۆ کۆمیساری باڵای خاوەنشکۆ لە عێراق‌و نوێنەری خاوەنشکۆ لە تاران دەنێرم.

جەیمس مۆرگن

وەزارەتی‌دەرەوە، ٢٧٦/٤٢٤، ل: ٦-٧، ژ: ٢

ژ: ١٠٥

## لە مستەر مۆرگنەوە بۆ سێرجۆن سیمۆن(٤ی كانوونی دووەمی ١٩٣٢ گەیشتووە)

ژمارە: ٤٤٧

ئەنگۆرە، ٣٠ی دیسەمبەری ١٩٣١

گەورەم،

ئاماژە بە نووسراوی ژمارە(٤٣٠)ی (٢٢) كانوونی یەكەمم سەبارەت بەسەردانی نووری پاشای سەرۆك وەزیری عێراق بۆ توركیا، دەمەوێ پێتان ربگەیەنم كە (٢٨)ی ئەم مانگە گەیشتە ئەنگۆرەو، لە وێستگە چاوی بە عیسمەت پاشا كەوت. لەوساوە سەرگەرمی دانوستاندنە لەسەر مەسەلەی بازرگانیو جێو شوێنیو رێكەوتننامەكانی بەدەستەوەدانی تاوانبارانو كێشەكانی پەیوەندیدار بە سنووری هەردوو وڵات.

٢. پێی راگەیاندم كە وتووێژەكان بەشێنەیی بەڕێوە دەچن. پێی وابوو توركیا بەئاسانی پێشنیارەكەی بۆ مۆڵەت پێدانی شوانكاریی عێراقیو ماڵاتەكانیان بۆ چوونە ناو لەوەڕگاكانی توركیا پەسەند ناكات، ئەگەرچی ئەمان بۆ ئەمە پارەیان دەدەنێو، بۆ چوونەكەیشی راست دەرچوو. پێشنیارەكە هەرچەندە بەڕوونی نەدرایە دواوە، وتووێژكارانی تورك لەوە ناڕازیبوون، چونكە شوانەكان ئاشووری یان خێڵەكییەكانن.

٣. وادیارە توركیا بەنیازە بۆ ئاسایشی سنوور دەسەڵات بداتە ئەفسەرێكی جەندرمەی توركو، لەسەر سنوور جێگیری بكاتو، هەركە پەلامارێكی سنووری روویدا، لەگەڵ ئەفسەرێكی بەتایبەتی دیاریكراوی سنووری عێراقدا، كاری خێرا ئەنجام بدات. نوری پاشا پێشنیاری كرد توركیا سەرباز بنێرێتە سنوورو، بەرووی شوێنكەتووانی شێخ ئەحمەدی بارزانیی تێكدەری ئاسایشی ئەم دواییەی عێراق دابیخات. بەڵام ئەم پێشنیارە، لەبەر ئەوەی جموجۆڵی سەربازی لەناوچەكەدا تا مانگی حوزەیران مەحاڵە، پەسەند نەكرا.

٤. رای تورک لەمەڕ ئاشووریەکان سەیرە. نایانەوێ شوانکارانی ئاشووری بچنە تورکیاوە، کەچی حکومەتی تورکیا چەند ساڵێك لەمەوبەر ناڕازی نەبوو (٥٠٠) ئاشووری لەعێراقەوە بگەڕێنەوە بۆ هەرێمی شاخاویی زێدی خۆیان لە تورکیا، کە ئێستایش تێیدا ماون. وا ئێستا داوا لە نووری پاشا دەکات هەرچیی پێدەکرێ، بۆ بەرگرتن لە کۆچی ئاشووریی نیشتەجێی عێراق بۆ سووریا، بیکات، چونکە یەکەم: عێراق دەتوانێ بۆ کۆنترۆڵکردنی کوردەکانی هاوسێیان بەکاریان بێنێ و، دووەم: تورکیا حەزناکات ئەو ئاشووریانە کەمینەی موسڵمانی نیشتەجێی خاکی سووریای نزیکی سنوورەکەی زیاد بکەن.

٥. کۆپی ئەم نووسراوە بۆ کۆمیساری باڵای خاوەنشکۆ لە بەغدا دەنێرم.

جەیمس مۆرگن

وەزارەتیدەرەوە، ٤٢٤/٢٧٦، ل: ٨، ژ: ٤

## ژ: ١٠٦

## لەسێرجۆن سیمۆنەوە بۆ سێرجی. کلارك (قوستەنتەنییە)

**ژمارە:١١**

**ئۆفیسی دەرەوە، (٨)ی کانوونی دووەمی ١٩٣٢**

**بەڕێز،**

باڵوێزی تورك پێی وتم، وەزیری دەرەوەی تورکیا بەڕێوەیە بەرەو تاران و، مەبەستیەتی، لەڕێی دانوستانێکەوە، چاککردنێکی کەم لە سنووری نێوانیاندا بکات. روونی کردەوە کە ئێستا هێڵەکە کە بەچیای ئاراراتدا تێپەڕدەبێ و، جەردەکانی بەری تورکیا کەڕاو دەنرێن، بەسەر سنوورەکەدا هەڵدێن و، بەپێچەوانەیشەوە. بۆیە پێشنیار کراوە گشت چیاکە بکەوێتە ناو خاکی تورکیاوە و، بەرامبەر بەوە پارچە زەوییەکی باشوور کەئێستا خاکی تورکیایە بدرێتە ئێران. بەرنامەی ئەم ئاڵوگۆڕە لەتاووتوێدایەو، گەشتەکەی وەزیری دەرەوەیش بۆ تەواو کردنیەتی. فەرید بەگ

ئەوەیشی وت کە وەزیری دەرەوە رەنگە لەبەغداوە بگەڕێتەوە. خۆئەگەر وابێ، مەبەستی سەردانەکە دروستکردنی پەیوەندیی تایبەتە لەگەڵ حکومەتی عێراقداو، ئامانجێکی تایبەتی نییە.

جۆن سیمۆن

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٦/٤٢٤، ل:٨، ژ: ٥

## ژ: ١٠٧

## لە سێرجی. کلارکەوە بۆ سێرجۆن سیمۆن (٢٩ی کانوونی دووەم گەیشتووە)

**ژمارە: ٣٠**

**ئەنگۆرە، ١٨ی کانوونی یەکەمی ١٩٣٢**

**گەورەم،**

ئاماژە بەبروسکەی ژمارە(١)ی (١١)ی ئەم مانگەم سەبارەت بە ئیمزاکردنی چەند رێککەوتننامەیەکی نێوان عێراق و تورکیا، پێم باشە پێتان رابگەیەنم، نوری پاشا بە نهێنی ئاگاداری کردوومەوە کە بابەتی دانوستاندنی رێککەوتننامەکان بەم جۆرەی خوارەوە بوون:

أ- حکومەتی تورکیا رازیبوو بە پێشنیارەکەی، تا هەندێ رێو شوێنی سەرەتایی بۆ راگرتنی جەردەیی سەر سنووری عێراق- تورکیا وەرگرێ. یەکلاییکردنەوەی مەسەلەی رێگەدان بە ئاژاڵداره عێراقیەکان بۆ چوونە ناو لەوەڕگاکانی تورکیا، تا ئەوکاتەی عێراق دەچێتە کۆمەڵەی نەتەوەکانەوە، دواخراوە. تورکیا رازیبووە کارمەندانی ئاگاداریکاتەوە کە ئەگەر شێخی بارزان لە تورکیا بینرا، بیگرن و، بیدەنەوە دەست حکومەتی عێراق. هەروەها ناڕازای نەبوە ئاشووریەکان لە هەرێمی برادۆست جێگیر بکرێن.

ب- نووری پاشاو دەسەڵاتدارانی تورک بۆ دەستکاریکردنی، یان دووبارە لێکدانەوەی برگەی(١٤)ی رێککەوتننامەی (٥)ی حوزەیرانی (١٩٢٦)ی ئەنگۆرەی

نێوان تورکیا– عێراق، نامەیان ئاڵوگۆڕکردووە. ئەم ماددەیە تایبەتە بە بەشی تورکیا لەو باجەی کە حکومەتی عێراق لە کۆمپانیا نەوتەکەی زووی تورکیا دەیدات. نامە ئاڵوگۆڕکراوەکان ئەوەیان تێدا هاتووە کە دەبێ راوێژ بە حکومەتی خاوەنشکۆ لە بریتانیا بکرێ، سەبارەت بە گفتوگۆکانی ئەم دواییە بۆ دەستکاریکردنی برگەی(١٤).

٢. وێنەی ئەم راپۆرتە بۆ کۆمیساری باڵای خاوەنشکۆ لە بەغدا دەنێرم.

جۆرج ئار. کلارک

وەزارەتی دەرەوە، ٢٧٦/٤٢٤، ل: ٥٢، ژ: ١٨

## ژ: ١٠٨

## لە مستەر مۆرگنەوە بۆ سێرجۆن سیمۆن( ١ی نۆڤەمبەر گەیشتووە)

**ژمارە: ٥٠٣**

**قوستەنتەنییە، ٢٤ی ئۆکتۆبەری ١٩٣٤**

**گەورەم،**

خۆشحاڵم وێنەی راپۆرتێکی کونسوڵی خاوەنشکۆ لە تەرابزوون هاوپێچ بکەم[1]، کە زانیاریی سەبارەت بە کوردانی دەرسیم تێدایەو، لە دوا گەشتیدا بۆ گوموشخانە وەریگرتووە.

٢. دەرسیم دەکەوێتە نێوان ئەرزنجان و ئەلعەزیز( خەرپووت)و، هەرێمێکی شاخاوییەو، رۆژئاوای دەڤەرێکی تری کوردنشینی تورکیایە. کوردانی ئەم شارە، ساڵانی دوایی باش رەفتاریان کردووەو، بەشداری زنجیرە سەرهەڵدانەکەی کورد نەبوون، کە ساڵی ١٩٢٥ بە یاخیبوونی شێخ سەعید دەستیان پێکرد.

---

[1] چاپ نەکراوە.

بەم جۆرە، دووربوون لە گورزی کاریگـەری کۆمـار، کـە بنـەماکانی، وەك هەسـت دەکرێ، ئیتر پەسەند ناکرێن. ئەو ڕووداوە بچووکانـە کـە مسـتەر مـاتیۆس ئامـاژەی پێکردوون، ڕەنگە ببنە بەهانەی ئارەزووی شاڵاوو هەڵمەتی سەرکوتکاریی بەهار یان هاوینی ساڵی ئایندەی حکومەت.

جەیمس مۆرگن

وەزارەتیدەرەوە، ٢٧٩/٤٢٤، بەشی، ل: ٤١، ژ: ٣٣

## ژ: ١٠٩

## لە سێر پی. لۆرەینەوە بۆ مستەر ئیێدن( ٩ی کانوونی دووەم گەیشتووە )

**ژمارە: ٦**

## ئەنگۆرە، ٣ی کانوونی دووەمی ١٩٣٦

**گەورەم،**

مستەر مۆرگن لە ڕاپۆرتی ژمارە(٥٠٣)ی (٢٤) ئۆکتۆبەری ساڵی ١٩٣٤یدا تیشکی خستووەتە سـەر ناوچـەی شـاخاویی دەرسـیم کـە کەوتووەتــە نێـوان ئــەرزنجان و ئەلعـەزیزو، کـوردی ڕەسـەنی دڕنـدەی تێـدا نیشـتەجێ بـووە. پلانـی حکومـەت بــۆ مامەڵەکردن لەگەڵ بارودۆخەکەدا، ئێستا دەرکەوتووەو، وادیـارە خـاڵێکی هاوبەشـی نێوان کاری ئاسایی کـارگێڕیو سـەرکوتکردنی سـەربازییەو، هەردووکیشـیان پێشـتر تاقیکراونەوەو، بەپێویست دانراون.

٢. وەزیـری نـاوخۆ، لـە وتەیـەکی(٢٥)ی کـانوونی یەکـەمی ئەنجومـــەنی مـــەزنی نیشـتمانیدا، بـۆ پشـتگیریی ئیجرائـاتی حکومـەت لـەپێناوی( دامـەزراندنی ویلایـەتی تونجەلی)دا، ڕوونیکردەوە کە ئەم ویلایەتە نوێیە، وەك پێشتر نـاوی دەرسـیم بـووە، دەبێ بەوناوەوە بێ. سنووری دەرسیم هەرگیز دیاری نـەکراوە، بـەڵام سـنوورەکانی ئەم ویلایەتە ئیدارییە دەست نیشـان کـراون. ئـەم ویلایەتـە نزیکـەی (٩٠) کیلۆمـەتر پـانو (٦٠) کیلۆمـەتر درێـژەو، ڕووبـەرێکی( ٤٥٠–٥٠٠) کیلۆمـــەتری چوارگۆشـــەی

گرتووەتەوە. دانیشتوانیشی، وەك شوكری قایا پێی لەسەرداگرت، (٦٠-٧٠) هەزار تورك دەبن. هەرێمەکە بەجۆرێك پشتگوێ خراوە کە ڕێکخستنی کۆمەڵایەتیی لە هەی سەدەکانی ناوەند دەکات. هاووڵاتیانی کە بەسەر (٩١)خێڵدا دابەش بوون، خۆیان باری مەدەنیو دادەوەریو تاوانکارییان سەقامگیرکردووە. دەرسیم هەرێمی (١١) ئۆپەراسیۆنی سەرکوتکردنی سەربازیووە. خەڵکەکەی نەفامنو، بەهۆی بێپیتیی خاکەکەیشیەوە، هەژارن. خۆ ئەگەر چەکدارین، بەردەوام شەڕوشۆڕ لەناویاندا بەرپا دەبێ. شوكری قایا پاش ئەوە کە ڕوونی کردەوە ناوچەی وا دواکەوتوو لە گشت وڵاتێکو فەرەنسەو ئیتاڵیاو یۆنانیشدا هەیەو، هۆکانی سەرنەکەوتنی هەوڵی شیاوی بۆ خەڵکی دەرسیم خستەڕوو. وتیشی حکومەت بڕیاریداوە ناوەندێکی شارستانی کە سەرتاسەری وڵات بۆ خۆی رابکێشێ، لەو دەڤەرەدا دروست بکات. وتی: ئەم بڕیارە زادەی بارێکی نائاسایی نییەو، زۆریش هەوڵی داوە ئەنجومەن دڵنیا بکاتەوە لەوەی کەوڵات هیچ جۆرە بارودۆخێکی لەو جۆرەی تێدا نییە.

٣. کارێکی نوێی حکومەت کە بە کۆی دەنگ بڕیاری لێدراوە، بەپێی ئاژانسی نیمچە رەسمیی ئەنادۆڵ، دەست نیشانکردنی فەرماندەی فەیلەقی سەربازییە ( کە درێژە بە پەیوەندیەکانی بە سوپاوەو بایەخی دەسەڵاتی پلە سەربازیەکەی دەدات) وەك پارێزگارو قوماندانی سەربازیی ویلایەتی تونجەلی. ئەم پارێزگارە قوماندانە ئیمتیازی وەزیری کابینە یەك لەدوای یەکەکانی لە مەسەلە ئیداریەکاندا هەیە. هەروەها دەسەڵاتی نیشتەجێکردنو گەشتو سەفەری ناو ویلایەتەکەی پێ بەخشراوەو، دەتوانی حوکمی مردن بدات، جگە لەو حاڵەتانەی دەست بە لێکۆڵینەوەیان دەکرێتەوە.

٤. ویلایەتە تازەکە لە ویلایەتەکانی ئەلعەزیزو ئەرزنجان جیاکراوەتەوەو، دەکەوێتە نیوەی ڕۆژئاوای بەرەو باکووری نێوان مورداسۆو فوراتی سەرووەوە.

پێرسی لۆرەین

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤/٢٨٠، ل: ٤١، ژ:٣

ژ: ١١٠

**لە سێرپی. لۆرەینەوە بۆ مستەر ئیدن( ١٩ی مارس گەیشتووە )**

ژمارە: ١١٩

ئەنگۆرە، ٤ی ئاداری ١٩٣٦

گەورەم،

ئامـاژە بەنووسـراوی ژمـارە( ٤٢٧)ی (٢٩) ئـابی سـاڵی (١٩٣٥)م سـەبارەت بـە پشکنیارییەکی گشتیی نـوێ، پێتـان رادەگەیـەنم: جەنـەڕاڵ عـەبدوڵڵا ئـاڵپ دۆغـان، بـەپێی راپۆرتـی چاپەمەنیـەکان، کراوەتـە چـوارەم پشـکنیاری گشـتیی ئەلعـەزیزی مەڵبەندی کارگێڕیی ویلایەتی تـازە پێکهاتووی تونجـەلی‌و، خـۆی لـەوێ فـەرماندەی سەربازییە( بڕوانەراپۆرتی ژمارە(٩٩)ی (٢٢) شوباتم)۔

٢. هێشتا روون نییە ئـاخۆ سنوورەکانی چـوارەم پشـکنیاری گشـتی‌و ویلایەتـە تازەکە دیاریکراون یان نا۔

پێرسی لۆرەین

وەزارەتی‌دەرەوە، ٤٢٤/٢٨٠، ل: ٥٢، ژ: ١٤

ژ: ١١١

**لە سێرپی، لۆرەینەوەبۆ مستەر ئیدن( ٢٨ی مایس گەیشتووە )**

ژمارە: ٢٩٣

ئەنگۆرە، ١٧ی مایسی ١٩٣٧

گەورەم،

(١١)ی حوزەیـران، بروسـکەی جێگـری کونسـوڵی تـەرابزوونی خاوەنشـکۆم پێگەیشت کە ئەم دواییە نائارامی، بەپێی سـەرچاوەیەکی زانیـاریی بڕواپێکـراو، لـە

هەرێمی دەرسیم سەریهەڵداوەو، کوردانی یاخی(١٠) ئەفسەرو (٥٠) سەربازیان کوشتووەو، سەربازیش لە ئەرزنجان کۆکرایەوە بۆ کۆنترۆڵکردنەوەی بارودۆخەکە.

٢. راپۆرتێك لەسەر تیرە کوردەکانی نیشتەجێی دەرسیم لەگەڵ نووسراوی ژمارە(٥٠٣)ی(٢٤) ئۆکتۆبەری ساڵی(١٩٣٤)ی مستەر مۆرگندا هاوپێچ کراوە. منیش لە راپۆرتی ژمارە( ٦)ی (٣) کانوونی دووەمی (١٩٣٦)مدا، رێو شوێنە ئیدارییەکانی ئەو هەرێمە ئێستا بە تونجەلی ناسراوە باسکردووە. دەست پێکردنی ئەو ئیجرائاتانەیشم لە راپۆرتی ژمارە(١٧٢)ی(٣) نیسانی (١٩٣٦)مدا خستووەتە ڕوو. ئێستا وادیارە بەرەو رووی جۆرێك لە بەرەنگاری دەبنەوەو، ئاڵۆزیی ناوچەکەیش لە قسەکانی ئەم دواییەی وەزیری ناوخۆدا بۆ ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانی لەمەڕ بارودۆخی ناوچە سنوورییەکان( بڕوانە لاپەڕە دووی هاوپێچی نووسراوی ژمارە(٢٠٤)ی (٩)ی نیسانم)و، لە سەرنجەکانی د.ئاراسدا بۆ من  کە لە نامەی (١)ی مایسی مستەر رێندێڵدا ئاماژەی بۆکردووە، پشت راست کرایەوە.

٣. سەربازانی بەرفەرمانی جەنەڕاڵ عەبدوڵڵا ئاڵپ دۆغانی سەرۆکی پشکنیاریی گشتی کە خێرا کەوتنە خۆ، سەربە فیرقەی سێی پیادەی ئەرزنجان بوون‌و، ژمارەیان (٢) هەزار چەکدار دەبوو. وا هەست دەکرێ ئەو بەگشتی پشت بە سەربازانی فەیلەقی(٩)ی ئەرزڕۆم ببەستێ. هەروەها یەکەکانی جەندەرمەی بەتایبەت لەسەر شاخ راهێنراو، پشتیوانیی دەکەن. (١٠) رۆژێك لەمەوبەر، پاشکۆی هەوایی" Air Attache"ی باڵوێزخانەی خاوەنشکۆ، زانیبووی جێگری وەزیری فڕۆکەوانی وادەیەکی لەگەل نوێنەری دامەزراوەیەکی ئینگلیزیدا هەڵوەشاندوەتەوە، چونکە بەپەلەو بە فڕۆکەیەك چووەتە هەرێمی کوردەکان. کونسوڵی خاوەنشکۆ لە مەرسین، بە بروسکەیەك ئاگاداری کردمەوە کە (٢٠) فڕۆکەی سەربازی، بەپێی هەواڵی لە جەختکردنەوە نەهاتوو، لە ئەلعەزیزی ناوەندی کارگێڕیی ناوچەی دەرسیم دژی کورد بەکار دەهێنرێن.

٤. سەبارەت بە هێزەکانی حکومەتیش، ڕێتێناچێ تورکەکان بتوانن بەئاسانی ئاگری جووڵانەوەکە خەفە بکەن.

پێرسی لۆرەین

وەزارەتی دەرەوە، ٢٨١/٤٢٤، بەشی (٣٣)، ل: ١٣٢، ژ: ٨٩

ژ: ١١٢

**لە پێرسی لۆرەین بۆ مستەر ئێدن( ٢٨ی مایس گەیشتووە )**

**ژمارە: ٣٠٩**

**ئەنگۆرە، ٢٢ی مایس ١٩٣٧**

**گەورەم،**

بروسکەیەکی تری (١٥) مایسی کونسوڵی کونسوڵخانەی تەرابزوونی خاوەنشکۆم، کاتی نووسینی راپۆرتی ژمارە(٢٩٣)ی (١٧)ی مانگم لەسەر بارودۆخی ناوچەی دەرسیم، پێگەیشت. بروسکەکە تایبەت بوو بەکوردە یاخیەکان، کەبەپێی ئاگاداریی ئەو، ژمارەیان ( ١٥) هەزار زیاترەو، بەردەوام زیانی گەورە لە هێزەکانی تورك دەدەنو، درندانە لاشەی ئەفسەرە کەوتووەکانی بەردەستیان دەشێوێنن. مستەر فالانگا هەروەها دەڵێ: (٣) هەزار سەربازی تورك لە ئەرزنجان کۆکراونەوەو، فڕۆکەیش لە دیاربەکرەوە دێ.

کونسوڵی خاوەنشکۆ لە مەرسین، لە راپۆرتی(١٩)ی مایسدا نووسیویەتی: هێزەکانی حکومەت، بەپێی هەواڵەکانی ناوخۆ، سێ گوندی کوردنشینیان سووتاندووەو، فڕۆکەیەکیان لەدەست داوە. هەروەها کوردەکان ئەفسەرێكو (١٢) سەربازی یەدەگیان گرتووەو، بەکۆمەڵ کوشتوویانن.

پێرسی لۆرەین

وەزارەتی دەرەوە، ٢٨١/٤٢٤، بەشی(٣٣)ل: ١٣٢، ژ: ٩٠

## ژ: ١١٣

## لە پێرسی. لۆرەینەوە بۆ مستەر ئیدن( ٢٨ی مایس گەیشتووە )

**ژمارە: ٣١١**

**ئەستەمبووڵ، ٢٣ی مایسی ١٩٣٧**

**گەورەم،**

ئامـاژە بـە نووسـراوی ژمـارە(٢٩٣)ی (١٧)و (٣٠٩)ی (٢٣)ی مایسـم لەمـەڕ ناثارامیی ناوچەی دەرسیم، یادداشتەکەی پاشکۆی سەربازیی ئـەم باڵوێزخانەیـە بۆ ئەم بابەتە هاوپێچ دەکەم.

٢. رائید رۆس( Major Ross) کەمیی زانیاریەکانی لە یادداشتەکەدا تێبینـی کـردووە. جـا ئەگـەر ئـەو دیمەنـە گشـتییە پیشـاندراوە دروسـت بـێ، ئـەوا دەشـێ دەرەنجامەکە، بەهۆی نەبوونی درێژەی هەواڵەکانـەوە، لـە هـەموو بارەکـاندا راسـت نەبێ.

٣. دەکرێ بڵێم چاپەمەنیەکانی تورك، تەنها یـەکیان نـەبێ، لـەم ئاڵۆزییـە تـەواو بێدەنـگ بـوون. (سـەن تێلیگـراف)(١٤)ی مـایس بابـەتێکی بڵاوکردبـووەوەو، ئاماژەیـەکی بەکێشـەی ویلایەتـەکانی رۆژهـەڵات کردبـوو. بڵاوکراوەکـە دوای ئەمـە راگیراو، چەند رۆژێك دەرنەچوو.

پێرسی لۆرەین

وەزارەتی دەرەوە، ٢٨١/٤٢٤، بەشی(٣٣)،ل: ١٣٣، ژ: ٩١

**********

## هاوپێچی ژ: ١١٣
## هەڵسەنگاندنی بارودۆخی سەربازیی ویلایەتەکانی رۆژهەڵات

حکومەتی تورکیاو، بەتایبەتی ئەرکانی گشتی ، دوو کێشەیان هەیە: یەکیان ئەوی سەر سنووری سووریایەو، لەرووی سەربازییەوە نەگەیشتووەتە ئەو ئاستەی کە سەرباز بۆ پشتگیریی گفتوگۆ سیاسیەکە کۆبکرێتەوە. رێگریو چەتەیی دەڤەری ماردین، کە چەتەکان لە خاکی سووریادانو، وامەست دەکرێ لەعێراقەوە هاتبن، بارودۆخەکەیان ئاڵۆزکردووە. هەڵبەت رێیتێدەچێ بەشێکی ئەم دزیو جەردەییە بەهۆی هاندانی سوورییەکانەوە بێ. هەرکە کێشەکەی سنجەقی ئەسکەندەروونە، وەك ئومێد دەکرێ، دوایی هات، گرفتەکە نامێنێو کۆبوونەوەی سەربازانیش ئاسایی دەبێتەوە. بەلام دەشێ پاسەوانانی سنوورو سەربازانی گوومرگ ، وەکوو ئیشارەتیان پێدەدرێ، بەهێزبکرێن.

کێشەی دووەم یاخیبوونی کوردەکانی دەرسیمە. ئەم یاخیبوونە، بێگومان ماوەیەکە پەنگی خواردوەتەوەو، ئێستا دەزگا سەربازییەکانی تورکیش خۆیان بۆ دەست بەکاربوون لەو ناوچەیەدا ئامادە دەکەن. ئەگەرچی رێیتێناچێ فەرەنسیەکانی سووریا دەستیان لە بزواندنی ئەم گرفتەدا هەبێ، دەکرێ ئەو ئەنجامە بەدەست بهێنین کە راوو رووتی سنوورەکانی عێراق – سووریا کەمێك پەیوەندییان پێوەی هەیەو، کوردانیش بڕیاریان داوە هەتا ناکۆکیی تورکیاو فەرەنسە کۆتایی نەهاتووە، یاخی ببن. یاخیبوونەکە، کاتی خێڵەکیەکان زیانی گەورەیان لە سەربازانی تورك داو، زۆر دڕندانە رەفتاریان کرد، بەتەواوی تاوی سەند.

ناکرێ بە درێژی باسی هەنگاوەکانی ئێستای حکومەت بکرێ، بەلام زانیاریەکانی بەردەست خواستەکانیمان بۆ روون دەکەنەوە. حکومەت مەبەستیەتی( حامیە)ی باشووری رۆژهەلات بەهێز بکاتو، لە باکوور بکەوێتە سزادانی خەلك. چەند

یەکەیەکی فەیلەقی (٧)ی دیاربەکرو فیرقەی( ١٤)ی سوارەی ئورفەو(٢)ی پیادەی سعرتو وانو(١٧)ی ئەلعەزیز، سازو تەیار کراونەوە. سێ پۆل یەدەگیش بۆ بەهێزکردنی فیرقەی (٧)ی سوارەی ئەدەنەی سەر بە فەیلەقی (٦) بانگ کراونو، ئەم ئیجرائاتانە، بەدڵنیاییەوە، لە فەیلەقی (٧)یش کراوە. کەسانێکی فیرقەی (١٤)ی سوارە، لەئورفەوە، سەریان لەدیاربەکر داوەیەکەی گەڕۆکی جەندرمە کە ئەرکیان پاراستنی ئارامیی ناوخۆ، بەتایبەتی ناوچە شاخاویەکانە، بە کەسانی قوتابخانە جۆلکراوەکانی سەر دەردەنێل بەهێزکراون.

جا لەبەر ئەوەی زانیاریی لەوە زیاتر نییە، پێم وایە ئەمانە تەنها رێوشوێنی خۆپارێزین. ئەوان نەك هەر بەنیاز بوون (حامیە)ی سنووریی خوارووی رۆژهەلات قایم بکەن، بەڵکوو دەیشیانویست فەیلەقی (٧) ئەوبەشەی ناوچەکە تەواو کۆنترۆڵ بکات. رەنگە بەشێکی ئەم فەیلەقە داوا بکرێ بۆ ئەوەی لە باشوورەوە یارمەتیی تێکشکاندنی یاخیبوون بدات.

کرداری سەربازیی دژی کورد، بەپێی زانیاریی دەستکەوتوو، لە ئەرزنجانی بنکەی فەرماندەیی فیرقەی (٣)ی پیادەی فەیلەقی (٩)ەوە بەڕێوەدەبرێ. ئەم فیرقەیە سازدراوەتەوەو، فرۆکەی دیاربەکرو، پێدەچێ سەربازانی ئەلعەزیزیش پشتیوانیی بکەن.

سەرۆکی ئەرکانی گشتییو جەنەراڵ ئەحمەد ناجی تیناسی قوماندانی گشتیی جەندرمە (٧)ی مایس، وەك دەڵێن، بە گەشتێکی پشکنیاری سەریان لە (قەیسەری)ی بنکەی فەرماندەیی فەیلەقی (٧) دا. هەڵبەت ئامانجی ئەم گەشتە بڕیاردان بوو لەسەر ئەو رێوشوێنانەی کە پێویستە دژی کورد بیانگرنەبەرو، وا پێشبینی دەکرێ زیاتر بەرەو رۆژهەلات بڕۆن.

دروستکردنی پشکنیارییەك لە تونجەلی، بەگشتی، ئامانجەکانی نەپێکا. دیسەمبەری ساڵی ١٩٣٥، جەنەڕاڵ حوسەین عەبدوڵڵا ئالپ دۆغانی ئەفسەری چالاك بەدەسەڵاتێکی فراوانی سەربازیو مەدەنییەوە دەستنیشان کرا بۆ ئەو پشکنیارییە.

وادیارە ئەو، لەبەر نەبوونی ئامرازو هۆکاری پێویست، نەیتوانیوە نیزامو یاسا پتەوبکات، یان بەهەر هۆیەکی ترەوە بێ، شکستی هێناوە. بەلاّم من بڕوام بە هۆکاری یەکەم زیاترە.

دواجار، بڕیاری سزادانی کورد لەکاتێکدا هات کە بۆ تورک نەشیاو نەبوو. پیادەکان، یەکی مایس، ئاسایی بانگ دەکرێنو، ئەمەیش تەشکیلەکان لەڕووی سەربازییەوە بەهێز دەکات. کێشەی سنجەقی ئەسکەندەروونەیش بەکردەوە چارەسەر دەکرێ، چونکە کاربەدەستانی سەربازیی تورک بەوە نەبێ، لەتەك یاخیبوونی کورددا، کەم یا زۆر، خۆیان لە دڵە ڕاوکێو نیگەرانیدا دەبینن.

وەزارەتی دەرەوە، ٤٢٤/٢٨١، بەشی (٣٣)ل:١٣٣-١٣٤، ژ١/٩١

ژ: ١١٤

**لە مستەر مۆرگنەوە بۆ مستەر ئێدن (٢٢ی حوزەیران گەیشتووە)**

**ژمارە:٢١**

**برووسکە**

**ئەنگۆرە، ١٦ی حوزیرانی ١٩٣٧**

ئاماژە بە بڕگەی (٢)ی بروسکەی ژمارە (١٩)ی حوزەیرانمو، ڕاپۆرتی ژمارە (٣١١)ی (٢٣) مایسی پێرسی لۆرەین، سەرۆکی ئەنجومەن (١٤)ی حوزەیران لە قسەکانی تایبەت بە سیاسەتی ناوخۆی بەردەم ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانیدا، باسی نائارامیی هەرێمی کوردانی کردو، وتی چەند سەرۆکێکی ناوخۆ بەرهەڵستیی بەرنامەیەکی تایبەتی چاکسازیی دووساڵ لەمەوبەریان بۆ بەشارستانیکردنی ئەو ناوچانە کردووە، بۆیە حکومەت ناچار بووە کۆتایی مانگی ئادار ڕێگەی سەربازی بگرێتەبەر. ئێستا دەسەلاّتی حکومەتو جەندرمە تەواو دامەزراوەتەوەو، بەرنامەی

چەکسازیش بەردەوام دەبێ. هەروەها ژمارەیەکی باش هێزی سەربازیی لە دەڤەرەکە بەجێهێڵراون.

سەرۆکی ئەنجومەن نکوولیی لە چیرۆکی شەڕوشۆڕی قورس و شکستی گەورە کردو، رایگەیاند: زیانەکانی ماوەی سێ مانگی ئۆپەراسیۆنەکەی حکومەت بریتی بوون لە (١٣) کوژراوو، (١٨) بریندار کە یەکیان ئەفسەربووە.

وەزارەتی دەرەوە، ٢٨١/٤٢٤، بەشی (٣٣)، ل:١٤٠، ژ:٩٨

## ژ:١١٥
## لە مستەر مۆرگنەوە بۆ مستەر ئیدن (٢٤ی حوزەیران گەیشتووە)

**ژمارە: ٣٦١**

**ئەنگۆرە، ١٧ی حوزەیرانی ١٩٣٧**

**گەورەم،**

ئاماژە بە بروسکەی ژمارە (٢١)ی (١٦) حوزەیرانم، ئاگادارتان دەکەمەوە کە چاپەمەنیی تورک ژمارەیەك بروسکەی پەیامنێرێکی بڵاوکردوەتەوەو، دەڵێن: ئەم پەیامنێرە بەشوێن دوا کردەوەی سەربازیی ناوچەی دەرسیمدا چووە. ئێستا، کە مەسەلەی ئەسکەندەروونە بەشێوەیەکی پەسەند دوایی هاتووە، نیگەرانیی ئەو بروسکانە لەو نیشانانەیدایە کە گوایە هەموو ئاڵۆزیەکە بەهۆی "سیخوڕە هاتووەکانی باشوور"ەوە بووە. هەروەها تێیاندا هاتووە: ئەمانە بەختیاریی ئەو خەڵکەیان کە بەهۆی لێهاتوویی لەڕادەبەدەری ئیدارەی تورکیاوەوازیان لە رێبازە کۆنەکەیان هێنابوو، لەسایەی نیزام و یاسادا دەژیان، لەباربرد.

٢ـ یاخیبوونەکە، بەپێی راپۆرتەکانی پەیامنێرەکە، بە بڕیارێکی خێڵەکی بووەو، مەبەست لێی داواکردن بووە لە حکومەت دەست لە دامەزراندنی خاڵەکانی پۆلیس و کۆکردنەوەی، چەك و.. هتد هەڵگرێ. ئەمجا پەلاماری هێزەکانی تورك دراوەو، پرد

رووخێنراوە. ئیتر ئەمانە کاری سەرکوتکاریی خێراو سەرکەوتوویان پێویست کردووە. یاخییان ئیستا گەمارۆدراون و (٥) هەزار کوژراوو برینداریان هەن، ڕەنگە دوا پێکدادانیش لەسەر چیای سوڵتان بابا (Sultan baba)[1] رووبدات. پەیامنێرەکە پێی لەسەر دادەگرێ کە حەسەن مەکی و سەید ڕەزای[2] یاخییان خەڵکیان بە نامەیەکی ساختە لەخشتەبردووە. نامەکە پرسیویە: بۆچی دەرسیمیە پێشتر هەرگیز خۆ بەدەستەوە نەداوەکان، ئێستا بە پشکنیارێکی گشتیی بێ چەک و سەرباز تەسلیم بوون؟

جەمیس مۆرگن

وەزارەتی دەرەوە، ٢٨١/٤٢٤، بەشی (٣٣)، ل: ١٤٧،ژ:١٠٣

***

## ژ: ١١٦

## لە پێرسی، لۆرەینەوە بۆ مستەر ئێدن (٨ی تەمووز گەیشتووە)

**ژمارە:٤٠٥**

**ئەستەمبووڵ، ٣ی تەمووزی ١٩٣٧**

**گەورەم**

ئاماژە بە راپۆرتی ژمارە (٣٦١)ی (١٧) حوزەیرانی مستەر مۆرگن، پێتان رادەگەیەنم کە سەرهەڵدانی ناوچەی دەرسیم، بەپێی بروسکەیەکی گەیشتووی (٢٨) حوزەیرانی کونسوڵی خاوەنشکۆ لە تەرابزوون، ئێستا تەواو خامۆش کراوە.

---

[1] لە باکووری ڕۆژهەڵاتی ناوچەی دەرسیمە. (س)

[2] کوڕی سەید ئیبراهیمی حەسنانییە، ڕۆژی ١٩٣٧/٩/٥ برایە ئەرزنجان بۆ گفتوگۆو دەستبەسەرکرا. ١٩٣٧/١٠/١٨ لە ئەلعەزیز ئیعدام کرا (د. نوری دەرسیمی، دەرسیم لە مێژووی کوردستاندا، ل٣٢٢، ٣٢٣). (س)

مستەر ماتیۆس لە سەرچاوەیەکی بڕواپێکراوەوە زانیویەتی: دوا کۆمەڵی یاخییان کە ژمارەیان (٥٠٠-٦٠٠) کەس بووە، (٢٤)ی حوزەیران خۆیان بەدەستەوە داوە، باوەڕ وایە زیانەکانی سەربازانی حکومەت گەورە نەبن، بەڵام جەندرمەو هێزی هەوایی کە ڕۆڵی گرنگیان لە دامرکاندنەوەی ڕاپەڕیندا بینیوە، زیانی بەرچاویان لێکەوتووە. چاپەمەنییەکان بەجۆش و خرۆشەوە ئەمەیان بڵاوکردەوە: سەبیحە گۆکچەن (Sabiha Gokcen)[1] کە ئەتاتورک خۆی بەخێوی کردووە، بنکەو بارەگاکانی یاخییانی بە سەرکەوتوویی بۆمباران کردووە.

٣ـ مستەر ماتیۆس زانیویەتی کە حوکمی عورفی لە ناوچە نائارامەکاندا کاری پێدەکرێ، بەڵام پەیوەندیی پۆستەو بروسکە هەر ماوە. دەڵێن: زۆر لە ڕێبەرە خۆبەدەستەوەداوەکانی یاخیبوون لەداردەدرێن.

٤ـ جێگری کونسوڵی بریتانیا لە مەرسین، دەڵێ: بەپێی ڕای گشتی، یاخیبوونەکە بەتەواوی دامرکێنراوەتەوەو، زۆرینەی سەرکردەکانی تەسلیم بوون. سەید ڕەزای ڕێبەری سەرەکی هێشتا تەسلیم نەبووە.

٥ـ چاپەمەنییەکانی ئەستەمبووڵ درێژەی پرۆگرامە چاکسازییەکانیان بڵاوکردەوە کە بەتەمان لە ناوچەی دەرسیم جێبەجێیان بکەن. ئەم بەرنامانە دروستکردنی ڕێگەو پردو قوتابخانەو قشڵەو دامەزراندنی بنکەی جەندرمەیان تێدایە. هەروەها پێشنیاری دانانی سیستمی بانك کراوەو، مستەر کاتۆن (Mr. Catton)

---

[1] سەبیحە گۆکچەن ١٩١٣/٣/٢١ لە برووسە لەدایك بووە. لە ساڵی ١٩٢٥ەوە، ئەتاتورك بەخێوی کردووە، چونکە باری بژێویی خراپ بووە. ساڵی ١٩٣٥ چووەتە قوتابخانەی فڕۆکەوانیی مەدەنیی کۆمەڵەی فڕۆکەوانیی تورکی. بۆ ڕاهێنان نێردراوەتەوە رووسیاو، دواترو ساڵی ١٩٣٦ چووەتە ئەکادیمی فڕۆکەوانیی سەربازی لە ئەسکیشەهر. ساڵی ١٩٣٧ بەشداریی ئۆپەراسیۆنەکانی ئیجەو دەرسیمی کردووە. ئەمجا تا ساڵی ١٩٥٥ کراوەتە ڕاهێنەری سەرەکیی کۆمەڵەی فڕۆکەوانی (Turk kusu)، پاشان کراوەتە ئەندامی دەستەی جێبەجێکاری فڕۆکەوانیی تورك. ٢٢ی ئاداری ٢٠٠١ بە نەخۆشی گیانی لەدەست دا. گۆکچەن بە یەکەم فڕۆکەوانی مێی تورك دادەنرێ

(http:llwww. byegm. gov. tr/yayinlarimiz/ newspot/2001/mar-apr/n4.htm)

زانیویەتی کەبانکی ئیش (Is Bankasi) بەم زووانە چەند لقێکی لە هەرێمی دەرسیم دەکاتەوە. هەر لە چاپەمەنییەکاندا هاتووە کە سیستمی دەرەبەگایەتی دەسڕدرێتەوەو، رێبەرانی سەرەکیی کورد رادەگوێزرێنە ناوچە دوورەکانی تری تورکیا

پێرسی لۆرەین

وەزارەتی دەرەوە، ٢٨١/٤٢٤، بەشی (٣٤)، ل:٥، ژ:٥

## ژ: ١١٧

## لە پێرسی لۆرەینەوە بۆ مستەر ئیدن (٢٣ی تەمووز)

**ژمارە: ٤٣٢**

**ئەستەمبووڵ، ١٦ی تەمووزی ١٩٣٧**

**گەورەم،**

ئاماژە بەراپۆرتی ژمارە (٤٠٥)ی (٣)ی تەمووزم، ئەمەوێ پێتان رابگەیەنم: ئەندامێکی ستافەکەم وتووێژێکی گرنگی لەگەڵ پشکنیارێکی وەزارەتی کاردا کە کەسایەتییەکی بەتەمەن‌و ناسراوەو، تازە لە ناوچەی دەرسیم گەڕاوەتەوە، سازداوە.

٢ـ پشکنیارەکە وتوویەتی: هێشتا شەڕ بەردەوامەو، جەنەراڵ ئالپ دۆغان دەسەڵاتی سەرکوتکردنی راپەڕین‌و دەستپێکردنی رێوشوێنەکانی کارگێڕیی بۆ هێورکردنەوەی کوردی پێدراوە. پشکنیارەکە زۆر بەشان‌و باڵی تین‌و توانی کارگێڕی‌و کۆنترۆڵی جەنەراڵیان هەڵداوە. هەروەها وتوویەتی: جەنەراڵ ئالپ دۆغان پێی وایە لە رابردوودا توندوتیژیی زیاد دژی کورد بەکارهاتووە، بۆیە راپەڕین بەردەوام سەری هەڵداوەتەوەو، دەبێ جەندرمە لەبەر ئەو نائارامییە درێژخایەنە سەرزەنشت بکرێ. ئەمساڵ هەوڵی داگیرکردنی سەرتاسەری هەرێمی نائارام نادرێ.

سەربازان تا هێڵێکی (دیارینەکراو) پێشڕەوی دەکەن و، ئیتر دەوەستن و، ئەمجا ڕێو شوێنی هێورکردنەوەو قەناعەت پێکردنی کورد دەست پێدەکەن. پرۆسەی گرتنەوەکە ساڵی ئاینده بەردەوام دەبێ و، سەربازی زیاترو ژمارەیەکی کەمتری جەندرمە لە داهاتوودا لەو ناوچانە جێگیر دەکرێن. لەهەندێ باری ناچاریدا نەبێ، مامەڵەیەکی زۆر بەخشندانە تر لەتەك کورداندا دەکرێ و، کوردەکانیش هەمیشە هاوکاریی ڕێبازە نەرمەکان دەکەن.

٣ـ پشکنیارەکە لەسەری ڕۆیشتووەو وتوویەتی: بنیاتنان و بەرەو پێشچوونی ناوچەی دەرسیم، بە چاودێریی جەنەڕاڵ و لەلایەن کارمەندانی وەزارەتەکانی پەروەردەو کارەوە دەستیان پێکراوە. ئەو خۆی، هەر کاتێ بکرایە، لەگەڵ کرێکارانی کورددا ئیشی دەکردو، پردی بنیات دەنا، کوردی لە ئاژاوەگێڕی دوور خستووەتەوەو، ئەوانیش وەك کارگەری باش و ئارەزوومەندو (ژیرتر لە تورکانی ئەنادۆڵ) کار دەکەن. ئومێد دەکرێ ساڵی ئاینده پاشماوەی ئەم شێوازانەی هێورکردنەوە، بەبێ خوێنڕێژیی تر، لەوناچانەد تەواو ببێ.

٤ـ پشکنیارەکە سەبارەت بە شەڕیش وتوویەتی: زیان و قوربانیانی تورك لەوانەی کورد، کە باجێکی زۆر لەشەڕیاندا دراوە، زیاترن.

پێرسی لۆرەین

وەزارەتی دەرەوە، ٢٨١/٤٢٤، بەشی (٣٤)، ل:٦، ژ:٧

## ژ: ١١٨

## لە پێرسی لۆرەنیەوە بۆ مستەر ئێدن (٢٥ی نۆڤەمبەر گەیشتووە)

ژمارە: ٦٨٤

ئەنگۆرە، ٢٠ی تشرینی دووەمی ١٩٣٧

گەورەم،

ئاماژە بە بروسکەی ژمارە (١٦)ی (٢١)ی ئۆکتۆبەری مستەر مۆرگن لەبارەی یاخیبوونی ئەم دواییەی کوردەوە، ئەمەتان پێ ڕادەگەیەنم: ئەو دادگایە کە سەرکردەکانی یاخیبوون دادگایی دەکات، بەپێی بڵاوکراوەکانی (١٦) تشرینی دووەمی تورکیا، (١١) کەسی بە مردن حوکم داوەو، سەید ڕەزاو شەشی تر لەسێدارە دراون و، حوکمی مردنی چوارەکەی تر، بەلەبەرچاوگرتنی تەمەنیان بۆ سی ساڵ زیندانی گۆڕدراوە. هەروەها لەراگەیاندنەکەدا هاتووە: (٣٣) تاوانبار، دیکە بەزیندانی بەحوکمی سزا دراون و، (١٤) کەسیش ئازادکراون.

٢ـ ڕۆژنامەی (Republique)، لە باسی لەداردانی خێرای سەید ڕەزاو شەش هاوەڵەکەیدا، نووسیویەتی: حوکمی مردنی ناوچەکانی بەرفەرمانی پشکنیارییە گشتییەکان، پێویستیان بە ڕەزامەندیی ئەنجومەنی مەزنی نیشتمانی نییە. ناوچەی دەرسیم (تونجەلی)ی ناوەندی ئۆپەراسیۆنەکانی ئەم دواییەش، هەرێمی یەکەم پشکنیاریی گشتییە.

پێرسی لۆرەین

وەزارەتیدەرەوە٢٤٢/٢٨١، بەشی (٣٤)، ل:٦٠-٦١، ژ:٦٤

## ژ:١١٩

## لە پێرسی. لۆرەینەوە بۆ ڤیسکاونت هالیفار (١٥ی سێپتمبەر گەیشتووە)

**ژمارە: ٤٥٩**

نوێنەری خاوەنشکۆ لە ئەستەمبووڵ راپۆرتێکی بۆ وزیری کاروباری دەرەوەی خاوەنشکۆ دەنێرێو، ئاماژە بە بروسکەی ژمارە (٩)ی (٥)ی ئابی باڵوێزخانە، کۆپی راپۆرتێکی (٥) ئەیلوولی پاشکۆی سەربازیی لەبارەی دامرکاندنەوەی کوردانی هەرێمی تونجەلی هاوپێچ دەکات.

ئەستەمبووڵ، ٩ی ئەیلوولی ١٩٣٨

## هاوپێچی ژ:١١٩

## لە نەقیب – کۆلۆنێل رۆسەوە بۆ مستەر مۆرگن

**ئەستەمبووڵ، ٥ی ئەیلوولی ١٩٣٨**

**گەورەم،**

خۆشحاڵم ئاگادارت بکەمەوە، کە کاتی سەردانەکەی (٣١)ی ئابی پاشکۆکانی خزمەت (ملحق الخدمة) بۆ ئەلعەزیز، جەنەراڵ عەبدوڵڵا ئاڵپ دۆغان وتەیەکی بچووکی لە هەرێمی تونجەلی پێشکەش کردووە. ئەم ئەفسەرە شارەزایە، هەروەکوو ئاگادارن، نزیکەی دوو ساڵە ئیش و کاری پارێزگاری مەدەنیو سەربازیی ئەو هەرێمەی لە ئەلعەزیزەوە پێکەوە گرێ داوەو، بەرپرسی پرۆسەی هێورکردنەوەی ئەو ناوچەیە بووە، ئەم وتەیەو چەند زانیارییەکی تری دەڤەری تونجەلی وا لە خوارەوە کورت کراونەوە:

جەنەراڵ عەبدوڵڵا ئاڵپ دۆغان وتی: دیجلەو فورات لەو ناوچەیەوە سەرچاوە دەگرن، بۆیە ئەو هەرێمە بایەخی خۆی هەیە. شێوەی ناوچەکە وا هەڵکەوتووە کە لێشاوی کۆچی خەڵك لە رۆژهەڵاتەوە، لەرابردوودا، رووی لەوێ کردووە. تورك خۆی

لەئاسیاوە هاتووەو، لەگەڵ دانیشوانی تونجەلیدا یەك رەچەڵەکن. هەڵبەت ئەم تیۆرییەکی بەجێیە کە تورکەکان بە رێیەکی گونجاوی بزانن بۆ پیادەکردنی سیاسەتی نەتەوەیی خۆیان.

خولی دووەمی کردارە سەربازییەکانی ئەمساڵ، وەك لەراپۆرتی (٥) تشرینی یەکەمی (١٩٣٨)مدا، ئاماژەم پێداوە، بۆ تێکشکاندنی هەر نیشانەیەکی درێژخایەن و ساڵی پار جێبەجێنەکراوی یاخیبوونی کوردانی ناوچەی تونجەلی تەرخانکراوە. سێ فەیلەقی سەربازیی و سەربازی زیادەو (٤٠) فرۆکە خراونەگەڕ. ئەو نەخشەو وێنانەی کە نیشانی پاشکۆکان دراون، دەریدەخەن ئەو هەرێمە چەندە شاخاوییەو، ئارامکردنەوەی چەند سەختە.

چەند سەرکردەیەکی دەستگیرنەکراوی یاخییان بەرگرییان کردووەو، رەنگە کوشتار لە هەردوولا بووبێ. راگەیاندراوە: بریندارانی تورك، مانگی ئاب، لە ئەلعەزیز بینراون.

پێم وایە چالاکییەکانی تورك تارادەیەك سەرکەوتوو، لەوانەیە ژمارەیەك کوژراویش هەبن. چەند رێبەرێکی کوردو ژمارەیەکی کەمی دانیشتوان گواستراونەوە بۆ شوێنی تری تورکیاو، برێك چەك (١٢ هەزار پارچە، بەپێی چاپەمەنییەکان) دەستیان بەسەردا گیراوە. پاشماوەی خەڵکەکەیش، بەچاودێریی هێزەکانی پارێزگاریی ناوخۆ، کە ئێستا لە خاڵە گرنگەکاندا بنکەیان بۆ دروست دەکرێ، دانراون. هەروەها بەتالیۆنێکی نوێی پێکهاتوو لە دوو فەوجی پیادەو چەند تۆپێك سازدراوەو، لەسەر چاوگەی رووباری مەنسوور (موراد) جێگیر کراوە.

ئارامکردنەوەی تەواوی ناوچەی تونجەلی پشت بەو رێوشوێنانە دەبەستێ کە دەزگاکانی تورك دەیانگرنەبەر. روودانی کێشەی بچووك لەو ناوە، تەواو بەدوور نازانم. تورکیا ئێستا پرۆگرامێکی بنیاتنانی بەبڕی (٣) ملیۆن لیرە بەدەستەوەیە. دوو شارێگە کە ئەرزنجان بەئەلعەزیزەوە دەبەستنەوەو، یەکیان بە بەشی رۆژئاواو ئەویتریان بەرۆژهەڵاتی تونجەلیدا تێدەپەڕێ، لە دروستکردندان. ئەم دوو رێگەیە

لەچەند خاڵێكدا پێكەوە دەبەسترێنەوەو، تۆڕێك لەسەرتاسەری دەڤەرەكەدا پێكدەهێنن. ئومێد وایە ئەم سیستمە لە دوو سێ ساڵدا كۆتایی پێ بهێنرێ. (٤٢٠) كیلۆمەتر ڕێگەو (٩)پرد بەكۆی درێژیی ٦٩٠ مەتر دروستكراون. (٩) قشڵەو (٨) پۆستی سەربازیو (٥) بینای ئۆفیسی كارگێڕیو (٩٢) خانوو بۆ كارمەندان، بەپێی بڵاوكراوەكان، لەناوچەكەدا بنیات نراون. سیستمی تەلەفۆنیش (٥٠٠) كیلۆمەتری خراوەتەسەر.

مارشاڵ فەوزی چاكماك (Fevzi Cakmak) پێی وتم: نەخشەی دروستكردنی بەستێك لەسەرچاوەی ڕووباری مەنسوور (یان موراد) كێشراوەو، بەمەیش دەریاچەیەكی دەستكردی قەشەنگو دڵگیر پێكدێو، پێشبینی دەكرێ، وزەی كارەبایشی لێ بەرهەم بێ. بە قسەی نوێنەری سەرەكیی ئەركانی گشتیو ئەفسەرەكانی تری تورك، هیوادارن لەدواییدا شەرێمی تونجەلی بكەنە (سویسرای دووەم)و، زۆر جوانی بكەن. پێم وایە ئەو سەختیو زەحمەتەی كە گەشتیارانی توركیا دێنە ڕێیان، تەگەرەیەكی بەرچاوی هاتنەدیی ئەم ئاواتو٩ خەونە دەبن.

ئێی ڕۆس

پاشكۆی سەربازی

وەزارەتی دەرەوە، ٢٨٢/٤٢٤، بەشی(٣٤)، ل:١٧-١٨، ژ:١٦

**كۆتایی**

## سوپاس و پێزانین

بە پێویستی ئـەزانم پـڕ بـە دڵ سوپاسـی ئـەم بەڕێزانـەی لای خـوارەوە بکەمکـە دڵسۆزانە هاوکارییان کردووم:

مامۆستا ڕەفیق ساڵح کە بە لەخۆبوردنەوە ئـەم کتێـب (سـەرچاوەیە)ی خسـتە بەردەستم بۆ وەرگێڕان.

کاک سدیق ساڵح کە بە پشوو درێژییەوە بە دەستخەتی وەرگێڕانەکەمدا چووەوە ، سـەرنجی بەسـوودی زمانـەوانیی دامـێ و کتێبەکـەی بـەو پـەراوێز و پێڕسـتانە دەوڵەمەند کرد.

شەن محەمەد لە زانکۆی سلێمانی کە چەند بڕگەو ڕستەو بەڵگەنامەی فەڕەنسیی کتێبەکەی بۆ کردمە عەرەبی.

ئەم خوشك وبرایانـە کـە هەریەکـەیان لـە سـاخکردنەوەی هـەندێ وشـەو زاراوەو ڕسـتەو بڕگـەدا یاریدەیان دام: بـەڕێزان د. کـوردۆ عـەلی، شـێرزاد حەسـەن، لیدیـا شاسوار، نومێد محەمەد ئەمین.

# پێرستی ناو

## ١- ناوی کەس

ئ:

**ب:**



**پ:**



**ت:**

## ز:

س:

غ:



ف:



ق:

ن:



هـ:



و:

ی:

# پێڕستی ناو

## ٢- ناوی شوێن

ئـ:

**ب:**

پ:



ت:

ج:

خ:



د:

ڕ:

ز:



س:

**ش:**



**ع:**



**غ:**

**ف:**



**ڤ:**



**ق:**

**ك:**

**گ:**

ل:



م:

و:



ی: